# ٣ ساڵ لەگەڵ

# ئیبراهیم عەلیزادە

## سکرتێری کۆمەڵە

دیدارێکی تایبەت بە مێژووی (٣٠) ساڵەی کۆمەڵە و کوردستانی ئێران و بزووتنەوەی چەپ



بەهمەن سەعیدی

2009

چاپی دووەم



# سێ ساڵ لەگەڵ
# ئیبراهیم عەلیزادە
# سکرتێری کۆمەڵە

دیدارێکی تایبەت بەمێژووی (٣٠) ساڵەی کۆمەڵەو کوردستانی ئێران
و بزوتنەوەی چەپ

بەهمەنی سەعیدی

٢٠٠٩-چاپی دووەم

Three years with

Ibrahim Alizadeh

Secretary of Komala

Unique insights into 30 years of history of Komala

Iranian Kurdistan and the left movement

Scend edition 2010

by

Bahman Saeydi

ISBN 978-91-86065-35-5

ناوی کتێب: سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیمی عەلیزادە سکرتێری کۆمەڵە

ناوی نووسەر: بەهمەنی سەعیدی

دیزاین: سیامەند .ک

چاپی دووەم

چاپ خانە کتاب ئەرزان

ساڵی چاپ: ۲۰۱۰

بەشی فەرهەنگی کومیتەی کوردستان

E_mail:info@komalah.org

پێڕست

ئەم کتێبە و ماندووبونەکەی پێشکەشە بە:

- دایکم
- شەهیدەکان و پێشمەرگە شۆڕشگێڕەکانی کۆمەڵە و خانەوادەکانیان
- باران و وشیار
- بەو کەسانەی بە عیشقەوە زۆر بەم کتێبەوە هیلاك بوون

بەهمەن

## چاپی دووهەم بۆ...

سەبارەت بەچاپی دووهەمی کتێبی (سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە)دا. حەزمکرد چەند قسەیەکی کورت بخەمە سەر قسەکانی پێشووم.

بێگومان لەهەموو دونیادا چاپی دووهەم و سێهەمی کتێب، ئاماژە و دەلالەتە بۆ باشی و سەرکەوتنی کتێبەکەو هەرئەمەش وایکردوە پاش چاپی یەکەم و سەرکەوتن و دەستخۆشیەکی زۆر لەکتێبەکە. ونەمانی لەبازاڕ و داواکاریەکی زۆر لەسەری بەتایبەت لەئەوروپاوە. بڕیارماندا چاپی دووهەمی بکەین.

لەسەر کتێبەکە کەوترا" "مێژویەکی سی ساڵەی زیندووکردەوە" "چەند قسەی مێژوویی خنکاوە، کەنەکرابون، درکێندران"

"هەقیقەتی مێژووی دەگێڕێتەوە" پرۆژەیەکە بۆ گەڕان بەدوای پرسیارە ونبوەکان و خەمی گرفتەکان"

ئەوەش وترا" لایەنگری پێوەیە" "دەبوو لایەنەکانی تریش قسەبکەن" "بەشێك لەنهێنیەکان ئاشکرا نەکراون"

بێگومان ئەوانە هەردووکیان بۆچونی خوێنەرانی کتێبەکەیە و لەم چاپە و چاپەکانی داهاتوشدا، ئەو بۆچونانە لەبەرچاو دەگرین.

بەڵام ئەوە دەزانین، کەکاریگەمانکردوە، بەوپەڕی یەقینەوە بۆ ئاشکرابوونی گومانەکان و بێ لایەنگری بەڵکو ئامانجمان خزمەتکردن بوە بەمێژوو و گەل و بەرنامە، بەواقیعەتێك کە (٢٠) ساڵ درێژەی کێشاوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین لەسەر ئەم پرۆژەیە بەردەوام دەبین و دەگەڕێن بەدوای یەك یەکی ئەو وەڵامانەی خەڵکی کوردستان دەیەوێت.

هەربۆیە بەم زوانە پرۆژەی دووەم دیداریکە لەگەڵ (عەبدوڵڵا مهتدی)، تابتوانین ئەو مێژووە باشتر قسەی لەسەر بکەین و دواتریش پرۆژەی ترمان دەبێت لەسەر هەڵوێستی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کەهەبوون پێیانوایە ئەم کتێبە پرۆژەیەکە تەنها لەخزمەت (کۆمەڵە)دایە. کەهەرگیز وانیە.

بەڵام دەبێ ئەوە بڵێن. هاوکاریکردنی ئیبراهیم عەلیزادە و زوو بەدەنگەوە هاتنی هۆکاری سەرەکی پێشکەوتنی کارەکە بوو لەهەردووجارەکەدا.

گەرچی ئێستا ناڵێین کتێبەکە و پرۆژەکەمان. بێ هەڵەنیەو کاملە، بەڵام پێمواییێت هەوڵێکە بۆ گەیشتن بەیەقین ...

هەروەکو چۆن بەچاپی یەکەمدا چوینەوە، دیزاین و فۆرمەکەیمان گۆڕی و لەپاشکۆیەکیشدا چەندین پرسیاری ترمان خستە سەر چاپی دووەم. کەلەچاپی یەکەمدا لەبیرکرابوون. سەرەرای چەندین بەڵگەو دۆکۆمێنت و وێنەی تر کەکارەکەی دەوڵەمەنتر کرد.

سەرەرای هەموو خۆشەویستیەك بۆ خوێنەرەکانمان و گلەیی و رەخنەو بۆچونەکانیان دەتوانن لە رێگای ئەم ئیمێڵەوە رەخنە و سەرنج و بۆچونەکانیانمان بۆ بنێرن تالەچاپی سێهەمدا کەڵکیان لێ وەرگرین.

bahmansnaiy@yahoo.com

بەهمەنی سەعیدی

٢٠٠٩/١٠/٢٥

# پێشەکی چاپی یەکەم

خوێنەری خۆشەویست

ئەم کتێبەی بەردەستت، هەوڵێکە بۆ زیندووراگرتنی مێژوویەك کە(سی) ساڵە درێژەی هەیە، مێژووی سازمانێکی سیاسیو چەندین کەسایەتی شۆڕشگێڕ، کەرۆڵی دیارو بەرچاویان هەبووە لەمێژووی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستانی ئێرانو ئێران بەگشتی.

ئەم کتێبە دیدارێکی مێژووی، سیاسی تایبەتە، کەسێ ساڵی خایاندووە، لەگەڵ "ئیبراهیم عەلیزادە" سکرتێری کۆمەڵە"

ئیبراهیم عەلیزادە سیاسیەکی ناسراوی ناوچەکەو کوردستان بەگشتی-کوردستانی ئێران بەتایبەتیو کەسێکی چەپو مارکسیو کۆمۆنیستێکی تێکۆشەرە، کەرۆڵی بەرچاوی هەبووە لەبزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستانو چەوساوەکانی ئێران.

بێ لەوان کۆمەڵەو مێژووەکەی هێندە دەهێنێت، کەلەدیدارێکی وەهادا هەموو ئەو باسو خواسانە بخرێنەڕوو کەلەماوەی (سی) ساڵی رابردوودا بەشارەوایی ماونەتەوە، یان کەوتونتەژێر تەپووتۆزی بارودۆخی ناهەمواری سیاسی کوردستانو ناوچەکە.

لەم کتێبەدا زۆر باسو بابەت خراونتەڕوو، کەپەیوەستن بەژیانی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردستانەوە، یان پەیوەستن بەمەسەلە نەتەوەییو جینایەتیەکانو داهاتووی کوردستانی ئێران.

بێگومان بۆ یەکەمین جارە لەمێژووی سیاسی (کۆمەڵە)دا بە شەفافو وردبینەوە، قسەلەسەر زۆربەی نهێنیەکانی رابردووی ئەم رێکخراوەو رووداوەکانی کوردستانی ئێران دەکرێت، بەو پێیەی کۆمەڵە، حزبێکی جەماوەریو لەمێژینەیە، بێگومان کتێبێکی وەها، گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ هەموو ئەو کەسانەی عەودالی مێژووی سیاسی کۆمەڵە و کوردستانی ئێرانو بزوتنەوەی چەپ وئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێرانن و پەیوەندیەکانی پارچەکانی ترن.

لەم دیدارەدا کەماوەی سێ ساڵە خایاندوە، لەگەڵ ئیبراهیم علیزادە، زۆر باسو بابەتی گەرمو نهێنیو سەرنجراکێشو حەماسیانەو مەترسیدار قسەیان لەسەرکراوە.

دەبوو کارەکە لەسەرەتاوە بەسادەیی دەستپێبکات، هەربۆیە بڕیارماندا، سەرەتا لە باسی منداڵیو ژیانی شەخسی ئیبراهیمی علیزادەوە دەستپێبکەین.

ئەو سەرەتا باس لەمنداڵی خۆیدەکات، کەچۆن هەژاری تەنگی پی هەڵچنیوەو عەودالی عەدالەتو بەدیهێنانی یەکسانی بووە... ئەو باس لەوەدەکات کەچۆن لەرێگای باوکێکی دیموکراتەوە پێ دەنێتە سیاسەتەوە...

عليـزاده سياسـيەكى هێمن‌و قوڵ‌و شارەزايە، بـەڵام ئـەو وەك چۆن لەمنـداڵى شـەرمن بـووە، ئێستاش هەر شەرمنە و خۆشى دان بەوەدا دەنێت كەعاشقێكى دۆڕاوە.

عليـزاده بـاس لەسـەرەتا مەترسـيدارەكانى كـارى نهێنـى‌و سياسـى دەكـات لەسـەردەمى شـاداو دەمانگێڕێتـەوە بـۆ بيرەوەيـە تاڵـەكانى سـەردەمى خەفـەقانى شاهانشايى‌و زيندان‌و كـارى نهێنـى‌و شـانە نهێنـەكانى ئـەو كاتـەى كۆمەڵـە، كەچۆن چـەند گـەنجێكى چـەپ‌و ماركسـى كەزۆرينـەيان كوردبوون. لەشارى تاران كەوتنە رێكخستن‌و دروستبوونى رێكخراوێكى چەپى كوردسـتانى بـەناوى كۆمەڵە كەجياوازتر بوو لە رێكخراوەكانى پێش خۆى.

باس لەوەدەكات چۆن كۆمەڵە ساڵى (١٩٦٩) بەنهێنى لەتاران دروستدەبێت، بەمـەيلى مائويستى‌و ماركسيسـزم‌و لينينـزم، كـە دەيانويسـت عەدالـەت‌و يەكسـانى بێنەكايـەوەو كۆمـەڵگاى ئێـران‌و كوردستان لەو سيستمە فنداليەو رزگاربكەن و، سيستمێكى سوسياليزمانە شوێنى بگرێتەوە.

لەم ديدارەدا كەسێ ساڵى خاياندووە، ئيبراهيم عليـزاده زۆر شـەفافانە هـەموو ئـەو بيرەوەريانـە دەگێڕێتەوە كەلەم پێناودا بۆ سەرخستنى دروستبوونى كۆمەڵە هاتەكايەوە.

هەربۆيە لەيەكەم كۆنگرەى ساڵى (١٩٧٨) دەستدەكات بەگێڕانەوەى ئەو مێژووە سياسيە، كەلەو ماوەيەدا كۆمەڵە لەساڵى (١٣٥٧) و گرتنى شارەبانى سەقز و شەهيدبوونى حەمەحوسێنى كـەريمى و ناونانى كۆمەڵە بەناوى (كۆمەڵەى شۆڕشگێڕى زەحمەتكێشانى كوردسـتانى ئێـران)و هـەر لێـرەوە عەليزادە دەچێتە ناو ئەم مێژووەو كەبەشێكى زۆرى مێـژووى سياسى‌و خوێنـاوى و ململانێيـەكى زۆر گەرومە.

لـەم ديـدارەدا بـاس لەچۆنيەتى ئـاڵوگۆڕ دەكـرێ لـەريزەكانى ئـەم رێكخـراوەداو گەشـەكردنى لـەرێگاى رێكخراوەكـانى جـەماوەرى‌و جوتيارانـەوەو چـەكداركردنى ژنـان‌و پيـاوانى شۆڕشـگێڕ‌و دروستبوونى ململانێى لەگەڵ حزبى ديموكراتى كوردستانى ئێران‌و شـەڕێكى خوێنـاوى نـاوخۆيى چەند ساڵەو شـەڕى بـەردەوامى (كۆمەڵـە-ئێـران)، عليزادە لـەم ديـدارەدا بـاس لـەو دۆستايەتى‌و هاوپەيمانيەتييـە دەكـات كەهـەر لەسـەرەتاوە لەگـەڵ يـەكێتى نيشـتمانى‌و كۆمەڵـەى رەنجـدەران دروستدەبێت.

دواتـريش ئـەو پەيوەنديـەى كەتائێستاش درێـژەى هەيـەو هاوكـارى جـەلال تاڵـەبانى سـەرۆك كۆمارى عيراقى ئێستاو سكرتێرى يەكێتى. ئامادەبوونى تاڵەبانى لەزۆربەى كۆنگرەكانى كۆمەڵەدا لەو كاتەدا بەشداربووەو پەيوەندى كۆمەڵەو يەكێتى دەخاتە بەرباس.

لەبەشێكى تـرى ئـەم كتێبـەدا، ئيبراهيم عليـزاده تيشـك دەخاتەسـەر شـەڕى نـاوخۆى نێـوان (ديموكرات‌و كۆمەڵە) و لايەنەكانى تر، كەچەندە كاريگەرى خراپى كـردە سـەر بـارودۆخى سياسـى كوردستانى ئێران، هەر لەو نێوەدا باس لـەتيرۆركردنى د.عەبـدولرحمان قاسملۆ و د. شـەرەفكەندى دەكات، ئەوە جگە لەگرفتە بەردەوامەكانى كۆمەڵەوديموكرات تادەگات بەئێستاو جيابوونـەوەكانى ئەو كاتى حدكا-رێبەرايەتى شۆڕشگێڕ...

هەر لەم ديدارەدا بەوردى قسەلەسـەر بـەعس‌و پەيوەنديـەكانى (كۆمەڵـە-بـەعس) و حكومـەتى عيراق‌و داهاتووى عيراقى ئێستادەكات‌و پەردە لەسەر زۆر نهێنى ئەم پەيوەنديانە هەڵدەماڵێ.

لەبەشـێكى تـرى باسـكردنى مێـژووى سياسى كۆمەڵـەدا، ئيـبراهيم عليـزاده، بـەوردى باسـى دروستبوونى (حزبى كۆمۆنيستى ئێران)و هاتنـە نـاوەى گروپـە سەهەندو مەنسورى حيكمـەت‌و رۆڵى عەبدوڵڵاى موهتەدى دەكات لەم بارەيەوە.

باس لەچەمکە فکرییەکانی مارکسیزمو لینینزم دەکاتو ڕۆڵی مەنسور شیدەکاتەوە، تا دەگات بەسەرهەڵدانی گرفتو کێشەکانی ناو کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیستو ململانێیەکانی ناو ئەو حزبەو جیابوونەوەی مەنسوری حیکمەتو دروستکردنی ڕەوتی کۆمۆنیزمی کارگەریو بێهزکردنی کۆمەڵە.

علیزادە بەشێکی ئەو گرفتانە دەخاتە ئەستۆی عەبدوڵلای موهتەدیو مەنسوری حیکمەتو پێیوایە مەنسور کۆمەڵەی زۆر لاوازکرد.

ئەم کتێبە جیالەوەی باس لەمێژووی شۆڕشگێڕانەی سازمانێکی سیاسی چەپ و مارکسی دەکات. لەهەمانکاتدا لەپەیوەست بەمەسەلەکانی چەپ و مارکسیزم وەستاوە، لەسەر خودی فەلسەفەی مارکسیزم و ململانێی چینایەتیەکان و سیستمی فئودالی و ململانێی هەردوو بلۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیزم و وەڵامدانەوە بەو پرسیارەی کەشورەوی نەیتوانی بەهەق نوێنەرایەتی باسکی سۆسیالیزمی جیهانی بکات.

هەر لەم بەشەدا، باس لەمەسەلەی چەپ و ڕێکخراوە مارکیستەکانی کوردستان دەکرێت. سەرەڕای پەیوەندی کۆمەڵە بەڕێکخراوە چەپ و مارکیستەکانی ئێران لەبابەتی ( ڕای کارگەر، حکمەتێست، حزبی کۆمەنیست، چریکە فیدائیەکان...)

جیالەوەی، لەبەشێکی تری ئەم کتێبەدا، مەسەلەی نەتەوەو مەزهەب و ناسیۆنالیزم ڕۆڵیان هەبووە لەسیاسەتی کۆمەڵەو بزوتنەوەی هەقخوازانەی خەڵکی کوردستان و

ئینشیقاق و ئینشعابەکانی کۆمەڵەدا بەئەهمیەتەوە لەسەری وەستاوەو چ وەکو فەلسەفە چ وەکو بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی و قەومی بەوردی قسە و باسی لەسەرکراوە.

ئیبراهیم علیزادە لەم کتێبەدا، باس لەیەك بەیەکی کۆنگرەکانی کۆمەڵە دەکات هەر لەیەکەم کۆنگرە کەلە ساڵی (١٩٧٨) لەسنە بەڕێوەچوە، تا کۆنگرەی (١٣) لە (٢٠٠٨) کەلەزرگوێز لەکوردستانی عێراق بەڕێوەچوە.

ئەگەر چی لەکۆنگرەی (حەوت و هەشت)دا بەوردی باس لەکێشەو گرفتەکانی ناو کۆمەڵە دەکات، بەتایبەت جیابونەوەی کۆمۆنیزمی کارگەری و جەماعەتی مەنسوری حیکمت، بەوردی لەسەر ئەم ئینشیقاقانە دەوەستێت وبەشێکی ئۆباڵەکەی دەخاتە ئەستۆی مەنسوری حیکمت و عەبدوڵلای مهتدی و پێیوایە حیکمت زەربەی گەورەی لەکۆمەڵەدا. لەکاتێکدا یەکێك بوو لە بونیادگوزەرانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران.

لەباسەکانی مەربوت بەکۆنگرەی نۆ لەساڵی (٢٠٠٠)دا بەوردی باس لەجیابوونەوەی عەبدوڵلای مهتدی دەکات وباس لەچۆنیەتی پێکهێنانی سەرلەنوێ ی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران دەکات، کەچۆن ئێران و ئیتلاعات، لایەنی تری سیاسی کوردستانی ڕۆڵیان هەبوە .بەتایبەتی کەنەوکات چۆن ئیدارەی سلێمانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و(ی.ن.ك) هاوکاری عەبدوڵلای مهتدی دەکات لەو ئینشیقاقەدا.

جیالەوە علیزادە لەم بابەتەدا باس لەڕۆڵی جەلال تاڵەبانی سەرۆکۆماری ئێستای عێراق و سکرتێری (ی.ن.ك) دەکات بۆ ڕێگرتن لەجیابونەوەی هەردوولا، بەلام هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، علیزادە لەم بارەیەوە دەڵێ بەلام (١٦)ی گەلاوێژ دەربخست کەکێ کۆمەڵەیە..؟!

ئەگەرچی لەم کتێبەدا علیزادە بەوردی باس لەپەیوەندیەکانی خۆی و مهتدی دەکات لەهەموو

کێشەو گرفتە سیاسیەکان و ململانێیەکانیان لەگەڵ حیکمت و باس و گرفتەکانی تردا

علیزادە لەباسی کۆنگرەی (١٣)دا لەساڵی (٢٠٠٨) باس لەکێشەو گرفتەکانی باڵی فراکسیۆن دەکات کەیەکێکی ترە لەگرفتەسیاسیەکانی ناوکۆمەڵە.

لەم کتێبەدا باس لەهێزی پێشمەرگە دەکات وەکو باسکی بەهێزی کۆمەڵە کەچ رۆڵ و کاریگەری پۆزەتیفی لەسەر خەباتی کۆمەڵە جێهێشتوە، باسی قارەمانی و گیانیانەی ئەو پێشمەرگانەو خێزان و خانەوادەکانیان دەکات. باس لەوە دەکات کەکۆمەڵە خاوەنی (٢٣٠٠) شەهیدی سەنگەرە کەلەپێناو بیرو باوەڕەکانیان بونەتە قوربانی، دەڵێ ئێمەش بەردەوام دەبین لەسەر رێبازیان.

علیزادە لەوەڵام بەکێشەو ململانێی مێژووی کۆمەڵەو دیموکرات باس لەسەرەتاو رەهەندو قوڵبونەوەکانی دەکات کەچۆن حزبی دیموکرات ئەوەی پێ قبوڵ نەدەکرا، رێکخراوێکی چەپ و خاوەن جەماوەر زو بەزوبێتە مەیدانەوە، هەربۆیە ئەوە سەرەتای ئەو ململانێ و شەڕو شۆڕانە بوو کەدواتر فاکتەری تری هاتەسەر، علیزادە رۆڵی خراپی قاسملۆ باسدەکات لەو شەڕانەدا سەرەڕا باسکردن لەنهێنیەکانی تیرۆری قاسملۆ و شەرەفکندی و جیابونەوەکانی (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ) بەرێبەرایەتی جەلیل گادانی.

لەپەیوەندی بەئێران، علیزادە ئەوە باسدەکات ئامانجی سەرەکی کۆمەڵە روخانی کۆماری ئیسلامی ئێران و بەدیهێنانی سیستمێکی سیاسی نوێیە لەئێران و خزمەتکردنی چەوساوەکانی کوردستانە.

باس لەخەباتی نهێنی و تەشکیلات و رۆڵی پێشمەرگە دەکات لەم پێناوەدا کەچۆن هەزاران کەس لەسێدارەدران و شەهیدبوون، باس لەدانیشتنەکانی لایەنەسیاسیەکان دەکات لەگەڵ خومەینی و ئێران. باس لەرۆڵی ئیتلاعات و هاوکارەکانی دەکات لەکوردستانی عێراق کەچۆن سەدان پێشمەرگەی کۆمەڵەو لایەنەکانی تریان تیرۆرکرد، کەچۆن دەمیان پیلانیان داناوە بۆ تیرۆرکردنی علیزادەو رێبەرانی کۆمەڵەو رێبەرانی ئۆپۆزسیۆن.

باسێکی تری ئەم کتێبە پەیوەندی کۆمەڵەو بەعس و کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو شەهیدبوونی (١٠٠) پێشمەرگەی کۆمەڵەیە، سەرەڕای روخانی بەعس و زۆربابەتی تری پەیوەست بەبەعس

لەکۆتاییدا دەمێ بڵێم ئەم کتێبە. پاش هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر هاتە بەرهەم کەسێ ساڵی خایاندوە و توانیویەتی وەڵامی زۆر پرسیارو زۆر رووداوی سیاسی نهێنی بداتەوە کەبۆ خوێنەرانی و خەڵکی کوردستان و لایەنگرانی و رێکخراوە سیاسیەکان گرنگەو ئەهیمەتی سیاسی و مێژووی تایبەت بەخۆی هەیە.

خوێنەری بەرێز.

بەوهیوایەی ئەم کتێبە ببێتە مایەی رەزامەندی هەموو لایەك و بتوانێت خزمەتێکی بچووك بکات، ئەوی تری کەماوە خوێنەر خۆی حەکەم دەبێت و بریار دەدات کەتاچەند راستگۆیانە مامەڵە لەگەڵ مێژووی سیاسی (٣٠) ساڵی رابردووی کوردستانی ئێران و رێکخراوە سیاسیەکان و کۆمەڵە کراوە.

بەهمەنی سەعیدی

ئازاری/٢٠٠٩

ژیانی منداڵی و گەنجێتی ئیبراهیم عەلیزادە

***ئێمە خۆشحاڵین بۆ دیدارێکی وەها؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: زۆر خۆشحاڵم کە بۆ دیدارێکی وەها. ئەمە بۆشاییەکە دەبێت پڕبکرێتەوە، وە جێگای خۆشحاڵی زۆر دەبێت بۆ من، وەمن بەشبەحاڵی خۆم بۆ هەموو یارمەتێک لەپێناوی ئەو مەسەلەیە کە قازانجی خەڵکی تێدایە ئامادەم.

*** شوێنی لەدایکبوونت، وەزعیەتی ژیانی هاوسەری و خێزانتم باس بکەیت؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ناوم ئیبراهیم عەلیزادەیە، .لەیەکێک لەئاوایییەکانی نێوان بۆکان و مەهاباد بەناوی غەوس ئاوباد، لە هاوینی ساڵی (١٣٢٩ی) هەتاوی لەدایکبووم. دووجار زەواجم کردووە، ئێستا لەگەڵ هاوسەری دووەمدا دەژیم. منداڵمان نییە. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم لە مەهاباد تەواوکردووە، دوای ئەوە چووم بۆ کۆلێجی تەکنیکی لەزانکۆی تەورێز و لەوێش دەرەجەی فەوقی لیسانسم لە مۆهەندیسی کارەبادا وەرگرتووە. لە دەورەی خوێندنم لە زانکۆی تەورێزدا یەکێک لە هەڵسووڕاوانی بزووتنەوەی خوێندکاران بووم. دوای تەواوکردنی زانکۆ بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک دەورەی سەربازیم بەپلەی سیتوان دووهەمی لە کارخانەی قەندی شاری میاندواو کە سەر بەبەشی لوجیستیکی سوپای ئێران بوو، تێپەرکردووە. بەدوای ئەوەدا بۆ ماوەی ساڵێک لە مەدرەسەیێکی تەکنیکیدا لە شاری مەهاباد دەرسم وتووەتەوە. هەر لەم دەورەیەدا بۆ ماوەی (٩) مانگ کەوتوومەتە زیندانی ساواکی شا. ماوەیەکی کورت دوای ئازاد بوونم، ژیانی نهێنیم هەڵبژاردوەو لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی ئێران کرێکاریم کردووە. لەکاتی راپەڕینی گەلانی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩) وازم لە ژیانی نهێنیم هێناوە، هەڵسووڕانی ئاشکرام دەستپێکردووە.

***پاش چەند ساڵ خەبات و قوربانیدان وململانێ لەگەڵ شۆڕش، ئەتوانم بڵێم (٣٥) ساڵ خەبات و پێشمەرگایەتی، کەچی ئێستا گەنج دیاری وبە ئومێدەوە ئەژیت وچاوەڕوانی داهاتوویەکی باش دەکەیت، دیارە کەهیلاک و ماندووشیت وە سەرو ریشت سپی بووە، بەڵام پێم نائێیت بەنیازی چیت یان ئەتەوێت چی بکەیت لەو ڕێگایە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هیلاک بوون و ماندووبوونی لەش واقعیەتێکە کەکەس ناتوانێ نکۆڵی لێبکات، بەڵام من تائێستا هەرگیز هەستم بەماندوو بوون و هیلاکی لەتێکۆشانی سیاسیمدا نەکردووە. من لام وایە هەوڵ و ماندووبوونی ئێمە لە چاو رەنجێک کەخەڵکی کرێکار و زەحمەتکێش بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیان و بنەماڵەکەیان دەیبەن، هیلاک بوونێکی قورس نییە. من بۆ ئەو هەوڵانەی کەتائێستا داومە هیچ منەتێکم بە سەر خەڵکەوە نییە. دیارە مەترسی لەسەر ژیانم بووە، هەروەکوو مەترسی کە بەردەوام لەسەر ژیانی گەلێک خەڵکی تریش لەو وڵاتەدا هەبووە ،کەلەوانەیە لە ناو تێکۆشانی سیاسیشدا نەبووبن. بەڵام ژیان چییە ئەگەر خەتەرکردنی تێدا نەبێت. تەنانەت لەناو بنەماڵەی منیشدا کەسانێک هەن کەلەژیانی ئاسایی خۆیاندا زیاتر لە من رەنجیان بردووە. ئەو ڕێگەیەی من پێیدا رۆیشتم هەرچی بووە باش بووە و **هیواداریشم و پێموایە روو لەسەرکەوتنە**. ئەو ئامانجە سیاسیانەی کە بۆ خۆم دیاریمکردووە، باوەڕم پێیەتی و لام وایە لەگەڵ رەوتی مێژووی ژیانی ئینسان دێتەوە و هەر دەبێت ببن.

*** ئەوانەی کەدەبێت ببن، چین ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە،** ئەگەر بمەوێ هەمووی لە چەند ووشەدا وەڵام بدەمەوە، بریتییە لە یەکسانی، لە ئاسایش و خۆشبەختیدا.

***هەر ئەوەیە کە لەسەرەتاوە کارت بۆ کردووە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە، ئەوە خاڵێکی سەرەکیو هەموو بیرو بۆچوونێکم بووە، کە من لە کۆمەڵگایەکدا بژیم ژیان تێیدا بەئاسودەیی بێت، یاسایانەو یەکسان بێت، زوڵم نەبێت، چەوسانەوە نەبێت، هەڵاواردن نەبێتو لەهەمان کاتدا خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی بێت. ئەوە هەمیشە ئارەزووی من بووەو سیاسەتو تاکتیکو ستراتیژی بۆ من هەمووی لەپێناوی ئەوەدا مانای پەیدا کردووە.

***تۆ وتت ژیانی کێ هەیە خەتەر نەبێت، بەڵام من زۆر زیندەگیت پێت دەڵێم خەتەر نییەو زۆر خۆشگوزەران دەژی، ئەو پیاوەی کە پیاوی دەوڵەتەو لەتاران بەئۆتومبێلێکیەوە دەسوڕێتەوە، ئەو پیاوەی بۆ خۆی لە سەفارەتخانەیەك دانیشتووە، ئەوپیاوەی کەهەرگیز مەترسی تیرۆرو رفاندنو کوشتنی لەسەر نییە، ئەوە زیندەگی جیاوازترە بەپێچەوانەی ئەوەی کە تۆ هەمووکات رووبەڕووی مەترسی بویتەوە، تۆ حەزت نەئەکرد لەو زیندەگیانەدا بژیت، بۆچی؟**

ئیبراهیم عەلیزادە، ئێوە باسی پیاوی دەوڵەتتان کرد لە تاران، با چەند نمونەیەکتان لەم بابەتەوە بۆ بهێنمەوە. دوو دەستە لە رێبەرانی کۆماری ئیسلامی هەر لە ساڵەکانی سەرەتای هاتنە سەرکاریانەوە هەر لە تاران تێدا چوون. ئێمە بەرانبەر بە کۆماری ئیسلامی خەباتی پێشمەرگانەمان هەڵبژارد، بەڵام لە باقی شوێنەکانی تری ئێران خەڵکیان هەر لە کرێکارەوە بگرە هەتا خوێندکارو دوکتۆرو مۆهەندسو فەرمانبەرانی ئیدارە دەوڵەتییەکان، لە سەردەمی شەڕی ئێرانو عێراقدا بە زۆر راپێچی مەیدانی شەڕدەکرانو تێدا دەچوون. کەچی لەکوردستان جمهوری ئیسلامی توانای ئەو کارەی نەبوو، چونکە هەر کە زەختی بۆ خەڵك دەهێنا روویاندەکردە پێشمەرگایەتیو ئەویش ناچار دەبوو زەختەکەی کەم بکاتەوە. لە (٢٨) ساڵی رابوردوودا گەلێك مەرگەساتی گەورە بە سەر خەڵکی ئەو وڵاتەدا هاتووە. منیش (٢٥) ساڵە خەبات دەکەمو لام وا نییە ئەو مەترسیانەی کە لەسەر ژیانم بووە زیاتربووبێ لە چاو ئەو مەترسیانەی کە لەسەر ژیانی خەڵکی ئاسایی بووە. هەربۆیە من لام وایە لەدونیای ئەمڕۆ لە وڵاتانێکی وەکوو وڵاتی ئێمەدا هەڵبژاردنی رێگای خەباتی سیاسی کەم مەترسی ترە لە بەرانبەر ئەو هەموو کارەساتانەی کە بەردەوام بەسەر خەڵکی ئاساییدا دێت. بە کورتی دەمەوێت ئەوە بڵێم کە خەباتکردن رێگەیەکی پڕ مەترسیو هاتو نەهات نییە. بێگومان مەترسی هەر لەرێدا هەیە، بەڵام لەژێر سێبەری ئەو نیزامەدا، کێ ئەتوانێ بەدڵنیایەوە هەست بە ئاسایش بکات .

***تۆ وتت من دڵنیام هەر سەرئەکەوین، چۆن؟**

ئیبراهیم عەلیزادە، لەبەر ئەوە پێموایە مێژوو لەگەڵ ئێمەیەو رەوتی حەرەکەتی مێژووش تائێستا هەر بەرەو پێشچوون بووە. ئارەزوەکانی من شتێك نین کەلەمێژادەوە سەرچاوەیان گرتبێت. بەڵکو دەتوانم بەشێوەیەکی زانستی نیشانی بدەم کەقابیلی وەدیهاتنن. لەئاکامی خەباتی ئینسانەکاندا رەوتی ژیان بەرەو پێشچووە. حەرەکەتی مێژوو بەرەوپێش بەردەوام دەور هەڵدەگرێت و هەلو مەرجی ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەرکەوتنی گەورە نزیك دەبێتەوە. من گۆڕانکاری لەژیانی ئینساندا هەر ئەمڕۆکە بە چاوی خۆم دەبینم. دیاردەی پێشکەوتوو کەنیشانەکانی کۆمەڵگای داهاتون دەبینم . کۆمەڵگای سوسیالیستی داهاتوو خەریکە لەناخی هەر ئەو کۆمەڵگایەی ئیستادا لەدایك دەبێ. ئەم نیشانانە ئاکامی خەباتی ئینسانیو وشیاری سەردەمی ئێمەن بۆیە دڵنیام لەوەی کە هەر سەردەکەوین.

*ئەو کاتەی ئێوە دەستان بەشۆڕشکرد، تەوەقوعتان ئەکرد کە (٢٥) ساڵ درێژە بکێشێ کە ئێستا هەر بە ئومێدی ئەڵێت هەر ڕووئەدات و سەردەکەوین، ئەگەر هاتوو دەیان ساڵی تری خایاند، ئەو تەوەقوعاتەکانتان ئەهاتە دی هەر بەردەوام ئەبن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: دەیان ساڵی تریش بخایەنێ گرنگ نییە، بەو مەرجەی کە ئێمە هەست بکەین کە لەهەر لەحزەیەکدا ڕێکخراوێکین کە هەبوونمان پێویستە و بە فازانجی خەڵکە. شەرت نییە، ئێمە هەر بەئومێدی کۆتایی بژین، بەڵکو دەبێت نیشانی بدەین لە هەر لەحزەیەکیشدا کارێك دەکەین کە ئەو کارە یارمەتیدەدات بەباشتربوونی ژیان، یارمەتیدەدات بەئاسانکاری بۆ ژیانی ئینسانەکان، یارمەتی دەدات بە وشیارکردنەوەیان و ڕزگارکردنیان لەژێر باری بیروبۆچوونی دواکەوتوانە کەئازاریان دەدات. من پێموایە خەبات بۆ باشترکردنی ژیانی ئەمڕۆ پەیوەندیەکی ئەپساوەی هەیە لەگەڵ خەبات بۆ باشترکردنی ژیانی دوا ڕۆژ ، واتە خەبات بۆ ڕیفۆرم لەگەڵ ئامانجی کۆتایی کە گۆڕانکاری گەورەو شۆڕشگێرانەیە لەژیانی کۆمەڵدا یەك پرۆسەیە.

ژیانم پڕبووە لەکوێرەوەری

*شەڕو پێشمەرگایەتی و تەق و تۆق و تیرۆرو برسیەتی و سەرما و گەرما و دوری لەمنداڵ و خێزان و باوك و دایك و کەس و کار، ئەو هەموو شتانە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە هیلاکیان نەکردویت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەمانای تایبەتی ئەم وشەیە دیارە هیلاکیش هەربووە، بەڵام سەرجەم کەبیر لەرابردووی خۆم ئەکەمەوە هەست بە هیلاکی ناکەم. لەزۆر لەحزەی ژیانمدا کە ئەو جۆرە کوێرەوەریانەی وا باسکرد تێیدا بووە، زیاتر هەستم بە شادی و خۆشحاڵیکردووە لەچاو ئەو کاتانەی کە بەڕواڵەت ئاسودەتر بووم. من هەرکات سەفەرێکی ئەوروپا دەکەم وەکو ئەوەی کە لەسەر ئاگریم وایە. حەز ئەکەم زووتر بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی وا وەکو مەئموریەت بۆم دیاریکراوە. هەر کات هەستم بەوە کردووە کە پێشکەوتنێك لەکارێکدا کە باوەڕم پێیەتی بووە، هیلاکیم دەرچووەو هەستم بە خۆشحاڵی کردووە.

*عەبدوڵڵا ئۆج ئالان دەڵێت، سیاسەت بەلای منەوە هونەرێکی گەورەی بەدەستهێنانی جوانییە، من لەپێناوی جوانترکردنی مرۆڤدا سیاسەت دەکەم، ئەی تۆ لەپێناوی چیدا سیاسەت دەکەیت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: من سیاسەت بۆ ئەوە ئەکەم کە خزمەت بەکۆمەڵگا بکەم.

*کام کۆمەڵگا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کۆمەڵگایەك کە زوڵم وناعەدالەتی و چەوساندنەوەی تێدا هەیە. بۆ وێنە کۆمەڵگای کوردستان.

*پێتوایە ئەو کۆمەڵگایە بەدەرجەی یەکەم کۆمەڵگای کوردستانە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بۆیە دەڵێم کۆمەڵگای کوردستان، چونکە خۆم تێیدا ژیاوم و لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکانی کەم یا زۆر کاریگەریم بووە، بەڵام پێموا نییە ئەمە هیچ ناتەبایەکی هەبێت لەگەڵ ئاواتی من بۆ ژیانی باشتری مرۆڤ لە هەموو شوێنێك.

سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستانی ئێرانیش بم، هەروەك ئێستا وام

* لەم بناری شاخەدا تۆ جیالەوەی کە سکرتێری حزبێکیت، بەڵام دەسەڵاتێکی ناوچەیی لۆکاڵی کەمت هەیە،

**چەند پێشمەرگەیەکت بەدەورەوەیە، هەموو کەس بەئاسانی دەگاتە لات، گەر لەداهاتویەکی نزیکدا لەکوردستانی خۆرهەڵات، بەرێزت لەکۆشکێکی ئەنجومەنی وەزیران یان لەپەرلەمانی هەرێمی کوردستانی ئێراندا، سەرۆکی حکومەت یان سەرۆکی پەرلەمان یان یەکێك لەو دەسەڵاتانە بیت، یەکەم پرسیارم ئەوەیە تۆ هەست بەچی ئەکەیت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەڵامدانەوە بەم پرسیارە ئاسان نییە، چونکە دەبێ بزانیت ئەو هەلومەرجەی کە باستکرد ئەو کات چ رەنگدانەوەیەکی دەبێت لەسەر ژیانت. ئەو کات چۆن بەرەو رووەبیەوە لەگەڵ واقعیەتەکان. وەڵامی ئێستام روونە، هەر ئەوەیە کەئەمرۆش لێرە دەیبینیت. نابێت هیچ ناتەباییەك لە مابەینی کردارو رەفتارو قسەی ئەورۆم لەگەڵ ئەو کاتە کە لە دەسەڵاتدا دەبین هەبێت. بەڵام ئەمە خۆی لەخۆیدا هیچ شتێك ئیسبات ناکات. ئینسان دەبێت بکەوێتە ئەو حاڵەتەوە تابتوانێت نیشانیبدات کە ئەو قسەیەی کە ئەمرۆ دەیکات چەندە واقعیە، ئەگەر ئێستا دەپرسیت من هەست بەوە دەکەم کە ئەگەر رۆژێك لەرۆژانی ژیانم، فەرهەنگی کۆمەڵایەتیم، هەڵستانو دانیشتنو رەفتارم لەگەڵ دەوروبەرم، لەگەڵ هاوسەرم، لەگەڵ منداڵ، لەگەڵ هاورێیەکانم بە پێی پلەو پایەیەك کەبەفەرز لەدەسەڵاتدا پەیدای دەکەم لەگەڵ ئێستادا جیاوازی هەبێتو ناتەبا بێت مانای ئەوەیە کە هەموو هەوڵو کۆششەکانی ژیانم تائێستا بەفیرۆچووەو پشتمکردووە لەو ئامانجانەی کەساڵەهای ساڵە هەوڵمداوە خەڵکی پێ پەروەردە بێ.

***بەڵام من بەڵگەم پێیە، ئەو کاتەی فیدل کاسترۆ دەستیان بەشۆرشکرد لەگەڵ گیفارا، قەناعەتو بۆچوون و بەرنامەیەکیان هەبوو، کەخزمەتی خەڵك بکەن، بەڵام ئێستا وەکو خۆت دەیبینی کاسترۆ دەڵی" کە سپیدار هەڵوژەی گرت، ئەوکاتە خەڵکی کوبا، با باسی دیموکراسی بکەن" وە وەزعیەتێکی خراپ لەسەردەستی ئەو بۆهەموو خەڵکی کوبا هاتۆتە پێش، نمونەیەکی نزیکتر وەزعیەتی سیاسی خەڵکی کوردستانی عیراقو سەرکردەکانیتی لەوکاتەی کەلەشاخ بوون جۆرێکی تر تەعامولیان کردووە، بەڵام ئێستا بەپێچەوانەوە کە گەیشتونەتە پلەی دەسەڵات جۆرێکی تر تۆ پێتوانییە، ئەوە دوو نمونەبن بۆ تۆش بەهەمان شکڵ بێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئارەزووی من ئەوەیە کە ئەو تەجروبە تاڵە دوپات نەبێتەوە، من بە سەهمی خۆم هەوڵدەدەم کە دووپات نەبێتەوە. بەڵام بەبڕوای من کەسێك دەتوانێت نیشانی بدات کە لەوجیهەتەدا هەنگاو هەڵدەگرێت کەلەژیانی ئەمرۆیدا نمونەی وەلەو گەلێك بچوکیش کەنیشانەی ئەو حاڵەتانە بێ نەبیندرێ. ئەگەر کەسێك ئەمرۆ نمونەی گەلێك بچوکیش لەم جۆرە خۆ بە زلزانیانە و دەستگرتن بەدەسەڵات بە هەموو قیمەتێك و لەرێگە لادانی ئەخلاقی لەسەرکردەیەك یان بەرپرسێکی سیاسیدا ببینێ، پێویستە کەهەست بەمێگەرانی بۆ دوارۆژیشی بکات. ئەخلاقی ئەورۆمان لە هەمانکاتدا دەبێ وێنەی ئەخلاقی دوارۆژیشمان بێت. لەوانەیە ئەم وشانەش هیچ دڵنیاییەك نەدات بە خەڵکێك کە تەجرەبەی تاڵی ئەم جەشنانەی کە باستان کرد، دیتویانە، بەڵام ئەمە بەڵێنییەکە کە نابێ هەرگیز لە دوپاتکردنەوەی ماندوو ببین.

***پرسیاری دواترم، گەر من بۆ دیدارێکی وا جارێکی تر هاتمە لای تۆ لەیەکێك لەو کۆشکانە بوویت، من وا بەئاسانی ئەتوانم بێمەلات و تۆ ئەم دیدارەت لەیاد ئەمێنێتەوە، یان وەکو ئەو سەرکردانەی تر کە ئەچێتە بورجی عاجو وەڵامی کەس نادەیتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ من ئاسان نیە تەسەوری ئەوەی کە رۆژێك لەرۆژان ئەخلاقیاتم وەها بگۆرێت کەهاورێیەکی دێرینی خۆم لە بیر بەرمەوە، تەنانەت بیرکردنەوە لەو حاڵەتەش هەر ئازارم ئەدات. ئەگەر ئەو ئەخلاقیاتە پەیدابوو مانای ئەوەیە کەلێنێکی گەورە کەوتووەتە نێوان جەماوەر و دەسەڵاتدا. مانای ئەوەیە

که دەسەڵاتو جەماوەر بێگانەن لەیەکتر.

ئەخلاقیاتی سبەی ڕۆژ لە هەمانکاتدا کاردانەوەی بەرنامەی سیاسی، ستراتیژ و شێوەی هەڵسوکەوتی ئەمڕۆمانە. بەرنامەیەك کەئەمڕۆ خەباتی بۆ دەکەین، شێوەی کاری ئەمڕۆمان بەرەبەرە ئەخلاقیاتی تایبەت بەخۆشی لەناو ڕیزی خەباتکاراندا پەروەردە دەکات. بەرنامەی سیاسی ئەمڕۆ دەبێت ببێت بەبەهای ئەخلاقی لەژیانی ڕێبوارانی ئەو ڕێبازە. ئەو گۆڕانکارییە سەلبیانەی که ئێوە باسیدەکەن بە یەك شەو پەیدا نابن، بەڵکو بەرەبەرە لەڕەوتی بەرەوپێشچوونی حەرەکەتەکەماندا دەتوانن نیشانەکانی ببیندرێن. کە وایە یەکێك لە زەمانەتەکانی دووپاتنەبوونەوەی ئەزموونی ڕابردوو ئەوەیە کە ئەو میکانیزمانەی کە پاك و خاوێنی ڕیزەکانی حەرەکەتێکی سیاسی دەپارێزن لە هەموو ئاستەکانی خەباتدا بە باشی کاربکەن. سەرکردە و بەرپرسەکان بە خێرایی ناگۆڕن و پێویستە گۆڕانی وردە وردەشیان لە میکانیزمێکی دیموکراتیکی ناوخۆییداو بەپێی بەهاکانی سیاسی و بەرنامەیی چاوەدێری بکرێ. کردەوەی ئەوڕۆمان پێویستە لە چەشنی ئامانجی دوارۆژمان بێت. دەسەڵات ماڵ جەماوەرەو دەبێ میکانیزمەکانی کۆنترۆڵی جەماوەر بە سەر دەسەڵاتدا بە باشی کاربکەن.

***ئەو قسانەی من بە تۆم وت، تۆ پێتوانییە خەیاڵ بێت یان تۆ بگەیتە ئەوێ یان واقعێکە ئەبێت قبوڵ بکرێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە دوری نازانم کە واقیعی بێ. بەڵام لەکاتێکدا کە وڵاتێك لەناکامی خەباتێکی پێشکەوتنخوازانەو شۆڕشگێڕانەی جەماوەریدا ڕزگار دەبێت گەلێك هێزی لاو و تازەتر و کار لێهاتووتر پێدەگەن کەدەبێ ڕێگایان بۆ پڕکردنەوەی شوێنەکانی دەسەڵات خۆشبکرێت.

**بیرم لەشەڕی ناوخۆ نەکردبووەوە**

***ئەو هەموو ناخۆشیو شتانەی کەباسمانکرد، تەوەقوعت دەکرد بێتە ڕێگات، یەعنی ئەگەر بتزانیایە ئەو هەموو وەزعیەتی ناخۆشیو شەڕو سەرماو گەرمایە توشت دەبێت شۆڕشی ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لە تەسەوری سەرەتایی خۆمان لە کاتی پێکهاتنی (کۆمەڵە)دا نمونەی شۆڕشی چینمان لەبەرچاوبوو، کە شۆڕشێکی درێژخایەنو پڕ لە هەڵسوکەوت بوو. ئێمە هەر لەسەرەتاوە لامان وابوو کە سەرکەوتن ئەگەرچی مومکینە، بەڵام ئاسان نییە. هەر بۆیە ئەم ڕووداوانەی کە پێشدەهاتن بۆمان زۆر چاوەڕوان نەکراو نەبوون. هەڵبەت دیارە بەعزە شتێك هەبوو کە چاوەڕوان نەکرابوو. بۆ وێنە من بیرم لە شەڕی ناوخۆ نەکردبووە. بەڵام بیرم لەوەکردبۆوە کە مومکینە ئێمە دوای شۆڕشی ساڵی(۱۳۵۷)ی هەتاوی ئێران کە شارەکانی کوردستان ئازاد بوون، جارێکی دیکە لە دەستیانبدەین و بکەوینە قۆناغی خەباتی پارتیزانیەوە. من بیرم لەوە کردبووە کە ناوچەیەکی سوور لە سنوورەکان بتوانین بپارێزین بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، بەڵام بیرم لەوە نەکردبووە مەجبوربین سنورەکان ببەزێنین بچین لەودیو سنوورەکانەوە لە کوردستانی عێراق دابەزین. ئێمە بیرمان لەوەکردبووەوە کەتەنانەت لەوانەیە بتوانین ناوچەیەکی ئازادکراو لە ئێران پێکبێنین و بۆماوەیەکی دورو درێژ بیپارێزینو پاراستنیشی زەحمەت بێت.

***بەڵام وانەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا وانەبوو.

**من رۆژنامەفرۆش بووم**

***دەمەوێت تۆ بگەڕێنمەوە بۆ سەردەمی منداڵی خۆت، لەگوندەکەتان یان لەشارەکەتان چۆن ژیانت دەگوزەراند وە لەگەڵ خێزان و کەس و کاردا چۆن دەژیایت، پێشتوابوو کەدەبیت بە پێشمەرگە یان سکرتێری حزبێك؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من زۆر زوو لەگەڵ سیاسەت بەمانای دیاریکراوی وشەکە ئاشنابووم. لەبەرئەوە باوکم کادرێکی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو. تەمەنم (٩) ساڵ بوو تۆزێك فامم کردبۆوە،ماڵمان لە ئاوایییەکی نزیك شاری مەهاباد بە ناوی "خانەگێ" بوو. باوکم گەلێك جار لە ناو باری توتنی قاچاخدا رۆژنامەی کوردستانی بۆ دەهات و هەموو جارێك ژمارەیەك لە خەڵکی دێی کۆدەکردەوەو رۆژنامەکەی بۆ دەخوێندنەوە. ئێمە (من و براکەم) منداڵبووین رێگایان نەدەداین بچینە ژورەکەوە. منیش زۆر تامەزرۆبووم و ئەمەویست بزانم چیدەکەن لەو ژورەدا کە دەرگایان پێوەداوە. گوێم بەدەرگاکەوە دەنا و هەر لەو سەرەتایەوە لەگەڵ کۆمەڵێك وشەی سیاسی ئاشنابووم.

پێم سەیربوو کە ئەم کارە بۆچی بەنهێنی دەکەن؟. هەڵبەت من هەر لەدەورانی منداڵییەوە هەستم بەدەسەڵاتی حکومەت لەرێگەی زەبر و زەنگ ئواندنی ژاندارم لەئاواییەکەمان کردبوو و یان زەختو زۆری دەرەبەگی ئاواییەکەمانم بەسەر خەڵکەوە دیبوو. هێشتا دەورەی سەرەتاییم تەواونەکردبوو، کە باوکم گیراو چووە زیندان و چوار ساڵ لەزیندان بوو، ئەو چوار ساڵە زیندانە بۆ ئێمە ژیانێکی پڕ لەنەهامەتی بەدوواوە بوو. هەر بۆیە بەردەوام بیرمان لەوەدەکردەوە کەباوکمان لەسەر چی گیراوە، بۆ گیراوە و بەم جۆرە وردە وردە سیاسەت هاتە ناو ژیانمانەوە. باوکم لەسەرەتاوە بە ئیعدام حوکم درا بوو، دوای ئەوە حوکمەی شکاو بوو بە چوار ساڵ زیندان. کە هاتەوە ئەگەر چی بە بۆنەی ئەو سەختیانەی کە لەزیندان کێشابووی و هەستێکی بێ هیوایی کە بە سەریدا هاتبوو، خۆی وازی لە سیاسەت هێنا، بەڵام ئێمە سەرنجمان بۆ ئەو کارەی کە ئەو دەستپێکردبوو راکێشرابوو. دوای ئازادبوونی باوکم لەزیندان ماڵمان هاتە شارو من لە پاڵ دەرس خوێندن کاری رۆژنامە فرۆشیم دەکرد. هەندێك لە دۆست و برادەر کە لە دەوروبەرمەوە بون پێیانوتم کە کتێب بخوێنمەوە. ئەو شوێنەی کە رۆژنامەکانم لێوەردەگرتن خۆی کتێب فرۆشێك بوو، دەمتوانی کتێبی لێوەرگرم و کتێبەکان بە ئامانەت بهێنم و بیخوێنمەوە، ئیتر لەو رێگایەشەوە هاتبوومە ناو دنیایەکی دیکەوە.

***کێ بوون ئەو برادەرانەی تۆیان هاندا کتێب بخوێنیتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستا زۆر بیرم ناکەوێتەوە، چونکە ئەوانە هاورێی دەورانی منداڵیم بوون، ئێستا هیچیان لە کۆڕی چالاکی سیاسیدا نابینمو خەریکی ژیانی ئاسایی خۆیانن.

***یەکەم کتێب کە خوێندەوە کتێبی چی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم کتێب کە خوێندمەوە، داستانێکی پۆلیسی بوو کە شەرحی ماجەراکانی شێرلوك هۆلمزی دەدا. ئینجا بە شوێن ئەوەدا رێنمایی کرام کەوا واز لەکتێبی پۆلیسی بهێنم و بەرەو خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی رۆیشتم. لە مەدرەسە کاتێك کە موعەلیمەکانمان تاقەتی دەرس وتنەوەیان نەدەما داوایان لە من دەکرد کە ئەم داستانانە بۆ هاوکلاسییەکانم بگەڕێنمەوە. ئەوەش خۆی هاندەرێکی دیکە بوو بۆ زۆرتر چوونە ناو خوێندنەوە. ئەوەندەی کە بیرم دێ یەکەم رۆمانی سیاسی کە دەستمداوەتێ کتێبە بە ناوبانگەکەی "دایك"ی ماکسیم گۆرکی بوو.

**خۆم بە قەرزاری حزبی دیموکرات نازانم**

* وتت باوکم لەحزبی دیموکرات بوو، ئەو شتە نهێنیانەی ئەو خەریکی بوو، ئەوە تۆی والێکرد بچێتەکاری سیاسیەوە پاڵ بەتۆوە بنێت، تۆ خۆت بەقەرزاری حزبی دیموکرات نازانی، ئەوە کە باوکت دیموکرات بووە، تۆش بەنهێنی گوێت لەوەگرتووە شتەکانی ئەو فێربوویت، وایکرد تۆ راکێشیتە ناو سیاسەتەوە، ئێستا تۆ جیاوازتر لە حزبی دیموکرات و رەوتێکی جیاوازترو مێژوویەکی خوێناویدا تۆ خۆت بەقەرزاری حزبی دێموکرات نازانی؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، من خۆم بەقەرزاری حزبی دیموکرات نازانم. بەڵام ئەو سەردەمانەی کە باسی لێدەکەین دەورەیەك بوو کە لە کوردستانی ئێران هەموو هەڵسورانێکی سیاسی بە هەربارێکدابوایە خۆبەخۆ ناوی حزبی دیموکراتی دەچووە سەر. ساڵەها دواتر بە پێکهاتنی کۆمەڵە ئەم کەش و هەوا سیاسیەی کوردستانی ئێران گۆڕا. با ئەوەش بڵێم باوکم و ژمارەیەکی زۆر خەڵکی تر لەسەر ئیعتراق کادرێکی حزبی دیموکرات کەوتبوونە زیندان. حەزناکەم ناوی بێنم و ئێمە منال بووین و ئەوەمان دەزانی. جگە لەوە باوکم دوای هاتنەدەر لە زیندان وازی لە پەیوەندی گرتنەوە لەگەڵ حزبی دێموکرات هێنا. من پێموایە ئەم رووداوە سەرەتاییانەی ژیانم و هەروەها ژیانی هەژارانەی بنەماڵەکەم وردە وردە بیری سیاسی منی بەرەو مەسیرێکی دیکە دەبرد.

**خانەوادەیەکی زۆر هەژار بووین**

***ئەو رۆژنامانەی کەشەوانە بەقاچاغ دەهات بۆ باوکت لەباری توتندا، ئەوە سەرەتای یاخیبوونی تۆ نەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا. بەڵام سەرنجی راکێشام بەرەو هێندێك مەسەلە کە تا ئەو کاتە لەژیانمدا نامۆ بوون. بەڵام بەراستی ئەوەی کە پێی دەوترێت یاخبوون، ئەوە لەژیانی فەقیرانەی بنەماڵەکەمانەوە سەرچاوە دەگرێت. ئێمە خانەوادەیەکی یەکجار زۆر فەقیر بووین، هەموومان یەك ژوورمانبوو کە نیوەی ژوورەکەشمان کۆزی کارژیلە بوو. لەڕاستیدا ژووری دانیشتن و نووستن و حەیوانەکانمان یەك ژوور بوو. ئینجا باوکم هەرچەند مەلا بوو، وردە وردە فێری کاری سەعات سازی بوو، لە شاری مەهاباد دوکانێکی بچوکی سەعات سازی دانابوو کە ژیانێکی یەکجار سادە و زۆر فەقیرانەی دەتوانی بەوە دابین بکات. کە گیرا، ئەوەشمان نەما، ئیتر من هەر لەو کاتەوە کە بیرم لەسیاسەت کردەوە بیرم لە جیاوازی چینایەتیو جیاوازی نێوان دەوڵەمەندو فەقیریش دەکردەوە، بۆ ئێمە واین و بۆ خەڵکی دیکە وانیە ، ئەوەی کە پێی دەوترێت یاخیبوونو هاندەری من بووە، خەباتی کوردایەتی نەبوو، مەوقعیەتی باوکم نەبوو، حزبی دیموکرات نەبوو، بەڵکو جیاوازی ژیانم بوو لەگەڵ کەسانێکی دەوروبەرم.

با بیرەوەریەکتان بۆ بگێرمەوە کە زۆر کاریگەری لەسەر زەینم داناوە. کلاسی چواری سەرەتایی بووم، رۆژێکیان لەماڵەوە کۆتێکی جوانیان پێدام کردمە بەرم و زۆر بە خۆشحاڵییەوە هاتمە قوتابخانە. هاوکلاسییەکانم کە تا ئەوکات قەت منیان بە جل و بەرگی رێکوپێك و جوانەوە نەدیبوو، زۆریان پێ سەیر بوو و دەورەیان گرتبووم و لێیان دەپرسیم ئەو کۆتە جوانەت لە کوێ بوو؟ لەناکاو یەکێك لە هاوکلاسییەکانم دەنگی بەرزکردەوە و وتی ئەوە کۆتە کۆنەکەی منە دایکم دوێکە پێیداون. من کە ئەوەم نەدەزانی هەموو گیانم بوو بە ئارەقە، بە پەلە مەدرەسەم بەجێهێشت و چوومەوە ماڵێ و کۆتەکەم فرێدا و لیباسە ئاساییەکانی خۆمم کردەوە بەرم. ئەو بیرەوەرییەم باسکرد بۆ ئەوەی کە بڵێم من سەرچاوەی یاخیبوونی

خۆم بە جیاوازییە چینایەتییەکانی ناو کۆمەڵگاکەمان دەزانم.

***ئەو کۆتەی کە تۆی والیکرد، کە ئەو هاوڕێیەت لەناو فوتابخانە وای پێوتی، هەستتکرد بەخۆتدا بچیتەوە کە تۆ ئەوە قبوڵنەکەیت، ئەوکاتە هەستتکرد کەئەمەیە نیزامی سەرمایەداری، ئەمەیە جیاوازی نێوان چەوساوەو چەوسێنەر؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من ئەوانەم بەو قەناعەتە نەدەزانی، بەڵام بیرم دەکردەوە بۆ وایە؟ ئەوە پرسیارێك بوو کە دواجار کاتێك کتێبێکم دەخوێندەوە بەشوێن وەڵامەکەیدا دەگەڕام.

***جوابەکەت دەستکەوت دوایی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر درەنگ دەستمکەوت، ساڵەها دواتر نەتوانم بڵێم وەختێك کەچوومە زانکۆ.

***ئەو کۆتە کەبەو شکڵە لەوفوتابخانەیە کەبەسەرت هات پێموانییە قەد لەبیرت بچێتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا قەد بیرم ناچێتەوە.

***کەواتە قبوڵی نەکەیت بۆ منالآنی فەقیرو هەژارو ستەم و چەوساوە رۆژێك لەرۆژان وەکو تۆیان لێ بەسەربێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە مەرگەساتە ، ئەگەر دەسەڵات بەدەست ئەو رەوتەی ئێمەوە بێت و ژیان هەر ناوا بێت و نمونەی ئاوا لە ژیاندا مابێت، بۆ ئێمە مایەی شەرمەزاریە، ئەو رۆژە هەست بە نائومێدی و شکست ئەکەم.

***خزم و کەس و کارە نزیکەکانی تۆ سبەێنی وانەبن، وەکو چۆن ئێستا لەکوردستانی عیراق چەند لێپرسراو ئەبینین منالەکانی ئەوان جیاوازن لەگەڵ ئەو پێشمەرگەکانەی کەبەیەکەوە لەیەك سەنگەردابوون، منالآکانی ئەو وئەوەی کە لەو پێناوەدا شەهیدبوون زۆر جیاوازترن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئارەزوومە هەرگیز وای لێنەیەت، وە ئەگەر ئەوە روویدات دیارە ئێمە شکستمان خواردوە.

بیری ماڵەکەمان دەکەم

***وەکو پێشتر پێموتی، وە جوابیشت دایەوە وتم پەشیمان نیت لەو رێبازو سیاسەتەی هەڵتبژاردووە وتت نەخێر پەشیمان نیم، قەت؟ ئەی بیری ئەو شتانەی رابردووت ناکەیت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەنانەت ئارەزووی کوچە و کۆڵانی ماڵەکەمان دەکەم، ئارەزووی ئەو دارە دەکەم کە لە حەوشەی ماڵەکەماندا خۆم چەقاندومە و نازانم ئێستا چی لێهاتووە، ئارەزووی هەموو ئەوانە دەکەم، ئەوە جۆرێك لە نۆستالژیە، بەڵام پەشیمانی سیاسی نییە.

***کەی وە چ کاتێك پەشیمان دەبیتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کاتەی هەست بەوە بکەم ئەو بەڵێنانەی کە بە کۆمەڵگامداوە، ئەو ئامانجانەی کە لەبەرنامەی سیاسی خۆماندا دیاریمانکردووە، ئەوانە بەئیرادەی خۆمان خەریکین پێشێلیدەکەین.

***تۆ زیاتر لەم بناری شاخە ژیان ئەگوزەرێنیت، شەوانە بە ئارامی ئەخەویت یا بەترسەوە ئەنویت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من هەست بە ترسناکەم. نەك ئێستا هەستم بە ترس نەکردوە، بەڵکو ئەو کاتانەی

کە شەڕیش بوو، لە بیرمە کە لە ناوایی مالومەبووین، لەناو چادرەکانمادا پەناگامان دروستکردبوو. خۆمپارەکانی ئەرتەشی عێراق لە سی و پەنجا میتریمان دەدرا، پریشکەکانی جاری وابوو چادرەکانی کون کون دەکرد و ئێمە گوێمان پێنەدەدا و دەخەوتین. ئەوەی راستی بێت بەرەو پیری مەرگ نەدەچوین، هەوڵماندەدا خۆمان بپارێزین، بە هەموو شێوەیەك، بەلام من شەخسەن هەستم بە ترس نەدەکرد. سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو وەزعەی کە من لە پشتی بەرەکانی شەڕەوە تێیدابووم، گەلێك ئەمین تر بوو لەو شوێنانەی کە هاوڕێیانی دیکەم خەباتیان تێیدادەکرد. رەفیقی ئێمە بوو کە بە فەرمانی ئێمەو بە ستراتیژێك کە ئێمە دامانرشتبوو، بە دڵناوالەییەوە بەرەو خەتەرترین شوێن دەچوون و خەبەری گیانبەختکردنی ئەم و ئەومان بەردەوام پێدەگەیشت. ئەو داستانانە لە خۆبوردویی و فیداکاریەکەی مەجالی ئەوەی دەهێشتەوە کە بیر لە خۆت بکەیەوە؟ بەڕاستی ئەم دەورانە هەموو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە ئامادەبوون بۆ ئەوەی وەکوو هەموو تێکۆشەرێکی دیکەی ناو کۆمەڵە لەپێناوی ئامانجەکانیاندا فیداکاری بکەن. لەبیرمە لەکاتێکدا کە کۆتایی هەشتاکان بوو، ناکۆکی لەناو ریزەکانماندا پەیدابوو، یەکێك لەو رەخنانەی کەلەرێبەرایەتی کۆمەڵە دەگیرا ئەوەبوو کەلەکاتێکدا کەشتییەکەتان خەریکە نوقم دەبێت، شانازی ئێوە ئەوەیە کە وەکو کاپیتانەکەی ناو کەشتیەکە دواین کەس بن کە دەچێتە ناو قایقی نەجاتەوە؟ تۆمەتی ئەوەیان لێدەدایں کە ئەمە خۆشەویستی خاکە کە واتان لێدەکات. ئێوە ئاسۆتان کوێستانەکانی قەندیلە و شتی تری لەو چەشنە کە هەرگیز ئەو قسانە بە گوێمدا نەدەچوو.

***بەڕاستی ئەوە عیشق بەخاك‌و جوگرافیاو کوردستان نەبوو کە ئێوە لەسەنگەرەکانی قەندیلدا نەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، ئەوە رێگای مۆقاوەمەتێکی دروستبوو کە ئێمە هەڵمانبژاردبوو. سەرچاوەکەی دەگەڕاوە بۆ ئامانجی سیاسی و خۆشەویستی جەماوەر. ئێمە هەمیشە ویستوومانە لە خۆشی و لە ناخۆشیدا لەو خەڵکە جیا نەبینەوە.

**شەرمنم، بەلام ترسنۆك نیم**

***من پرسیارێکت لێئەکەم، ئەگەر هەڵەبوو تۆ بۆم راستبکەرەوە، تۆ پیاوێکی شەرمن دیاریت، یەعنی ئەمەوێت بڵێم شەرمنیت‌و ترسنۆکیت وایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەوانەیە تۆزێك شەرمن بم، بەلام ترسەنۆك نییم.

***چۆن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جۆرێك لە شەرمنی هەڵدەگەرێتەوە بۆ پەروەردەی بنەماڵەیی و ژیانی رابردوو و ئەو کوێرەوەریانەی کەلەژیانی منالیدا بەسەرم هاتووە. ترس هەستێکی ئینسانییە کە بێگومان هەموو کەس لەژیانیدا تووشی دەبێت، بەلام من دەتوانم بڵێم کەلەژیانی خۆما هەرگیز ترس بە سەرما زاڵ نەبووە. هیچ کات ترس مەسیری زیندەگی منی دیارینەکردوە.

**باوەژنەکەم باشبوو**

***لەماڵی ئێوە کێ بەهێزبوو باوکت یا دایکت، یا خێزانی ئێوە چۆن بوو، چی پاڵی بەوەوە نا تۆ خەریکی خەبات‌و شۆڕش بیت وەکامیان تۆیان زیاتر خۆشدەویست و هانیان ئەدایت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کەمتر لە دوو ساڵ تەمەنم بوو کە باوکم و دایکم لە یەك جیا بوونەوە و من لای باوکم دەژیام. باوکم منی زۆر خۆشدەویست، باوەژنیشم ئینسانێکی نەرم و نیان بوو، عەزیەتی نەدەدام. نە

مەحەبەتی زۆری پێدەکردم و نە عەزیەتیشی دەدام. بەڵام گەورەترین هاندەری من بۆ خۆشەویستی و بۆ ئینسان دۆستی و بۆ میهرەبانی باوکم بوو.

*پەیوەندیت لەگەڵ براو خوشکەکانت چۆن بوو؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من برایەکم هەیە کە دایکمان یەك نیە و پەیوەندیم لەگەڵی زۆر رەفیقانە بوو، ئێستاش هەیە وە ئەو لە ئێران دەژی، ئەو خەریکی سیاسەت نەبوو، خەریکی ژیانی ئاساییانەی خۆی بوو، بەڵام دایکم لەباوکم جیابووە وە خۆی مێردی کردبوو، لەخانەوادەیەکی تردا بوو، ئەویش چوار کچ و کوڕێکی بوو کە لەدایکەوە خوشك و برا بووین. دایکم و برا وخوشکەکانم زۆر خۆشدەویست . ئەگەر چی وەکوو ژیان لە یەك جیا بوین بەلام لەگەڵ ئەوانیش تێکەڵاویم هەبوو، ئەوانیش سەرچاوەیەکی خۆشەویستی بوون بۆ من کە زۆرم پێویستی پێی بوو.

*ئەی بۆ ئەو برایەت رانەکێشایە کۆمەڵەوە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو لەسەرەتای جەوانیدا عاشق بوو، وە ئەو عەشقە کاریگەری خستبووە سەر هەموو ژیانی. بە لای سیاسەتدا نەهات.

## عیشق و سیاسەت

*باشە، تۆ کەی عاشق بووی؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** چەند جارێك ئەوە روویداوە. لام وایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی دەرس خوێندنم لە زانکۆ هاوینی (١٣٤٧).

## کچێکم خۆشەویست

*چۆن جۆنی بوو، باسێکی ئەو عشقەم بۆ بکە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جارێکیان چاوم بە کچێك (کەنیشکێك) کەوت و دڵمی گرت. وەها عاتفی بووم وا هەستدەکەم کە جۆرێك لە هەستی شاعیریم تێدا دروستبوو. کۆمەڵێك شیعر و پەخشانم بۆ نووسی ، ئەو شیعرانەم هەموو لەبیرچووەتەوەو ونبوون، بەڵام من ئەو خۆشەویستیەی خۆم بۆ ئەو کچە هەرگیز بەرەو رووی خۆی دەرنەبڕی، واتا ئەو کچانە نەیانزانی کەمن ئەوانم خۆشدەویت . جارێکی دیکەش هەر لەم دەورانە دا عاشق بوم و هەر ئەو سیناریۆیە دووپات بۆوە.

*هەر ئەوە بوو کە شەرمن بووی؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شەرت نییە وا بوو بێ، خەباتی سیاسی وایکردبوو کە ئەو کاتە تەسەورم ئەوەبوو کە ئەگەر برۆم بەرەو ئەو ژیانە وە بە دەمیەوە بچم ناتوانم درێژە بە خەباتی سیاسیم بدەم.

## عشق زۆر گرنگە

*دەتوانی پێم بڵێی عیشق، قورسترە لەشۆڕش؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من عیشق زۆر گرنگە، زۆر فرسەتێکی گەورەیە کەلەژیانی ئینساندا پەیدا دەبێ، بەڵام عەشقەکەی ئەو کاتی من ئەوەندە قوڵ نەبوو کە بتوانێ لەگەڵ رووداوی گەورە بەراوردی بکەی. هەستێکی دەورانی سەرەتای جەوانییە کە بە پەلە دێت و دەروات.

* ئەو کچانەت خۆشدەوێ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: نا.... نا تەواوبوو،

*تۆ وتت من ئەمە پێشمەرگەو شەڕ ئەکەم لەو پێناوەدا ئەکوژرێم، بەس ئەتوانی بەکچێك بڵێی خۆشمئەوێت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کێشەکە ئەوە بوو کە ئاسۆی تێکۆشانی سیاسی، منی بەرەو ژیانی بەنهێنی و کاری سیاسی پیشەیی دەبرد و ئەوە لەگەڵ ئەو جۆرە خۆشەویستییانەی کە دەهاتە ڕێگام نەدەهاتەوە و منیش نەمدەویست کەسێك بخەمە شوێن هیوایەك کە لەوانەیە نەتوانم بۆی بەدیبێنم.

خانەی موعینی هەموو وێنەکانی خۆی فەوتاند

*ئەی تۆ ئیحتیمالی ئەوە دانانێت ئەگەر ئێستا یەکێك لەو کچانەت خۆش بویستایە ئێستا تۆ ئەئەبووی بەسکرتێری کۆمەڵەو ڕەنگە وەکو براکەت عاشق بویتایەو وازت لەسیاسەت بهێنایە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: مەسەلە ئەوە ئەبوو کە ئێمە خۆشەویستی تەرك بکەین، بەڵام پرۆژەیەکە خۆمان دیاریمانکردووە، ئێمە دەمان هەویست، هەموو ئەو ئاڵقانەی کە دەیان بەستینەوە بە ژیانی ڕابوردوو ئەیان هێلێن، بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ و لە شوێنێکی دیکە و بەناو ناسنامەیەکی دیکەوە پێکبێنین وهیچ حەلقەیەك واسیتەی ئێوان ئێمە و ژیانی ڕابردومان ئەمێنێ. لەبیرمە هاورێی گیانبەختکردوو (خانەی موعینی) هەرچی وێنەی بوو هەر لەئالبومێکدا تەنانەت لە ئەلبومی خزم و رەفیقەکانی دەورو بەریشی هێنایە دەرێ و لە ناویبردن. دەمەوێت بڵێم ئەو شێوەیە لەژیان کە ئێمە هەڵمانبژاردبوو، ژیانی ئەهێنی، ژیانی کرێکاری ، ئەبوایە خۆمان بۆ ئامادەکردبا کە ئەوە ڕێگەی ئەدەدەدا بە دەم ئەم جۆرە خۆشەویستیانەوە بچین.

*فەرزاری ئەو کچەیەت کە تۆی گەیاندۆتە ئێستا، خۆشەویستیت لەگەڵ ئەکردووە یان لەگەڵی ئەکردویت یەعنی لەو بەینەیا کە تۆ ئەوت بەنسیب ئەبوو، یان حاسڵ ئەبوو وسیاسەتشتکرد، پەشیمان نیت خۆ لەمەیان؟

ئیبراهیم عەلیزادە: نا پەشیمان نییم، بەس باش حاڵی ئەبووم لە پرسیارەکەت.

*یەکەم کچ کەناسیت و عاشق ئەبوویت، بوویت بەشۆڕشگێر، ئەگەر عاشق بویتایە ڕەنگە فاشل بویتایە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لەوانەیە

*بەڵێ کەسەرینەگرت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێستا ئەو کچە ماوە و خەریکی ژیانی خۆیەتی. من جاروبار هەمیشە بیری لێدەکەمەوە، هەمیشە ئەحوالی دەپرسم دەمەوێت و پێمخۆشە بزانم چۆن دەژی. چ دەکات، مناڵەکانی گەورەبوون چ دەکەن چ ناکەن بەبێ ئەوەی پەشیمانیش بم، بەڵام بیرەوەریەکەی بۆم شیرینە.

*جوانترین بیرەوەری و خاگرتە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ناتوانم بڵێم جوانترینە، بەڵام لە یاد ناچێتەوە.

*برادەرێك کەلەگەڵ تۆ بوو ئەو کات دڵی عاشقم کردووە بەردەوام؟

ئیبراهیم عەلیزادە: من برادەرێکم بیر دەکەوێتەوە، ئەگەر ئەو بیرێ تا سنووری دەرکردن لەکۆمەڵەچوو. لەبیرمە ئەو برادەرە لەیەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵەدا ئەندامیتی لە سەرئەو عەشقە هەڵپەسێردرا.

***بەگەنجی پارەت پێبوو، وەزعەت باشبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەر لە (٩) ساڵانەوە تاکۆتایی خوێندنی ناوەندی و چوونە زانکۆ هەموو ساڵێک (٣) مانگی هاوین ڕۆژنامە فرۆشی یان کرێکاریم کردووە. لەدانیشگاش کە بووم ڕۆژانە دوای تەواوبوونی دەرسەکانم لە چاپخانەی دانیشگا ئیشم دەکرد. من هیچ کات ئەوەندەم پارە پێ نەبوو کە بتوانێ سێ ڕۆژ لە گیرفانمدا بمێنێتەوە، واتە هەر بەشی خەرجی ڕۆژانەم هەبووە.

***ئەوە وای لێکردیت ببیت بەچەپ و مارکسی و بزووتنەوەیەکی چەپ دروستبکەن دوایی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بوونی من بە هەڵسووڕاوێکی مارکسی دەگەڕێتەوە بۆ وشیارییەکی سیاسی، کەلەڕێگەی خوێندنەوەی ئەدەبیاتی چەپدا بە دەستم هێنابوو. بەڵام جێگا و شوێنی چینایەتی و ژیانی رابردووم زۆر سوورتری کردم لەسەر پێداگرتن لەسەر ئەو ڕێبازە و درێژە پێدانی.

***چی پاڵی بە تۆوە نا، فاکتەرێکی حەماسی گەنجانە بوو یان ڕێبازێکی جۆراوجۆر بوو وەکو زەروورێکی مێژوویی و نەتەوەیی، ئەقڵ و مەنتق، کەپێویست بوو تۆ بیکەیت، ئەو بنەماڵەکەت بوو یا تۆ چاوت لەباوکت کردکە دیموکرات بوو، چی وایلێکردیت بێیتە ناو ئەو مەیدانەوە بەردەوامبیت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێش ئەوەی کە پێ بنێمە ناو هیچ چەشنە خەباتێکی سیاسییەوە، هەستم بە بێ عەدالەتی و هەڵاواردن لە کۆمەڵگادا دەکرد. باوکم زۆری دەور بینی لەوەدا کە بزانم هەڵسوکەوتی دروست لەگەڵ خەڵک و ئەخلاقی پاک دەبێ چۆن بێ. چوونە زیندانی باوکم سەرنجی بەرەو سیاسەت ڕاکێشام. خوێندنەوەی کتێب ڕەوتی بە ئاگاهاتنەوەی لە مندا بەرەو پێشبرد. شعوری سیاسی من بە دوورکەوتنەوە لەباوەڕەکانی مەزهەبی و ئاشنا بوونم لەگەڵ زانستی مارکسیسم سەقامگیر بوو.

**نوێژم کردوەو تەرکم کرد**

***قەد نوێژت کردووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ بۆ ماوەیەک لە ژیانمدا هەم نوێژم کردووە و هەم ڕۆژوم گرتووە. لە تەمەنی(١٥) ساڵیدا یەکەم شك و گومان بەرانبەر بەم باوەڕە لە مێشکمدا پەیدا بوو. بەڵام تەنیا کاتێک کە چوومە زانکۆ و لەوێ لەگەڵ کوڕێکی ڕووناکبیر ئاشنابووم و دوای خوێندنەوەی کتێبێک بە ناوی "بنەما سەرەتایی یەکانی فەلسەفە" لە نووسینی کۆمۆنیستی فەرانسەوی "ژۆرژ پۆلیتزێر" کەلەرژێمی ئەڵمانی نازی دا ئێعدام کرا، بوو کە بە تەواوی هەموو بیروبۆچونێکی ئاینیم وەلا نا و بە سەر هەموو شك و دوو دڵییەکانی خۆمدا زاڵبووم.

***خۆ بەنیاز نیت جارێکی تر نوێژ بکەیت و بەرۆژو بیت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە وەڵامی ئەم پرسیارە لای خۆشت ڕوونە، ئەوە داستانێکە کە پەیوەندی بەرابردووە هەیە و تێپەڕیوە. بەڵام با هەر بەم بۆنەوە باسێکی کورتت بۆ بکەم لەسەر کێشەی خۆمو ئەندامانی دیکەی بنەماڵەکەم لەسەر ئایین.

لەسەرەتاوە زۆر هەڵوێستێکی چەپڕەوانەم هەبوو بەرامبەر بە مەزهەبو کاتێك خۆم لێی دوورکەوتمەوە، هەوڵمدا باوکم و مامم و کەس و کارم هەڵگەڕێنمەوە. بەردەوام خەریکی پیلەگردن بووم پێیان. هەوڵم ئەدا بە قەناعەتیان بگەیەنم کە ئەمانە خۆرافاتن. بەڵام دواجار لێم حاڵیبوو کە ئەمە زۆڵمێکە دەرحەقی ئەوان دیکەم ، نەك هەر یارمەتی نەدەکرد کە پەیوەندیم ئاسایی وسەمیمانە بێت لەگەڵیان و ئەوان گوێبگرن بۆ

قسەکانی دیکەشم، بەڵکو جۆرێك لە موقاوەمەتی لە ئەواندا پێکدەهێنا، کە ئەگەر قسەیەکی حیسابیشم بووبایە، ئەوان گوێیان بۆ نەدەگرت. وردە وردە بۆم دەرکەوت کە ئایین پەناگایەکە بۆیان تێیدا ئارامدەگرن. من لە کاتێکدا کە هیچیان پێنادەم هەوڵدەدەم ئەو ئارمگەیان لێ بستێنمەوە. حاڵیبووم کە ئەگەر لەم بابەتەوە پێویست بێ کارێك بکەم نابێ لێرەوە دەستپێبکەم. من خۆم دەمبینی دایکم کە نانی ماڵانی دەکرد بۆ ئەوەی منداڵەکانی بێ بەخێوبکات، کاتێك منداڵەکانی نەخۆش دەکەوتن دەچووە لای دوعا نووس و نوشتەی بۆ دەنوسین. بۆ یەکەم جار کە ویستم بە دایکم بڵێم "دایە واز لەوە بهێنەوئەوە خورافاتە"، بیرم لەوەکردەوە ئەو قسەیە وەختێك دەتوانێ ئارامی بەدایکم بدات یان لە منی وەربگرێت، کە بتوانم دەستی منداڵەکەی بگرم بیبەمە لای دکتۆر. وردە وردە بەوە گەیشتم کە مەزهەب لەڕاستی جەماوەریدا تەنیا دەتوانێ بە پێی ئاڵوگۆڕەکانی زەمانە و گۆڕینی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیو ئابوریو فەرهەنگی لەژیانی ئینسانەکاندا وردە وردە زەواڵ پەیدابکات. لەڕاستیدا ئەو شێوە کارەی من رەنجی بێ حاسڵ بوو.

***بەپێی زانست و سایکولۆژیا ئەڵێت، ئەوانەی کە بەمنداڵی تۆرەبوون یان نەگبەتبوون، لەدوایدا کە گەورە دەبن عادەتەن هێمن و لەسەرخۆدا دەبن، تۆ بە گەنجی توند بویت یان وەکو ئێستا هێمن بویت، وە پێم بڵێ چەندجار سەرت شکاوە لەشەڕو هەرای کۆڵاندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من کەسێکی شەڕانی نەبووم لە منداڵییدا شەڕم زۆر کەمکردووە. چەند جارێك بیرم دێ کە لەگەڵ کەسی بە هێزتر لە خۆم شەڕم بووە و لێدانم خواردووە.

***هەر ئەوەیە بەردەوام لەدانوستانەکاندا لەگەڵ ئێراندا داوانەکەن ئێمە نامەناوێت خەڵك بکوژین، لێمان نەکوژن ئێمە نامانەوێت شەڕ بکەینو شەرمان پێ نەفرۆشن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە، پەیوەندی بە ستراتیجی سیاسیەوە هەیە، ئەم شتە سایکۆلیۆژیانەی ژیانی منداڵی کاریگەری زۆر زۆر مەحدود و بچکۆلەیان هەیە لەسەر زەینی کەسانێك کە ئیتر رەوتی ژیانی خۆیان وشیارانە دیاریدەکەن.

**ژیانم زۆر خۆشدەوێ**

***ژیانت خۆشدەوێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر.

***ئەی بۆ خەڵك ئەکوژیو پێشمەرگەکان رائەهێنی خەڵك بکوژنو خەڵکیان لێ بکوژرێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من پێموایە کە ئەمەش هەر لەپێناوی خۆشەویستی ژیاندایە. ئێمە بۆ پارێزگاری لەژیان بەرانبەر بە هێرشێکی ناجوامێرانە کە هێنایانە سەرمان، دەستماندایە موقاوەمەتی چەکدارانە. هەر لەسەرەتاوە کە ئێمە دەستمانکرد بەخەباتی چەکدارانە لە کوردستانو هێزی پێشمەرگەمان پێکەوەنا، یەکێك لە دەرسە هەرە گرنگەکانی کە بەپێشمەرگەی کۆمەڵە ئەوترا ئەوە بوو کەلەگەڵ دیل چۆن هەڵسوکەوت بکەن، ئەوە بوو کە لەگەڵ بریندارەکانی دوژمن لەمەیدانی شەڕ چۆن رەفتاربکەن. خۆم لە بیرمە یەکەم شەڕ کە خۆم تێی دا بەشدار بووم، دوو برینداری شەڕمان گرتبوو خۆم و چەند هاورێ یەکەم لەناوچەی دارساوێنی سەردەشتەوە گەیاندمانە شوێنێك کەتەداویان بکەین. ئەمانە هەردووکیان حزبوڵلاهی زۆر توندڕەو و دژ بە ئێمەبوون کە بەخوێنی سەرمان تینوو بوون و ئەوەیان نەدەشاردەوە. دوای دەرمانکردن ئازادمان کردن. زۆریان پێ سەیر بوو، باوەڕیان نەدەکرد. رێبازی ئێمە لەسەر بنەمای ئینسان

دۆستی بینا کراوه و کاری بێ بەزەییانە دەرحەق بە ئینسان تێیدا جێگا و شوێنێکی نییە. بەڵام وەختێك لولەی تفەنگی دوژمن روو لەسینگت دەکرێ، تۆ چ چارەیەکت هەیە غەیری ئەوەی کە خۆ بپارێزی و وەڵامی بدەیەوە؟

*یەکەم تەقە کەی بوو کە کردت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: یەکەم تەقە کە بە نیەتی شەڕکردم ئەوەندەی لەبیرم بێ لە پاییزی ساڵی( ١٣٥٨)ی هەتاوی دابوو لە کاتێکدا کە تیمێکی پێشمەرگە بۆ مەئموریەتێك چوون بۆ ناو شارۆچکەی رەبەت لەنزیك شاری سەردەشت و ئێمە ئەرکی تەئمینکردنی رێگای پاشەکشێی ئەوانمان لەبەرزاییەکانی دەوروەی رەبەت لەئەستۆ بوو. سەرجەمی ئەم شەڕە هیچ کەسی تێدا نەکوژرا.

*چیت پێبوو ئەوکات؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کلاشینکۆف.

*چەند تاقم تەقەنگ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: شەش.

کەسم نەکوشتوە

*یەکەم کەس کە کوشتت کێ بوو لەو دەورانی شەڕدا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: باوەڕناکەم کەسم کوشتبێ. نامهەوێ ئەمە بەبایەخێکی گرنگ بۆ خۆم حیساب بکەم، لەکاتێکدا مەسئولیەتی موقاوەمەتی چەکدارانە لەکوردستان وە ئەستۆ دەگرم. بەڵام بەهەرحاڵ نەکەوتومەتە مەوقعیەتێك کە کەس بکوژم.

*پێشمەرگەیەکی ئازا بوویت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لەزۆربەی نزیك بە هەموو دەورانی پێشمەرگایەتیم هەمیشە پارێزگاریم لێکراوە و زۆر کەم لەشەڕی پێشمەرگانەدا بووم.

*یەکسەر بویتە مەسئول مەبەستت ئەوەیە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ، یەعنی کاتێك هێزی پێشمەرگەمان پێکهێنا، من ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و کۆمەڵەو ئەندامی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵە بووم.

*بۆچی یەکسەر بویتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە، هەر بەزوویی هی خوێندەواریەکەت بوو یان هی چی بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لەیەکەم کۆنگرەی کۆمەڵەدا پێش ئەوەی هێزی پێشمەرگە پێك بێت لە ساڵی (١٩٧٩) لەسنە بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرام.

*بۆچی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەمە بریاری کۆنگرە بوو، لەوانەیە هەڵسوڕانی من لەدەورەی خەباتی نهێنیدا لەبەرچاو بوو بێت.

*پێتخۆشبوو کەیەکسەر بوویت بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیونەوانە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ناتوانم بلێم زۆر خۆشحالبووم، چونکە هەر ئەو کاتە کەسی تر هەبوو کە لە من بەتوانا تر بوو.

***بریندار بوویت؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: نەخێر، بریندار نەبووم.

**لەزیندانی ساواکدا بووم**

***چوویتە زیندان؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ، نۆ مانگ لە سلولی تاکەکەسی ساواکدا بووم.

***لەماوەی ئەو (٢٥)ساڵە چۆن نەکوژراویت، چۆن ماویت؟ ئەو هەموو هاوڕێیانەت گیانیان لەدەستداو رەنگە هاوڕێیانی جەهێل زۆر کوژراو شەهید بووبن؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هۆکاری سەرەکی ئەوەبوو کە ئەو شوێنانەی کە ئێمەی لێ دەژییان زۆر بە وردی پارێزراو بوو. هاوڕێکانم زۆریان هەوڵداوە بۆ پاراستنم. لە بیرمە لەوەختی سەختترین بۆمبارانەکاندا کەسێك یان دووکەس یا سێ کەس بووە خۆیان بەسەر مندا کێشاوەو پاراستوویانم. زۆرکەسم بینیوە کە فیداکاریان کردووە. ئەگەر نەکوژراوم تەنیا بە هۆی فیداکاری خەڵکی دیکەوە بووە.

***ئەوە کارێزمایی نییە خەڵك خۆی بەر فیشەکدا هەتابەرتۆ نەکەوێت و نەکوژرێیت؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: پاراستنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بڕیارێکی پەسەندکراوی حزبی بوو. من خۆم لەم جۆرە کاتانەدا بەم جۆرە پاراستنە خۆشحاڵ نەبووم، بەڵام هەستی رێز و ئیحترامی زۆرم بۆیان هەبووە. هەرگیز بەوەی کە پێشمەرگە بە شوێنمەوەیە و دەمپارێزێت یان لەجێگایەکی پارێزراو دەژیم هەستم بە ناسودەیی نەکردووە، بەڵام لەهەمانکاتدا وەکوو زەرورەتێك قبوڵم کردووە.

***تۆ لە دانیشگایت و لە کولیەی هەندەسە، چی بەسیاسەتیەوە بەستیەوە بۆ خۆت، بۆنەبوی بە موهەندیسێك یا خەریکی کاری کارەبایی بی، یا شارەزای لەکاروباری کارەبا؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هەرچەند لەکاتی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیدا هەمیشە خوێندکارێکی دەرجە یەك بووم، بەڵام ساڵێك دوای ئەوەی کە چومە زانکۆ ، وردە وردە خوێندن بۆ من ئەولەوییەتی خۆی لە دەستدا و بووم بە خوێندکارێکی مام ناوەندی. کە زانکۆم تەواوکرد ئیتر دەمزانی ناتوانم لەم رێگایەوە ئارەزووەکانم بەدی بێنم. دەمزانی کە ئەمە رێگای خۆشی و خۆشبەختی لەژیانی مندا نییە. کەڵك وەرگرتن لە پلەی مۆهەندیسی هاندەری ژیانم نەبوو.

**زۆرجار دەگریم**

***هیتلەر جاروبار بۆ خۆشەویستەکەی ئەگریا بەو هەموو دڵرەقیەی هەیبووە، عەبدوڵڵا ئوج ئالان لەزۆرکاتدا ئەڵێن خەریکی دروستکردنی خانووی قو رۆچکەی منالانە بوو، تۆ هیچ شتێکی وات تیایە لەو سیفاتە منالیانە یان سیفاتە گەنجیانە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ من وەختێك زوڵمێکم لێبکەن، نەتوانم دیفاع لە خۆم بکەم، هەست بەوە بکەم کەبەرانبەر بەناحەقییەك کەدەرحەق بە من دەکرێت، هیچ کارێکم پێناکرێت، دڵم پڕ دەبێت لەگریان.

***ئەگریت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جاری واش هەبووە. تەنانەت جاری وا هەیە ئەو زوڵمە تەنیا قسەیەکی ناحەقە.

***ئەی بۆ جوابی نایتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاتێك کە جوابی دەدەیتەوە فائیدەی نییە.

***تۆ باسی کتێبت کرد، تۆ کتێبی قاچاخت ئەخوێندەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کتێبی قاچاخم نەك هەر دەخوێندەوە بەڵکو گەلێك جار دەشم نوسیەوە بۆ ئەوەی بە دەستی خەڵکی تریش بگات.

# چۆنیەتی پێکهاتنی کۆمەڵە

(کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران)

**چۆنیەتی دروستبوونی کۆمەڵە**

***ئێستا بابێینە سەر بابەتێکی تر، پێم بڵێ ئێوە سەرەتا کێ و کێ سیاسەتتان دەکرد، گروپتان پێکهێنا بەنهێنی کارتان دەکردو لەماڵی کێ بوون‌و باسی چیتان نەکرد، ئەوەی کە لە گەنجێتیا ئینسان ئەیکات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم چالاکی سیاسی من لەزانکۆی تەوریزەوە دەستپێکرد کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٣٤٧)ی هەتاوی. ئەو کاتە زانکۆی تەوریز ناوەندێکی پڕ جۆش و خرۆشی خەباتی سیاسی بوو. ژمارەیەك لەخوێندکاران گیرابوون‌و خەبات بۆ ئازادکردنیان لە ئارادا بوو. بەهۆی چالاکی سیاسیم بووم بەکەسێکی ناسراو لەزانکۆ. ئەو کاتە هاوڕێیانی کۆمەڵە کە بە نهێنی کاریاندەکرد سەرنجیان بەرەو لای من راکێشرا بوو و منیان بۆ بانگهێشت بە کارکردن لەگەڵ خۆیان هەڵبژارد بوو.

**من و حەمەسوورو عومەری ئیلخانیزادە لەشانەیەك بووین**

***کێ تۆی هەڵبژارد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وا بزانم بەهاری ساڵی (١٣٥٠)ی هەتاوی بوو و یەکەم کەس، حوسێنی مۆرادبەیگی بوو کە دواجار بە ناوی حەمەسور دەناسراوە. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە لەگەڵ عومەری ئیلخانیزادە کە ئەویش پێش من پەیوەندی پێوە گیرابوو، هەر سێکمان بووین بەشانەیەك. هاوینی هەر ئەو ساڵە کەگەڕامەوە بۆ مەهاباد لەوێ لەڕێگای عەلی ئاشناگەرەوە پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێی گیانبەخت کردوو کاك حەمە حسێنی کەریمی گرت کەلەلایەن کۆمەڵەوە چالاکی لەشاری مەهاباد و دەوروبەری پێسپێردرابوو. بەم جۆرە شانەیەکیش لەم (٣) کەسەمان لە مەهاباد پێکهات. دواجار لەم دوو شانەیەش ناوەندێکمان پێکهێنا. تا ئەو کاتەش هێشتا من بەرەسمی نەببووم بە ئەندامی ڕێکخراو و ئەوە ساڵی (١٣٥٣)ی هەتاوی بوو کە دوای ئەوەی کۆمەڵە زەربەیەکی قورسی لەسەر دەستی ساواکی شا خوارد و ژمارەیەکی زۆر لەکادرەکانی کەوتنە زیندان، من بە رەسمی کرام بە ئەندام.

***هەوزەکانی تر کێ و کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای چوونە زیندانی هاورێیانمان کە بەشی زۆریان لەتەشکیلاتی تاران و شارەکانی دیکەی ئێران بوون، تەشکیلاتی ئێمە لەکوردستان دوو ناوەندی جیاوازمان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان بەناوی ناوەندی مۆکریان‌و ناوەندی سنە پێکهێنا. ناوەندی مۆکریان بریتی بوون لە حەمە حسێنی کەریمی، حسێنی مۆراد بەیگی، عومەری ئیلخانی زادە و من. ناوەندی سنەش بریتی بوون لە، ساعیدی وەتەندوست، سدیقی کەمانگەر، و جەمیل زەکەریایی، حسێنی مۆراد بە یگی کە لە هەر دوو ناوەندەکە دا بوو. ئەم حەرەکەتە هەوڵێك بوو بۆ ساغکردنەوەی ڕێکخراو دوای زەربەکەی پۆلیس.

**عەبدوڵای موهتەدی لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵەیە**

***سەرەتای دروستبون و فکرەی کۆمەڵە کێ بوو چۆن بوو ئەوکاتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆتایی ساڵەکانی دەیەی حەفتای زایینی دەورەیەکە کە زانکۆکانی ئێران ببونە ناوەندێکی چالاکی قسە و باس و دیالۆگی سیاسی. لە ناو کۆڕ و کۆمەڵی خوێندکاراندا مەیل و بۆچوونی سیاسی و جۆراوجۆر خەریك بوو شکلی دەگرت. ئەم باس و گفتوگۆیانە لەناو خوێندکارانێکدا کە بیری چەپ

و غەیرە مەزهەبی یان هەبوو لەلایەکەوە لەژێر کاریگەری ئەزموونی خەباتی دژی دیکتاتۆری لە ناوخۆی وڵاتدا بوو و لەلایەکی دیکەشەوە پەیوەندی هەبوو بە کێشەکانی ناو بەرەی چەپ لەئاستی جیهانیدا. لەگەرمەی ئەو باس و گفتوگۆیانەدا ژمارەیەك لەخوێندکارانی زانکۆی تاران بە بیری ڕێکخستنی خەباتی چینایەتی بۆ ئامانجی سۆسیالیزم یەکدەگرنەوە و ڕێکخراوێك کە دواجار ناوی کۆمەڵەی لەسەر دانرا پێکدێنن. ئەم کەسانەی کە دەتوانین وەکوو دامەزرێنەرانی سەرەتایی کۆمەڵە ئێویان لێبەرین بریتین لە: فوئاد مستەفا سوڵتانی، محەمەد حسێن کەریمی، عەبدوڵڵا موهتەدی، مۆسلێح شەیخوڵ ئیسلامی، سدیق کەمانگەر، ساعد وەتەندوست، ئیرەج فەرزاد، شۆعەیب زەکەریایی، فاتح شێخوڵ ئیسلامی، یەدێ بێگلەری، حسێن مۆراد بەیگی

**کۆمەڵە بەدیلی دیموکرات نەبوو**

***کۆمەڵە وەکو ئەڵتەرناتیڤی دیموکرات هاتەبووە کایەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ڕاستیدا وا نییە، کەسانێك هەن کە مێژووی کۆمەڵە لە سەر بنەمای بۆچوونی سیاسی ئێستایان دەنووسنەوە، ئەوانە هەوڵ دەدەن پێك هاتنی کۆمەڵە بە ململانێ و خەباتی سیاسی ناو کوردوستانەوە گرێ بدەن، کە ئەوە تەنیا بەشێکی کەم لە واقعیەتەکەیە. بێ گومان خەباتی سیاسی ڕابوردوو و ئەوکاتی کوردوستان کاریگەری لە سەر زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە کوردوستانەوە هاتبوون و لە تاران دەژیان، هەبوو. بەڵام ئەساسی ئەو باسانەی کە کۆمەڵەی لە سەر دامەزرا پەیوەندی بە کێشە جیهانی و ئێرانییەکانی ناو بزووتنەوەی چەپی ئەو سەردەم بوو. هەموو هاورێیانی دامەزرێنەری کۆمەڵە نامیلکەی "بۆچی پرژ و بلاوین و چۆن ڕێکخراو بین" کە بە زمانی فارسی نوسراوە و واتە (چرا پراکندە ایم و چگونە متشکل شویم)، لە بیرە و دەزانن کە لەو نامیلکەیەدا بە ڕوونی سەرچاوە فیکری و سیاسییەکانی کۆمەڵە دیاری کراون و دیارە کە کۆمەڵە لە جەرگەی چ دیالۆگێکی ئەو سەردەمدا لە دایك بووە. کە وایە ناکرێ بڵێین کۆمەڵە بەدیلی حزبی دیموکرات بوو. کۆمەڵە و حزبی دیموکرات لە دەورەی شۆڕشی (١٣٥٧)ی ئێران و ساڵەکانی دواتری بوو کە وەکوو دوو حزبی جیاواز بەرامبەر یەك لە کوردوستان دەرکەوتن.

ئەمانەی کە ناوم بردن هەموویان خەڵکی شارەکانی کوردستانی ئێران بوون کەزۆربەیان لەتاران دەرسیان دەخوێند. گەلێك خەڵکی فارس و تورك زمانیشیان پێ پەیوەست بوون. دەزانین کە عادەتەن خوێندکارانێك کە لە شارە چکۆلەکانەوە دەچنە شارە گەورەکان پەیوەندی ئاساییان بەیەکەوە هەیە و کۆڕو کۆمەڵی تایبەت بە خۆیان پێکدێنن. کۆبوونەوەی ئەو کەسانەی کەکۆمەڵەیان پێکهێنا لەدەوری یەکتر پەیوەندییەکی بە خەباتی کوردایەتییەوە نەبوو. هەر ئەو کاتەش لەژێر کاریگەری بیری ناسیۆنالیزمی کورد و ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق، حەرەکەتێکی دیکەش لەئارادا بوو. ژمارەیەك لەخوێندکارانی ئەو سەردەمە زانکۆیان بەجێهێشتبوو و ڕوویانکردبووە کوردستانی عێراق. پاش ماوەی ئەمانەش لەزانکۆی تاران کۆڕو کۆمەڵی خۆیان هەبوو. دیارە پەیوەندیش لەنێوان ئەمانە و دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بە شێوەیەکی ئاسایی هەبووە. ئەمڕۆ بەداخەوە کەسانێك هەن کە بە پێی مەسلەحەت یان بۆچوونی ئەمڕۆیان ئەم دوو سەرچاوەیەی تێکەلاو دەکەن، بۆ ئەوەی زەرورەتی پێکهاتنی کۆمەڵە بەرنەوە سەر ناسیۆنالیسمی کورد.

ئەم دوو حەرەکەتە هەرکامەیان دواجار چارەنووسی تایبەت بە خۆیان پەیداکرد. ئەوانەی کە ڕوویانکردبووە کوردستانی عێراق لەژێر گوشارێك کە مەلا مستەفا بارزانی لەسەر داوای ڕژێمی شا بۆی هێنان

کەوتنە هەلومەرجێکەوە کە ناچاربوون کوردستانی عێراق بەجێ بهێڵن و بە بێ ئامادەکاری و بەرنامەیەکی تەواو و تۆکمە بێنەوە بۆ کوردستانی ئێران و چەك هەڵبگرن. ئەمە حەرەکەتێك بوو کە کۆمەڵێك ئینسانی مارکسیستی تێدا بوو و کەسانێکیشی تێدا بوو کە لەسوننەتی کوردایەتیدا پەروەردە ببوون. بزووتنەوەکەی ئەوان لەلایەن رژێمی شاوە نوقمی خوێن کرا و زۆربەیان گیانیان بەختکرد و یا بۆ ماوەی دوورودرێژ لەزیندانەکانی شادا مانەوە.

حەرەکەتەکەی دیکەیان یان بابڵێین حەرەکەتی کۆمەڵە ئامانجی شۆڕشی سەرلەسەری لە ئێران و پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی یان هەڵبژارد و رێبازێکیان گرتەبەر کە ئەو کات بە خەتی "کاری سیاسی_ رێکخراوەیی" دەناسرا. هەر لەم دەورەیەدا ژمارەیەکی دیکە لە هەڵسوراوانی چەپ لەئێران رێبازی خەباتی پارتیزانییان لەشارەکان هەڵبژارد، کەدواجار رێکخراوی "چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران"ی لێکەوتەوە.

**نە سەر بەشورەوی بووین، نە مائویست**

*** بۆچی ئێوە ئەو کاتە رێکخراوێکی چەپو مارکسیتان دروستکرد، پێم بڵێ ئەوکاتە ئێوە سەربە بلۆکی شۆرەوی بوون یا مائوئیست بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دامەزراندنی کۆمەڵە لەسەر بنەمای فکر و بەرنامەی کۆمۆنیستی بوو. هەر بۆیە کۆمەڵە وەکوو رێکخراوێکی چەپ پێکدێت. ئێمە نە سەر بە بلۆکی شورەوی بووین و نە خۆشمان بە مائویست دەناسی. بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەلومەرجی سیاسی و ئابوری ئێرانمان هەر وەکوو هەلومەرجی وڵاتی چین پێش شۆڕش هەڵدەسەنگاند، زۆر لەژێر کاریگەری ئەزمونی شۆڕشی چین و دەرسەکانی مائۆ، رێبەری حزبی کۆمۆنیستی چین لەو شۆڕشەدا بووین.

***پەس کارو فەعالیەتی ئێوە بەشێك بوو لە فکرەی ماوئیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆچونی مائۆیستی تارادەیەك کاری تێکردبووین، بەڵام ئێمە خۆمان بە مارکسی_لێنینی پێناسەدەکرد. ئەوەی کە ئێمەی لەبیرۆکەی مائۆئیستی نزیك دەکردەوە هەڵسەنگاندنێك بوو کە بۆ هەلومەرجی کۆمەڵگای ئێران هەمانبوو. ئێمە کۆمەڵگای ئێرانمان بە "نیوە مۆستەعمەرەنیوە فیئۆدال" دەزانی. لامان وابوو کە پێویستە زەویوزارەکان لەچنگ دەرەبەگەکان بێنینە دەرێ و بەسەر جوتیاراندا دابەشی بکەین، بەم جۆرە جوتیاران بکەین بەبنچینەی هێزێکی چەکداری شۆڕشگێر کە پارێزگاری لە دەستکەوتەکانی خۆی بکاتو بەیارمەتی راپەرینی جەماوەری لەشارەکان سەرئەنجام وڵات لەدەست دەسەڵاتی رژێمی شا رزگار بێت .

لامان وابوو کە ئەم ئەرکە لەتوانای حزبێکی کۆمۆنیستدایە کە لەسەرەتاوە لەشارەکان و لەشوێنە کرێکاریەکاندا پێکدێت و سەرجەمی ئەم حەرەکەتە رێبەرایەتی دەکات. دیارە ئەمە زۆر نزیك بوو لەئەزموونی شۆڕشی چین. هەر بۆیە ئێمە هەموو نوسراوەکانی مائۆمان لەناو ریزەکانی خۆماندا بڵاودەکردەوە و دەمانخوێندەوە و وەکو ئەزمونێکی دیاریکراو چاومان لێدەکرد. هەڵبەت من دەزانم کە بەم حاڵەشەوە ئەگەر کەسێك ئەو کات ئێمەی بە مائۆئیست هەڵسەنگاندبێ، بۆچونێکی بە بێ زەمینە نەبووە. بەڵام لەڕاستیدا ئێمە هەمیشە هەوڵماندەدا بە هیچ لەونێك بە وابەستەی فکری هیچکام لەناوەندەکانی ئەو کاتی وەکوو شورەوی و چین و ئالبانی و کوبا، نەناسرێینەوە. هەر ئەوە جۆر خۆ پاراستن لەخۆ بەستنەوە

بەم یا بەو جەمسەر یارمەتیکرد بەوە کە ئێمە بتوانین لەساڵانی دواتر لە دوگماتیزمێك کە لەوانە بوو ڕێگا نەدات دەوری شایستەی خۆمان لە شۆڕشی (١٣٥٧)ی گەلانی ئێران بنوێنین، خۆمان بپارێزین.

**دکتۆر جەعفەر شەفیعی لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە نییە**

**«خۆت دەزانی‌و بەپێی قسەی چەند لەهاوڕێکانی تۆ، کۆمەڵە، لەشاری تاران لە ساڵی (١٩٦٩) پێکدێت دووهێڵی سەرەکی یا دوو شانەی سەرەکی دەوری سەرەکیان هەبوو لەدروستکردنیدا ، شانەی یەکەمیان پێکهاتووە لە فوئادی مستەفا سوڵتانی، دکتۆر جەعفەری شەفیعی، حەمە حسێنی کریمی، عەبدوڵڵا موهتەدی، شانەی دووهەمیشیان فوئاد تیابوو سدیقی کەمانگەر، ئیرەجی فەرزاد بووە، ئەمانە تا چەند ڕاستە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: پێکهاتنی کۆمەڵە بەم شێوەیە نەبووە و ئەوەی من پێشتر باسم بۆ کردن ئەوە دەقیق ترە. با بۆ وێنە پێتان بڵێم دکتۆر جەعفەری شەفیعی هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویست و لێهاتوی ئێمە بووە، بەڵام ئەو لەساڵی (١٩٧٩) بووەتە ئەندامی کۆمەڵە. پێشتر لەپەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەدابوو، بەڵام ئەندام نەبوو. من لەو ساڵەدا و لەکاتێکدا کەکۆمەڵە ئەوی بۆ مەئموریەتێك وەکو پزیشك و بۆ یارمەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ناردبوو، هەر لەوێ لەسەر بڕیاری کۆمەڵە، ئەندامەتیەکەیم پێڕاگەیاند. ڕاستە کە بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵە لە سەرەتاوە لە لایەن کۆڕێکی چکۆلەترەوە گەڵاڵە کرابوو کە بریتی بوون لە فوئاد مستەفا سوڵتانی، حەمە حوسێنی کەریمی، عەبدوڵڵای موهتەدی و مصلح شێخ الاسلامی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا لام وایە ئەو ناوانەی کە پێشتر باسم بۆ کردی دەکرێ وەکوو دەستەی دامەزرێنەر ناو ببرێن، چونکە ئەوکات بە بۆنەی هەلو مەرجی دژواری پۆلیسی و مەرجەکانی کارێکی نهێنی جیددی، ئەو ئاستەنگانە ئاسایی بوون و ئەو جەمعە هەر بەو شێوەیە دەیانتوانی بە هاوئەرزی لە سەر کارێکی هاوبەش بکەن.

**«یەکێك لە هاوڕێیەکانی خۆتان دەڵێ کۆمەڵە لە (٥) ڕەزبەری (١٩٦٩) ز لەسەردەمی شادا دروستبووە، یەعنی سەردەمی ساواکە، دەقیقەن وایە ئەوکاتە کارێکی زەحمەت نەبوو کە بەتوندی مورەقابەی ئەم جموجۆڵە سیاسیانەی دەکرد؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: من لەسەر (٥)ی ڕەزبەرەکەی ناتوانم بەو تەنکیدە بڵێم. دیارە ساغبوونەوەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێك لەپاییزی (١٩٦٩)دا بووە. ئەوەندەی لەبیرم بێ هەر لەڕۆژانی سەرەتای پێکهاتنیدا زەربەیەکی پۆلیسی خوارد، بەڵام نهێنییەکانی ئاشکرا نەبوو. هەر ئەو کاتە ئەو قسەیە لەناو دەستەی دامەزرێنەردا دەهات و دەچوو کە ئایا لە هەلومەرجی خەفەقان و دیکتاتۆری شادا ئیمکانی پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسی نهێنی لەسەر شێوازی "هێرەمی" هەیە یان نا؟ وەڵامی زۆربەی دامەزرێنەران بەم پرسیارە ئەرێ بوو. بەڵام لەبەرانبەردا بۆچوونێکی دیکەش هەبوو کە دەیگوت ڕێکخراوی لەو چەشنە زۆر زوو دەبێت بە ئامانجی دوژمن و تێدا دەچێ و پێویست ناکات مەرکەزیەت دروستبکەین. دەتوانین بە شێوەیەکی ئاڵقەیی پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتر بپارێزین. ئەم بۆچوونە سەرنەکەوت. ئێمە لامان وابوو کە مەترسی پولیس و ساواك بەوە کەم دەبێتەوە کە شوێنی کار و ژیانمان لە سەتحی کۆمەڵگاوە بگوازینەوە بۆ قوڵایی کۆمەڵگە. واتە ببین بە کرێکار و بچین لەشوێنی کارو ژیانی خەڵکی زەحمەتکێش لەشار و لە دێ بژین‌و کاربکەین و لە هەمان کاتدا ڕێکخراوێك بین بە مەرکەزیەتێکی دیاریکراوەوە. کەس یا کەسانێك بوون کە ئەو بۆچوونەیان قبوڵ نەبوو.

***بەعنی بەشدارییان نەکرد لە ئیدامەی پرۆژەکە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەشداری نەدران و بەشێوەیەك وەلانران و درێژەی کارەکەیان لێ شاردراوە.

***کێ بوون ئەوانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەندەی من لەبیرم بێت ئەو کات ناوی نهێنی کاك "فاتح شێخ الاسلامی" بە ئێمە دەگوترا.

***بەلام ئێوە بۆچوونەکەی ئەوانتان قبوڵ نەکرد دەستاندیە چالاکی ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ئەو ڕێکخراوەیان ئەوجۆرەی کە دەیان هەویست دامەزراند.

## ئامانجی ئێمە ڕروخانی شاو کۆماری دیموکرات بوو

***ئەتوانیت پێم بڵێیت کۆمەڵە هەر لەسەرەتاوە کە دروستبوو وەکو ئەلتەرناتیفێکی حزبی دیموکرات هاتە کایەوە، حزبی دیموکرات لەساڵی (١٩٤٥) کە کۆمار دروستدەبێت و دوابەدوای ئەوە بەو پێیەی کە نەیتوانی بوو لەناستی پێداویستیەکانی چەپ و خەڵکی شۆڕشگێر وەکو ئەوەی کە ئێوە هەوڵتاندا ئەلتەرناتیفێك بدۆزنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان کۆمەڵە لەسەرەتای پێکهاتنی خۆیدا وەکو ئەلتەرناتیفی حزبی دیموکرات نەبوو. حزبی دیموکرات لەسەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵەوە جێگایەکی ئەوتۆی لە فکر و بۆچوونی ئێمەدا نەبوو. جێگاو شوێنی حزبی دیموکرات لەلای کۆمەڵەوە دوای ڕووخانی ڕژێمی شا و دەستپێکردنی بزووتنەوەی موقاوەمەتی خەڵکی کوردستان بەرانبەر بە دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی گرنگی پەیدادەکات. پێویستی پێکهاتنی کۆمەڵە لەخەباتێکی سەرانسەری لە ئێراندا بوو. ئامانجی ئێمە ڕوخاندنی ڕژێمی شا، دامەزراندنی " کۆماری دیموکراتیکی نوێ" و "هەنگاو نان بەرەو سوسیالیسم" لە ئێران دیاریکرابوو. ئەو بۆ چوونە لە نووسراوەکانی سەرەتایی ئێمەدا بە ڕوونی بەیانکراون.

***دەکرێت بڵێن بە ڕووخانی شا، کۆمەڵە دروستبوو یان کۆمەڵە گەشەی کردو فراوان بوو و هەر دوا بەدوای ئەوەش یەکسەر کۆمەڵە گەشەیەکی بەرچاوە ئەکات کەرەنگە لەمێژووی ئەحزابی کوردیدا گەشەیەکی وا خێراو بەرچاو کەمبێتەوە هەر دوابەدوای ئەوە کەگەشە ئەکات و خەڵك لەدەوری کۆئەبێتەوە، ئەبێتە مونافسی دیموکرات، یان دیموکرات ئەو کاتە نەمابوو، کۆمەڵە زوو گەشەی کرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** راستە کەکۆمەڵە بەرووخانی شا چالاکی ئاشکرای خۆی دەستپێکرد، بەڵام کۆمەڵە زۆر پێش رووخانی شاش تێکۆشانی لەناو جەماوەردا هەبوو. دیارە ئەم تێکۆشانە مۆرکی دەورەی دیکتاتۆری و سەرکوتی ڕژێمی شای پێوە بوو وە بە نهێنی دەکرا. بەڵام ڕێکخراوی ئێمە هەر لەو هەلومەرجەشدا هاندەری چەندین حەرەکەتی جەماوەری لەشوێنە جۆراوجۆرەکانی ئێران و کوردستان بووە. بۆ وێنە ئێمە دەورمان بووە لەمانگرتنێك لە کارخانەی ئاسن تواندنەوەی ئیسفەهان، یان مانگرتنی کرێکارانی سەدی بۆکان، مانگرتنی کرێکارانی جادەی بۆکان_ میاندواو، بەشی سەنگ شکەن، نارەزایەتی دەربرینەکانی شیرکەتی سەهامی زەراعی لە مەهاباد، هاندان و ڕێبەری کردنی حەرەکەتی جووتیاران لە دارسەیران لەنزیك شاری مەریوان، چەند حەرەکەتی جوتیاری دژی دەرەبەگایەتی لەناوچەکانی نێوان سنە و دیواندەرە و کامیاران و نمونەی دیکەش. کۆمەڵە لەخەبات بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی شادا لە ساڵی (١٩٧٩) لە هەموو بوارەکاندا چالاکانە

بەشداربوو. رووخانی رژێمی پاشایەتی مەجالێکی کەم وێنەی بۆ تێکۆشانی کۆمەڵە خوڵقاند. لەو دیموکراسیە بەرفراوانەدا کە پەیدابوو کۆمەڵە بوو بە باڵی چەپی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە.

حزبی دیموکرات و کۆمەڵە دوو رێکخراوی سیاسی جیاواز بوون و هەرکامیان بەرنامە و ستراتێژی و شێوەی کاری تایبەت بە خۆیان هەبوو هەر بۆیە هەبوونی ناکۆکی لە بەینیان دا گەلێك ئاسایی بوو. بەلام ئەگەر بمانەوێ بزانین کە کێشەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە بۆچی حاڵەتی توند و تیژیان بەخۆوە دەگرت، دەبێ بگەرێینەوە بۆ ساڵی (١٩٧٩) ئەو کاتەی کە حزبی دیموکرات لە حزبێکی تەبعیدیەوە پێی نابووە چالاکی ئاشکراو جەماوەرێکی دیاریکراو لەدەوری کۆببووە. ئەم حزبە لە سەرەتای پێکهاتنیەوە لە ساڵی (١٩٤٧) تا ئەو کات خۆی بە تاقانە و یەکەم خاوەنی مەیدانی سیاسەت لەکوردستان دەزانی. کە لەتەبعیدەوە گەرانەوە بۆ کوردستان لەگەڵ هەلومەرجێك بەرەو رووبوون کە بە تەواوی لە تەسەورێك کە ئەوان بۆ کۆمەڵگای کوردستان بویان جیاواز بوو. ئەوان نەیاندەتوانی ئەوە لێك بدەنەوە کە چۆن چۆنی رێکخراوێکی وەکو کۆمەڵە بەم شێوەیە لە کوردستان نفوز و توانایی جەماوەری پەیداکردووە. هەر بۆیە زۆرجار لەناو کادرەکانی خۆیاندا لێرە و لەوێ کۆمەڵەیان بە دەستکردی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ناو دەبرد کە گوایا بۆ ژێر پێ خالیکردنی حزبی دیموکرات پێکهاتبێ!. ئەوان ئەو گۆرانکارییە بنەرەتییە کۆمەڵایەتیەی کەزەروورەتی پێکهاتنی رێکخراوێکی چەپ و سۆسیالیستی لەکوردستان رەخساندبوو، دەرك نەدەکرد. کۆمەلگای کوردستان پێی نابووە قۆناغی سەرمایەدارییەوە. چینێکی نوێی کرێکار پێکهاتبوو. ریفورمی زەوی و زار کرابوو ، پاشماوەی دەرەبەگایەتی دوایین هەناسەکانی خۆی دەکێشا. ژمارەی خوێندەوار و روشنبیر گەلێك زیادی کردبوو ئەوەیەکی نوێ لە روناکبیرانی چەپ و کۆمۆنیست سەریان هەڵدابوو. ئیتر حزبی دیموکرات و رێبازەکەی و رابردوو و سوننەتەکانی وەلام دەرەوەی هەموو ئەو هەلومەرجە نوێیە نەبوو.

### کۆمەڵە لە یەکێتی جوتیارانەوە دەستپێیکرد

***کۆمەڵە خۆت دەزانی لەسەرەتاوە وەکو رێکخراوێکی سیاسی خۆی نەناساند، بەڵکو لەرێگای رێکخراوە سینفی و سەنعەتیەکانی وەکو( جوتیاران، ژنان، کرێکاران و مامۆستایان)ەوە گەشەی کرد، واتا ئەم فکرەیە هی کێ بوو، وە من تەئکیدم لەوەی، ئەمە فکرەیەکی تازەبوو لەکوردستانی ئێران، وە زۆر بەخێرایی سەرکەوت، ئێوە توانیتان لە رێگای ئەو رێکخراوە سەنفی و سەنعتیانەوە، خەڵکێکی زۆر لەخۆتان کۆبکەنەوە، ئایا ئەمە تاکتیك بوو، ئێوە ویستان خەڵك لەو رێگایانەوە کۆبکەنەوە، دوایی بیانخەنە پاڵ کۆمەڵەکە هەر واشتانکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم ئەزموونی کۆمەڵە لە کاری رێکخراوەیی دیموکراتیك و غەیرە حزبیدا لە یەکێتی جوتیارانی مەریوانەوە دەستی پێکرد. لەم ناوچەیە هەم پاشماوەی ئیزامی دەرەبەگایەتی هەبوو، کە زەمینەی راپەرینی جوتیاران لە دژی فەراهەم بوون و هەم کۆمەڵە هەر لەزەمانی حکومەتی شاوە پێگەی خۆی لەناو زەحمەتکێشانی ئەو ناوچەیەدا لە رێگەی هاندان و بەشداری لەخەباتی جوتیارانی "دارسێران" مەحکەم کردبوو.

بیری پێکهێنانی یەکێتی جوتیارانی مەریوان ئەوەندەی کە من ئاگادارم لە کاك فوئادەوە بوو. کاك فواد لەسەر ئەو باوەرە بوو کە دەبێ هێزی چەکداری جوتیاران پێکبێت بۆ ئەوەی جموجۆڵی دەرەبەگەکان پوچەڵ بکاتەوە. ئەو کات ژمارەیەك لە فیئۆداڵەکانی کوردستان لەرێکخراوێکدا بەناوی "شورای عەشایری"

کۆببوونەوە، هێزی چەکداری بەکرێگیراویان پێکەوە نابوو، ئەمەش خۆی هاندەرێك بوو بۆ ئەوەی کە مەیلی چەکدار بوون لەناو جوتیارانیشدا پەرەبستێنێ. ئەم تەجرەبە ماوەیەکی کورت لەناوچەکانی دیکەی کوردستان وەکو سەقز و مەهاباد و سەردەشت دووپات بۆوە و زەحمەتکێشانی دێهات لەسەر ڕێنوێنی کۆمەڵە لە یەکێتی جوتیارانی ناوچەکانی خۆیاندا کۆبوونەوە.

دوهەمین تەجرەبەی کۆمەڵە لە پێکهێنانی ڕێکخراوەی دیموکراتیك لە "جەمعیەتەکانی دیموکراتیك" لەشارەکانی کوردستاندا خۆی نیشاند. هەر وەها گەلێك ڕیکخراوی کرێکارانی بیکار و ژنان لە شارەکانی کوردستان هەر لە سەر ڕێنوێنی کۆمەلە پێك هاتن.

لەسەردەمی ڕاپەڕینی ڕێبەندانی (١٣٥٧)ی هەتاوی و مانگەکانی دواتری ژمارەیەکی زۆر لەلاوان و تێکۆشەرانی بە بیر و بۆچوون چەپ هاتبوونە ناو گۆڕی خەباتی سیاسییەوە و مەیلیان بەرەو لای کۆمەڵە بوو. ڕێکخراوی کۆمەڵە نەیدەتوانی بە خێرایی هەموو ئەو هێزە لە ناوخۆیدا جێ بکاتەوە. پێکهاتنی ئەو جەمعیەتانە بوو بە زەرفێك بۆ پەرەپێدانی چالاکی سیاسی کۆمەڵە لەئاستێکی کۆمەلایەتیدا. تەجروبەیەکی دیکەی کۆمەڵە خۆی لە پێکهێنانی بنکەکانی گەرەکەکان لەشاری سنەدا دەبینێتەوە کە بەکردەوە بوون بەناوەندی ڕێکخستنی ژیانی ئاسایی خەلکی گەرەك و هەروەها ناوەندی ئامادەکردنی خەلك بۆ موقاوەمەت بەرانبەر بەهێرشێك کەلە ڕێگەدا بوو. کۆمەڵە هەروەها هاندەری پێکهێنانی شورای شارەکان لەهەموو کوردستان بوو و خۆشی چالاکانە لەم شورایانەدا بەشداری دەکرد. لە پاڵ ئەمانەدا چەندین ڕێکخراوی ژنان‌و کرێکاران‌و خوێندکاران لەشوێنە جۆراوجۆرەکانی کوردستان لەسەر ڕێنوێنی کۆمەڵە پێکهاتن.

جگە لەمە چالاکی سەربەخۆی کۆمەڵەش تاڕادەیەکی زۆر پەرەی سەندبوو. کاتێك کە کۆمەڵە خۆی ئاشکراکرد خاوەنی ژمارەیەك کادربوو، ئەگەرچی زۆر نەبوون، بەلام هەموویان لەناو خەلکدا خۆشەویست و جێگای متمانە بوون. هەر لەدەورانی دیکتاتۆری شاوە تێکەلاوی خۆشی و ناخۆشییەکانی خەلکی ئەو ناوچانەبوون کە تێیدا دەژیان. لەجەرەیانی ڕاپەڕیندا لەریزی پێشەوەی خەباتی جەماوەری بوون. هەر بۆیە دوای تێکشکانی دیکتاتۆری شا خەلك کە کۆمەڵەی لە ڕێگەی ئەوانەوە ناسیبوو، ئەو متمانە و خۆشەویستیەی کە پێئەوانی بوو بە کۆمەڵەی بەخشی.

جەمعیەتەکانی دیموکراتیك لەڕێگەی ناوەندێکەوە بە ناوی "شورای هەماهەنگی" چالاکییەکانیان بە یەکەوە گرێدرابوو. لەبیرمە کە پێشنیاری پێکهێنانی ئەم شورای هەماهەنگییە لەلایەن کاك فوئادەوە بوو و بانگەوازەکەی لە ئارشیوی کۆمەڵەدا هەیە. ئەم جەمعیەتانە هەتا کاتێك کە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی هێرشی هێنایە سەر کوردستان هەر مابوون و چالاکیان هەبوو. دوای ئەوە زۆریەی هەڵسووڕاوانی هاتنە ناو ریزەکانی کۆمەڵە و لە ناو هێزی پێشمەرگە و تەشکیلاتی نهێنی شارەکاندا ڕێکخران.

**دیموکرات هەڵوێستی پارێزگارانە هەبوو**

*هەر ئەوە نەبوو کەحزبی دیموکرات هەرشتێ لەو شتانەی نەکردبوو، ئێوەچون ئەو شتانەتان گرد کەحزبی دیموکرات فەراموشی کردبوو، یا ئەو خاڵە زوعفانەتان گرت کە حزبی دیموکرات پەی پێ نەبردبوون؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من مەسئەلە ئەوە نەبوو کە حزبی دیموکرات دەرکی بە هەڵسووڕانی لەم

جەشنە نەکردبێ، بەڵکو مەسەلە ئەوە بوو کەئەوەیەکی خەباتکاری تازە هاتبووە سەر شانۆی سیاسیو کۆمەڵایەتی لەکوردستان کە حزبی دیموکرات زەرفییەتی جەزب و ڕێکخستنی ئەوانی نەبوو. لە جەمعیەتە دیموکراتیکەکانەدا ژمارەیەکی زۆر هەڵسوراوی چەپ هەبوون کە سەرچاوەی بیر و بۆچونیان سۆسیالیستی بوون، ئەوانە لە سونەتی کوردایەتییەوە نەهاتبوونە ناو خەباتی سیاسییەوە. هەر بۆیە حزبی دیموکرات ئەگەر بیشی هەویستبایە نەیدەتوانی وەها هێزێك لەناوخۆیدا جێبکاتەوە. سەبارەت بە یەکێتی جوتیارانیش پێویستە بزانین کە حزبی دیموکرات لەمەڵسوکەوت لەگەڵ پاشماوەی دەرەبەگایەتی لە کوردستان هەڵوێستێکی مۆحافزەکارانەی هەبوو. تەنانەت بەشێك لەو پاشماوەیە هەوڵیاندەدا کە لە ناو حزبی دیموکراتدا جێگایەك بۆ خۆیان ببیننەوە. هەر ئەوە جوتیارانی هەزار و زەحمەتکێشانی دێی تا ڕادەیەك لە حزبی دیموکرات دڕدۆنگ دەکرد. با لەم بابەتەوە بیرەوەریەکم هەیە بۆتی بگێڕمەوە:

بەهاری ساڵی (١٣٥٨)ی هەتاوی بوو. جموجۆڵێك لە ناو ئاغاکانی ناوچەی سەردەشت دەستی پێکردبوو. هێزێکی هاوبەشی کۆمەڵە و یەکێتی جوتیارانی سەردەشت و ڕەبەت تەرتیبی جەولەیەکی چەکدارانەیاندا کە بە ئاوایییەکانی ئەم ناوچەیەدا بگەڕێن و دەرەبەگەکان چەك بکەن. دەرەبەگەکان بەردەوام بەرانبەر بە هێزی کۆمەڵە و جوتیاران پاشەکشەیان دەکرد تا سەرئەنجام لە ئاوایییەك کە وا بزانم ناوی "ئالاوان" بوو، لە ناوچەی "بەری مێرگان"، کۆ بوونەوە. لە بەر ئەوەی ئێمە نەماندەویست شەڕ و خوێن ڕشتن بێتە کایەوە، پێشنیاری گفتوگۆمان پێدان. شەو بە سەردا هات، حزبی دیموکرات کە بنکەیەکی سەرەکی لە ئاوایییەکی گەورەتری ناوچەی سەردەشت بە ناوی "میراوێ" هەبوو، پەیوەندی پێوە گرتبوون و کارتی ئەندامەتی حزبی دیموکراتی بە هەموویان گەیاندبوو. ئەوانیش یەکێك لە ماڵەکانی خۆیان کردبوو بە بنکەی حزبی دیموکرات. بەم جۆرە ئێمە ئیتر ناچار دەبووین نەك لەگەڵ بەگەکان بەڵکو لەگەڵ حزبی دیموکرات گفتوگۆ بکەین، کە ئیتر کێشەکە بە تەواوی فەرقی کردبوو و بە ناچار وازمان لێهێنا.

***دەتەوێت لەم خاتەرەیە بڵێت حزبی دیموکرات نوێنەرایەتی دەرەبەگ و فیئۆدال و عەشایەرەکانی ئەکردو ئێمەش نوێنەرایەتی خەڵکی چەپ و شۆڕشگێڕو مارکسییمان دەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من ناڵێم کە نوێنەرایەتی فئودال و عەشایرەکانی دەکرد ، بەڵکوو دەڵێم سیاسەتێکی هەبوو کە ئەوانیشی لە نێو خۆیدا جێگا دەکردەوە.

***ئێوە نەتانویست ئەوانە لای ئێوە جێگای نەبێتەوە، خەڵکی عەشایرو دەرەبەگ و خەڵکی فیئۆدال؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیارە کە لای ئێمە جێگایان نەدەبۆوە، بەڵام ئێمە دەمانویست کۆمەڵگای کوردستان پێ بنێتە نێو دەورەیەکی تازەوە کە تێیدا مەدەنیەت و شارستانیەتێکی نوێ ببێتە سەرچاوەی پێکهاتنی حزبەکان و حزبایەتی و خەباتی سیاسی. ئەمانە پاشماوەی دەورەیەکی کۆن بوون و پێگەی کۆمەڵایەتیان تەقریبەن نەمابوو، حزبی دیموکرات ئەو بڕوا بەخۆیەی تێدا لاواز بوو کە بتوانێ بە تەواوی لێیان ببڕێ.

## کۆمەڵە دەرەبەگایەتی تواندەوە

***کۆمەڵە تا ئێستا بەوە ئەناسرێتەوە کە دیفاعی لە جوتیاران کرد، کە زەوی بۆ جوتیار گەڕاندەوە، کە دژایەتی ئاغاو دەرەبەگەکانی ئەکرد لەو زوڵم و زۆرەی کە کردبوویان، ئەم پرۆسەیە چۆن چۆنی بوو، وە نەئەترسان ئێوە هەم حزبی دیموکرات هەم ئاغاکان ڕووبەڕووتان ببنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ڕاستیدا پاشماوەی دەرەبەگایەتی لە کوردستان لاوازتر لەوەبوو کە ئێمە لە زەینی

خۆمان و بۆچوونی ئەو سەردەمی خۆماندا جێگامان بۆ کردبۆوە. هەر بۆیە لەگەڵ یەکەم هێرشی یەکێتی جوتیاران و لەگەڵیەکەم جەولەی چەکدارانەی هێزی جوتیاران تا ڕادەیەکی زۆر توانەوە. ئەو سەرکەوتنە یارمەتی داین تا لە چەند شوێنی کوردستان وەکوو دیواندەرە، کامیاران و بۆکان، زەوییەکان بگەڕێنینەوە دەست خاوەنەکانی واقیعی خۆیان، واتە ئەو کەسانەی کە کاریان لەسەر دەکرد. چارەسەر بوونی بە خێرایی ئەم کێشەیە دەوری سەرەکی هەبوو لە ساغ بوونەوەی کۆمەڵە لەسەر ئەو بیرەی کە کوردستان کۆمەڵگایەکی سەرمایەداری بەڵام دواکەوتووە. ئەم ئاڵوگۆڕە فیکرییە کاری کردە سەر ستراتیژی کۆمەڵە لە شۆڕشی داهاتووی ئێراندا. چالاکی لە شارەکان دەورێکی گرنگتری لە قۆناغەکانی سەرکەوتنی یەکجاری لە بیر و بۆچوونی ئێمەدا پەیدا کرد.

***یەعنی حزبێکی شاری بوو، بە پێچەوانەی حزبی دیموکرات کەحزبی لادێیەکان یان حزبێکی دەرەوەی شاربوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من نامەوێت لەم بابەتەوە کۆمەڵە بە حزبی دیموکرات بەراورد بکەم. ئێمە زۆر زوو بووین بە حزبێکی شاری، زۆر زوو ئەو بیر و بۆچوونەی کە ستراتیژی ئێمەی لەسەر بنەمای خەبات لە دێهاتدا دادەمەزراند، وەلا نرا. هەر بۆیە بە بەراورد و لەگەڵ یەکێتی جوتیاراندا، جەمعییەتە دیموکراتیەکان کە لە شارەکان پێکهاتبوون گرنگتر بوون. بۆ وێنە ڕێکخراوەکانی ژنان و کرێکاران و بنکەکانی گەرەکەکان، ئەوانە زۆرتر بوون بە پایە بۆ گەشەکردنی دواجاری کۆمەڵە. حزبی دیموکراتیش ئەگەر چی لە دیهات پێگەی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام ناکرێ بە حزبێکی لادیی پێناسە بکرێ.

***تۆ ئەوانە ناو دەبەیت بە ڕێکخراوی دیموکراتی، یەکەم پێم بڵێ تۆ ئەتوانی پێناسەی دیموکراتی بکەیت وە دیموکراتیش لەو کاتەیە ئەوانە ڕێکخراوی دیموکراتیک بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیموکراتی بەو مانایە ئەڵێم کە ئەمانە ئامانجەکانیان ڕاستەوخۆ سۆسیالیستی نەبوو، جوتیاربوو زەمینی دەویست، ژنان یەکسانی و کۆتایی هێنان بە هەڵاواردنیان دەویست، ژیانی ئاسایی لە گەرەك و لە شار ئەبوایە بەڕێوە بچێت، کۆمەڵگا پێویستی بە حەرەکەتی فەرهەنگی پێشکەوتنخواز هەبوو، ئەمانە هەموی هاندەری پێکهێنانی ڕێکخراوە دیموکراتیکەکان بوو.

***ئەو داوایانە هەر لەمانیفێستی سۆسیالیزمدا هەیە، یەکسانی نێوان ژن و پیاو، زەوی بۆ جوتیار؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مانەوەی ئەمانە ڕێگرە لەسەر ڕێگای حەرەکەت بەرەو کۆمەڵگای سۆسیالیستی. کە تێیدا چەوسانەوەی ئینسان بە دەستی ئینسان کۆتایی پێدێت و گەشەی ئابوری و کۆمەڵایەتی ئیمکانی ژیانێکی تێر و تەسەل و یەکسان بۆ هەمووان فەراهەم دەکات.

**بۆچی کۆمەڵە لەتاران پێکهات ؟**

***خۆت دەزانی کۆمەڵە بەپێی قسەی هاوڕێیەکانت لە تاران لە شارێکی فارس پێکدێت، یەکەم ئایا ئەمە گونجاوە یان دەتوانم بڵێم لەهەناوی کۆمەڵگای کوردستاندا دروست نەبوەو زادەی واقعیەتی کوردستان نییەو لە ڕووی جوگرافیەوە دوورە لە کوردستان، مەبەستمە بڵێم یەکەم ئایا مەسەلەکە مەسەلەی چەپ نەبوو، چونکە ئێوە پێتانوابوو دروستبوونی حزبێکی چەپ و مارکسی لەتاران زەرورترە تا لەسنەو مەهاباد، پرسیاری دووهەم، ئێوە هیچ نفوزێکتان نەبوو لە کوردستان بە پێچەوانەوە حزبی دیموکرات هەیمەنەی کردبوو ئێوە لەکوردستان دوور بن، پرسیاری سێیەمیان ئەترسان، ئەتان ئەوێرا لەکوردستان ئەو چالاکییە**

بکەن؟

**ئیبراهیم عەلیزادە،** مەسەلە وێران و نەوێران نییە. مێژووی کۆمەڵە هەمووی بە هەلومەرجی پێکهاتنی تەوزیح نادرێت، بەڵکو دەبێ چاو لە جێگا و شوێن و هەلومەرجی گەشە کردنیشی بکەین. ئەو تێکۆشەرانەی کە کۆمەڵەیان دامەزراند لە تاران و شارە گەورەکانی ئێران دەژیان و ڕێکخراوەکەشیان لەسەرەتاوە هەر لەم شوێنانەوە پەرە پێ دا. ڕاستە کە ئەم ڕێکخراوەیە لە ساڵی (١٩٦٩) لە شارەکانی غەیرە کورد نشین پێکدێت، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٩)لە کوردستان مەجالی گەشە کردن و پەرە سەندنی بۆ دەرەخسێ.

گەشە کردنی کۆمەڵە لە کوردستانیش هەر بەشێك لە مێژووەکەیەتی. ئەگەر لە ساڵی (١٩٧٩) کۆمەڵە دەرکی واقیعی کوردستانی ئێرانی نەکردبایە و وەڵامی پێویستییەکانی ئەو سەردەمی لەو ناوچەیە نەدابایەوە بێگومان نەدەبوو بە ڕێکخراوێکی بە نفوزی جەماوەری. پێویستە ئەوە بزانین کە ڕێکخراوی کۆمەڵە لە تاران دەزگای ڕێبەرایەتییەکەی لە ساڵی (١٣٥٢)ی هەتاوی زەربەیەکی قورسی لەسەردەستی ساواکی شا خوارد و بەشی زۆری تەشکیلاتەکەی کەوتە زیندان. بەشی کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر ئەو زەرەبەیەی تێپەر کرد و درێژەی بە هەڵسووڕانی خۆیدا. دوای رووخانی رژێمی شا لە یەکەم ڕۆژەکاندا کۆمەڵە هەوڵیدا تەشکیلاتی خۆی لە تاران و تەورێز و شارەکانی دیکەی ئێرانیش ببوژێنێتەوە. جیاوازی کوردستان بۆ کۆمەڵە لە چاو باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران لەوەدا بوو کە موقاوەمەتێکی جەماوەری بەرانبەر بە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی لەسەر بنەمای هەلومەرجێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بە تایبەتی هەبوونی ستەمی نەتەوایەتی کەوتبووەڕێ، کە کۆمەڵە خۆی دەوری چارەنوس سازی تێدا بوو.

**«یەعنی مەسەلەکە ئەوە نەبوو ئەم حزبە، حزبێکی چەپ و مارکسیبێت دەبێ هەر لەتاران دروست بێت، کۆمەڵگای تاران ئامادەترە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە،** شۆڕشی دژی نیزامی پاشایەتی لە ئێران لە ڕێبەندانی ساڵی (١٩٧٩)دا بە لوتکەی خۆی گەیشت و رژێمی شای روخاند، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئامانجەکانی بۆ ئازادی و بۆ ژیانی باشتر بەدی نەهاتبوو درێژەی پەیدا کرد. لە لوتکەوە بەرەوخوار چەند ساڵ درێژەی کێشا هەتا بە تەواوی تێکشکا. لەدەورەیەکدا کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە لەناستی سەرانسەریدا پاشەکشەی دەکرد، بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی و بۆ لابردنی ستەمی نەتەوایەتی بەرپا بوو و گەشەیکرد. کۆمەڵە کە ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕ بوو نەیدەتوانی و نەیدەویست لە خەباتی عادلانەی ئەو جەماوەرە لە کوردستان جیا ببێتەوە. با نموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە: هاوکات لەگەڵ ئێمە ڕێکخراوی چریکە فیدایییەکانی خەڵکی ئێران کە ئەوانیش لە کوردستان چالاکییان هەبوو گەشەیانکرد، تاڕادەیەك کە بوون بەئەندامی "هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد". بەڵام هەر ئەو هێزە کە ئەویش وەکوو کۆمەڵە هێزێکی سەرانسەری بوو بە هۆی ئەوەی کە دەرکی پێویستی بەشداری چالاکانەی لە خەباتی شۆڕشگێڕانەی کوردستاندا نەکرد لەسەرەتاوە تووشی لەتبوون بوون و دواجاریش نەیانتوانی خۆیان لەگەڵ واقیعی ئەم ناوچەیە بگونجێنن و هەر بۆیە باوەکوو زۆربەی نزیك بە تەواوی ئەندامان و هەڵسووڕاوانیان خەڵکی کوردستانی ئێران بوون، بەرەبەرە توانەوە و دەوریکیان نەما. کە وابێ بەبڕوای من مەسەلە ئەوە بوو کە پێکهاتەی کۆمەڵە وەها بوو کە نەیدەویست و نەیدەتوانی لەهیچ هەلومەرجێکدا لە جەماوەر و خەباتەکەیان جیا بێتەوە. لە هەر کوێ خەباتی عادلانە و پێشکەوتنخوازانەی جەماوەری بوایە بە ئیشی خۆی دەزانی کە تێیدا حزوری بێت بۆ ڕابەریکردنی و بۆ سەرکەوتنی تێبکۆشێت.

**کۆمەڵە لەژێر کاریگەری کۆمەڵەی عیراقدا دروست نەبوو**

*پاش هەرەس یا پاش ئاشبەتاڵی ساڵی(١٩٧٤) لە کوردستانی عێراق، لەسەر دەستی پارتی دیموکراتی کوردستان. ڕێکخراوێکی ئەلتەرناتیڤ بە ناوی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی- کوردستان) و دواتر یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێکدێ و وە زووش گەشە ئەکات، یەعنی ئەمەوێت بڵێم هەر لەو سەردەمەشدا کۆمەڵە لەپاش شکستی کۆماری مەهاباد و لەپاش شکستەکانی حزبی دیموکراتی کوردستان ڕێکخراوێکی بەهەمان شێوە چەپ و مارکسی لەکوردستانی ئێران دروست ئەبێ و زوو گەشە ئەکات، ئەم دووانە لێچوونیان زۆرە، یەکێکیان ئەوەیە کە یەکێتی وەکو بەدیلی پارتی دروست ئەبێت، کۆمەڵەش وەکو بەدیلی حزبی دیموکرات دروستدەبێت، ئەمە خاڵێکیان وایە وە تا چەند ئەو قسەیەش راستە کەتۆ پێشتریش رەتتکردەوە کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆڵی هەبووە لە دروستکردنی کۆمەڵەدا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: پێشتر وتم، کۆمەڵە وەکوو بەدیلی حزبی دیموکرات دروست نەبوو. کۆمەڵە لەجەرگەی باس و لێکۆڵینەوەکان بۆ دۆزینەوەی ڕێگای شۆڕشی داهاتووی ئێران لە ناو باڵی چەپی رۆشنبیران و خوێندکارانی زانکۆکانی ئێران، لە دایکبوو. کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لەجەرگەی خەباتی نەتەوایەتی لەکوردستانی عێراق پێك هاتبوو وە پەروەردە ببوو. ئەم ڕێکخراوەیە زۆر زوو تێکەڵاو بوو لەگەڵ بزووتنەوەیەکی مێژووکردی کۆنتر کەلەکوردستانی عێراقدا لە ئارادا بوو.

ئێمە لە ساڵی (١٩٧٩) ئاگاداری هەبوونی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کە ئەو کات ناوی کۆمەڵەی مارکسی _ لێنینی بوو، بووین. هەر لەسەرەتاکانی ئەو ساڵەدا هەوڵماندا پەیوەندییان پێوە بکەین. هاورێیەکمان نارد بۆ ئەورووپا کە ئەو لە ئەورووپاوە لەرێگەی سوریەوە بگەرێتەوە بۆ کوردستانی عیراق و لەوێوە پەیوەندی بکات بەو ڕێکخراوە وە. ئەم پرۆژەیە سەر نەگەوت و ئەم هاورێیە نەچوو بۆ کوردستانی عێراق و گەڕایەوە بۆ لای خۆمان لەئێران. دوای ئەوە هاورێ (خانەی موعینی) مان لەرێگەی سنوورەکانی کوردستانی ئێران و عیراقەوە نارد کە ئەم پەیوەندییە بگرێت، ئەویش بەداخەوە هەرچەند گەیشتە ناو ریزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەڵام نەیتوانی بگاتە شوێنی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتی و لە شەڕێکدا لەگەڵ هێزەکانی ئەرتەشی بەعسی عیراق لەگوندی دری لەناوچەی ماوەت گیانی بەختکرد. دوای ئەوە هەینەتێکی دیکەمان نارد کە ئەوان توانیان خۆیان بگەیەننە شوێنەکانی سەرکردایەتی. ئێمە کە هەستمان بە نزیکایەتی لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دەکرد هەوڵماندا بۆ ئەوەی کەیارمەتییان بکەین و تارادەیەکیش بە پێی توانای ئەوکاتمان ئەو کارەمانکرد، کە لەگەڵ ئازادبوونی کوردستانی ئێران لەچنگ رژێمی شا ئەو یارمەتی دانە هەمە لایەنەتر و بەرینتر بوو.

**کۆمەڵەو کۆمەڵەی رەنجدەران زۆر یارمەتی یەکترماندا**

*دواتریش کۆمەڵەی رەنجدەران یارمەتی ئێوەیاندا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ.

*چۆن چۆنی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لە دوایین مانگەکانی ساڵی (١٩٧٩) ئێمە لەبەردەم شۆڕشێکی گەورەدابووین لە ئێران. شارەکان ئازاد ببوون. ئەو بارودۆخە ئیمکانیدا بە ئێمە کە یارمەتییەکانمان بۆ بەهێزترکردنی ریزی خەباتی دژ بە دەسەڵاتی بەعس لە کوردستانی عیراق بەرە پێبدەین. لەم دەورانەدا ئێمە لە هیچ بابەتێکەوە

درێخیمان نەدەکرد لەچەك و تەقەمەنی و خواردن، بەڵام ساڵانی دواتر بەرەبەرە هەلومەرجەکە گۆڕا، خەباتی پێشمەرگانە لەکوردستانی ئێران پاشەکشەی پێکرا و مقەرەکانی ناوەندی ئێمە گوازرانەوە بۆ سەر سنوورەکان و دواجار لە ساڵەکانی (٨٣ و ٨٤) مقەڕاتی لەکوردستانی ئێرانەوە پەڕینەوە بۆ ناوچە ئازادەکانی کوردستانی عیراق. ئیتر بەردەوام هاوکاری و یارمەتیدان بە یەکتر مۆتەقابیل بوو. پەیوەندییەکانمان نزیکتربوو.

## خانە لەدڕێ شەهید بوو

***ئەی چۆن بوو یەکەم پێشمەرگە سەعیدی موعینی تان نارده ناو یەکێتیەوە، بۆچی بوو یا بۆ تەدریب و دەورات بوو بۆ ئەوەی کە تۆ وتت بۆ پەیوەندی بوو دواتریش هەر لە دڕێ لەناوچەی ماوەت شەهید ئەبێت، ئەو تا چەند لە ناو یەکێتی مایەوە، وە توانی ئەو ئەرکەی ئێوە پێتان سپارد جێبەجێ بکات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سەعیدی مۆعینی ناسراو بە "کاك خانە" بە مەبەستی دامەزراندنی پەیوەندی لەنێوان کۆمەڵەی ئێمە و کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ناردرا بۆ کوردستانی عیراق. مەئمورییەتی ئەو کورت ماوە بوو و بڕیار وابوو کە ئەو ڕاپۆرتی ئەو دیدارەی خۆی بۆ کۆمەڵە بنێرێتەوە و لەسەر چۆنیەتی پەیوەندییەکانی دوارۆژ بڕیاری نەهایی بدرێت. بۆیە کاك خانەمان هەڵبژارد، چونکە ئاساییە کە لە هەلومەرجی کاری نهێنی لە ئێران ڕێکخراوی ئێمە و کادرەکانی بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەناسراو بوون. بەڵام کاك خانەی مۆعینی هەم لە بنەماڵەیەکی ناسراوی کوردستانی ئێران بوو کە پێشتر دوو برای شەهید ببون کەهەردووکیان لە کوردستانی عیراق کەسایەتی ناسراو بوون. هەروەها کاك خانە خۆیشی بە بۆنەی موقاوەمەتێکی کەم وێنە کە لەژێر ئەشکەنجەکانی ساواکی شادا کردبووی، ناوبانگێکی گەورەی لە هەموو ئێران و کوردستان دەر کردبوو. بەمجۆرە لامان وابوو حزوری کاك خانە لە لای کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتی نیشتمانی مەئموریەتەکەی دەتوانێ ئاسانتر جێبەجێ بکات و زووتر متمانەی پێدەکرێ.

***شەهید بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، بەداخەوە لە ناوایی "دڕێ" لە ناوچەی ماوەت لە شەڕێکدا لەگەڵ هێزەکانی بەعسی عیراق گیانی بەختکرد. ئەو کات ئێمە شارەزاییەکی زۆرمان لەسەر هەلومەرجی نیزامی سنوورەکان نەبوو. سەرکردایەتی یەکێتی ئەوکات لە کوێستانەکانی قەندیل گیرسابۆوە، کەچی ئێمە هاورێ خانەمان لە رێگەی ناوچەی ئالانی کوردستانی ئێرانەوە ناردە ئەودیوی سنوور. ئەو کارە بە هۆی تێکۆشەرێکی ناسراوی خەڵکی ئاوایی بێژوێ بە ناوی کاك محەممەد مەلا عەلی کە ئەویش چەند ساڵ دواتر شەهید بوو جێبەجێکرد و لەوێ لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتی نیشتمانی پەیوەندی گرت. سەرکردایەتی یەکێتی کە ئاگاداری سەفەرەکەی کاك خانە بوو، بڕیاریدابوو کە بە زوویی بەرێیکەن بۆ ناوچەی قەندیل لەلایەن کاك ئەحمەد فەتحوڵلاوە، بەڵام بەداخەوە خۆیشی شەهیدبوو.

*** تۆ باسی خانەی موعینیت کرد، بەڵام بە درێژایی ڕاگەیاندنەکانی کۆمەڵە من هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان نەمبینیوە کە بڵێن لە لایەن بەعسەوە کوژراوە، هەمیشە خۆتان لەوە ئەپاراست، هەتاوەکو پاش ڕووخاندنی رژێمی بەعس لەساڵی (٢٠٠٣)دا ئەوەتان ئاشکراکرد، لەڕووی کاری ڕێکخراوەیی و لە ڕووی ئەخلاقی تا چەند ئەو شاردنەوەیە دروستە، وە بۆچی ئێوە ئەو کارەتان نەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموانییە ئەم قەزاوەتەی ئێوە دەقیق بێ. ڕاست ئەکەی ئێمە ساڵانی دواتر بە هۆی بوونمان لە شارەکانی عیراق ئاژیتاسیۆن مان لە دژی ڕژێمی بەعس نەبوو. بەڵام قەد ئەوەشمان نەدەشاردەوە کە کاک خانە لە کوردستانی عیراق و لە ڕیزی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا شەهید بوو. کاتێک ڕادیۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ یەکەم جار لە دۆڵی ئاوزەنگ کەوتە کار لە یەکێک لە یەکەم بەرنامەکانی خۆیدا و بە هاوئاهەنگی لەگەڵ هاوڕێیانی ئێمە هەموو ڕووداوەکەی بە تێر و تەسەلی باسکرد. ئێمە حەتمەن لەم گفتوگۆیەدا لە جێگای خۆی دەبێ باسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆمەڵە بکەین و لە جێگای خۆیدا باسی ئەو مەحدودیەتانەی کە لە تەبلیغات دژ بە ڕژێمی بەعسدا بوومان دەکەین، بەڵام با لێرەدا هەر ئەوەندە بڵێم کە سەرەتایەک لەناو ئێمەدا لەم بابەتەوە جێکەوتبوو کە ئەویش ئەوە بوو، کەمئەگەر نەشتوانین ڕۆشنگەریەکی دیاریکراو سەبارەت بە مەسئەلەیەک بکەین. بەڵام هیچکات نابێ ڕاستیەکان بشارینەوە.

**٭وابزانم لەپێش رووخانی رژێمی شا لەساڵی (١٩٧٩) لەپایزی ساڵی (١٩٧٨)دا کۆمەڵە یەکەم کۆنگرەی خۆی لەسنە و نەغدە ئەبەستێت، بەئامادەبوونی (١٢ یا ١٤)کەس، مەبەستم ئەوەیە ئەوە سەرەتای رێکخستن و کاری سازمانی کۆمەڵەبوو، خۆت ئەزانی کۆنگرە زیاتر لە سازمان و رێکخراوەکان رێکدەخات وە بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامی تیادائەنرێت، وە جۆرێك لە چالاکی زیاتر ئەدات بەو سازمانە ، یەکەم مەبەستم ئەوەبوو بۆچی وا کەمبوون، یەعنی رێکخراوەکەتان بچووك بوو یان ئێوە خۆتان حەزتانکرد وابێت وەچیتانکرد وە پەیڕەو پرۆگرام چۆن نووسرا، کێ هەڵبژێرا، ئەگەر لەبارەی یەکەمین کۆنگرەی کۆمەڵەوە بۆمان بدوێت؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەندامانی کۆنگرەی یەکەم (١٠) کەس بوون کەناوەکانیان ئەمانەیە: (فوئاد مۆستەفا سۆڵتانی، حەمە حسێنی کەریمی، تەیب روحوڵاهی، ئیرج فەرزاد، عەبدوڵڵا موهتەدی، عۆمەر ئیلخانی زادە، ساعد وەتەندوست، حسێن مۆراد بەیگی، مۆحسێن رەحیمی و ئیبراهیم عەلیزادە). لە دوایین رۆژی کۆنگرەشدا شۆعەیب زەکەریایی کە تازە لە زیندان هاتبووە دەرێ حزوری بوو. لە ساڵانی تێکۆشانی نهێنیدا ئەندامگیری لەناو کۆمەڵەدا پرۆسەیەکی زۆر سەخت و دژواری بوو. بەتایبەت دوای ئەو زەربەیەی لە ساواکی شا خواردمان و ژمارەیەك لە هاورێیانمان چوونە زیندان، یەکێك لەمەرجەکانی ئەندامەتی ئەوەبوو کە ئەبوایە ئەندامی کۆمەڵە وەکوو هەڵسووراوێکی پیشەیی ژیانی کرێکاری و نهێنی بوایە. ئەم جۆرە سەختگیرییانە ئێمەی مەحروم کردبوو لە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر شۆڕشگێڕی کۆمۆنیست کە دەیانتوانی لەناو ریزەکانی ئێمەدا چالاك بن. ئێمە ئەوکات لامان وابوو کە ئەم هەڵسووراوانە مادام کە لە ژیانی وردە بورژواییانەی خۆیان نەبڕێن، ناتوانن هەڵگری بیر و بۆچوونی کۆمۆنیستی و کرێکاری بن. سەرەڕای هەمووی ئەوانە چەندەها جۆر تاقیکردنەوە لە مەیدانی کردەوەدا ئەبوایە لەسەریان کرابا. بۆ نمونە من خۆم لە ساڵی (١٣٤٩)ی هەتاویەوە پەیوەندیم بە کۆمەڵەوە بوو و لام وایە بە هەموو تواناشمەوە کارم بۆ دەکرد، بەڵام سێ ساڵ گوزەرا تا توانیم وەکوو ئەندام وەر بگیرێم. یان دوکتور جەعفەری شەفیعی باوەکوو چەندین ساڵ بوو لەگەڵ کۆمەڵە پەیوەندی هەبوو لە ساڵی (١٩٧٩)دا بوو بە ئەندام. لە وەڵامی پرسیارەکەتدا دەمهەوێ ئەوە بڵێم کە هۆی کەمبوونی کادرەکانی کۆمەڵە لەیەکەم کۆنگرەیدا دەگەڕێتەوە بۆ هەل و مەرجی دژواری کاری نهێنی و بۆ داخراو بوونی کۆمەڵە و ئەو کاردەی کە بووی بەرانبەر بە وەرگرتنی رووناکبیرانی شۆڕشگێڕ بە ئەندام.

لەم کۆنگرەیەدا پێداچوونەوەیەکی تەواوەمانکرد بە هەموو رابردووی کۆمەڵەدا و بە تایبەت قورسایی زۆر خرایە سەر رەخنە گرتن و هەڵسەنگاندنی کاری یەکەیەکەی ئەندامانی کۆنگرە لە زیندان و دەرەوەی زیندان. هاورێیانی زیندان لایان وابوو کە هاورێیانی دەرەوە لەم دەورەیەدا بە باشی ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام نەداوە. بەڵام سەرەڕای رەخنەیەکی زۆر کە لە کاری ئەم دەورەیە گیرا سەرئەنجام کۆنگرە ساغ بوە کە ڕابردوو بە جێبهێڵێ و پێ بنێتە دەورەیەکی تازەوە.

**سەرەتا (٥) کەس دەبنە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە**

**٭کێ بوون ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ئەم کونگرەیە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: فوئاد مۆستەفا سۆڵتانی، مۆحسێن رەحیمی، ساعد وەتەندوست، عەبدوڵڵای موهتەدی، ئیبراهیم عەلیزادە.

*پێنج کەس بوون بەیەکەم کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ.

(٢٦) رێبەندان رۆژی شەهیدبوونی حەمەحوسێنی کەریمی

*ئەو کاتە چ پێناسەیەکتان کرد بۆ رێکخراوەکەتان؟

ئیبراهیم عەلیزادە: رێکخراوی ئێمە هەر لەسەرەتاوە بە رێکخراوێکی کۆمۆنیستی پێناسەدەکرا. ئەوکات هێشتا ناومان لەسەر دانەنابوو هەر بە ناوی "تەشکیلات" ناومان لێ دەبرد. بەیان و راگەیاندنەکانمان لەژێر ناوی "هاونیشتمانانی تێکۆشەر" بڵاودەکردەوە. کاتێک لە (٢٦)ی رێبەندانی (١٣٥٧)ی هەتاوی لە جەرەیانی گرتنی شارەبانی شاری سەقز کاک حەمە حسێنی کەریمی شەهید بوو، رێکخراوەکەمان بەناوی (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) لەبەیانێکدا کە ئەم رووداوەی راگەیاندبوو، ئاشکرا کرد.

*تۆ لەگەڵ برادەرەکانت بەو ناوە رازی بوون؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ منیش بەو ناوە رازی بووم. بەڵام ئێمە هەمووومان ئەو ناوەمان بەناوێکی کاتی دەزانی. چونکە هەر لەسەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵەوە لە هەموو نووسراوەکانی دەورانی حکومەتی شادا کە کۆمەڵە بڵاویکردبۆوە، ئاسۆیەك کە بۆ رێکخراوەکەمان دیاریکرابوو تەبدیل بوونی بوو بە بەشێك لە حزبێکی کۆمۆنیستی سەرانسەری. تەنانەت ماوەیەك دواتر لە کۆنگرەی(٢)ی کۆمەڵەدا پێشنیارکرا، ئێستا کە پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست دواکەوتووە با لانیکەم ناوی رێکخراوەکەمان ناوێکی سەرانسەری بێت. لە بیرمە کەپێشنیاری ناوی "رێکخراوی کرێکارانی شۆڕشگێڕی ئێران" یا شتێکی لەوە نزیك کرا. ئەو کات هەر بەو هۆیە گۆڕینی ناو رەتکرایەوە کە پێویستە هەوڵەکانمان بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران چڕ و پڕ تر بکەین و لەم بابەتەوە کۆنگرە بڕیارنامەیەکیدا کە ئاماژە بەپێویستی یەکگرتنی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لەپێناوی پێکهێنانی وەها حزبێك دەکرد.

لەکۆمەڵەوە بۆ کرێکارانی شۆڕشگێڕ

* کێ بوون ئەوانەی ئەیان وت بابیگۆڕین بۆ رێکخراوی کرێکارانی شۆڕشگێر؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هاورێیانی تەشکیلاتی تاران بوون و پێشنیارەکە لەسەر زاری دوکتۆر سەعیدی بەزدییان کە ئەوکات بەرپرسی تەشکیلاتی تاران بوو دواتر لەسێدارەدرا، هاتە گۆڕێ.

*ئەو کاتە هیچ مەیلێکی ناسیۆنالیستی، مەیلێکی قەومی لەناو کۆمەڵە، لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵە هەبوو؟ مەبەستم کۆنگرەی یەکە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لە کۆنگرەی یەکدا دوو جۆر بەحس هاتە گۆڕێ. جۆرێکیان بەحسی رێکخراوەیی بوو کە تێیدا سەرجەمی هەڵسووڕانی دەورەیەکمان وکارکردی ئەم و ئەو تێیدا هەڵسەنگێندرا و رەخنەی لێگیرا و لەسەر ئەساسی ئەو رەخنەیە تەشکیلات خۆی بۆ هەلومەرجی نوێ ساغکردەوە. جۆرێکی دیکە بەحسی ناسینی کۆمەڵگای ئێران بوو. سەبارەت بەم مەوزوعەش دوو بۆچوون هاتە گۆڕێ.

بۆچوونێکیان لای وابوو کە کۆمەڵگای ئێران تێکەڵاوێکە لەسەرمایەداری و پاشماوەی فیئوداڵی، سەرمایەداری ئێران گرێدراوە بە ئەمپریالیزم و کۆمەڵگای ئێران نیوە فیئۆدالیە. بۆچوونێکی دیکە پێی

لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئێران وڵاتێکی بە تەواوی سەرمایەدارییە. کۆنگرە لەسەر ئەوە ساغبۆوە کە لێکۆڵینەوەی پێویست لەسەر ئەم مەسەلەیە نەکراوە و پێویست ناکات لەم بابەتەوە بە پەلە بڕیاری کۆتایی بدرێت و بە بێ ئەوەی بەحسەکە ببڕێتەوە بە کراوەیی داینا بۆ داهاتوو. دواجار بوختەی باسەکانی کۆنگرە لەسەر ئەم مەسەلەیە لە گۆڤاری پێشڕەودا لە ژێر ناوی "لە کۆنگرەی یەکەوە بۆ کۆنگرەی دوو" شی کرایەوە و بڵاوکرایەوە. ئەوەی کە بە لای کۆنگرەی یەکەمەوە گرینگ بوو ئەوە بوو کە لە حەرەکەتی شۆڕشگێڕانەی ئەو سەردەم کە لە ئارادابوو دوا نەکەوێ و بە تایبەت لەکوردستان دەوری رابەریکردنی بگێڕێ.

**لەسەرەتاوە کۆمەڵە کۆمۆنیستی بوو**

***لەهەموو کۆنگرەیەکدا کەپەیڕەو پرۆگرام ئەنوسرێتەوە، پێناسەی حزب یا سازمانی تیا ئەکرێت، ئەو کاتە پێناسەی ئێوە بۆ کۆمەڵە چی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رێکخراوێکی کۆمۆنیستییە.

***کۆمەڵە رێکخراوێکی چەپی مارکسی_ لینینی بوو یان هەر بەتەنها مارکسی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە کۆمەڵەدا هەمیشە و هەتا ئێستاش بایەخێکی زۆر بۆ ئەزمونەکانی لینین و شۆڕشی ئۆکتۆبر لە روسیە دانراوە و دادەنرێت، بەڵام ئەو کات لە ناو هێزەکانی چەپدا لە ئێران رەوتێك هەبوو کە خۆی بە مارکسی لینینی "م.ل"، پێناسە دەکرد. ئێمە لەبەرئەوەی کە خۆمان لەم رەوتە بە جیاواز دەزانی ئەمانەدەویست لە نووسراوەکانماندا ئەم وشانە بەم شێوەیە بەکاربێنین، جگەلەوە لەئاستی جیهانیشدا کۆمەڵێك رێکخراوی چەپ هەبوون کە لایەنگری "ئالبانی" بوون و خۆیان بەم شێوەیە پێناسە دەکرد. ئێمە نەماندەویست لە رێگەی ناوەکەمانەوە بیردرێینە ناو ئەو ریزەوە. تەبعەن ئێمە نکۆڵیمان لەوە نەدەکرد کە هەم مارکسیستین و هەم بە مانایەك لێنینیستیش.

***باشە خۆ ئەو خەڵکانەی لەگەڵ ئێوەبوون، ئێوە جگە لەوەی کە زادەی واقیعی کۆمەڵگای کوردستانبوون. کوڕوکچانی کوردستانتان لەگەڵ بوون، ئەم هەموو خەڵکەی کەلەگەڵ ئێوە بوون کۆمونیست و مارکسی نەبوون، زۆربەیان ئەسڵەن رەنگە پێناسەی مارکسیزمی نەزانیبێت یا مارکسی نەناسیبێت، چۆن ئێوە ئەو هەموو خەڵکەتان لەژێر ئەو ناوە رێبەری ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە وەڵامی بەرنامەییمان هەبوو بۆ کێشە کۆمەڵایەتیەکانی کوردستان. بۆ کێشەی نەتەوایەتی بەرنامەی خودموختاریمان دارشتبوو. بۆ پاشماوەی دەرەبەگایەتی دروشمی زەوی هی ئەو کەسەیە کە کاری لەسەردەکاتمان بەرز کردبووە، بەرنامەمان هەبوو بۆ یەکسانی ژن و پیاو. هاندەر و بەرێوەبەری موقاوەمەت بووین بەرانبەر بە هێرشی کۆماری ئیسلامی بۆ کوردستان و پاراستنی دەستکەوتەکانی بزووتنەوەی خەڵك. ئەمانە خەڵکی لە دەوری کۆمەڵە کۆکردبۆوە. کاتێکیش باسی کۆمەڵگای سوسیالیستی مان دەکرد بێگۆمان خەڵکی کرێکار و فەقیر و هەژار ئاواتیان بۆ دەخواست بەڵام کەسانیکیش هەبوون کە دەیان گوت بەداخەوە خەیاڵێکی شیرینە و بەدی نایەت. کاری ئێمە ئەوەبوو کە نیشانی بدەین ئەگەر ئەوان بە هێزبن ئەو ئاواتە شیرینە دەتوانێ ببێ بە واقیع.

ئەو خەڵکە شتێکی هاوبەشیان لەگەڵ ئامانجی ئێمە وەکوو مارکسیست و کۆمۆنیست دیوەتەوە کە لێمان کۆدەبنەوە، ئێمە هیچ کات ناسنامەی خۆمان لە خەڵك نەدەشاردەوە. ئێمە هەستمان بەوە دەکرد کە ئەو قسانەی کە ئێمە دەیکەن جوابی پێویستیەکی کۆمەڵایەتییە لە کوردستان. بەڵام ئەو وەڵامە، وەڵامی

ڕێکخراوێکی جیا لە خەڵك نەبوو، بەڵکوو وەڵامی ڕێکخراوێك بوو کە لەناخی کۆمەڵگادا پەروەردەببوو، جەماوەری بوو، لەگەڵ ژیان و لەگەڵ هەڵسووڕان و تێکۆشانی ئەم خەڵکە تێکەڵاو بوو. لە شکستیاندا و لەسەرکەوتنیاندا لەگەڵیان بوو. وەها ڕێکخراوەیەك بوو کەلە وەرچەرخانێکی مێژووی ئەو کۆمەڵگایەدا وەڵامی گونجاوی بە پێویستییەکانی زەمانەی خۆیدابووە. ئەگەر وانەبووایە تەسەوری ئەوە بکە ژن دەچوو لە میحرابی مزگەوتەوە ئەسیحەتی پیاوی دەکرد. ئەمە هەمووی کفرە. ژن بچێتە مزگەوت کفرە، بچێتە میحراب کفرترە، ئەسیحەتی پیاو بکات هەر تەسەور ناکرێت. دواجاریش عوزریان لێ بخوازێت و لە نوێژەکەشیاندا بەشداری نەکات. بەم حاڵەشەوە بۆچی پشتیوانیشیان لێ دەکردین؟ لەبەر ئەوەی کە هەستیان بەوە دەکرد کە شتێکی هاوبەش هەیە لەقسەی ئێمەدا وە لەرەنج و ئازاری ئەواندا.

## کۆمەڵەی هێزی چەکدار پێکدەهێنێت

***دوابەدوای کۆنگرەی یەکەم ئێوە خۆتان ڕێکدەخەن، ئەبنە ڕێکخراوی عەلەنی و خەڵك وەکو سازمان دەتاناسێت و بەشەخصیەتەکانتانە ئەتانناسێتەوە کە ئێوە خەریکی کاری سیاسین، بەناوی سازمانێك، پێم بڵێ چۆن دواتر خۆتان ڕێکخست و خۆتان چەکدارکرد، ڕاگەیاندتان دروستکردو بارەگاکانتان دروستکردو ئەم هەوڵانە چۆن چۆنی بوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: مەسەلەی پێکهێنانی هێزی چەکدار لەبۆچوونی ئێمەدا جێگایەکی کۆنی هەبوو، ئێمە لەو باوەڕەدا بووین کە ڕزگاری لە جەنگ ئیزامی چەوسێنەرانەی سەرمایەداری بە بێ شەڕی درێژخایەنی جەماوەری مۆمکین نییە. پێشتر باسمکرد کە ئەمە جۆرێك دەرس وەرگرتن لە تەجرەبەی شۆڕشی چین بوو. لە دەورەی پێش ڕوخانی ڕژێمی شا هەمیشە بیرمان لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ کەی ئەو هەلومەرجە دەرەخسێت کە ئێمە بتوانین خەباتی چەکداری لەشوێنە ستراتێژیکەکانی ئێران، لە دێهاتەوە دەستپێبکەین. ئێمە دەمانگوت کە پێویستە ڕێکخراوی کرێکاری لەشارەکان پێکبێنین. پێگەی ڕێکخراوەیی حزب لەناو جەماوەردا لەشارەکان بە ئهێنی مەحکەم بکەین. هاوکات ڕوو بکەینە دێهات و لەوێ بە یارمەتی هێزی چەکداری جەماوەر دەرەبەگ و ژاندارم ڕاو بنێین. زەوی لەنێو جوتیاراندا دابەش بکەین. پێگەی کۆمەڵایەتی خۆمان بەرینتر بکەینەوە. هێزی چەکداری جەماوەری پێکبێنین. ناوچەی ئازادکراومان هەبێ و بەرەبەرە بەرەو شارەکان بگەڕێینەوە و بە گەمارۆدانی شارەکان لە دەرەوە و بەرێکخستنی ڕاپەڕینی جەماوەری لەناو شارەکاندا، ڕژێمی دەسەڵاتدار بروخێنین. ئەگەرچی دەزانین کە شۆڕشی گەلانی ئێران دژی ڕژێمی پاشایەتی بەم جیهەتەدا نەچوو و ئێمە خۆمان بۆ جۆرێکی دیکە لە شۆڕش لە ئێران ئامادە کردبوو، بەڵام دەمهەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە پێویستی پێکهێنانی هێزی چەکدار بە لای ئێمەوە هەر لەسەر جێی خۆی مابوو، ئەگەرچی دەمانزانی ستراتێژی ئەو هێزە ئیتر هەر ئەوە نییە کە پێشتر بیرمان لێدەکردەوە.

کاتێك کە ڕژێمی شا ڕووخا، سیلاحێکی زۆر لە هەموو کوردستان بڵاوبووە. پاش ماوەی دەرەبەگەکان خۆیان پڕ چەك کردبوو و شورای چەکداری عەشایریان پێکهێنابوو. دار و دەستەی ئیسلامی سەر بە ڕژێم چەکدار بوون. زەحمەتکێشانی دێهات کە ئیگەرانی گەڕانەوەی دەرەبەگەکان بوون هەوڵیاندەدا چەك بە دەست بێنن. جگە لەمانە ڕژێمی تازە بە دەسەڵات گەیشتووش جێگای هیچ متمانەیەك نەبوو و بۆ هێرش هێنانە سەر کوردستان هەر ئەمرۆ و سبەی دەکرد. لە وەها هەلومەرجێکدا کۆمەڵە هەستی بەوە دەکرد کە تەنانەت بۆ پاراستنی چالاکی سیاسی خۆشیبووە، پێویستە باڵی چەکداری هەبێت.

بوونی کادرەکانی ئێمە لای یەکێتی نیشتمانی کوردستان و کەلك وەرگرتن لە ئەزموونی پێشمەرگانەی ئەوان، پارەمەتیدا بەوەی کەئێمە زووتر دەس بە کار بین بۆ پێکهێنانی هێزی چەکداری کۆمەڵە. دەمهەوێ هەر لێرەش ئەوە روونبکەمەوە کە ریوایەتێکی نادروست هەیە کە دەڵێت هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە لە یەکێتی جوتیارانەوە شکڵی گرت، واتە یەکێتی جوتیاران بوو کە بەردی بناغەی پێشمەرگایەتی و هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەی دامەزراند. ئەوە راستە کە یەکێتی جوتیارانی مەریوان لەژێر رابەری کۆمەڵەدا هێزی چەکداری پێکهێنا و دەستیکرد بە جموله لە نێو دێهاتی ئەو مەنتەقەیەدا. بەڵام ئەوەی کە بوو بە برپرەی پشت و بناغەی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە بنکەیەك بوو کە لە ناوچەی سەردەشت لە شوێنێك بە ناوی گۆزەمەر بۆ پەروەردە کردنی کادری نیزامی دامەزرا. لەو بنکەیەدا کۆمەڵێك کادری نیزامی ئامادە کران کە هەرکامەیان دواجار ناردرانەوە بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان و هێزی چەکداری ناوچەکەی خۆیان رێکخست. هەڵبەت هاوکات لە ناوچەی مەریوانیش بنکەیەکی هەر لەم چەشنە و هەر بەو مەبەستە دامەزرا کە زۆر دەوامی نەکرد.

**کۆمەڵە ژنان چەکدار دەکات**

***کۆمەڵە یەکەم هێزی کوردستانە کە ژنان چەکدار ئەکات، ژنان دێنە ریزەکانیەوە، ئەمە چۆن چۆنی بوو، تاچەند قورسبوو بۆکۆمەڵگای کوردستان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** راستە کە کۆمەڵە یەکەم هێز بوو کە ئەو دەورەی هەبوو، بەڵام بەبروای من درەنگ دەستیپێکرد. نزیکەی سێ ساڵ گوزەرا تائێمە توانیمان ئەو دەستکەوتە بە دەست بێنین. هۆکارەکەشی ئەوە نەبوو کە ئێمە چالاکی و هەڵسوورانی ژنان لەم بوارەدا بەرەسمی نەناسین، بەڵکو بەشی زۆری هەڵدەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەئێستا بەجۆرێك لەپرسیارەکەی ئێوەشدا هەیە کە دەڵێن داخۆ چەندە قورسبوو بۆکۆمەڵە لەکوردستان. ئێمەش لەسەرەتاوە بە نادروست، بە پارێزەوە دەمانروانییە ئەو مەسەلەیە. لامان وابوو رەنگە ئەم کارە بۆ کۆمەڵگای کوردستان هێشتا قورس بێت. هەر بۆیە یەکەم دەستەی هێزی پێشمەرگەی ژنان بە جیاواز چەکدار کران. و لەناوچەی بۆکان بە جیاواز جموڵەیانکرد. ئەو پێشوازیەی کە تەنانەت خەڵکی دێهاتی کوردستان لەم حەرەکەتە کردیان ئێمەی گەیاندە ئەو قەناعەتە کە مۆحافزەکاریەکەمان لەجێگای خۆی نەبووە. پێشوازی لە چەکدار بوونی ژنان وەکوو پێشمەرگە زۆر لەچاوەروانی خۆمان سەروەتر بوو. دوای ئەوەش کە ژنان لە ناو ریزی کۆمەڵەدا چەکدار بوون، هێشتا ئەو نیگەرانیە بوو کە ئاخۆ بە بێ حیجاب لە ناو خەڵکی دێهاتدا چۆن قەزاوەت دەکرێن، جامانە کە بەشێك لە جلوبەرگی پێشمەرگانە بوو تۆزێك وەڵامی ئەم نیگەرانیە بێ جێگەیەی دەداوە. ماوەیەکی زۆری پێنەچوو ئەم کێشەیە بە بێ هیچ گیروگرفتێك چارەسەربوو و ژنانی پێشمەرگەی کۆمەڵە بەسەری بێ جامانەشەوە بوون بەهاورێ و هاوسۆزی کچان و ژنان و پیاوانی کوردستان.

**حەمە سوور بەرپرسی هێزی پێشمەرگە بوو**

***واتا کۆمەڵە یەکەم رێکخراوی کوردستانییە کە ژنی هاندا بێتە ناو ریزەکانیو چەکداریکردن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ بەبروای من یەکەم رێکخراوی کوردستانییە کە لەو ئاستەدا ئەو کارەی کردووە. چونکە پێشتریش ژنی پێشمەرگە بووە بە تاق و تەرا، نەك لەو ئاستەدا کە لەناو ریزەکانی ئێمەدا بوون. کارکردی چەکداربوونی ژنان لەناو ریزەکانی ئێمەدا هەر ئەوە نەبوو کە هێزی چەکداری کۆمەڵەی پێ زیاد

دەبێت، بەڵكو گرنگتر لەوە كەش و هەوایەكی لەباری سیاسی بوو كە بۆ خەباتی یەكسانیخوازانەی ژنان لەكۆمەڵگای كوردستاندا پێكیدەهێنا.

*دواتر لە بەشێكی تردا دێینەوە سەر مەسەلەی ژن و پێشمەرگەی ژن و كۆمەڵە، بەڵام ئێستا باسی دروستبوونی هێزی چەكداری كۆمەڵەمانكرد، یەكەم بەرپرسی ئەو هێزە كێ بوو ئەگەر لە بیرت دێ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: یەكەم بەرپرسی نیزامی هێزی پێشمەرگەی كۆمەڵە حوسێنی موراد بەیگی ناسراو بە حەمە سور بوو.

*ئازاترین پێشمەرگە لەناو هێزی پێشمەرگەی كۆمەڵە كە تۆ بیناسی وە بینیبێتت كێ بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: دەستنیشانكردنی كەسێك زۆر زۆر دژوارە، چونكە بەڕاستی لەم دەورانەدا ئەوەندە ئازایەتی زۆر بوو، ئەوەندە فیداكاری زۆر بوو قەزاوتی ئەوەی كە كێ لە كێ ئازاتر بووزۆر دژوارە!

*بۆ نموونە لەكوردستانی عیراق مامە ریشە نموونەی پێشمەرگەی ئازابوو، لای كۆمەڵە كێ بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لای ئێمە زۆر موشكیلە، چونكە بەدەیان كەس دەناسم كە هەموویان كار لێهاتوو، رێكخەر و جەسوو بوون لەشەڕەكاندا و پێشمەرگەی كۆمەڵە بە دڵنیاییەوە سەری خۆی پێئەسپاردن.

*یەك ناوم ئەتوانی پێ بڵێت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: زۆر موشكیلەیە، چونكە ئەوانە زۆرن.

*هاوڕێ شوان ئەوەنەبوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: خەڵكێكی زۆر هەن كە كاك شوان بە یەكێك لە فەرماندە جەسوور و لێهاتووەكانی كۆمەڵە دەزانن، منیش هەر پێموایە، بەڵام مەگەر خەسرەو رەشیدیان، شۆكێ خەیرئابادی، قادر بەهرامی، حەمەی حاجی و حەمەی رەسوڵی ، حەسەن شەعبانی، رەحیم عەبدینی، شەهلا كلاه فوچی، ئەیوب ئەبەوی و دەیان كەسی دیكە كە زۆربەیان گیانیان بەختكرد و ئێستا ناویان نایێتەوە زەینم، هەر لەو چەشنە نەبوون؟

*خۆت بەشداری قورسترین شەڕت كردبێت، كام شەڕەبوو، چۆن وچكات بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: من یەك، دوو وردەشەڕ نەبووبێ راستەوخۆ بەشداری شەڕی قورسم نەكردووە بەڵام شەڕێك كە لەنزیكەوە لە جەرەیانیدا بووم و لە نەقشە دارشتنەكەیدا بەشدار بووم و لێی نزیكبووم شەڕی ناسراو بە "شەڕی دارساوێن" بوو، تیایدا ستونێكی گەورەی تانكی هێزەكانی رژێم تێكشكا. ئەم ستونە لە بانەوە دەهات بۆ سەردەشت. ئەوە یەكێك لەو شەڕانەبوو كە دەتوانم بڵێم ئارادەیەكی دیاریكراو جمهوری ئیسلامی ناچار كرد بێتە پای وتووێژ. شەڕێكی دیكە بوو هەر لە دارساوێن، بەڵام بچوكتر بوو. لەو شەڕەدا من لەكەمینێكدا بووم، بەڵام تەقەم نەكرد. لە شەڕێكی دیكە من بەشدار بووم كە رێگای پاشەكشەمان بۆ تیمێك تەئمین دەكرد كەچوو بۆوە ناوشارۆچكەی رەبەت.

*ئەی ئازاترین ژنە پێشمەرگە كێ بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لە ناو ژنانی پێشمەرگەشدا كەسی كار لێهاتوو لە شەڕدا زۆر بوون، دیاریكردنیان كارێكی ئاسان نییە.

**كۆمەڵە شەهیدی زۆری داوە**

***تۆ سەرنج بدە ئەم پرسیارەی من، ئەم ناوانەت پێدەڵێم (خەلیلی زارعی، تاهیرەی ئاماجی( مریم)، ناسری عەلەوی، مەحمودی ئیبراهیم زادە، ئاوێنەی زەمانی (چیمەن)، سیروس ئەفراسیاپور، ئیبراهیمی کەمانگەر، ئازیتای شەریفی، شۆکێ، گەلاوێژسەردەشتی) ئەزانی ئەمانە کێن و لەپێناوی چیدا شەهیدبوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوانە هەموویان کادری رێبازێکی کۆمۆنیستی بوون. ئەوانە هاتبوونە ناو ریزی پێشمەرگەی کۆمەڵە بۆ ئەوەی هێزی داگیرکەری دوژمن لە کوردستان رابماڵن. ئەوانە لە پێناوی ئەو ئامانجانەدا کە کۆمەڵە بۆی دیاری کردبوون گیانبازییان دەکرد.

***شەهید لای تۆ چی دەگەیەنێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مرۆڤێکی خۆنەویست کەلەپێناوی بەرژەوەندی جەماوەردا بەرژەوەندی شەخسی خۆی فیدا ئەکات.

***تا چەند وەفاداریت بەرامبەر بە رێبازو ئامانجیان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەوڵدەدەم تا بمێنم وەفاداربم.

***تا چەند بەهاوسەرو خێزان و ماڵ و منداڵ و هاورێیانیان لەئێستاو لەداهاتوودا وەفاداریت وە چییان بۆ ئەکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر بەداخەوە ئێمە زۆر کەممان بۆ کردوون، نەك لەبەرئەوە نەمانویستبێت، بەڵکو لەبەرئەوەی کەمنەمانتوانیووە. بنەماڵەکانیان هەموویان جێگەی رێزن، ئەوەی کە ئێستا لەلایەن ئێمەوە پێویستە بۆیانبکرێ زۆرتر دەتوانێ مەعنەوی بێ هەتا ماددی. کاتێك ئەوان هەستبکەن بەوەی کە رێبازی ئەو خۆشەویستانە یان بەردەوامە ئەوە زۆر گرنگە و ئارامشیان پێدەدا، نمونەیەکت بۆ بێنمەوە کە خۆم بیستوومە، چەندە بنەماڵەی چەند شەهیدێکی ئازاردراوە. لەسەر گڵکۆی ژمارەیەك لەشەهیدەکانی کۆمەڵە لەشاری سلێمانی لەپاڵ ناوەکەیان وشەی کۆمۆنیستی تێکۆشەر نوسرابوو، کەسانێك کە نازانم کێ بوون، چوو بوون وشەی کۆمۆنیستەکەیان خەت لێدا بوو. ئەم کارە بنەماڵەکانیانی ئازار دابوو، چونکە ئەوان دەزانن کەئەمانە لەسەر شانییەکانیان دروشمی بژی سۆسیالیزم یان نوسیبوو. گەورەترین دڵنەوایی لەبنەماڵەکانیان ئەوەیە کە بۆ رابردووی رۆڵەکانیان رێز دابنێین و بە ئامانجەکانیان وەفادار بین.

***تا ئێستا چیتانکردووە بۆ ئەو شەهیدانەتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر وتم بە داخەوە کارێکی زۆرمان نەکردووە. بە تایبەت نەمانتوانیوە ئەو جۆرەی کە پێویستە کەموکورتییەکانیان لەباری ماددییەوە چارسەر بکەین. هەروەها بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی وڵات لێپرسینەوەشیان کەمبووە. ئەوە بۆشاییەکە لەکاری ئێمەدا کەپێویستە پڕ بکرێتەوە.

***چەندیان ئەدەنێ، ئێوە ئێستا یارمەتی مانگانەتان هەیە بۆیان، چۆن چۆنیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە یارمەتی مانگانەمان بۆ بنەماڵەی گیانبەخت کردوومان نی یە، بەڵام ئەگەر هەستبکەین کە بنەماڵەیەك بەرێ چوون و ژیانیان بە هۆی ئەو کەسیانەوە بووە کە بووە و ئێستا هەژارن، بە پێی مەورید، جاروبار یارمەتی دەدرێن. بەردەوام لە نووسراوە و بڵاوکراوەکانمانەوە یادی گیانبەخت کردوومان دەکەین.

**پێشمەرگەی کوردستانی عیراقیشمان وەردەگرت**

*ئێوه پێشمەرگەی کوردستانی عیراقیشتان لەگەڵ بووه ئەو کاتە، خەڵکی پێشمەرگەتان وەردەگرت کە لەکوردستانی عیراقەوه هاتبوو، پێم بڵێ بەکەم ئەوانە چۆن چۆنی بوو وەرتان ئەگرتن، دوایی ئەم پرۆسەیەتان راگرت خەڵکی کوردستانی عیراقتان راگرت و ئەو شەهیدانەی کە هەتانە لەناو کوردستانی عیراق بە کەمتر باستان نەکرد لەڕاگەیاندنەکانی ئێوەوه، ئایا ئەو هاوکارییە جوزئیەی کە هەیە ئەوانیش ئەگرێتەوه؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ هەر بەم پێیە ئەوانیش دەگرێتەوه. بەڵام چۆن هەر بۆ خەڵکی دیکە کەمەو مەحدوده بۆ ئەوانیش کەم بووه. لەسەرەتاوه کەم تا زۆر وەردەگیران، بەڵام لەو کاتەوه کە ئێمە هەستمان بەوه کرد کە رژێمی عیراق زۆر حەساسیەت بەو مەسەلەیە نیشاندەدات وجۆرێك لە هەڕەشەش لەم بابەتەوه لەلایەن رژێمی عێراقەوه لەسەرمان بوو، هەوڵماندا ئەو ژمارەیە لە پێشمەرگەکانی کوردستانی عیراق لە نێو ئێمەدا بوون بە جۆرێك لەناوچەکە دەربازیان بکەین. لە ساڵەکانی (١٩٨٨ و ١٩٨٩) توانیمان ژمارەیەکیان ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکەین.

کۆمەڵە (٢٣٠٠) شەهیدی هەیە (١٠٠)یان ژنن

*ژمارەی شەهیدەکانتان چەندە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لام وایە زیاتر لە(٢٣٠٠)کەسن کە هەموویان هێشتا تۆمار نەکراون.

*ناتوانیت پێم بڵێت چەندیان پیاوه و چەندیان ژن بووه؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ژمارەی ژنانی گیانبەختکردوو کەناویان لەناو ئالبۆمی شەهیدەکاندا سەبتکراوه زیاتر لە ١٠٠ کەسە.

*چەندیان عیراقی بووه؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ژمارەی عیراقیەکان ئیشارەتم پێدا کەمترلە (١٠)کەس بوون.

*بەشێکی ئەو پێشمەرگانەی ئێوه کە شەهیدبوو گیانیان لە دەستدا لە شەڕەکانی ناوخۆبوو لە شەڕی ئێوەو حزبی دیموکرات بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ، بەداخەوه بەشێکی وابوو.

*یەك پرسیارم ماوه لەسەرئەو مەسەلەیە هیوادارم ئیحراج نەبێت، کە بەڵگەی راستیمان لەبەر دەستدایە، لەداهاتوودا مەبەستمە وەکوکوردستانی عیراق مەسئولەکان ژنەکانیان مارە ناکەنەوه هی شەهیدەکان وه تەعدایان لێناکرێت، منالەکانیان بێ سەرپەنا نامێننەوه؟

ئیبراهیم عەلیزادە: پێموایە ئەو پرسیارە بۆ ئێمە زۆر غەریبە. زۆر نامۆیە بۆ ناو ریزەکانی ئێمە. تەنانەت تەسەور کردنیشی ئازارمان دەدات. ئەگەر رۆژێك لەڕۆژان وامان لێبێت، زۆر رەنج بە خەساربووین.

***دێینە سەر کۆنگرەی دووهەمی کۆمەڵە کە لە بەهار یان مانگی (٣) ساڵی (١٩٨١) لەخانەقای زەمبیل لە نێوان بۆکان و سەقز ئەبەسترێت، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە لەمزگەوتێکدا ئەبەسترێت، یەکەم پرسیارم ئەوەیە نێوانی کۆنگرەی یەکەم و دووهەم چۆن بوو، وە ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لەو نێوانەدا هات چیبوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە کۆنگرەی ئێمە لە مزگەوتێکدا بەڕێوە چووە، شتێکی ئاساییە. مزگەوت لە هەموو دێهاتی کوردستان تەنیا شوێنێکی جێدارە کە دەکرێ ژمارەیەك زۆری خەڵك تێداکۆببێتەوە. ئێوە دەبینن کە دێهاتەکانمان هەموو وێرانەن، بەڵام هەموویان مزگەوتی ئاوەدان وگەورە و جێداریان تێدا دروستکراوە. دەسەلاتداران ئەو پارەیان خەرجکردووە و بە رەنجی شانی خەڵك ئەو مزگەوتانەیان دروستکردووە، با کارێکی باشی لەو جەشنەشی تێدا بکرێت.

لەنێوان کۆنگرەی یەك و دوودا ئاڵوگۆڕی گەورە روویدا. یەکیان ئەوەبوو رژێمی شا رووخا، دووهەمیان ئەوەبوو کە ئێمە لەنێوان کۆنگرەی یەك و دوودا لە رێکخراوێکی چکۆڵەوە بووین بە رێکخراوێکی جەماوەری گەورە. با هەر لێرە بیرەوەریەکتان بۆ بگێرمەوە. کۆبوونەوەی یەکەمی کۆنگرەی یەك لەشاری نەغەدە بوو. ئەو کات هێشتا کوردستان لەچاو باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران ئارام بوو. ئێمە نیگەران بووین کە مەبادا لەم رەوتەدا کە دەستیپێکردووە کوردستان دوابکەوێ. لە کاتی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەدا خەبەرمان پێگەیشت کە توتن کارانی ناوچەی بانە بریاریان داوە ئەمساڵ توتنەکەیان نەدەن بە دەوڵەت. لە بیرمە کاك فوئاد وتی: " بەبڕوای من ئەو کارەی ئەوان دەستیانپێکردوە ئێستا بۆ داهاتووی کوردستان لەدرێژەدانی کۆنگرە گرنگترە، پێشنیاردەکەم کە کۆنگرە چەند رۆژێك دوا بخەین و بچین ئەو حەرەکەتە بە سەرکەوتن بگەیەنین". زۆرمان ئەو پێشنیارەمان پێ سەیر بوو. بەڵام ئەو پێی لەسەرداگرت و هەموومانی بە قەناعەت گەیاندودواجار روونبووە کە جیهەتەکەی ئەو دروستبووە. دوو حەوتوو دواتر کۆبوونەوەکانمان لە شاری سنە درێژە پێدا. ئەو بیرەوەرییە نمونەیەکی بچووك بوو، ئێمە خۆمان بە شۆڕشگێڕ دەزانی لە هەر کوێ شۆڕشی لێبوایە وزیفەی خۆمان دادەنا کە بەشداری تیادابکەین وە بەراستی یەعنی تایبەتمەندیەکیش کەلەکۆمەڵەدا هەبوو هەمیشە ئەوەبوو کە ئەزمەریە و تێئۆری بە ئەندازەی هەستی شۆڕشگێڕانە و پێویستی تێکەڵاوی لەگەڵ ژیانو خەباتی جەماوەری دەوری نەبینیوە، دەنا ئەگەر تێئورییەکانی ئەو دەورەیەمان کە باسی لێدەکەین زۆری دەور بینیبایە، ئێمەی بەرەو جێگایەکی دیکە دەبرد.

لەنێوان کۆنگرەی یەكو دوودا، ئێمە خۆمان گرتەوە، یەعنی توانیمان لەو جموجۆڵە جەماوەریە لەکوردستانی ئێران بەشداری بکەین.

هەروەها ئاڵوگۆڕێکی دیکە کە هەر لە نێوان ئەم دوو کۆنگرەیەدا بەسەر کۆمەڵە هاتبوو دەستپێکردنی موقاوەمەتو خەباتی چەکداری بوو بەرانبەر بە هێرشی رژێم بۆ سەر کوردستان، بۆ ئەوەی بتوانین بچینە ناو وردەکارییەکانی کۆنگرەی دووهەم پێویستە باسی ئەو بۆچوونانەبکەین کەلەجەرەیانی تەداروکی کۆنگرەدا لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا سەریهەڵدا بوو، تەنانەت دەتوانم بڵێم کۆمەڵەی نزیك کردبووە لە دوو پارچە بوونێك. باسەکان لەژێر ناوی "دیدگای یەك" و "دیدگای دوو" کۆ ببوونەوە.

بە کورتی دیدگای یەك لەسەر ئەو باوەرە بوو کەکۆمەڵگای ئێران هێشتا بە تەواوی قۆناعی فیئۆدالی تێپەرنەکردووە و پاشماوەی فیئۆدالیزم دەوری گرنگ دەبینێ لەدارشتنی ستراتیژی شۆڕشی دوارۆژ لە ئێران، بەو پێیە دەورێکی گرنگتریان بۆ خەباتی جوتیاران و هەڵسانەوەی شۆڕش لە دێهات دادەنا. دیدگای دوو لای وابوو کۆمەڵگای ئێران کۆمەڵگایەکی سەرمایەدارییە و بەو پێیە چینی کرێکار و شارەکان دەوری سەرەکییان هەیە لە

دیاریکردنی ڕێگای سەرکەوتنی شۆڕشی داهاتووی ئێران. ئەم باسانە هەموو تەشکیلاتی کۆمەڵەی هەر لە شیمالەوە هەتا جنوبی کوردستان و هەروەها تەشکیلاتی کۆمەڵە لەشارەکانی تەورێز و تاران‌و شوێنەکانی دیکە داگرتبوو، لەکۆنگرەی دوودا ئەم کێشەیە چارەسەرکرا، هاورێیانی خاوەنی "دیدگای یەك" دەنگیان بە بڕیارنامەکان و پێشنیارەکانی "دیدگای دوو" دا و بەم جۆرە کۆمەڵە لە مەترسی دوو لەتبوون رزگاربوو.

**هەر زوو کۆمەڵە خەریکبوو ئینشیقاقی تێبکەوێت**

***کێ بوون خەتی یەکەم و دووهەم، ناوەکانت لەبیرە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ناوەکانم لە بیرە، بەڵام وام پێ باشترە کە خۆتان بچنە سەر نەواری قسەو باسەکانی ئەو کۆنگرەیە کەلەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت بڵاوکراوەتەوە و لەوێ دەریانبهێنن.

*** سەعید یەزدیان، ساعید، ئیرەج فەرزاد ئەو سێ کەسە بوون ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ وایە.

***ئەوە راستە کە کەسە دیارەکانی ئەم خەتە عەبدوڵڵای موهتەدی، حوسێن مورادبەیگی و ئیبراهیم عەلیزادە بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ئەمانەش بوون و کەسی دیکەش بوون.

***ستراتیژی خەتی دوو چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ستراتیژی ئەو خەتە لەباری ڕێکخراوەیی هەوڵدانی زۆرتربوو بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و لەڕووی خەباتی جەماوەریشەوە دەورێکی چارەنووسسازی بۆ خەباتی کرێکاری لە ئێران دەدیت.

***ناسینەوەی کۆمەڵە وەکو ڕێکخراوێکی مارکسیست؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هەردوو دیدگا کۆمەڵەیان وەکو ڕێکخراوێکی مارکسیست دەویست، دیدگای دوو تەئکیدی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە پێداچوونەوەیەکی ئەساسی بکرێت بە بۆچوونەکانی پێشووی ناو کۆمەڵە و پاشماوەکانی فکر و کار و کردەوەی مائۆئیستی و پۆپۆلیستی لەناوخۆماندا پاك بکەینەوە. هەروەها لەیەکێك لەبڕیارنامەکانی کۆنگرەدا سنووری خۆمان لەگەڵ ڕەوشەکانی ستالین لەئیتحادی شوروی دیاریکردبوو.

***ئەو کاتە کۆمەڵە لەکۆنگرەی دووەمدا کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتێکشانی کوردستانی ئێران ناوەکەی ساغبۆوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر باسمکرد کە پێشنیاری گۆڕینی ناو هاتە گۆڕێ ، بەڵام پەسەندنەکرا، لەبەرئەوەی کە پێمانوابوو ئەو ناوە کاتییە و ئێمە بەزوویی دەبێ خۆمان لەچوارچێوەیەکی گەورەتری وەکو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا ببینینەوە و دەبێ بۆئەوە هەوڵبدەین.

***ئەم ناوە هەمووتان لەسەری ڕێکەوتبوون یا پێشتر کەسێك تەرحیکردبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە بیرۆکەی سەرەتایی ناوی کۆمەڵە لەحاشیەی کۆنگرەی یەکدا هاتبووە گۆڕێ. دواجار ئەو ناوە لە کۆبوونەوەیەکدا لەشاری بۆکان لە بیست و حەوتی ڕێبەندانی (١٣٥٧)ی هەتاوی دا تەسبیت بوو، بەشداربوونی ئەم کۆبوونەوەیە کێ بوون بەدەقیقی لە بیرم نەماوە، بەڵام پێموایە کاك فوئاد، ساعد وەتەندۆست، ئیرجی فەرزاد و دوکتۆر جەعفەر تێیدا بەشداربوون، دەبێ عەبدوڵڵا موهتەدیش لەوێ بووبێ.

***لەناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، هەستناکەیت ئێوە ویستوتانە تاکتیکێك بکەن،**

**یەعنی هەم گەرایشێك و مەیلێکی چەپی تێدایە و هەم گەرایشێك و مەیلێکی نەتەوەیی و قەومی تێدایەو ویستوتانە ئێوە هەردوو چەقلەکە بگرن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من لام وایە کورتکراوەی ناوی "کۆمەڵە" کە دواجار وردە وردە جێگای ناوە دوورودرێژەکەی گرتەوە مەبەستێکی تایبەتی تێدا نەبووە و هەر مەبەست ناوێکی کورت بووە کە رەسم وابوو لەجێگای ناوی درێژ بەکاربهێنرێت. یەکەم راگەیاندن کەرێکخراوی ئێمەی ئاشکراکردووە بەزمانی فارسییە کەنووسراوە "سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران". دواجار ئەو ناوە تەرجومەکەی دەبێتە "کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران". کەناوی کۆمەڵە وەکوو کورتکراوە بۆهەردوو ناوەکە گونجاو دەبینرێ و دیاریدەکرێ. لەوانەیە کەسێك لەدەرەوەی ئێمە ئەم ناوە بۆی وەبیر هێنەرەوەی "کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد" بوو بێت یەکێك لەوانە ماموستا شێخ عێزەدین حوسێنی بوو، بەڵام لە ناو ئێمەدا کەس نەبوو کە بیهەوێت بە هیچ شێوەیەك پێشینەی کۆمەڵەی ئێمە بەرێتەوە سەر ئەو رابردوویە نە لەناودا و نە لە ناوەرۆکدا.

**کۆمەڵەو دیموکرات لەململانێدا بوون**

***ئەو کاتە کە کۆنگرەی دووهەم ئەبەستن کۆمەڵە حزبی یەکەمە یا بۆتە حزبی دووهەم لە کوردستانی ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من دیاریکردنی حزبی یەکەم و دووهەم موشکیلە، چونکە بە پێی وەزعە واقیعییەکە لام وایە لە جنوبی کوردستان ئێمە حزبی یەکەم بووین و لە شمالی کوردستان حزبی دووەم بووین. ئەو کاتە لە سەقز بۆ خوارەوە ئێمە لەهەموو جێگایەك حزبی یەکەم بوین وە لەسەقز بۆ سەرو حزبی دووەم بوین و دیموکرات یەکەم بوو.

***بۆکۆمیتەی ناوەندی کێ هەڵبژێردرا لەو کۆنگرەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** عەبدوڵڵا موهتەدی، حوسێن موراد بەیگی، موحسین رەحیمی، حەسەن قادری، جەواد مشکی، شوعەیبی زەکریایی، عومەر ئیلخانی زادە، سەعید یەزدیان، مەحمەد شافعی، ساعد وەتەندۆست و ئیبراهیم عەلیزادە

**عەبدوڵڵای موهتەدی دەبێتە سکرتێری کۆمەڵە**

***ئەو کاتە کێ بەسکرتێری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردرا لەکۆنگرەی دووەم؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: عەبدوڵڵای موهتەدی.

***لەکۆنگرەی دووەم ئێوە کەوتونەتە نێوان دوو جەریانی گەورە، یەکەم شەڕی عێراق_ ئێران، خەریکە دەست پێئەکات یا دەستیپێکردووە، شەڕی ئێوەو حزبی دیموکراتیش لە ئارادایە، ئەم جەرەیانە گەورەیە چ کاریگەری هەبوو لەسەر کۆمەڵە وە لەناو کۆنگرەدا چۆن باسکرا؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: کاتێك کۆنگرەی ٢ی کۆمەڵە بەرێوە چوو هێشتا شەڕی ئێران و عێراق نەگەیشتبووە سنوورەکانی کوردستان، بەڵام سەرەڕای ئەوە لە سەرجەم ئێراندا بەکوردستانیشەوە کەش و هەوای شەڕ زاڵ بوو. چەند سەرەتایەك لە هەڵوێستی ئێمەدا بەرامبەر بەم شەڕە ڕوون بوو، یەکەم ئەوەی کە مۆقاوەمەتی خەڵکی کورد بەرامبەر بە هێرشی کۆماری ئیسلامی مۆقاوەمەتێکی عادڵانەیە و پەیوەندی بەو شەڕەوە نییە، بەرپا بوونی ئەو شەڕە ناتوانێ کاریگەری لە سەر بڕیاری ئێمە بۆ مۆقاوەمەت هەبێ. دووهەم، ئەو شەڕە لە هەردوولاوە

کۆنەپەرستانەیە و ئێمە پێویستە مۆقاوەمەتی خۆمان بەرامبەر بە کۆماری ئیسلامی درێژە پێ بدەین و خۆمان لە بەرەکانی شەڕی ئێران و عێراق بپارێزین. هەڵبەت بۆچوونێکیش هەبوو کە دەیگوت با ئێمە هاوکات دژی هەردوو لایەنی شەڕەکە بجەنگین، کە زۆر برەوی نەبوو. دیارە شەڕی ٨ی ساڵەی ئێران و عێراق لە درێژەی خۆیدا کاریگەری زۆری هەبوو لە سەر هەلومەرجی خەباتی چەکداری و سیاسی ئێمە کە لە جێگەی خۆیدا پێویستە لە سەری بچین. ئەو شەڕە ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی ڕژێمی ئێران بە خێراییەکی زۆرترەوە بتوانێ شوێنە ئازادەکانی کوردستان داگیر بکاتەوە. بە نیسبەت حزبی دیموکراتیش لەو دەورەیەدا ە کۆنگرەی (٢)ی کۆمەڵە بەرێوە چوو، جار و بار لێرە و لەوێ لە نێوان هێزەکانی ئێمە و حزبی دیموکراتدا تێکهەڵچوون روویدەدا، بەڵام شەڕی بەرین و سەرتاسەری حزبی دیموکرات و کۆمەڵە چەند ساڵ دوواتر هەڵگیرسا.

**دیموکرات وەکو بۆرژواز ناسرا**

*** هەڵوێست بەرانبەر بە دیموکرات لە کۆنگرەی (٢)دا چۆن بوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: لەم کۆنگرەیەدا بۆ یەکەمجار بڕیارنامەیەکی ناوخۆیی پەسەند کرا کە تێیدا حزبی دیموکرات وەکوو حزبێکی بورژوایی پێناسە کرابوو، بەڵام بڕیار درا جارێ ئەو بڕیارنامەیە بە ئاشکرا بڵاو نەکرێتەوە.

***یەکەم بەیاننامەی ئێوە، حزبی دیموکرات وەکو حزبێکی ناسیۆنالیستی وردە بۆرژوا ناوئەبەن کە بەیاننامەکەی بڵاوناکرێتەوە لەکۆنگرەی دووهەم؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: وردە بۆژوا نا، بورژوا.

**دیموکرات قەتلوعامی پەیکار دەکات**

***بۆبڵاوتان نەکردەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** قەرار نەبوو دوای ئەو بڕیارنامەیە سیاسەتی ئێمە بەرانبەر بە حزبی دیموکرات هیچ ئاڵوگۆرێکی بە سەردابێت، هەلومەرجە کەحەساس بوو، ئێمە بە لای خۆمانەوە وەکوو هەڵسەنگاندنێکی سیاسی چاومان لێدەکرد، بەڵام نەماندەزانی کاردانەوەی لای ڕێبەرایەتی و ریزەکانی حزبی دیموکرات چۆن دەبێ. حزبی دیموکرات بە تەبلیغاتی سیاسی دژ بە خۆی حەساس بوو. لە نموونەی ڕێکخراوی "پەیکار" دا لە شاری بۆکان دیتمان کە چۆن دوای ئەوەی کە ئەو ڕێکخراوە، چەپە ئێرانیە چەند بەیانێکی دژ بە حزبی دیموکرات بڵاوکردەوە، چوونە سەر مەقەڕەکەیان و چەند کەسیان لێ شەهید کردن. بۆیە وەکوو پرنسیب ئەو بەڵگەنامەیەمان پەسەندکرد، بەڵام بڕیارماندا تەبلیغی پێوە نەکەین و وەکوو سەنەدێکی ناوخۆیی کۆمیتەی ناوەندی رایبگرین.

***ئەوە سەرەتای ململانێی چەکداری لەنێوان کۆمەڵەو حزبی دیموکرات یا مێژوویەکی پێشینەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەر لەسەرەتاوە لە نێوان حزبی دیموکرات و کۆمەڵە دا کێشە هەبوو، بەڵام تا کاتێك کە شارەکان ئازاد بوون، ناکۆکییەکان وەڵامی سیاسییان پێدەدراوە و کار نەگەیشتە تێکهەڵچوونی چەکدارانە. ڕاستە کە ئێمە حزبی دیموکراتمان بە حزبێکی بورژوایی پێناسەکردووە، بەڵام لە بۆچوونی خۆماندا پێمانوانەبوو کە کوردستان ئەو مەیدانەیە کە دەبێ تەکلیفی کێشەی چینایەتی بورژوا و کارگەر بە خەباتی چەکداری یەك لایی بێتەوە. ئەولەویەت لە خەباتی چەکداریدا بۆ ئێمە هەڵچنین و ڕامالینی هێزی داگیرکەری کۆماری ئیسلامی لە کوردستان بوو. ئێمە سەرەرای ئەو لێکدانەوەمان لەسەر حزبی دیموکرات ئامادە بووین لە کوردستان لەدژی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی هاوکاریمان هەبێت لەگەڵیان.

***لە کۆنگرەی دوودا ئیشوکار دابەشکرا، یەعنی کۆمەڵە چووە قۆناغێکی گەورەترو بوو بەهێزێکی جەماوەری ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای کۆنگرەی دوو.

***بەڵێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێش کۆنگرەی دوو کۆمەڵە ببوو بە هێزێکی گەورەی جەماوەری. بەڵام دوای کۆنگرەی دوو، هێرشی ئیزامی جمهوری ئیسلامی بۆ سەر کوردستان زۆر پەرەی سەند و کۆمەڵە ئارایشێکی جەنگی تری بە خۆی گرت. هەروەها بە پێی یەکێك لە بریارنامەکانی کۆنگرە ئەبوایە چالاکی سەرانسەری ئێمە لەئاستی ئێراندا بەرەو یەکگرتن لەگەڵ بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئێران بێ و هەوڵی جیدی بدرێت بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران.

***من ئەمەوێت یەك تۆز بتگەرێنمەوە بۆ کە لەساڵی (١٩٧٩) رژێمی شا ئەروخێ و کۆمەڵە و دیموکراتیش وەکو دوو هێزی جەماوەری لە کوردستانی ئێران دەرئەکەون دوای ئەو بۆشایەی دەسەڵات کە دروست ئەبێت، پاش کشانەوە هێزەکان پشێوی دروست ئەبێت کۆمەڵە و دیموکرات چۆنچۆنی ئەو دەسەڵاتەیان دروستکرد کە ناو دەبرێت کە دەسەڵات بەدەست کۆمەڵەو دیموکراتەوە بووە، ئەم دەسەڵاتە چۆن چۆنی بوو تاکەی درێژەی کێشاوە چۆنچۆنی کوردستانتان دابەشکردبوو وە چۆنچۆنی ئیدارەکانتان بەرێوەئەبرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەرلەوکاتەوە کەرژێمی شا بەرەو رووخان دەچوو و دەسەڵاتی بەسەر شارەکانی کوردستاندا لەدەستدا ئێمە و هێزە چەپەکانی دیکەی هەڵسوراو لەکوردستان دروشمی پێکهێنانی شورای شارەکانمان بەرز کردەوە. ئەم دروشمە لەلایەن خەڵکی راپەریوەوە پێشوازی لێکرا و دوای رووخانی رژێمی شا لەزۆربەی شارودێهاتەکانی کوردستان، بەرێوەبردنی ئیدارەی وڵات کەوتە دەست ئەم شورایانەوە.

هەڵبەت ئەوە بڵێم کە شوراکان هەموویان لە هەڵبژاردنێکی گشتیدا لە هەر شارێك دیاری نەکرابوون. تەنیا ئیستسنایەك کە هەیە شاری سنە بوو، کە لەوێ شورا بە هەڵبژاردن دیاریکرا. لەشارەکانی دیکە ئەو کەسایەتیە ناسراوانەی کە لە جەرەیانی راپەریندا هاتبوونە روو و خەڵك متمانەی پێدەکردن بە کردەوە بوون بە شورا و خەڵکیش تەئیدی دەکردن.

لە ناو شوراکاندا لە هەموو شارەکان جگە لە شاری سنە (٣) جەرەیانی کەمو زۆر جیاواز هەبوون. جەرەیانی حزبی دیموکرات، جەرەیانی کۆمەڵە و جەرەیانی رێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران. هەڵبەت کەسانی بێ لایەنیش بوون. لەشاری سنە جەرەیانی ئیسلامی سەر بە مۆفتی زادەش لە شورادا دەوریان هەبوو. وردە وردە ناکۆکی لە ناو شوراکاندا سەریهەڵدا و بە تایبەت حزبی دیموکراتی کوردستان لەو شوێنانەی کە دەسەڵاتدارتر بوو زۆرتر مەیلی بەرەو دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆی دەکشا و عەلاقەیەکی بە درێژە پەیداکردنی کاری شوراکان نەبوو.

دوای تێکشکانی یەکەم هێرشی رژێم بۆ سەر کوردستان کە بە دەورەی یەکەمی "بزووتنەوەی موقاوەمەتی خەڵکی کورد" دەناسرێتەوە، رژێم ئامادەبوو لەگەڵ نوێنەرانی خەڵکی کوردستان وتووێژ بکات. لەو کاتەدا دوای مشتومرێکی سیاسی چڕ وپڕ لەنێوان حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و دەفتەری مامۆستا شێخ عێزەدین و رێکخراوی چریکە فیداییەکان، "هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد" پێکهات. زۆر زوو کاری ئەم هەیئەتە لەچوارچێوەی وتووێژ لەگەڵ رژێم تێپەربوو بەکردەوە بوو بەناوەندێك بۆ بەرێوەبردنی کوردستان. ئەوە کاتێکە کەمێتر بەرەبەرە شوراکانیش کاڵدەبنەوە.

دەسەڵات بەدەست کۆمەڵەو دیموکراتەوە بوو

***یەعنی مەبەستم ئەوەیە دام ودەزگاکان بەدەست کێوە بوو ئەوکاتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای رووخانی رژێمی شا بێجگە لە ساواك و دام و دەزگای نیزامی ژاندارمەری باقی ئیدارە دەوڵەتییەکان هەروەك خۆیان مابوونەوە. ئەو کەسانەی کە بەدنێو نەبوون و هاوکاری دەزگای ساواکی شایان نەکردبوو لە جێی خۆیان مانەوە. لە ناو دەزگا دەوڵەتییەکاندا بە دەرەجەی یەکەم لایەنگرانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە هەر لەشیمالەوە تا جنوب حزوریان بوو. ئەتوانم بڵێم کەتەسلسەی دەسەڵات بەگردەوەو بە پێی هاوسەنگی هێز لەهەر ناوچەیەك لەنێوان دوو رەوتی کۆمەڵەو دیموکراتدا دابەش ببوون.

***تەقریبەن کوردستانی ئێران دابەشکرابوو وەکو چۆن لەدوای کێشانەوەی هێزەکانی بەعس لە کوردستانی باشور رووبدا هەر ناوچەیەك کەوتبووە دەست هێزی سیاسی، شتێکی واهەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەکوردستانی ئێران دابەشبوونەکە بەم شێوەیە نەبوو، هەم حزبی دیموکرات و هەم کۆمەڵە لەهەموو کوردستان بەیەکەوە لەبەرێوەبردنی وڵاتدا دەوریان هەبوو. بەڵام لەناوچەکانی جنوبی کوردستان نفوزی کۆمەڵە لەناو دەزگاکانی دەسەڵاتو ئیداریدا زیاتربوو و لە شمال و ناوەندی کوردستانیش نفوزی حزبی دیموکرات.

***هەیئەتی نوێنەران کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم هەیئەتە لەنوێنەرانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین و رێکخراوی چریکە فیدائییەکانی خەڵکی ئێران، پێکهاتبوو. رەئیسی هەیئەتەکە مامۆستا شێخ عیزەدین بوو، وتەبێژی هەیئەت دوکتۆر قاسملۆ بوو. ئەندامانی کۆمەڵەش لەم هەیئەتەدا بریتی بوون لە: دوکتۆر جەعفەری شەفیعی، یوسف ئەردەڵان، عەبدوڵڵا مۆهتەدی و ئیبراهیم عەلیزادە.

دیموکرات پڕوپاگەندەی دەکرد کەشێخ عیزەدین کۆمەڵەیە

***مامۆستا شێخ عیزەدین حسێنی، وەکو لەهەموو میدیاکانە لەسەر ئێوە حساب بوو، بۆچی پیاوێکی دینی لەسەر کۆمەڵە حساب بێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مامۆستا شێخ عیزەدین لەسەر کۆمەڵە حیساب نەبوو، ئەوە زۆرتر تەبلیغاتی حزبی دیموکرات بوو وای دەنواند. راستە کەمامۆستا پیاوێکی ئاینی بوو، بەڵام بە سەراحەتەوە داوای جیایی دین لە دەوڵەتی دەکرد، هەڵوێستی بەرانبەر بە جمهوری ئیسلامی لێبڕاو بوو و هەوڵیدەدا لە هێزە سیاسییەکانی چەپی ئێرانی و لە کۆمەڵەش نزیکایەتی بکات. ئەو کەسایەتیەکی سەربەخۆ بوو کە لە گفتوگۆکانی ناو هەیئەتی نوێنەرایەتیدا هەڵوێستەکانی لە هەڵوێستی ئێمە نزیکتر بوو. هۆکاری ئەو تەبلیغاتە پاوانخوازی حزبی دیموکرات بوو کەئەو حزبەی هاندەدا دەوری لایەنەکانی دیکە کەم کاتەوە.

شەڕو ململانێکانی کۆمەڵە – دیموکرات

***بە درێژایی چەندین ساڵی رابردوو، حزبی دیموکراتو کۆمەڵە وەکو دوو هێزی ئەساسی لە کوردستان مانەوە، وە تا ئێستا هیچ هێزێکی تر نەیتوانیوە بێتە موناڤسیان یا هێزی سێهەم، بە بۆچوونی ئێوە هۆکارە ئەسڵیەکان چیبوون، ئەم ململانێیە هاتەکایەوە وە تا چەند توانیوتانە ئەو هۆکارانە کە بوونەتە فاکتەری ململانێی نێوان حزبی دیموکرات و کۆمەڵە چارەسەر بکەن وە چەند بە هیوان کە لەداهاتوودا ئەو کێشە و ململانێی نێوانتان**

**نەمێنێ، یان تەوقوع ناکەن بەرەو قوڵبوونەوە بچێ یان هەوڵتانداوە ئەو کێشانە نەمێنێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ململانێی سیاسی نێوان دوو حزب بە ڕێباز و ئیدئۆلۆژی و ستراتیژ و سیاسەتی جیاوازەوە شتێکی گەلێك ئاساییە. هەر لەسەرەتاوە ئێمە رەخنەمان بوو لە سیاسەتی حزبی دیموکرات، لەبەرنامە و لە هەڵسوکەوتی. هەروەها حزبی دیموکراتیش کۆمەڵێك رەخنەی هەبوو لە سیاسەت و هەڵسوکەوت و بەرنامەکانی ئێمە. ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە وە دەیتوانی لە کۆمەڵگای کوردستاندا ئەو ململانێیە بە شێوەیەکی شارستانیانە بەڕێوە بچێت. ئەو ململانێیە دەیتوانی لەکەش و هەوایەکی ئازاد دا، چ ئەو کاتەی کە کوردستان ئازادبوو و چ دواجاری کەخەباتی پێشمەرگانە دەورێکی گرنگتری پەیدا کرد، ئیمکانی هەبوو کە ئێمە و حزبی دیموکرات وەکوو دووحزبی سیاسی جیاواز لە کوردستاندا هەبین وە ململانێکەشمان، ململانێیەکی شارستانیانە بێ. قسە لەسەر ئەوەیە کە بۆچی ئەو ململانێیانە دەگوازراوە بۆ توندوتیژی؟ بۆچی زمانێکی وا بەکار نەدەبرا لەو ململانێ سیاسیەکە خەڵك نیگەران نەکا بگرە ئاموزشیان بدا؟ دیارە نامەوێ بڵێم کە لە هیچ قۆناغێکدا و لە هیچ شوێنێك تەشکیلاتی ئێمە لەم کێشمەکێشە سیاسیەی کە لە بەینی ئێمە و حزبی دیموکراتدا هەبووە تووشی هیچ هەڵەیەك نەبووە، بەڵام بەبڕوای من هەڵەکان ئەساسەن لە حزبی دیموکراتەوە دەستیانپێکرد و بەداخەوە کێشەی ئێمە و ئەوانی بەرەو توندوتیژی برد، پێموایە سەرچاوەکەی بەر لە هەر شتێك هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆحیە پاوانخوازانەیەی کە حزبی دیموکرات هەر لەسەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانەوە و لە هاتنەوەی کادرەکانی بۆ کوردستان و ئاشکرابوونی تەشکیلاتیان لە ناو کوردستانی ئێران. ئەوان لەبەریانگران بوو کە هێزێکی نەیاری خۆیان بەو ئەندازە لە دەسەڵاتدا ببینن. پێیانوانەبوو ئەوە شتێکی ئاساییە و لەکۆمەڵگەی کوردستاندا ڕوویداوە، پێیانوانەبوو کە کوردستانی ئێران ئەو گۆڕانکاریانەی بە سەردا هاتووە. بۆیە ئاستی تەحەمولیان لەبەرامبەر مۆخالفینی سیاسی خۆیان زۆر نزم بوو وە لە هەر کوێ بەرهەڵستێکی ئاوا دەبینرا، ئەمان خۆیان لەو ئاستەدا نەدەبینی کە وەڵامی سیاسی پێبدەنەوە. بارەها و بارها ئەوەم لەرابەرانی حزبی دیموکرات بیستووە کە وتوویانە: ڕیزەکانی ئێوە ڕۆشنبیرن وخوێندەوارن و لە شت حاڵی ئەبن، بەڵام پێشمەرگەکانی ئێمە فەقیرو بێ سەوادن و ئەوەندە تەحمولی ئەوە ناکەن رەخنەیان لێبگیرێت و موخالەفەتی حزبە خۆشەویستەکەیان بکەن، لێتان بەرز دەبنەوە، نازانن بەو زمانەی ئێوە جوابتان بدەنەوە، لە ئەنجامیدا شەڕ دەخوڵقێت.

بۆ ئاگاداریتان یەکێك لەشەرتەکانی کە هەرگیز لە گفتوگۆکانی ئێمە و ئەوانەدا حەزف نەدەبوو هەمیشە بەشێوەی رەسمی یا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ دەهاتە گایەوە، مەسەلەی تەبلیغات بوو. داوایان دەکرد تەبلیغاتی ئێمە لەرەخنە گرتن لەوان رابوەستی. ئێمە دەمانگوت تەبلیغات و رەخنە گرتنی سیاسی ناگرێت رابوەستێ. راوەستانی، یەعنی راگرتنی حەیاتی سیاسی حزبی. خۆ ئەگەر قسە لەسەر بەکاربردنی وشە و لەحنی موناسب بۆ خوڵقاندنی فەزای موتەمەدینانە بۆ ململانێی سیاسی بێ، ئەوە ڕاستە ئێمەش بەش بەحاڵی خۆمان لەشێواندنی ئەو فەزایەدا قەت دەستپێشخەر نەبووین، بەڵام ئەوە لە کوێ و قەدەغەکردنی تەبلیغات یا دانانی مەحدودیەت لەسەر تەبلیغات وەکوو شەرتێك لەململانێی ئێمە و ئەوندا لەکوێ؟

لە داهاتووشدا ئەوەی کە پێی دەوترێت ململانێی سیاسی قەتعەن هەر درێژەی دەبێتو ناتوانێت بوەستێت، بەڵام تا ئەو جێیەی کە بە ئێمە مەربوتە ئێمە دەبێت هەوڵبدەین ئاستی شعوری سیاسی و ئەزموونی خەبات لەکوردستان ئەوەندە بچێتە سەرێ کەهیچ کەس نەتوانێ یان بۆی ئاسان نەبێت کێشەیەکی سیاسی لەگەڵحزبێکی نەیاری خۆی بکێشێتە قۆناغی تێکهەڵچوونی چەکدارانە.

***پێتانوایە ئەو عەقڵیەتە گۆڕابێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموایە زۆر گۆڕانیان بە سەرداهاتووە. بەڵام لەم جۆرە حزبانەدا ئەوەی کە لە دەسەڵاتدا بن و یان دوور بن لە دەسەڵات، بەرانبەر بە دیموکراسی بە تەجروبە دوو هەڵوێستی جیاوازمان دیووە. پێویستە مکانیزمەکانی پاراستنی دیموکراسی لە ململانێی نێوان حزبە سیاسیەکانی ئۆپۆزسیۆندا، بدۆزینەوە. واقعیەت ئەوەیە کە لەو ساڵانەدا کە ئێمە لەشارەکانی کوردستان بووین و خەڵکی کوردستان خۆیان راستەوخۆ لە مەیدانی خەباتی سیاسیدا بوون کێشەی بەینی ئێمە و حزبی دیموکرات نەیدەکێشا تێکهەڵچوونی چەکدارانە. توندوتیژی لەکاتێکەوە دەستیپێکرد کە جەماوەری خەڵك پاشەکشیان پێکرا لەڕاستیدا مەیدانی چالاکی سیاسی و مەیدانی نیشاندانی ئیرادەیان بەرتەسکبووە وە لەئەنجامدا فورسەت خوڵقا بۆ ئەوەی کە حزبی سیاسی خۆی ئیرادەی خۆی چۆن بوو، رەوتەکە ئاوا بەرێتە پێش، بەرهەڵستی جەماوەری لە بەرامبەریدا نەبوو. پێموایە لە داهاتوودا ئەگەر کوردستان بە خەبات و راپەرینی کۆمەڵانی خەڵك ئازاد بێت و خەڵك ئیمکانی ئەوەی هەبێت دەوری سیاسی خۆی راستەوخۆ بنوێنی رێگانادات بەوەی کە ئەوان شەڕ بخوڵقێنن.

**هیچ رێکخراوێکی چەپ نییە دیموکرات پەلاماری نەدابێ**

**★ لەژمارە (١١) گۆڤاری پێشرەو لەساڵی (١٩٨٥) واتە لەساڵی (١٣٦٤) سەبارەت بە شەڕی نێوان کۆمەڵە و دیموکرات لەمەقالێکدا هاتووە، ئەڵێت هێرشی چەکدارانە بۆ سەر کۆمەڵە، نیشانەی نیگەرانی و داماوی بۆرژوازی کوردە، وە لە درێژەی ئەو مەقالەیەدا ئەڵێت دیموکرات خوێنی کۆمۆنیستەکان دەڕێژن، ئەم شەڕە دژی کرێکارانە، ئەم مەقالەیە هی عەبدوڵڵای موهتەدیە، من ئەپرسم بۆچی بۆرژوازو کرێکاران، بۆچی ناوی نەنێین شەڕی نفوزو دەسەڵات و پارەو ئیمکانات و ململانێی سیاسی و شەڕی دوو حزب؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من شەڕی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات، شەڕ لەسەر دەسەڵات نەبوو، ئەوە یەك، دووهەم ، شەڕێکی کلاسیکی چینایەتیش نەبوو، شەڕی بۆرژوازی وپرۆلیتاریاش نەبوو.لە ناوەرۆکی واقیعی خۆیدا شەڕێك بوو لەسەر دیموکراسی و دابین بوونی ئازادی بێ مەرجی هەڵسووڕانی کۆمۆنیستی لەکوردستان، ئەوە راستە کەئێمە رێکخراوێك بووین کە دیفاعمان لەبەرژەوەندی خەڵکی کرێکار دەکرد، وە پێشمانوایە بەرنامەی حزبی دیموکرات نیهایەتەن بەرنامەیەکە بۆ پاراستنی وەزعی موجود، یانی پاراستنی پەیوەندیەکانی نیزامی سەرمایەداری. بەڵام لەڕوانگەی ئێمەوە شەڕی چینەکان دەبێت، خەباتی چینایەتی، بەمانای دەقیقی وشە واتە بەرەورووبونەوەی چینە کۆمەڵایەتییەکان بێ، نەك بەرەورووبونەوەی دوو رێکخراو بە نوێنەرایەتی ئەو دوو چینە.ئامرازەکانی روتینی چینی کرێکار، رێکخراو بوونە ، مانگرتنە، خۆپیشاندانە، پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ژیانی رۆژانەیەتی. بورژوازیش بە ئامرازەکانی خۆی وەکوو دەزگای فریو، دەزگای پۆلیس و زیندان، لەسەر کاردەرکردن و زەختی ئابوری و شتی دیکەی لەو چەشنە بەرەو رووی دەبێتەوە.

شەڕی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە لەوەها چوارچێوەیەکدا نەدەگونجا. ململانێی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە دەیتوانی ناوەرۆکی چینایەتی هەبێ بە بێ ئەوەی بکێشێتە بەرەو روو بوونەوەی چەکدارانە.

ئەو شەڕە بەبڕوای من لەسەر دەسەڵاتیش نەبوو. هەر چەند حزبی دیموکرات لەچەند خاڵی گومرگی لەسەر سنوور کێشەی بۆ ئێمە خوڵقاند ، یان ژمارەیەك لە شوراکانی دێهاتی کە لەسەر رێنوێنی کۆمەڵە پێکهاتبون، هەڵوەشاندەوە، بەڵام لەسەرجەمی کوردستان دەسەڵاتێکی ئەوتۆ نەمابوو کە شەڕی لەسەر بکرێ، واقعیەت ئەوەیە ئەگەر کەسێك سەرنج بداتە مەرجەکانی حزبی دیموکرات بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕە، بەباشی ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە شەڕ لەسەر دیموکراسی و دابینبونی کەش وهەوایەکە کە کۆمۆنیستەکان بتوانن فەعالییەتی تێدابکەن.

تەقریبەن هیچ ڕێکخراوێکی چەپی ئێرانی کە لە کوردستان چالاکیان هەبوو، نییە کە بە جۆرێک نەکەوتبێتە بەر هێرشی چەکداری ئەو حزبە ، جەك ئەکرابێ یان زەربەی نەخواردبێ. خۆ ئەوان بۆ دەسەلآت شانیان لەشانی حزبی دیموکرات ئەدەدا، دوا جار دەتوانین باسی ئەو مەقالەیەی پێشرەو کە ئاماژەتان بۆ کردبکەین. بەلآم ئەوە چۆن تەوزیح دەدرێت کە بۆ چەندین ساڵ حزبی دیموکرات دوو مەرجی سەرەکی هەبوو بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لەگەڵکۆمەڵە. مەرجی یەکەمیان ئەوە بوو کە کۆمەڵە دەبێت حزبی دیموکرات وەکو حزبێکی ڕەسمی شۆڕشگێڕ بناسێت. مەرجی دووهەم ئەوە بوو کە کۆمەڵە چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە هێزێکی بچوکە دەبێ سەرکردەیی حزبی دیموکرات لە بزووتنەوەی کوردستاندا بسەلێنێ. ئەوانەیان بە ئاشکرا لە گۆڤاری کوردستان دا نووسیوە. واتە ئەوان ڕێك گۆڕینی بیروباوەڕوبۆچونی سیاسی ئێمەیان مەبەست بوو. مەگەر ئێمە چیماندەکرد؟ ئێمە بۆچون و فکری خۆمان تەبلیغ دەکرد . ئێمە ئازادیەکمان دەویست کە بتوانین بەرنامەی سیاسی خۆمان تەبلیغ بکەین و ڕەخنەش لە بەرنامە و هەڵسوکەوتی سیاسی ئەوان بگرین. ئەوە ئەو دیموکراسیەبوو کە ئێمە پێوەی ماندوبوین و بۆ ئێمە حەیاتی بوو. ئەوە ئەو دیموکراسیە بوو کە حزبی دیموکرات بۆی هەزم نەدەکرا. هەر بۆیە دەیانگوت پێشمەرگەی ئێمە بێ سەوادن و گەلێك ئاوئاتۆرەی ئارەوایان لە پێشمەرگەی خۆیان دەدا تەنیا بۆ ئەوەی کە تەوجیهی ئەوەبکەن کە گۆیا ئەوە تەبلیغاتی سیاسی ئێمەیە کە بەناچار شەڕی لێدەکەوێتەوە. من پێموایە کە ئەو وەختە ئەو تەبیینەی کە کاك عەبدوللا لەو مەقالەیدا لە شەڕی دیموکرات و کۆمەڵە کردی کەم دیقەتی تێدایە، بەلآم دوای چەندین شەڕی مەحدود لەم یان لەو ناوچە و دوای دەستپێکردنی شەڕی سەرانسەری، ئەو کاتەی کە هەوڵاندەدا هۆکارەکانی پێ داگرتنی حزبی دیموکرات لە سەر شەڕێك کە بە عەمەلی لە جەریاندابوو بدۆزینەوە، ئەو مەقالەیە نووسرا. لەسەر لێکدانەوەی ماهیەتی شەڕ لە ناو ئێمەدا نەزەری جیاواز هەبوو. نەزەری کاك عەبدوللا نەبوو بە نەزەری ڕەسمی.

**شەڕ، دیموکرات هەڵیگرساند**

***وانا حزبی دیموکرات دەستپێشکەر بوو کە شەڕیان هەلگیرساند؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** واقیعەت ئەوەیە لە شەڕی کۆمەڵە و حزبی دیموکراتدا، حزبی دیموکرات دەستپێشخەر بووە. گەلێك بەڵگنامەی حاشا هەڵنەگری مێژوویی هەیە کە ئەو ڕاستیە ئیسپاتدەکات. ئێمە تەنانەت بیرمان لەوەشدەکردەوە، ئێستا کە حزبی دیموکرات دەست لەمەرجەکانی غەیرە دیموکراتیکی خۆی هەڵناگرێ و شەڕەکە تەواو ناکات، خۆمان ڕێگایەك ببینینەوە بۆ ئەوەی بە عەمەلی شەڕ کۆتایی بێبێت. خۆ ئەگەر شەڕی چینایەتی بوایە و یان شەڕ لەسەر دەسەلآت بووایە، کۆتایی پێهاتنێکی بۆ تەسەور نەدەکرا. تەوزیحدانی ئەوەی کە شەڕ لەسەر دیموکراسیە هەم واقعی بوو و هەم ڕێگای هێورکردنەوە و تەنانەت کۆتایی پێهاتنیشی تێدا دەدۆزراوە. دەتوانم بەڵگنامەکانی مەربوت بەو بەحسانەی نێو خۆمان لەسەر ئەو مەوزوعە لە ئیختیارتان بنێم و سەر ئەنجامیش ئەو بۆچوونە لەناو ئێمەدا بوو بە بۆچوونی ڕەسمی کەلە دوو خاڵدا بەیاندەکرا.

**خاڵی یەکەم:** ئەوە بوو کە، ئەمە شەڕێکە لەسەر دیموکراسی و تەفەلایەکە کە کۆمۆنیستەکانی کوردستان دەیدەن بۆ ئەوەی کەش و هەوای حەیاتی بۆ فەعالییەت و کاری سیاسی خۆیان دابین بکەن.

**خاڵی دووهەم:** ڕێگای تەواوکردنی ئەو شەڕە ئەوەیە کە ئێمە تا ئەو جێگایەی بتوانین هێزەکانمان لە تێك هەڵچوون لەگەڵ حزبی دیموکرات بهێنینە دەرێ و بۆ ئەو مەبەستە کوردستان لەڕووی چالاکی ئیزامی و حوزوری هێزی پێشمەرگەوە دابەش بکرێ و سیاسەتی جەنگی ئێمە لەو شەڕەدا لەسەرئەساسی وەها بۆچونێك دادەمەزرێ.

***ئەو چەمکی دیموکراسیەی کە ئێوە باسی دەکەن خۆ حزبی دیموکراتیش هەمان دیعایەی دیموکراسی دەکرد؟ یەعنی ئەو خاڵ و بەندانە چیبوون کە بۆ ئێوە پێویست بوو، وتان دەویست حزبی دیموکرات قبوڵیان بکات، خاڵی دووهەم دیموکرات، دیموکراسییەکی خۆرئاوایی بوو ئێوە وەکو حزبێکی مارکسی دەتانویست ئەم دیموکراسیەتە چۆن لەکۆمەڵگایەك پیادەی بکەن، یا هەر ئەوەبوو سەبارەت بەمافی ژنان و ئازادی رادەربڕین و ئەوانە بوو یان ئێوە تەفسیرێکی تری جیاوازتان هەبوو بۆ چەمکی دیموکراسی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هیچ کاتێك لەو بڕوایەدا نەبووین کە لە کوردستان دەتوانین جیاواز لە ئێران، دورگەیەکی ئارامی سۆسیالیستی بنیاد بنێین و لەئەنجامدا لە ستراتیژی ئێمەدا ئەوە نەبووکە تەکلیفی بورژوازی و چینی کرێکار لەکۆمەڵگای کوردستاندا یەك لایی بکرێتەوە. ئێمە دەمانویست دیموکراسیەکی بەرین و هەمە لایەنە بەرقەرار بێ که تیایدا ئازادی هەڵسووڕانی سیاسی بەمانای وەسیعی وشەکە بەرەسمی بناسرێت. مافی ژنان، مافە سەرەتاییەکانی خەڵکی زەحمەتکێش، کە لەبەیانیەکدا فورمولەکرابوو و راگەیاندرابوو بە رەسمی بناسرێ و بە کردەوە بەرێوەبچێ، زۆربەی ئەو سەرەتا دیموکراتیکانە لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری لە رۆژئاوا بەرەسمی ناسراون. لە مارکسیسمدا بەهەرەمەندبوون لەو مافانە مەرجی حەیاتی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگا و هەنگاو نان بەرەو سۆسیالیسمە.

***کۆمەڵە لە بڕیارنامەیەکدا لەساڵی (١٩٨٨) لە دەقی ئەو بڕیارنامەیەدا هاتووە کە حزبی دیموکرات بەدرێژایی چەندین ساڵ نوێنەری سەرەکی جەرەیانی ناسیۆنالیستی لە کوردستانی ئێران بوو، لەوێدا دیموکرات تۆمەتبارکراوە بەوەی کە ناسیۆنالیست و وردە بۆرژواو خودموختارخوازە وە دیفاع لە سیستمی سەرمایەدەکات، ئایا ئەم راگەیاندنەی ئێوە هی شەڕ بوو، یا واقعی بوو، ئێوە چۆن ئەتوانن لەونێوەندەدا وەکو حەرەکەیەکی چەپ و مارکسی دیفاع لە خەڵکی کوردستان بکەن، یەعنی ئەوە خراپ نەبوو کە ئێوە رقتان ئەگەیاند حزبی دیموکرات حەرەکەیەکی ناسیۆنالیستی و قەومیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من نازانم رێك ئێوە ئاماژە بە کام بڕیارنامە دەکەن، بەڵام ئێمە لەبواری لێکدانەوە و هەڵسەنگاندندا حزبی دیموکراتمان بە هیچ شتێکی غەیرە واقیعی تۆمەتبارنەکردووە. ئەگەر ئێمە وتوومانە حزبی دیموکرات، حزبێکی ناسیۆنالیستی کوردییە ئەوە هەم لێکدانەوەیەکی واقیعییە و هەم ئەمانەت خۆشیان شانازی پێوەدەکەن. بەڵام پێویستە ئەوەش روون بکەمەوە سەبارەت بە لەحن و ئەو وشانەی کە لە تەبلیغات دا سەبارەت بە حزبی دیموکرات بەکارهاتوون پێویستە دوو دەورە لەیەك جیابکەینەوە، دەورەیەك کەشەڕی قورس لەنێوانماندابوو و دەورەیەك کە لەگەڵ یەك لەئاشتیدا بووین. لە هەردوو دەورەکەدا لێکدانەوەی بنەرەتی ئێمە نەگۆڕاوە، بەڵام لەحن و ئاژیتاسیۆنی تەبلیغاتیمان وەڵامی لەحن و ئاژیتاسیۆنی تەبلیغاتی ئەوان بووە و ئەو ئەدەبیاتەی کەبەکار هاتووە ناکرێ لە هەلومەرجێك کە تێیدا بووین جیا بکرێتەوە.

حزبی دیموکرات دەتوانێ حزبێکی ناسیۆنالیستی کوردی بێت کە ئامانجی نیهاییەکەی خودمۆختاری یا فیدرالیزم بێت، لە دژی نیزامی سەرمایەداری زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا، هیچ داخوازیەکی نەهێنابێتە گۆڕێ و بەو مانایە لایەنگری پاراستنی وەزعی مەوجود بێ، لە هەمانکاتدا لەخەباتی هاوبەشمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیشدا خاڵی هاوبەش و هاوکاری دیاریکراویشمان هەبێت، ئێمە دەمانهەوێ خەڵکی کوردستان بە ئامانجی رزگاری لەستەمی نەتەوایەتی بگەن و لە هەمان کاتدا پرۆسەی رزگاری لەستەمی نەتەوایەتی پرۆسەی بە ئاگاهاتنەوەی سیاسی خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێش بێت و لە هاوپەیمانانی چینایەتی خۆیان لەئاستی ئێران و جیهاندا نزیك ببنەوە. لەوەها ستراتیژێکدا هاوکاری لەگەڵ حزبی دیموکراتیش دەگونجێ.

**شەڕی هەورامانی کۆمەڵەو دیموکرات و رۆڵی (ی. ن. ك)**

***ئەوە راستە کە کۆمەڵە لە یەکێك لە راگەیاندنەکانیدا ئەڵێت "حزبی دیموکرات لە (٢٥)خەزەڵوەری ساڵی (١٣٦٢) پەلاماری چەکداری بەرنامەدارێژراوی بۆ سەر واحیدێکی پێشمەرگەی کۆمەڵە دەستپێکرد، ئایا ئەوە بەرنامە دارێژراو بوو، حزبی دیموکرات دەیویست پاوانخوازی بکاو کۆمەڵە لەسەر ساحەی کوردستان لاداو کۆمەڵە دیفاعی لەمە ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من لام وایە کە حزبی دیموکرات هەرگیز تووشی ئەو خۆشباوەرییە نەبووە کە دەتوانێ کۆمەڵە لەسەر ساحەی کوردستان لابدات. مەسەلە ئەوە بوو کە ئەوان دەیانەویست کە بەبێ‌کار هێنانی هێزی چەکداری خۆیان مەیدانی چالاکی کۆمەڵە لەکوردستان ئەوەندەی بکرێت بەرتەسك بکەنەوە. بۆ نمونە هەندێك ناوچە هەبوو کە ئەوان بە پاوانکراوی خۆیانیان دەزانی و نەیاندەویست رێگا بدەن کۆمەڵە لەو ناوچانە چالاکی سیاسی و نیزامی هەبێ. بۆ نمونە ناوچەی شیمالی کوردستان و هەورامان کە دوو شەڕی قورسی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات تێیاندا روویداوە.

- لەشوێنەکانی دیکەیش بە تایبەت لە دێهات، هەوڵیدەدا بە هێز نواندن، خەڵك لە هاوکاریکردن لەگەڵ کۆمەڵە بترسێنێت.

دیارە لەسەرەتاوە لەساڵەکانی سەرەتای دەیەی شەست تێکهەڵچوونەکان مەحدود و مەحەلی بوون و بە گفتوگۆ و رێککەوتن لەسەرەوە، پێش بەپەرەسەندنیان دەگیرا. کاتێك کە ئەوان لەو ساڵەدا کە ئاماژەتان پێکرد لە هەورامان چوونە سەر پێشمەرگەکانی ئێمە و قەتڵی عامیانکردن، ئێمە وتمان کە ماوەی (٣) مانگ مۆڵەت بەسەرکردایەتی حزبی دیموکرات دەدەین کەتاوانبارانی ئەو رووداوە بناسێنێ و سزایان بدات و هەر ئەو کات بەراشکاوی وتمان‌کە زەربەی ئێرە و لەوێی حزبی دیموکرات لەوە زیاتر تەحەممول ناکرێ و ئەگەر سەرکردایەتی حزب رووداوەکەی هەورامان تەئید ناکا و بە نارەوای دەزانێ پێویستە بە رەسمی هەڵوێستی لەسەر وەربگرێ و تاوانبارانیشی بە سزا بگەیەنێت. ئەگەرنا، ئێمە مافی پارێزگاری لە خۆمان بەکاردێنین. لەماوەی ئەم (٣) مانگەدا هەم خۆمان دانیشتنمان لە گەڵیان بوو و هەم هەیئەتێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش وەکو نێو بژیوان بۆ لێکۆڵینەوە سەردانی ناوچەکەیان کرد، بەڵام بە داخەوە ئەم هەوڵانە کاریگەر نەبوون و حزبی دیموکرات ئامادە نەبوو چکۆلەترین پاشەکشەیەك لەم بابەتەوە بکات و هیچ مەیلێکی بە سازان لە خۆیدا نیشان نەدا. دوای تەواو بوونی (٣) مانگەکە ئێمە بریارماندا بە زۆری چەکیش بووە مەودای درێژەی فەعالییەتی خۆمان لەناوچەی هەورامان دابین بکەین. دوای ئەو روداوە حزبی دیموکرات بۆچوونێك کە گەلێك جار لەپلینۆمەکانی کۆمیتەی ناوەندی خۆیاندا باسیان لێکردبوو، بە گردەوە دەریان هێناو بریاریاندا کەلە هەموو کوردستان پەلامار بەرنە سەر هێزەکانی ئێمە و شەڕ کە تا ئەو کات مەحدود و ناوچەیی بوو، بوو بە شەڕێکی سەرانسەری و حزبی دیموکرات بۆ کۆتایی پێهێنانی، ئەو مەرجانەی هێنایە گۆڕێ کە کۆمەڵە، حزبی دیموکرات وەکوو حزبێکی رەسمی شۆڕشگێر و رێبەری بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان بە رەسمییەت بناسێ و رای بگەیەنێت.

**(ی.ن.ك) دەیزانی شەڕ خەتای دیموکراتە**

*** هێئەتی نوێنەرانی یەکێتی نیشتمانی هاتە ناو جەریانەکەوە، بەڵام نەیانتوانی کێشەکە چارەسەربکەن، وە هیچ راگەیاندنێکی گشتیان بڵاونەکردەوە و دوای ئەوە کەنەیانتوانی سەرکەوتووبن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەیئەتی نێو بژیوانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بە

ئاشکرا بڵاوکردەوە. بەڵام ئەوانە هەمووی لەبەڵگەنامەکاندا و لەوانەیە لە ئارشیوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیشدا هەن. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەی کە کردمان ئەوان دەیانزانی کە حزبی دیموکرات خوڵقێنەری رووداوەکەی هەورامان بووە، بەڵام بە ئێمەیان گوت کە ئەوە بریاری دەفتەری سیاسی حزبی دیموکرات نەبووە و بەرپرسەکانی ناوچەی هەورامان سەربەخۆ ئەو کارەیان کردووە. ئێمەش ئەوکات وتمان کە ئەگەر وایە با دەفتەری سیاسی حزب بۆ ئیسباتی ئەم مەسەلەیە هەڵوێستێك بەرانبەر بە مەسئولە مەحەلییەکانیان وەربگرێ. دیارە وەڵامی ئەو داوایەی ئێمە نەدراوە.

*هەر ئەو کاتە لە (١٥)ی پوشپەری (١٣٨٤) واتە لەساڵی (١٩٨٥) بابەتێك لە گۆڤاری پێشرەو نوسراوە بەناوی" شەری ناوخۆ لەکوردستان و سیاسەتی ئێمە"، تێیداهاتووە گوایە "دیموکرات وتویەتی، شەر هاتە فەوتاندنی کۆمەڵە، جەنگ، جەنگ تا پیرۆزی" وە بەو شکڵەی کۆمەڵە فیودتاڵەو ساواکیەو کۆمەڵە لەئێران خەتەرناکە ئەم ریکلامانەی ئەم مەقالەیە راستە ، ئەمانەی لەم مەقالەیەدا هاتووە راستە وە ئایا حزبی دیموکرات دیعایەی ئەوەی ئەکرد کە کۆمەڵە ساواکیە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کاتێك کە حزبی دیموکرات بریاری شەری سەرتاسەریدا، ئیتر راگەیاندنی هەردوولاش رەنگ و بۆنی هەلومەرجی شەری بە خۆیەوە گرت. هەوڵەکانی (٦) لایەنی سیاسی کوردستانی و ئێرانیش بۆ کۆتایی پێهێنانی بێ ئاکام مایەوە. چاوخشاندن بە سەر بەڵگەنامەکانی بڵاو کراوە لە لایەن ئەم (٦) لایەنەوە نیشاندەدات کە ئەوە لایەنی حزبی دیموکرات بووە کە ئامادە نییە شەرەکە کۆتایی پێبێنێت، ئیتر (م. س) دیموکرات بەعەلەنی شەری لەسەرتاسەری کوردستان دژی کۆمەڵە راگەیاند.

قاسملۆ و شەری ناوخۆ

*لەزۆر راگەیاندنی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات - رێبەرایەتی شۆرشگێری ئەوکاتەو زۆر شوێنی تر بیستراوە کە شەهید قاسملو رۆڵێکی خراپی هەبوو لەپەرەپێدانی شەری ناوخۆو لە قوڵبوونەوەی ملمڵانێکان، ئایا ئەوە وابوو قاسملۆ، لەلایەن خەڵکی کوردستان وەکو پیاوێکی دیموکرات و ئازادیخوازو تێکۆشەر ناسرابوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کاتێ کە قاسملو لەئەوروپابوو، شەش لایەنی سیاسی و مامۆستا عیزدین حوسێن کەوتنە ناوبژیوانی ئێمەو دیموکرات. لە ئەنتیجەی هەوڵەکانی ناوبژیوانی شەش لایەنی سیاسی کوردستانی و ئێرانی دەفتەری سیاسی ئەو کاتی حزبی دیموکرات هەتا بەردەم رێککەوتن هات. بەڵام دوکتۆر قاسملۆ لە دەرەوەی وڵاتەوە پەیامیان بۆ دەنێرێ کە هەتا گەرانەوەی ئەو دەست رابگرن و هیچ رێککەوتنێك ئیمزا نەکەن. کە گەرایەوە بۆ کوردستان ئامادەنەبوو رێککەوتن نامەکە ئیمزا بکات و هەوڵەکانی (٦) لایەنی سیاسی بێئاکام مایەوە و سەر لەنوێ مەرجەکانی نادیموکراتیکی خۆیان دوپاتکردەوە.

بەعس و موخابەراتی عیراقی ناویژیوانی کۆمەڵەو دیموکرات دەکەن

* بیستومە کە رژێمی بەعس هەوڵیداوە نێوبژیوانی بکات بۆ تەواو کردنی شەری نێوان ئێوە و دیموکرات، ئەو مەسەلەیە چۆن چۆنی بووە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ ئەوە راستە. پائیزی ساڵی (١٣٦٥) بوو، دەوڵەتی عیراق ئێمە و حزبی دیموکراتی بانگهێشت کرد بۆ بەغدا بۆ ئەوەی ئەو شەرە کۆتایی پێ بێنێت. ئەوان لەو کاتەدا زەختی زۆری سوپای ئێرانیان بەسەرەوە بوو و لایان وابوو کە رژێمی ئێران لە شەری ناوخۆی کوردستان زۆرترین کەڵك وەردەگرێت بۆ بەهێز کردنی بەرەکانی شەری خۆی. لە لایەن ئێمەوە هەیئەتێك کە بریتی بوون لە کاك سەدیق کەمانگەر و حەسەن

شەمسی و من چوین بۆ بەغدا. لە لایەن حزبی دیموکراتیشەوە دوکتۆر قاسملو لەوێ بوو لەگەڵ نوێنەری ئەوکاتیان لە بەغدا، ئەگەر کەسی دیکەش بووبێ، من خەبەرم نیە. دوکتور فازڵ بورراك، رەئیسی موخابراتی ئەوکاتی عێراق لەگەڵ کەسی دیکەیان بە ناوی ئەبو عودەی دەوری نێو بژیوانیان دەگێرا. حزبی دیموکرات ئامادە نەبوو راستەوخۆ لەگەڵمان دابنیشێ. هەرکامەمان لە ژوورێك بووین و فازڵ بورراك لە نێوانماندا هاتوچۆی دەکرد. هەر لێرەدا ئەوە بڵێم پێشتر فازڵ بورراك مامۆستای مێژوو بوو لە زانکۆی مۆسکۆ. ئەو کابرایە ماوەیەك دواتر بە هۆکارێکی نەزانراو بە دەستووری سەدام ئیعدام کرا.

ئەوکات حزبی دیموکرات مەرجەکانی خۆی بۆ ئاگربر فورموڵە کردبوو، بە پێی ئەو مەرجانە دەبوایە حزبی دیموکرات وەکوو هێزێکی رەسمی شۆڕشگێڕ و سەرکردەی بزووتنەوەی کوردستان بەرەسمی بناسین و رابگەێنین و ئامادە نەبوو لەو مەرجانەی خۆی بێتە خوارێ. هەڵبەت ئەوان دەیانزانی کە ئەو مەرجانە بۆ کۆمەڵە قابلی قەبوڵ نین، پێیان لەسەر دادەگرت بۆ ئەوەی کە شەڕەکە درێژە پێ بدەن، چونکە لایان وابوو کە سەرئەنجام لەو شەڕەدا ئێمەین کە دەوام ناهێنین.

بالێرەدا نوکتەیەکتان بۆ باس بکەم، فازل بورراك لەگەڵ خۆی چەند کتێبێکی مارکس و لنینی هێنابوو و چەند کۆدی لێ دەرکێشابوو و بە ئیستناد بەوانە لەگەڵ ئێمە قسەی دەکرد. بۆ نمونە دەیگوت ئێوە حەقتانە حزبی دیموکرات بە حزبێکی بورژوای بناسن، بەڵام بەپێی ئەو کودانەی کە باسیان دەکەم لەم قۆناغەدا بورژوازی شۆڕشگێڕە، ئێوە جارێ ئەوە بسەلێنن، باوتووێژەکانمان پێشرەفت بکات دواجار لەسەر شتەکانی دیکەش قسە دەکەین.

نە ئێمە و نە حزبی دیموکرات هیچ کاممان هەر کامەمان بە هۆکاری تایبەتی خۆمان، لە نێو بژیوانیەکە خۆشحاڵ نەبووین و ئێمە لامان وابوو کە ئەگەر مەجالێك بۆ رێککەوتن و کۆتایی هاتنی شەڕ هەبێ، باشتر وایە لەسەر دەستی هێزە سیاسیەکانی ئۆپۆزیسیونی ئێران، ئەو شەش جەریانەی کە لەهەولێدا بوون، وە یان لەسەر دەستی یەکێتی نیشتمانی بێ. حزبی دیموکراتیش بەهۆی هەڵوێستێك کە لە شەڕەکەدا هەبووی بەو نێوبژیوانیە رازی نەبوو و هەوڵی دەدا خۆی لێ دەرباز بکات.

***پەیوەندی شەخسی تۆ لەگەڵ قاسملو چۆن بوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هیچ پەیوەندیەکی شەخسیم لەگەڵی نەبوو و تەنیا لە کۆبوونەوە رەسمییەکاندا چاومان بە یەکدەکەوت.

***سەبارەت بە تیرۆرکردنی ئەوکاتەی کەتیرۆرکرا تۆ یان کۆمەڵە چ راگەیاندنێکی هەبوو هەستت بەچیکرد؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: دوای ئەو رووداوە بە ناوی خۆمەوە و لەلایەن کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەوە بەیانێکم ئیمزا کرد و تێیدا ئەم روداوەم مەحکوم کرد.

***تائێستا کێشەی تیرۆری قاسملو یەك لایی نەکراوەتەوە، بەقەناعەتی تۆ وڵاتانی ئەورووپا لەتەماحی گرێبەستی ئابوری و پارەو پول و نەوت وایکردوە تیرۆرێکی وا ژێر بەڕە بخرێت یان ئەوە بێ خەمی حزبی دیموکرات و کوردە کە نەیتوانی ئەو دۆسیانە راکێشێتە ناو دادگاوە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بەرژەوەندی ئابووری دەوڵەتانی ئەوروپایی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران وایکردبوو کە زۆر لەسەر کێشەکە نەچن و تەنانەت دەوڵەتی ئۆتریش( نەمسا) بە ئاشکرا بکوژەکانی دوکتۆر قاسملوی رەوانەی

تیرۆریان کردووە. هەڵبەت دەوڵەتانی ئەوروپایی و بەتایبەت دەوڵەتی ئاڵمان دواجار و لەڕووداوەکەی ڕێستورانتی میکۆنۆسدا کە دوکتۆر سادق شەرەفکەندی و هاوڕێیانی تیرۆرکران تاڕادەیەک ئەو هەڵوێستەی خۆیان قەرەبوو کردەوە، بەڵام ئەویش هیچ کردەوەیەکی جیدی بە دواوە نەبوو.

**(م.س) دیموکرات، ئاگاداری وتوویژی قاسملۆ و تیرۆران نەبوون**

*** حزبی دیموکرات بە چ مەبەستێك چوو بوو بۆ وتوویژ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەو جۆرەی کە دواجار لە لایەن خودی حزبی دیموکراتەوە روونبووە تەنانەت دەفتەری سیاسی حزبیش ئاگاداری کۆبوونەوەکەی نێوان دوکتۆر قاسملۆ و ئەندامانی سوپای پاسدارانی تیرۆران نەبووە. ئاشکرایە کە نەفسی کۆبوونەوەکە لەلایەن ڕژێمی تیرانەوە بەمەبەستی پیلانگێری تەرتیب درابوو و گومان لەوەدا نییە کە ئەوان نیەتی بە رەسمی ناسینی هیچ مافێکی گەلی کوردیان لە مێشکدا نەبووە و ئەو کۆبوونەوە ئەگەر بەم جۆرەش تەواو نەبوایە، نەیدەتوانی غەیری زیان گەیاندن بە بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان هیچ ئاکامێکی دیکەی هەبێ.

چەند مانگ پێش ئەو ڕووداوە لە وتوویژێکدا کە لەگەڵ "کریس کۆچارا" ڕۆژنامەنووسی فەرانسەوی بووم لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر بە ئەگەری وتوویژ لەگەڵ ڕژێمی کۆماری ئیسلامی چییە؟ پێم وت: بە لەبەرچاوگرتنی هاوسەنگی هێزی ئێستای ڕژێمی جمهوری ئیسلامی و بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان و بە لەبەرچاو گرتنی ماهیەتی کۆماری ئیسلامی ئەم جۆرە وتوویژانە تەنیا دەتوانێ پلانێك بێ بۆ لەناوبردن نەك بۆ سەلماندنی هیچ بەشێك لە مافەکانی خەڵکی کوردستان. "کریس کۆچارا" لە باسی تیرۆری دوکتور قاسملوودا ئەو خاڵەی باسکردووە.

***یەعنی تەوەقوعی کردەوەیەکی تیرۆریستی یان پلانێکی بەرنامە داڕێژراوت کردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من تەوەقوعی ئەو ڕووداوەم بەو شێوەیە کە ڕوویدا نەبوو، بەڵام دڵنیا بووم کە ئەمجۆرە بە ناو وتوویژانە لەو هەلومەرجە دیاریکراوەدا، هیچ ئاکامێکی غەیری پلانگێری و قووڵکردنەوەی دوو بەرەکییەکان و زەرەر گەیاندن لێناکەوێتەوە.

**قاسملۆ بەئاسانی کەوتە تەڵەی تیرانەوە**

***چەند قسە هەیە کە گوایە ئاگادارییەك هەبووە بە شکڵێك لە شکڵەکان، یان ئەکرا ڕێگری لەو پلانە بکرێت تۆ چی لە بارەی ئەم پلان و تیرۆرکردنەوە ئەزانی و ئەو نهێنیانەی کە تا ئێستا ئاشکرا نەبوون چی ئەزانی و وە چۆن ئەکرا ڕێگری لەم تیرۆرە بگیرێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من دوکتۆر قاسملۆ باشتر لە هەر کەسی دیکە دەیتوانی خۆی پێش بەو پلانەبگرێت. ئەگەر دەفتەری سیاسی حزبی دیموکراتی لە وردەکارییەکانی ئەو کۆبوونەوەیە ئاگادارکردبایە بێگومان ڕێ و شوێنێکی گونجاوتریان بۆ دادەنا. ئەگەر دەوڵەتی ئۆتریشی لەکۆبوونەوەکە و شوێنەکەی ئادگادارکردبا، پارێزگاریان لێدەکرد و تیمەکانی تیرۆری کۆماری ئیسلامی کە بۆ ئەم کارە ئامادەکرابوون کارێکی ئەوتۆیان بۆ نەدەکرا. خۆ ئەگەر ماهیەتی کۆماری ئیسلامیشی ناسیبایە و وەزعی ئەو کاتی حزبی دیموکرات کە دوو لەت ببوو و هەلومەرجی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستانیشی بە دروستی لێکدابوایەوە، هەر نەدەبوایە پێبنێتە ناو ئەو پلانەوە کە بە ناوی وتوویژ داڕێژرا بوو.

***تۆ پێتوانییە مەسەلەی تیرۆری قاسملۆ، ئێران زۆر بەجیدی گرتبووی، لەبەر ئەوەی قاسملۆ شەخسیەتێکی بەهێزو خۆشەویستی خەڵکی کوردستان بوو، پلانێکی گەورەتر بوو لەوەی کەوا بە ئاسایی سەیری بکەین یەعنی بەرنامە بۆ دارێژراو بوو، رەنگە خەڵکی کورد ئاگای لێبووبێت، وڵاتی نەمسا بە نهێنی هاوکاری ئەو مەسەلەی کردبێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نازانم من مەعلوماتی وردم نییە، بەڵام سێ تیم بۆ ئەو کارە سازکرابوون لەو باوەڕەدا نیم کە دەوڵەتی ئۆتریش ئاگاداری پلانەکە بووبێت، بەڵام ئاشکرایە کە بە پێی ئەو بەرژەوەندیانەی کەلەمێران بووی، چاوپۆشی لەبکوژەکانی کرد و دەربازیکردن. دیارە کۆماری ئیسلامی هیچ فۆرسەتێکی بۆ تێرۆری نەیارانی خۆی لە دەرەوەی وڵات لە دەستنەدەدا. دوکتۆر قاسملوش دەورێکی گەلێك گرنگی لە ناو حزبی دیموکراتدا هەبوو، هەر بۆیە ئاسایی بوو کە هەوڵی تێرۆرکردنی بدرێت. بریاری تیرۆری دوکتۆر قاسملۆ لە ئاستی زۆر سەرەوەی رژێمی ئێرانەوە بە مەبەستی لاوازکردنی حزبی دیموکرات درابوو، بەڵام هەرچی چۆنێك بێ دوکتور قاسملۆ کەوتە تەڵەکەوە.

*** حزبی دیموکرات بە تیرۆرکردنی قاسملۆ لاواز بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کوژرانی رەهبەری حزبێك بێگومان زیان بە حزبەکە دەگەیەنێ، بەڵام من ناتوانم قەزاوەتی ئەوە بکەم کە ئەگەر دوکتۆر قاسملۆ تێرۆر نەکرابایە ئێستا وەزعی حزبی دیموکرات چۆن دەبوو؟

***بۆچی قاسملۆ تاکڕەوانە بریاریدا بێ ئەوە بگەڕێتەوە مەکتەبی سیاسی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوکتۆر قاسملۆ کەسایەتیەك بوو کە لە دەرەوەی وڵات زیاتر لە حزبی دیموکرات دەناسرا. لام وا نییە کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتیش ئەو جۆرە تاکڕەویانەی تەئید کردبێ.

***تۆتالیتاریەت و تاکڕەوی قاسملۆ بوو واینەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەناو زۆربەی حزبە سیاسییەکانی کوردستان و بگرە هەموو رۆژهەڵاتی ناوەراستدا وا هاتووە لەکاتی خۆیشی بارزانی هەمان کاری کردبوو کە کەسایەتی رێبەرانی، سێبەر دەخاتە سەر زەوابتی حزبییەوە. ئەوە ئەساسەن هەڵدەگەرێتەوە بۆ نەبوونی سوننەتی دیموکراتیك لەو وڵاتانەدا. لەم رووداوەشدا حزبی دیموکرات قوربانیەکی هەر ئەم سوننەتە دێرینەیە بوو.

***ئەوە هەر ئەو شتەیە کە پێی ئەڵێن دروستکردنی کارێزما حزبی دیموکرات کە قاسملۆی کردبوو بە کارێزما و خەڵکی کوردستان ئەوەی دەوێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموانییە کە چارەنووسی خەڵکی کوردستان هەر ئەوەیە کە دەبێ لەژێر سێبەری کارێزماکانیدا بێت. بەتایبەت کە ئێستا لەم بابەتەوە بە ئاگا هاتنەوەیەکی دڵخۆشکەر هەیە. بەڵام حزبێك کە بەرانبەر بە ئامانجەکانی و بەرانبەر بە خەڵکەکەی خۆی راستگۆ بێت، پێویستە ئاگاهانە هەوڵبدات کە ئیرادە بگەرێتەوە بۆ جەماوەر و بۆ ریزەکانی حزبەکەی. رێبەری بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بەمیکانیزمی حزبی دیاری ناکرێن. ئەم رێبەرانە کەسانێکن کە توانیویانە لە هەلومەرجە هەستیارەکاندا و لە خاڵە وەرچەرخانەکانی مێژوویدا رێگا و شوێنی دروست دیاری بکەن و کۆمەڵگا بەرەو پێش بەرن و یان لە مەترسییەکان دەربازی بکەن.

***ئەوەش بۆ حزب زۆر خراپە کارێزمایەك قەوتا حزب بقەوتێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وایە زۆر خراپە.

**تیرۆری سادق شەرەفکەندی رێبەری دووهەمی دیموکرات**

***دوای تیرۆرکردنی قاسملو یەکێکی تر لە سکرتێر و رابەرەکانی حزبی دیموکرات بەهەمان پلان تیرۆر دەکرێت کە سادق شەرەفکەندییە لە ئەڵمان، بەبۆچوونی تۆ حزبی دیموکرات بۆ دەرسی لە تیرۆرکردنی قاسملۆ وەرنەگرت وە بۆ ئێران وازی نەهێنا لەتیرۆرکردنی سکرتێرەکانی حزبی دیموکرات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران هیچکات وازی نەهێناوە لەتیرۆرکردنی رێبەرانی حزبەکانی نەیاری خۆی. ئاساییە کە بۆ حزبی دیموکراتیش کە حزبێکی گرنگی دژی رژێمی ئێران بووە هەروا بکات. ئەو کۆبوونەوەیەی کە دوکتۆر سادق شەرەفکەندی و هاورێیانی تێیدا تیرۆر کران لە لایەن رێکخراوی "فیدائیانی ئەکسەریەت"ەوە رێکخرابوو. "ئەکسەریەت" لەو دەورەیەدا کەرەفسەنجانی هاتبووە سەرکار لای وابوو کە هەلومەرج بۆ گەرانەوەیان بۆ ئێران فەراهەمبووە. دەزگای ئیتلاعاتی جمهوری ئیسلامی نفوزی کردبووە ناو ئەو رێکخراوەیە و لە رێگەی جاسوسەکانیەوە ئاگاداری کات و شوێنی کۆبوونەوەکە بوو. بەڵام ئەو هەڵوێستەی ئەکسەریەت و ئەو واقعیەتەی کە هاوکارانی جمهوری ئیسلامی لە ناویاندا هەن، شتێکی شاراوە نەبوو، هەر بۆیە ئەگەر جۆرێک لە ئەناسینی دوژمن نەبێ، رێبەرانی حزبێکی مۆخالیفی ئەو رژێمە کە خەباتی چەکداریش دەکات، بە پێی قاعیدە نابێ بچنە ناو کۆبوونەوەیەك بەم شێوەیە و لە وەها شوێنێك.

***زۆرجار باس لەوە ئەکرێت ئێران، کۆمەڵەی بەلاوەگرنگ نییە، بۆیە تا ئێستا هەوڵی تیرۆرکردنی ئیبراهیمی عەلیزادەو عەبدوڵڵا موهتەدی نەداوە، ئەوەندەی خۆی بەدیموکراتەوە خەریك ئەکات، تۆ پێتوایە ئەمە فاکتەرە سیاسیەکەیە یا ئەوەی کە تۆ دەستنیشانت کرد، کە کۆماری ئیسلامی ئەمکارەی بۆ ئەکرا، بەڵام ئیبراهیمی عەلیزادە پێشترئەگەر شتێکی وابووایە یا لە مەکتەبی سیاسی یا لە کۆمیتەی ناوەندی باسی دەکرد وە ئامادەنییە لە شوێنێکی نهێنی دابنیشی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کێشە ئەوە نیە کە کێ گرینگە و کێ گرنگ نییە، بە درێژایی تەمەنی کۆماری ئیسلامی بەردەوام هیچ مەجالیکی بۆ زەربە لێدان لە هیچ گروپێکی ئۆپۆزسیۆنی خۆی، دەوری زۆری هەبووبێت یان کەم، لە دەستنەداوە. لە هەر شوێنێك کەلێنێکی شك بردبێت کاری خۆی تێدا کردووە. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی رێکخراوەکانی جۆراوجۆر و یا تەنانەت کەسانی سەربەخۆی لە ئەوروپا تێرۆرکردووە کە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی لە حاڵەتی شەرێشدا نەبوون تەنیا نەیاری سیاسی ئەو رژێمە بوون. بۆ وێنە بۆ ناو کۆمەڵەش تا ئێستا هەوڵی زۆری داوە و بە داخەوە لەو شوێنانەی کە کەلەبەر و زەعفێك لە کاری ئێمەدا بووە زەرەریشی پێبردوین. ئێمە کەسایەتی وەکوو کاك سدیقی کەمانگەر و کاك غوڵامی کەشاوەرزمان هەر بەم هۆیەوە لە دەستداوە.

***چەند جار هەوڵی تیرۆرکردنی تۆیداوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گەلێك پلان لە دژی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ئێمە پوچەڵکراوەتەوە. هەر لە ناردنی ژەهرەوە بگرە هەتا تەقەمەنی و هەتا هەوڵی بە نار پی جی و موشەك و خۆمپارە لێدانی شوێنەکانی ناوەندی ئێمە. هەڵبەت بە نیسبەت خۆمانەوە بە شتێکی ئاساییمان زانیوە، چونکە ئێمە لەگەڵ رژێمی کۆماری ئیسلامی لەحاڵی شەردا بوین و لە شەرێشدا قەراردادێکی ئاوا نییە کە گۆیا نابێت پەلامار ببرێتە سەر رێبەران. لێرەدا تەنیا قسە ئەوەیە کە شەر لەلایەن ئێمەوە موقاوەمەتێکی عادلانە بووە و شێوازەکانیشی سنووردار بووە، بەڵام لە لایەن ئەوانەوە پەلامارێکی سەرکوتگەرانەیە بۆ ئەوەی کە خەڵکی وڵاتێك و یان رێکخراوێکی سیاسی لە مافی سەرەتایی خۆیان بێبەشکەن و لە بەکار هێنانی هیچ جۆرە شێوازێك دەستی نەپاراستووە. کاتێك لە وڵاتانی دەرەوە وەکو کوردستانی عیراق یان وڵاتانی ئەوروپایی رژێمی کۆماری ئیسلامی هەوڵی تیرۆری ئەم و ئەو بەرێوەدەبات ئیتر ئەوە ئەك هەر هێرشێك بۆ سەرنەیارێکی سیاسی خۆی بەڵکو گەلێك لەوە گرنگتر کایە پێکردن و سوکردنی

دەسەڵات و یاسا و ڕێسای ئەو وڵاتانەیە لەلایەن دەوڵەتێکی ڕەسمی ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

**تیرۆری ئیبراهیمی عەلیزادە**

***بەرچاوترین پلان بۆ تیرۆرکردن و کوشتنی تۆ چی بوو، کەی بوو چۆن بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کارێکی دیاریکراو کە ڕاستەوخۆ تەنیا لە دژی من بوبێت پێم شك نایەت.

***لە ئاگایی خۆتەوە بوو یا لەئەوەبوو کە هەوڵێك نەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە ئاگا لێبوونی خۆم دەورێکی زۆری نەبینیوە. بەڵام لە ناو ئێمەدا پاراستنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی، سوننەتێکی جێکەوتووە و بە هیمەتی هاوڕێیانی دیکەوە بەڕێوەدەچێت.

**تائێستا لەگەڵ ئێران دانەنیشتوین**

***یەعنی کارێکی واکراوە کە ئێوە لە شوێنێکی وەکو ئاڵمان یا لە ڤێنا چۆن حزبی دیموکرات و ڕێبەرەکانی کەوتنە ئەو تەڵەیەوە، ئێوە ئەوا دانیشن بۆ موفاوەزات لەگەڵ ئێران و دەرباز ببن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هەرگیز لەگەڵ کۆماری ئیسلامی لەهیچ شوێنێك دانەنیشتوین بۆ گفتوگۆ. ئەوەی کە بووە لە ساڵی (١٩٨٠) و لەچوارچێوەی گفتوگۆکانی نوێنەرانی خەڵکی کوردستان بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی ئاشتیانە بۆ دابینکردنی مافەکانی خەڵکی کوردستان بووە.

***تائێستا هیچ جارێك دانەنیشتوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە دانەنیشتوین. ڕێکخراوی دیکەش هەیە کە بەناوی کۆمەڵە کاردەکات، دەبێ لە ئەوانیش بپرسی. من تەنیا لە مەوردی خۆماندا بە دڵنیاییەوە وەڵامتدەدەمەوە.

**مام جەلال و دانوستانی کۆمەڵە- ئێران**

***ئەی بۆ قسەباس هەبووە کە ئێوە چەندین جار بەهەماهەنگی یەکێتی نیشتمانی‌و مام جەلال دانیشتنتان کردووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەگەر ئاماژە بە گفتوگۆکانی ساڵانی سەرەتای ڕووخانی ڕژێمی شا، لەساڵی (١٩٨٠) بێ، کە پێشتر باسمکرد، ئەوە ڕاستە کەلەچەند دەوری گفتوگۆکاندا، یەکێتی نیشتمانی و بەڕێز مام جەلالیش لە بەیندابوون.

***ئەگەر کۆماری ئیسلامی ئێران داوا لە ئێوە بکات بۆ دانوستان و گفتوگۆ ئێوە ئامادەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هەمیشە وتوومانە کە وتووێژ لەگەڵ دوژمن دەتوانێ بەشێك لە موبارزەکەمان بێت لەگەڵی. بۆیە قەت لەڕووی ئەزەرییەوە وتووێژ ڕەتناکەینەوە. بەڵام بەر لە هەموو شتێك وتووێژ لەسەر مافەکانی خەڵکی کوردستان بە ئەمرێکی هەموو خەڵکی کوردستانی دەزانین و لامان وایە کە لە گفتوگۆ لەسەر ئەم مەسەلەیە دەبێ خەڵکی کوردستان بە شێوەیەکی گونجاو نوێنەرایەتی بکرێن. سەرەڕای ئەوە، بۆ دەستپێکردنی وەها پرۆسەیەك ئێمە پێش مەرجی خۆمانمان هەیە. بۆ وێنە، پێویستە ئامادەیی کۆماری ئیسلامی بۆوتووێژ بە ئاشکرا و لەسەر زاری مەقاماتی ڕەسمی ڕژێمەوە ڕابگەیەندرێت. ناردنی چەند مەئمورێکی وەزارەتی ئیتلاعات بەناونیشانی خوازراوەوە، بۆ شوێنێکی نهێنی، لێرە یان لەوێ، ئەوە وتووێژ نییە، هەر کەس لە هەر لایەنێکەوە پێبنێتە ناو وەها پرۆسەیەکەوە دەبێ شك بکەی لە نیەتی واقیعیدا. ئەگەر وتووێژ لەسەر ماف و ئازادییەکانی

خەڵکی کوردستانە بۆچی دەبێ کەسانێك کە لەسەر دیفاع لەو مافانە لە زیندان دان یان لە تەبعید دان، ئازاد نەکرێن و یا نەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان؟ کە وابێ مەرجێکی دیکە ئەوەیە پێش هەموو شتێك هەموو زیندانیانی سیاسی ئازاد بکرێن و بگەڕێنەوە سەر کار و ژیانی خۆیان. بەشێوەیەکی گشتی هەلومەرجی گفتوگۆ لەگەڵ هەر رژیمێکی دەسەلاتدار لە ئاکامی هاوسەنگییەکی دیاریکراوی هێزی دوو لایەن دێتەکایەوە. ئەگینا مەسەلەن تفەنگێکی لەسەر مێشکت راگرتبێ و خوێنی خەڵکی کردبێتە شوشەوە، زیندانەکان پڕ بن لە زیندانی و هێزی چەکداری تۆیشی تا پشت مەرزەکان پاشە کشە پێکردبێت، گفتوگۆ چ مانایەکی هەیە؟.

**ئامادەیی گفتوگۆی کورد- ئێران**

***ئامادەن وەکو سازمانی کوردستانی-حزبی کۆمۆنیستی ئێران "کۆمەڵە" تاك لایانانە مفاوەزات لەگەڵ کۆماری ئیسلامی بکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نە، ئەگەر وەها هەلومەرجێك خوڵقا ئەو جار پێمانوایە کە دەبێ هەیئەتێکی نوێنەرایەتی خەڵکی کوردستان پێك بێت و بێبنێتە ناو وەها پرۆسەییکەوە.

***کێن ئەوانە جگە لە ئێوە و حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕان ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من مەبەستم تەنیا حزبەکان نییە، هەرچەند ئەوان بەشێکی گرینگی ئەو پرۆسەیە دەبن. خۆ ئەگەر هەلومەرجی گفتوگۆ رەخسا بێت، بە پێی قاعیدە دەبێت ئیمکانی ئەوە هەبێ کە لە ئاستی جەماوەریدا پرس بە خەڵك بکرێ و رادەی پشتیوانی خەڵك لە نوێنەرانی خۆیان چ بە ناوی حزبە سیاسیەکانەوە و چ لە دەرەوەی ئەوان دەر کەوتبێت. لە ئەزموونی کوردستانی ئێراقدا، هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کوردمان بوو کە خەڵکی کوردستان پشتیوانیان لێدەکرد، دەتوانێ گەلێك دەرسی بۆ ئەمرۆشمان تێدا هەبێت.

***پێتوایە کەی شتێکی ئاوا روو ئەدات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ هەلومەرجێکی وەکوو ئێستا زۆر زۆر بە دووری دەزانم. ئەوە دەتوانێ ئێستا تەنیا باسێکی گشتی و ئەزەری بێ نە شتێکی زۆرتر.

**کۆمەڵە گەلاڵەی هەیە بۆ دانوستان لەگەڵ ئێران**

***ئەگەر هات و دانوستانێك روویدا ئێوە داخوازییەکانتان چ دەبێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لە دوایین کۆنگرەی خۆماندا ئەمساڵ (٢٠٠٦) گەلاڵەیەکمان پەسەندکردووە کە لامانوایە لەو چوارچێوەیەدا دەتوانێ مافەکانی خەڵکی کوردستان بەدی بێت. لە هەر گفتوگۆیەکدا لە روانگەی ئێمەوە ئەو گەلاڵەیە دەتوانێ رێ نیشاندەرێکی باش بێت. بەڵام پێشتر وتم کە مەسەلەی وتووێژ، مەسەلەی هاوسەنگی هێزە لەو کاتەدا کە وتووێژ هاتۆتە کایەوە، تەبعەن وەختێك شەرایەتی گفتوگۆی وەها دەخوڵقێنێت دەبێت هێزی خۆمان بناسین و هێزی تەرەفەکەشمان، ئەو کاتە دیاریدەکرێت کە لە رێگەی گفتوگۆوە دەتوانێ چیمان دەستبکەوێ. ئێمە ئەوەمان لێ روونە کە بە هەر دەرەجەیەك دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی لەسەر کوردستان کەم بێتەوە پێشوازی لێدەکەین و هەوڵدەدەین بۆشاییەکەی پڕبکەینەوە.

***خاڵە ستراتیژەکانی ئەم دانوستانە چییە؟ کە تۆ ئەتەوێت تەرحی بکەیت لە دانوستان و موفاوەزات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گرنگترین خاڵ ئەوەیە کە دەبێ پێش هەر شتێك هەلومەرجێکی وەها دیموکراتیك بخوڵقێ کە خەڵکی کوردستان بتوانن رای خۆیان لەسەر هەر مەسەلەیەك ئازادانە دەرببڕن. ئەو ئازادییە بەدیناییەت

ئەگەر هەرەشەی دام و دەزگاکانی ئەمنیەتی رژێم هەر بەسەر خەلکەوە بێت و یان لەسەر هەر تەپە و جادەیەك، پایگایەك و پاسگایەك دامەزرابێت. ئەو ئازادیە بەدی نایێت ئەگەر خەلك دەستی بەرگەیمنە گشتییەکان رانەگات، ئەگەر ئازادی هەڵسووراتی سیاسی بە بێ هیچ مەرجێك دابین نەبوو بێت. کاتێك ئەوە دەستەبەر بوو و خەڵك لێی بەهرەمەند بوون ئەو کات دەکرێ لێیان بپرسین کە ئایا دەیانەوێ لەچوارچێوەی وڵاتی ئێراندا بمێننەوە؟ کە بریاری مانەوەیاندا ئەو کات دێنە سەر ئەو زەمانەتانەی کە دەسەلاتی خەڵك بە سەر ژیانی خۆیاندا دابینی دەکەن و رێگە لە دوپاتبوونەوەی هەلومەرجی ستەمکاری پێشوو دەگرن. ئەوانە لەبەرنامەی ئێمەدا روونکراوەتەوە.

لێرەدا دەمەوێ ئەوە بلێم ئەو بەرنامانەی کە بە ناوی خودموختاری و یان فیدرالی تا ئێستا هاتوونەتە گۆرێ ناتوانن ئەو زەمانەتە بە خەلکی کوردستان بدەن و هەر بۆیە ئەگەر لە ژێر دەسەلاتی دژی دیموکراتیکی لەو چەشنەی کە ئێستا لە وڵاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست لە کایەدان، ئەم جوزە بەرنامانە قەبولیش بکرێن، کاتی دەبن، چونکە ئامرازەکانی سەرەکی دەسەلات کە بریتین لە ئەرتەش و ئابوری و سیاسەتی دەرەوە هەموویان هەر بە پێی بەرنامەی خودموختاری یا فیدرالی هەر لەژێر دەسەلاتی دەولەتی مەرکەزیدا دەمێننەوە و لەگەڵ گۆرانی هاوسەنگی هێز ولات دەبنەوە سەر دۆخی جارانی خۆی.

***لەگەڵ دروستبوونی دەولەتی کوردی دی لەوکاتەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مادام کە دەوڵەتێکی دژی دیموکراتیك لە مەرکەز لەسەر کار بێت و خەباتێکی شۆرشگێرانەش بۆ گۆرینی ئەو دەسەلاتە لەئاستی سەراسەریدا کە ئاسۆی روخانی ئەو رژێمە دەر بخات، لە ئارادانەبێ، لە وەها حالەتێکدا گەلێك ئاساییە کە خەلکی کورد هەر کات مەجالی بۆ برەخسێت و فاکتۆرێکی گرنگی رێگری لە رێدا نەبێ، خۆی لە وەها دەولەتێك جیا بکاتەوە و دەولەتی سەربەخۆی خۆی پێکبێنێ.

**لەگەڵ دەولەتی سەربەخۆی کوردیم**

***دەولەتی سەربەخۆی هەبێ و خاوەنی ئالای خۆی بێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** <u>دەولەتی سەربەخۆی هەبێ و خاوەنی ئالای خۆی بێت</u> و خەباتی خۆی بۆ ژیانی باشتر و پێشکەوتن لەو چوارچێوەیەدا درێژە پێبدات.

***ئەو دەولەتە نابێتە دەولەتێکی قەومی، ناسیۆنالیست، کە ئێوە کار بۆ ئەوە ناکەن، ئێوە ئەتانەوێت لانیکەم دەولەتێك بێت کەچینی کرێکار، حاکم بێت تێیدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەکلیفی نیهایی دەسەلات لە وەها وڵاتێکداوەکوو هەر وڵاتێکی سەربەخۆی دیکە ، لە رووی هاوسەنگی هێزی خەباتکاری چینایەتی لەو ولاتەدا دیاریدەکرێ.

***لە هێنانەدی ئەو ئامانجانە، کۆمەڵە، لایەنی یەکەمە لەبەرامبەر حزبی دیموکرات یا دووهەمە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە لە سبەی رۆژی رزگاری کوردستان لە ستەمی نەتەوایەتیدا هاوسەنگی هێزی چینایەتی و سیاسی چۆن دەبێ و کام حزب چ دەورێك دەبینێ، ئێستا دیاریکردنی ئاسان نییە. خەباتی سیاسی و چینایەتی لە رەوتی بەرەو پێشچونیدا لەوانەیە چەندین حزب و رێکخراوی دیکەش بێنێتە کایەوە. کۆمەڵگای کوردستان زۆر گۆراوە هەم هوشیاری سیاسی تیاگەشەی کردووە، هەم چینی کرێکارو زەحمەتکێش تیایدا بەژمارە زۆر بووە وە دەوری گرنگی پەیدا کردووە لەبەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتی، لەکۆنترۆڵ شوێنە حەیاتیەکانی ئەو کۆمەلگایە، ئەوانە هەمووی نیشاندەدات کە زەمینە بۆ سەرکەوتنی ستراتیژی ئێمە لەباری کۆمەلایەتیەوە لێرەش

هەیە. هەر بەو پێیە هەوڵدەدین رەوتی ئێمە لە چارە سەرکردنی کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا دەوری سەرەکی ببینێ. بەڵام وەقعیەت ئەوەیە کە ئەوە هاوسەنگی هێز لەئاستی سەرانسەریدایە کە بە دڵنیاییەکی زۆرترەوە دەتوانین بڵێین بە قازانجی رەوتی ئێمە دەگۆردرێ. هەر بۆیە ئێمە هەوڵدەدەین خەباتی کرێکاران و خەڵکی ستەم لێکراوی کوردستان لە خەباتی سەرتاسەری هاوچارەنووسانیان لە ئاستی ئێران گرێبدەین.

**سەرۆکی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان وەرناگرم**

***لەو حاڵەتەدا حەز ئەکەیت سەرۆکی حکومەت بیت یان سەرۆکی پەرلەمانەکەی بیت لەکوردستانی ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حەزناکەم سەرۆکی هیچیان بم. لە هەلومەرجی شۆڕشگێڕانە دا گەلێك ئینسانی بە توانا پەروەردە دەبن کە دەتوانن بۆشاییەکان پڕکەنەوە. ئەوە مەیلی ئێستای منە خۆ ئەگەر زەرورەت بێ سەنگەرەکەی خۆم بەجێناهێڵم و وەزیفەیەك بە پێی توانا وەئەستۆ دەگرم.

***ئامادەی واز لەو ئیمتیازە گەورانە بهێنێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەك هەر ئامادەم، بەڵکو ئارەزووی دەکەم.

***ئەی بۆلەکوردستانی عیراق بەتەجرەبە نەبینرا بەعەکسەوە بوو، ئەوەی کە رۆژێك فیشەکێکی تەقاندوە ئێستا حەق بەخۆی ئەدەدات وەزیر بێت، ئەوەی بەشداری شاخی نەکردووە، شۆڕشی نەکردووە، پێشمەرگە نەبووە، حەقی ئەوەی نییە وەزیر بێت، حەقی ئەوەی نییە زۆربەی ئیمتیازتەکانی ئەم وڵاتە بۆ خۆی بێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەگەڵ گۆڕانی هەلومەرج ژیان لەوانەیە جۆری بیرکردنەوە و حەز و ئارەزووەکانی ئینسانەکانیش بگۆڕێ.لە ئاستێکی ئەزەریدا هەر وەکو مارکس دەڵێ "بیرکردنەوەی ئینسان لە کاخ و لە کۆخدا وەکوو یەك وانییە" ، لە مەوریدی ئەم یا ئەو کەسی دیاریکراویش لەوانەیە هەروابێ. ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە کۆمەڵگا ئەو میکانیزمانەی پێکهێنابێ کە رێبەران و بەرپرسانی خۆی کونتڕۆڵ بکات.

**من و کۆمەڵە ئامانەوێت وەك سەرکردەکانی کوردستانی عیراق بین**

***مەبەستم لەم پرسیارە ئەوەبوو بە تەجرەبە لە ئەزموونی شۆڕشی خەڵکی کوردستانی باشوردا هەیە، ئەو سکرتێرو سەرکردانەی کە وەکو تۆ بوون لەپێناوی خەبات و خەڵکدا شۆڕشیان کرد، بەڵام دواتر بینیمان ئێستا دەست لەهیچ کام لەم ئیمتیازاتانە هەڵناگرێت، مەبەستم لەوە بوو کە نمونەم هێنایەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شەرت نییە ئێمە وابین، نامانەوێت وابین ، من نامەوێت وابم.

**کۆمەڵە، پارمەتی حدکا- رێبەرایەتی شۆڕشگێڕیدا**

***ئێمە مەوزوعەکەمان لەسەر حزبی دیموکرات بوو، ئەوەی تۆ راستە، بەڵام پاش جیابوونەوەکانی (حزبی دیموکراتی کوردستان - رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ) شەڕ لەنێوان کۆمەڵە و ئەم باڵەی کە جیابوونەوە، راوەستا، وە دیموکرات ئەوەشی راگەیاند "کە کۆمەڵە دەستی لەم جیابوونەوەو ئینشیعابەدا هەبووەو چەك و پارمەتی ماڵی زۆرتان داوە بەرێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، ئایا ئەوە وابوو، ئەمە یەك، دووهەم ئایا ئەو جیابوونەوەی رێبەرانی شۆڕشگێڕ مەوقعیەتی کۆمەڵەی بەهێز کردو و دیموکراتی لاوازکرد، هۆکاری ئەو جیابوونەوەیە چیبوو، رێبەرانی شۆڕشگێڕ لەراگەیاندنەکانیدا حزبی دیموکراتیان بە تاقمەکەی قاسلۆ ناودەبرد، بەڵام دواتر ئەمانە لەناو حزبێکدا یەکیانگرتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو پرسیارە زۆر لایەنی جۆراوجۆری هەیە ، یەکەم ئەوەی کە بە رای من، کۆمەڵە

**کۆنگرەی سێیەم و بەشداربوونی مام جەلال لە (١٩٨٢) لە سەردەشت**

**کۆنگرەی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران**

**٭لە پرسیارەکانی پێشوماندا باسی کۆنگرەی یەکەم و دووەمی کۆمەڵەمان کرد، کۆنگرەی سێهەمی کۆمەڵە چۆن چۆنی بوو؟ کەی بەسترا؟ لەکوێ بەسترا وە ئاڵوگۆڕیان و خوێندنەوەی تازە چیبوو کە ئێوەکردتان؟ وە ئەو کاتە کۆمەڵە لەگەشەیەکی بەرچاودابوو؟ گرنگترین ئەو بڕیارنامانە و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کەلەوکاتەدا لەکۆمەڵە کرا چی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی سێهەمی کۆمەڵە لەڕۆژی (١١)ی گوڵانی(١٣٦١ ) لە(امەی ١٩٨٢) لە یەکێك لە مقەرەکانی کۆمەڵە لەنزیك ئاوایی بەردە سوور، لە ناوچەی سەردەشت دەستپێکرد و بۆ ماوەی یەك هەفتە درێژەی بوو. لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرانی "ئیتحادی مۆبارزانی کۆمۆنیست" ئەو رێکخراوەی کە دواجار بوو بەشێك لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران، مامۆستا شێخ عزالدین و چەند کەسێك لە ئەندامانی دەفتەرەکەی، مام جەلال و نوێنەرانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، نوێنەرانی رێکخراوی ئاڵای رزگاری لەکوردستانی تورکیا بەشدار بوون. کۆنگرەی (٣)ی کۆمەڵە چەند بابەتی گرنگی تێدا یەکلایی کرایەوە، لەوانە بۆ یەکەمجار گەلاڵەی خودمۆختاری کۆمەڵە بۆ کوردستان لەم کۆنگرەیەدا وەکو بەرنامەیەکی کامڵ پەسەند کرا. پێشتر گەلاڵەی خودمۆختاریمان بوو، لەم کۆنگرەیەدا وردترمانکردەوە و لەشکڵی بەرنامەیەکی هەمەلایەنەدا پەسەندکرا. هەروەها بەرنامەی حزبی کۆمۆنیست پێش پێکهاتنی حزب هەر لەو کۆنگرەیەدا دەقی نیهاییەکەی پەسەند کرا.

پێشتر لەسەر گەلاڵەی ئەو بەرنامەیە باسی زۆر کرابوو. هەموو ئەندامانی کۆمەڵە دیتبویان، زۆربەیان ئەزەر و مۆلاحەزەی ئیسلاحیان لەسەردابوو، لە کۆنگرەدا وەکو ئامادەکاریەك بۆ پێکهێنانی حزب پەسەندکرا و بڕیاردرا کە بڵاوبکرێتەوە. مەبەست ئەوە بوو پێش پێکهاتنی حزب سەرنجی زۆرتری هێزە چەپەکانی ئێران بەرەو ئەو حزبەی کە قەرار بوو پێکبێت ڕابکێشین.

کۆمیتەی ناوەندی ئەرکی بەدواداچوونی پرۆسەکەی پێسپێردرا.باسێکی دیکەی گرنگی ئەو کۆنگرەیە مەسەلەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی شوێنە رزگارکراوەکانی کوردستان بوو. لەو کۆنگرەیەدا بوو کە بە وردی باسی شوراکان کرا و بە پێی باسەکان و پەسەندکراوەکانی ئەو کۆنگرەیە، دەسەڵات بە ماف و بەئەرکی جەماوەری خەڵك دانرا و بڕیاردرا کە پارمەتی خەڵکی ناوچە ئازادەکان بدەین لەرێگەی شورای هەڵبژێردراوی خۆیان ئەرك و کاری خۆیان بەڕێوەبەرن و ئێمەش بە هەموو توانا وە کار ئاسانیان بۆ بکەین.

**٭ئێوە هەمیشە رەخنەی ئەوەتان لەحزبی دیموکرات ئەگرت کە داخوازی خودموختاری بۆ کوردستانە، لەم کۆنگرەیە ئێوە خودی خودموختاریتان قبولکرد، بۆچی ئەوکاتانە قسەتان لەسەر بەرنامەیەکی باشتر نەکرد وەکو فیدرالی، یان ئێوە کە زۆرجار کەباسی سەربەخۆیی کوردستانتان نەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رەخنەی ئێمە لە حزبی دیموکرات لەسەر خودمۆختاری نەبووە، ئەگەرچی بەرنامەی ئێمە و ئەوان بۆ خودمۆختاری جیاوازی زۆری هەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا، ئەوە خاڵی هاوبەشیشمان بوو کە بۆ دەورەیەك بنەمای هاوکاریەکانمانی پێکهێنابوو. بۆ نمونە ئێمە و ئەوان پێشتر لەسەر گەلاڵەی (٢٦) مادەیی بۆ خودمۆختاری کوردستان رێك کەوتبووین. خودمۆختاری لە ساڵەکانی سەرەتای دوای رووخانی رژێمی شا و

هاتنە سەرکاری رژێمی کۆماری ئیسلامی ببوو بە داخوازیەکی جەماوەری و هەر بۆیە کۆمەڵەش بەرنامەی بۆی هەبوو. لە ساڵانی دواتردا خەبات و موقاومەتی خەڵك بەرانبەر بە دەسەلاتی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان درێژەی هەبوو، بەلام بزووتنەوەیەکی "خودمۆختاری خوازانە" لە ئارادا نەمابوو. مەسەلەی ماق سەربەخۆیی لە بەرنامەی ئەو کاتیشمان هەر بوو. بەڕەسمی ناسینی ماق خەڵکی کوردستان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ و خەبات بۆ پێکهاتنی هەلومەرجێك کە بتوانێ لەو مافەی خۆی کەڵك وەربگرێ، ئەوە خاڵێکی نەگۆڕی بەرنامەی ئێمە بووە هەتا ئێستاش، بەلام هەر وەك باسمکرد ئەو کات خەڵکی کورد لەو سەنگەرەدا، بەرانبەر بە دەسەلاتی دەوڵەتی مەرکەزی لەکوردستان موقاوەمەتی دەکرد. رەخنەی ئەوکاتی ئێمە لە حزبی دیموکرات ئەوە بوو کە رێگای گفتوگۆی جیاوازی لەگەڵ دەوڵەت دەگرتەبەر و لە گفتوگۆکانیدا داخوازیەکانی خەڵکی کوردی کە لە گەلاڵەی (٢٦) مادەیی هاوبەشماندا هاتبوو، دادەشکاند وا بەنەزەر دەگات کە بۆ ئەوان تەنیا وشەی خودمۆختاری بە هەر ناوەرۆکێکەوە لەلایەن دەوڵەتی مەرکەزیەوە قبوڵ کرابا، کافی بوو.

**دەچوینە لای مام جەلال بۆ قەندیل**

***بەشداربوونی مام جەلال و شێخ عیزەدین حسێنی و ئەوانە، ئەوندەی من دیقەتم داوە مام جەلال هەمیشە لەکۆنگرەکانی ئێوە، لەکۆنفرانس، لە زۆربەی کێشەکانی ئێوە بەشدارە ئەو نزیکایەتی و دۆستایەتیەی ئێوە لەگەڵ مام جەلال چۆن چۆنی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستە برێك بگەرێینەوە دواوە. رووداوەکانی ساڵی (١٩٧٥) و شکستی شۆڕشی کوردستانی عێراق، دەنگدانەوەی زۆر گەورەی لەکوردستانی ئێران هەبوو. بە تایبەت کە بە هەزاران کەس لە خەڵکی کوردستانی عیراق ئاوارەی کوردستانی ئێران بوون. ئەم رووداوە کاریگەری زۆر خراپی لەسەر وورەی خەڵکی کوردی لای ئێمەش دانابوو، کۆمەڵە ئەوکات لەنامیلکەیەکدا لەژێر ناوی "پیلانێکی نوێ لە دژی گەلی کورد" ئەو رووداوەی لێکدا بۆوە و هەڵوێستی گرتبوو.

کاتێك دوو ساڵ دوای ئەو رووداوە هەواڵی هەڵگیرسانەوەی خەباتی چەکداری لە کوردستانی عیراقمان بیست، سەرنجی زۆری ئێمەی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا و لە هەوڵی ئەوەدا بووین لە چەند و چۆنەکەی ئاگادار بین، کە بیستمان رێکخراوێکی چەپی مارکسی لە ناو ئەو حەرەکەتەدا هەیە ئەوەندەی دیکە عەلاقەمەند بووین کە پەیوەندیان پێوە بکەین و لەگەڵ حەرەکەتەکە ئاشنا بین. نامیلکەی راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانمان، لە هەموو شوێنێك بلاوکردەوە. کاتێك کە ئێمە پەیوەندیمان پێوەکردن لە دژوارترین هەلومەرجی ژیان و خەباتی خۆیاندا بوون. کارەساتی هەکاری قەومابوو، لە ژێر زەختی دەوڵەتانی ئێران و عیراق و تورکیادا بوون و لە کوێستانەکانی قەندیل دا گیرسابوونەوە. بریارماندا، کەس بنێرین بۆ لایان، بۆ پەیوەندی گرتن و هەروەها دەستماندایە کۆکردنەوەی یارمەتی بۆیان. یەکەم کەسی ئێمە کاك خانەی مۆعینی بوو، دوواجار دکتۆر جەعفەری شەفیعی و چەند هاورێ دیکەمان چوون بۆ لایان. ئەوە یەکەم ئاشنایی ئێمە بوو لە نزیکەوە لەگەڵ مام جەلال لە کوێستانەکانی قەندیل.

مام جەلال لە کۆنگرەی (٣ و ٤)ی ئێمەدا بەشداربووە و وتەکانی لەم کۆنگرانەدا لەئارشیوی کۆمەڵەدا تۆمارکراون. ئێمەش لە کۆنفرانسی یەك و دوو و سێی کۆمەڵەی رەنجدەراندا بەشدار بووین.

**مام جەلال رەشنووسەکەی ئێمەی گۆڕی، کەچی ئێستا کاری پێناکات**

*بیستوومە لە کۆنگرەی ٢ی کۆمەڵەدا، مام جەلال دوای ئەوەی کە رەشنووسی بەرنامەی کۆمەڵە بۆ خودمۆختاری کوردستان دەبینێ، رەخنەی لێدەگرێ، کە لەم بەرنامەیەدا بۆچی تەنها ماف پەنابەرێتی بۆ کوردەکانی ناوچەکانی تر هاتووە، بەڵام دوای قسەکانی ئەو ئێوە رەخنەکەتان وەرگرت و پەنابەرێتیتان گۆڕی بە پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد لە پارچەکانی تر، کەچی ئێستا حکومەتی هەرێم ئەو مافەش نادات بە کوردە سیاسییەکانی نیشتەجێی ئێرە، ئەو باسە چۆن بیری مام جەلال دێننەوە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە ئێوە بیستووتانە رێك وابوو. لە سیمینارێکی پەراوێزی کۆنگرەدا کە مام جەلالیش بەشدار بوو ئەو رەخنەیەی لێ گرتین و ئێمەش سەلماندمان. وەك من بزانم ئێستا حکومەتی هەرێم لەم بابەتەوە لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی ناکۆکییان هەیە. هەرچۆنێك بێ لام وایە کە ئەوە لانیکەمی کارێکە کە بۆ تێکۆشەرانی سیاسی کوردستانی ئێران لێرە پێویستە بکرێ و گەلێکیش لەوە ئەولاتر، حەق وایە حکومەتی هەرێم ئەو رەخنەیەی ساڵی ١٩٨٢ی مام جەلال لە رەشنووسی بەرنامەکەی ئێمەی لەبەرچاو بێ و بە پێی ئەو گۆڕانکارییە هەڵس و کەوت بکات کە ئەوکات ئێمە لە سەر پێشنیاری مام جەلال هێنامانە ناو بەرنامەکەی خۆمانەوە.

کۆمەڵەو رۆڵی شوراکان

*باسی شورا ئایا کارکردنی شوراکان تا چەند سەرکەوتووم یەعنی ئەزموونێکی واقیعی بوو توانیتان ئێوە بیسەلمێنن کە فعیلەن سەرکەوتووە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەر لەڕۆژەکانی پێش رووخانی رژێمی شاوە، شوراکان لە شار و لە دێ دامەزران، لەگەڵ لەبەر یەکترازانی دام و دەزگای رژێمی شا، ئەو شورایانە کە هەموویان جێگەی متمانەی خەڵك بوون کۆنترۆڵی شارەکانیان بە دەستەوە گرت. تاڵان و بڕۆ روویشەدا، ئەمارەکانی دەوڵەتی، کەلوپەلی ئیدارە دەوڵەتییەکان، هەمووی هاتنەژێر کۆنترۆڵی شوراکانەوە. هەڵبەت لە برێك شوێن ئەو پرۆسەیە هەروا بە ئاسانی نەچووە پێشەوە. بۆ نموونە لەشاری سنە چەند لایەن لەسەر بەڕێوەبردنی شار تووشی ناکۆکیبوون، کۆمیتەی سەر بە جمهوری ئیسلامی کە ئاخوندێك بە ناوی سەفدەری بەڕێوەیدەبرد. مۆفتی زادە و لایەنگرانی کە رەوتێکی مەزهەبی بوون، کۆمەڵە، چریکە فیدائیەکان، حزبی دیموکرات بەڵام سەرئەنجام هەموو رێککەوتن و شورای شاری سنەش بەهەڵبژاردن دیاریکرا.

پێشتر باسی بنکەی گەڕەکەکانم کرد. سەرجەم ئەزمونی شورا سەرکەوتوو بوو، بەڵام بە داخەوە کورت ماوە بوو و بە هێرشی رژێمی جمهوری ئیسلامی بۆ سەر کوردستان لە شارەکان لەناوچوون و لەبرێك دێهاتیش کە لەناوچەی ئازاددا بوون هەر شوێنێك حزبی دیموکرات دەسەڵاتی هەبوایە بە بیانووی ئەوەی کە ئەمانە دەستکردی کۆمەڵەن هەڵیدەوشاندنەوە.

شکڵی دەسەڵاتی شورایی ئەو ئینسانانەی کە لەناو کۆمەڵگادا لەهیچ شوێنێك ناویان نییە و مافیان پێشێلکراوە ، بەرزیان دەکاتەوە دەیانهێنێت تا ئاستی بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا، کەسێك کە نووسەر نییە، شاعیر نییە، هونەرمەندێکی بەرجەستە نییە، دەوڵەمەندێك نییە کە بە ئیعتیباری سەروەتەکەی ناوی دەرکردبێ و مەسەلەن رۆژێك لەڕۆژان کارێکی خێرخوازانەی کردبێ و لەو رووە ناوێکی دەر کردبێ ، هیچکام لەوانە، هیچ کات دەسرەسی بە وەسیلەیەکی وا نەبووە کە لە ئاستێکی بەرینتردا خۆی بە کۆمەڵگا بناسێنێ، وەها کەسێك دەتوانێ باشترین بەڕێوەبەری کاروباری گەڕەکەکەی خۆی بێ و لە رێگەیەوە خۆی بناسێنێ و

تواناییەکانی گەشە پێبدات و ڕێگە پەیەدا بکات بۆ ئاستی بالاتری دەسەلات.

**پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران ( سەردەشت) ۱۳٦۲**

***باست لەوەکرد لە کۆنگرەی سێهەمدا لەگەڵ ( ئیتیحادی موبارزانی کۆمۆنیست) جەماعەتی مەنسوری حیکمەت و لەگەڵ بەشێك لە چەپەکانی ئێران قسەکرا بۆ بونیادنانی حزبێکی تازە، بەناوی (حزبی کۆمۆنیستی ئێران) یەعنی من ئەمەوێت سەرەتا باسی ئەوە بکەم ئایا ئەو بیرۆکەیە یا دروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەو کۆنگرەیەوە سەرچاوەی گرت یان پێشتر ئێوە بەرنامەیەکتان هەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ڕۆژی ئەوەڵەوە کە کۆمەڵە پێکهات، ئاسۆی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی لەبەرچاو بوو. سێ ئامیلکەی سەرەکی کە لەساڵەکانی (۱۹۷۰) ی زاینیدا لە ناو ڕیزەکانی ئێمەدا دەست بەدەست دەگەرا و وەکوو بنەمایەك بۆ پەروەردەکرنی ڕیزەکانی کۆمەڵە چاویان لێدەکرا، لە هەر سێکیان دا لەسەر پێویستی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێداگری کراوە. هەر سێکیان بەفارسی نوسراون: "بۆچی پرژو بلاوین و چۆن یەك بگرین" و "بۆ پێشەوە بەرەو یەکگرتنی نوسوڵی کۆمۆنیستەکان" و "پلانێکی نوێ لە دژی خەڵکی کورد" .

پلانی ئەسڵی بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیست لە ساڵی (۱۳٦۰)لە کۆنگرەی دووی کۆمەڵەدا دارێژرا و کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە بۆ هەوڵدان لەم جیهەتەدا ئەرکی پێسپێردرا. کۆمیتەی ئەداروکی حزبی کۆمۆنیست کەمتر لە ساڵێك دوای ئەو کۆنگرەیە پێکهات. ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە بریتی بوون لە عەبدوڵڵا موهتەدی کە ووتە بێژی کومیتەکە بوو، دوکتۆر جەعفەر شەفیعی، شوعەیب زەکریایی، جەواد مشکی، مەنسوری حیکمەت، حەمید تەقوایی، خەسرەو داوەر.

***ئەو دافیعانە چیبوون بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیست؟ کێبوون ئەوانەی کە جەختیان لەسەر ئەوە ئەکردەوە کەپێویستە حزبی کۆمۆنیست پێکبێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە بۆچونێکی جێکەوتوو بوو بە لای ئێمەوە، کە شۆڕشی کرێکاری لە ئێران بە بێ سەرکردایەتی حزبێکی پێشرەو سەرناکەوێ. قسە لەسەر پێویستییەکەی نەبوو، قسە لەسەر ئەوە بوو کە ئایا هەلومەرجی پێکهاتنی ڕەخساوە یان نا؟ کەرەسەی پێکهاتنی ئەو حزبە ئامادەیە؟ ئێمە لامان وابوو کە بۆ پێکهێنانی حزب چەند مەرجێك دەبێ هەبێ بەرنامەیەکی کۆمۆنیستی، لانیکەمی پێگەیەکی کۆمەلایەتی، ڕێبەرایەتی و ژمارەیەك کادری کۆمۆنیست. ئەو کات لامان وانەبوو کە هەمووی ئەو مەرجانە بە تەواوی پێکهاتوون، بەلام بەهۆی هەلومەرجی سیاسی دوای شۆڕش لە ئێران و چارەنووسێك کە ئەو شۆڕشە پەیدای کردبوو و هەلومەرجێك کە هێزە چەپ و کۆمۆنیستەکان تێی کەوتبوون لامان وابوو کە دەبێ پەلەی لێبکرێ، بۆ ئەوەی پێش بەدابران و بلاو بوونەوەی کادرەکانی ئەو بزووتنەوەیە بگیرێ.

لامان وابوو ئەو کەم و کوریانەش کە هەیە بە بوونی حزب باشتر چارەسەر دەکرێن تا لە نەبوونیدا. هێزەکانی چەپ و کرێکاری لە ئێران لە شۆڕشی (۱۳٥۷)دا دەورێکی چارەنووس سازیان بینی. مانگرتنەکانی مانگی هاوین و پائیزی ئەو ساڵە کەزۆربەیان کرێکاری بوون و ڕێکخراو و کادر و هەڵسوراوانی کۆمۆنیست دەوری سەرەکییان تێیدا هەبوو، پشتی ڕژێمی شای شکاند. لەسەردەمی ڕاپەڕیندا لە هەموو کارگە و کارخانە گەورەکان لە پالاوگەکانی نەوت، شورای کرێکاری پێکهاتبوو. لەیەکەم ڕۆژی یەکی ئەیاری دوای ڕاپەڕیندا لەسەر بانگەوازی سازمانە رادیکالەکانی چەپی ئێران بە سەدان هەزار کرێکار هاتنە سەر شەقامەکانی شاری

تاران. بزووتنەوەی ژنان، بزووتنەوەی خوێندکاران، بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان، ئەوانە هیچ کامیان لەژێر سەیتەرەی ئیسلامییەکاندا نەبوون.

بەو حالەشەوە هەتا چاومان کردەوە، بە هۆی کارناسانێك کە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بۆ حەرەکەتی ئیسلامی کردیان، ئەوانیش کە هێز و توانا و پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان هەبوو، لە خەباتی دژی شادا بەشدار بوون، هاتنە روو و هاوسەنگی هێزیان بە قازانجی خۆیان گۆڕی.

ئێمە پێمانوابوو شۆڕشی ئێران بە هۆی نەبوونی حزبێکی یەکگرتووی خاوەن بەرنامە و ستراتیژو رێبەرییەوە بەو چارەنووسە گرفتار بوو، نەگینا پێگەی کۆمەڵایەتی چەپ لەوە بەهێزتربوو کەبەمجۆرە، تەفر و توونا بکرێ. دوژمن هێرشی هێنابوو، دەبوایە سەنگەر بەندی یەك لە بەرانبەریدا بکرێ، بۆ ئەوەی خەسارەتەکانمان کەمتر بێتەوە، ورەی هەڵسووڕاوانی کۆمۆنیست لە دەرەوە و ناوەوەی زیندان بەرزتر بێتەوە. بەنیسبەت کوردستانیشتەوە خەڵکی کورد ئەگەرچی دەستیدابووە موقاوەمەتێکی سەروماڵی، بەڵام هەمووان هەستیان بەوە دەکرد کە پێویستیان بە پشتیوانی سەرتاسەری هەیە. بۆیە کاتێك دەمانگوت لە هەوڵی پێکهێنانی حزبێکی سەرانسەریدابن، کە هێز و تواناکانمان یەك بخاتەوە، ئەو بەشە لە خەڵکی کورد کەپشتیوانیان لە کۆمەڵە دەکرد، پێی خۆشحاڵبوون. ئەو خاڵەش جێگای سەرنجە کە هەر ئەوکات حزبی دیموکراتیش وەکوو باڵێکی دیکەی موقاوەمەت لە کوردستان چۆە ناو "شورای نیشتمانی بەرگری"یەوە و بوو بە هاوپەیمانی رێکخراوی مۆجاهدینی خەڵك. لایەنگرانی حزبی دیموکراتیش بە هۆی ئەو سیاسەتەوە حزبەکەی خۆیان سەرزەنێش نەدەکرد. نەك هەر ئەوکات ئێستاش کەسێك بیهەوێ رێگایەکی سەر راست بۆ رزگاری خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێران لە ستەمی نەتەوایەتی نیشان بدات، هەر دەبێ لەهەوڵی پێکهێنانی هاوپەیمانی و یەکگرتوویی بۆ گۆڕینی دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزیدابێ، بەبێ ئەوەی کە لە تاران دەوڵەتێك لەسەرکار بێ کە هیچ بەرژەوەندییەکی لە ئیدامەی ستەمی نەتەوایەتیدا نەبێ، هیچ دەستکەوتێك لەژێر هەر ناوێکدابێ، ناتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن بەردەوام بێ. خۆ ئەگەر وەها دەوڵەتێك لەسەرکار نەبێ ماق جیابوونەوەش بەرەسمی ناناسێ. مەبەستم لەم مافە ئەوەیە کە بوونی کۆمەڵە وەکوو بەشێك لە حزبێکی کۆمۆنیستی سەرانسەری، لە هەمان کاتدا کە لەگەڵ ستراتیژی سیاسی و بەرنامەی گشتی ئێمە دێتەوەئاسۆیەکی روونیشە کە بە رووی خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێران بۆ رزگاری لە ستەمی نەتەوایەتی کراوەتەوە. خۆ ئەگەر خەڵکی کورد خەڵکی خورد وەها دافیعەکی لەو سیاسەتەی کۆمەڵەدا هەست پێنەکردبایە بە درێژایی (٢٤)ساڵی رابردوو کەکۆمەڵە وەکوو بەشێك لەو حزبە چالاکی کردووە، پشتیوانی لێنەدەکرد.

لە وەڵامی بەشی دووهەمی پرسیارەکەتاندا، لەناو کۆمیتەی ناوەندی ئەو کاتەی کۆمەڵەدا هیچ کەس دژی پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست نەبوو. پێش کۆنگرەی (٣)ی کۆمەڵە باسەکانی مەربوت بەبەرنامەی حزب لەناو "دەستەی نوسەرانی" کومەڵەدا گەڵاڵە بوو کە بریتی بوون لە عەبدوڵڵا موهتەدی، شوعەیب زەکەریایی و ئیراهیم عەلیزادە.

بونیاگوزارانی حزبی کۆمۆنیست (٣٦) کەس بوون

*کەی پێکهات دەقیقەن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: رۆژی (١١ )مانگی شەهریوەری (١٣٦٢)هەتاوی بەراگەیاندنێکی رەسمی لەلایەن

کۆنگرەی دامەزرێنەرەوە لەناوچەی ئالانی سەردەشت.

***کێ بوون بەشدارانی ئەو کۆنگرەی دامەزرێنەرە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** (٣٦) کەس ئەندامی کۆنگرەی دامەزرێنەر بوون که (٥)کەسیان بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی ئەو کات نەیانتوانی بەشداری کۆبوونەوەکان بن و (٣١) کەس ئامادەبوون. (٤)کەس لەوانەی غایب بوون دەنگی خۆیان دابوو بە ئەندامانی حازر. (مەنسور حکمەت، ئیرەج ئازەرین، عەبدۆڵڵا موهتەدی، شۆعەیب زەکەریایی، موزەفەر مەحمەدی، ناسر جاوید، خەسرەو داوەر، رەزا مۆقەدەم، حەبیبۆڵا فەرزاد، غولام کەشاوەرز، ساعد وەتەندوست، جەواد مشکی، گۆرش مۆدەرسی، ئەبوبەکر "سیامەك" مۆدەرسی، حوسێن مۆرادبەیگی، سدیق کەمانگەر، ئیرەج فەرزاد، محەمەد هاشم رەزایی، ئیبراهیم عەلیزادە، جەعفەر شەفیعی، شەریف شاگری، خەسرەو رەشیدیان، عوسمان رەوشەن تودە، رەحمان حوسێن زادە، یەدۆڵا بیگلەری، فاروق بەیگزادە، بابامیری، حەمید تەقوایی، عومەر ئیلخانیزادە، فەرهاد ئەردەلان، عەلی ئەسەغەر نیکخواە "کازم"، رەحمان ئەرغەوانی، موحسێن رەحیمی، محەممەد شافعی، شەهرام، تاهێر خالیدی و عەبدوڵڵا دارابی) لە ناو ئەوانەدا محەممەد شافعی، رەحمان ئەرغەوانی، موحسێن رەحیمی، شەهرام وەکوو ئەندامی کۆنگرە دیاری کرابوون کە بە هۆکاری فەنی نەیانتوانی بەشدار بن.

**حزبی کۆمۆنیست زەربەی لەکۆمەڵە نەدا**

***ئێوە کۆمەڵەتان نەکرد بەقوربانی حزبی کۆمۆنیست یا هەستان نەکرد هەڵەتان کرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست هیچ شتێکی لەکۆمەڵە کەم نەدەکردەوە، بەڵکو توانای زۆرتریشی پێدەبەخشی. هیوا و ئومێدێك گەرێباز و ئامانجەکانی ئەو حزبە بەریزەکانی کۆمەڵەی بەخشی کۆمەڵەی لە قۆناغێکی سەختی ژیانی سیاسی خۆیدا کە بە دوای تێکشکانی شۆڕشی ئێران بەدەستی رژێمی ئیسلامی و بە دوای پاشەکشەکانی یەك لە دوایەکی هێزی پێشمەرگە لەکوردستان تووشی بوو لەرۆژانی دژواری شەڕی داسەپاوی حزبی دیموکراتدا، تێپەراند. بەنیسبەت بزووتنەوەی خەڵکی کوردستانیش بۆ لەناو بردنی ستەمی نەتەوایەتی، کۆمەڵە لەپێناوی بەرێوەبردن و بەسەرکەوتن گەیاندنی ئەو بزووتنەوەیەدا دەسەڵاتی تەواوی پێدرابوو و ئەوە لە پەیرەوی ناوخۆی حزبدا بە وردی فۆرمولە کراوە.

ئەو کات بەتایبەت هەم بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئێران و هەم بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان پێویستییان بەوە بوو کە خۆیان لەچوارچێوەیەکی گەورەتردابیبیننەوە. بە هەڵکەوت نییە ئەگەر هەر لەم دەورەیەدا حزبی دیموکراتیش بە شوێن هاوپەیمانی سەراسەرییەوە دەچێتە ناو شورای میللی بەرگریەوە و لەگەڵ موجاهیدین دەبێتە هاوپەیمان. ئەوەش ئاشکرایە کە رێبەرییەتی ئەوکاتی حزبی کۆمۆنیست دەورێکی بەرچاوی لە پێکهێنانی بەرچاو روونی و ستراتێژی رۆشن بۆ بەسەرکەوتن گەیاندنی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان بینی.

***ئەی بۆ داهاتوو زەرەری نەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حزبی کۆمۆنیستی ئێران دوای ئەو ساڵانەی سەرەتایی کە باسمانکرد هەڵسوکەوتی زۆری هەبووە، تووشی لێکدابڕان و جیابوونەوە هاتووە، بەڵام لە پەیوەند لەگەڵ هەلومەرجێکی سیاسی کە لەئێراندا بووە، ئەم وەزعە تەنها تایبەتمەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران نەبووە، بەڵکو کەم و زۆر هەموو ئۆپۆزسیۆنی ئێران هەر لە وەها مەوقعیەتێکدا بوون. کێ دەڵێ ئەگەر کۆمەڵە نەچووبایە چوارچێوەی حزبی

کۆمۆنیستی ئێرانەوە وەزعی لە ئێستای باشتر دەبوو؟. چاوێك لە وەزعی حزبە ناسیۆنالیستەکانی کوردستانی ئێران بکەن، تەنانەت ئەوانەی بە ناوی کۆمەڵەشەوە کاردەکەن، ئەوجار ئەوەتان بۆ روووندەبێتەوە کە ئەو بڕیارەی ئەو کاتی ڕێبەرایەتی کۆمەڵە، ئەگەر لەچوارچێوەی مێژوویی خۆیدا چاوی لێبکرێ، بە پێی بەرنامە و ڕێبازی سیاسی کۆمەڵە، بڕیارێکی لەجێگای خۆی بووە. لەوانەیە ئەگەر بە فەرز ئەمڕۆ بگەڕێینەوە ئەو سەردەم ڕێگا و شوێنێکی جیاواز بۆ پرۆسەی پێکهێنانی حزب بگرینە بەر، بەڵام بەبڕوای من لە نەفسی پێویستی پێکهێنانی وەها حزبێك پاشگەز نابینەوە.

***ئێوە ئەگەر وایە بۆهەر لەسەرەتاوە شتێکتان دروستکرد بەناوی (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) هەرشتێکتان دروستبکردایە بەناوی (حزبی کۆمۆنیستی کوردستانی ئێران، حزبی کۆمۆنیست) یان سازمانی کۆمۆنیست شتێکی بەو ناوەتان دروستبکردایە و کۆمەڵەتان بۆ دروستکرد ئەگەر وابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر باسمکردبوو بۆتان، کە کۆمەڵە هەر لەسەرەتای پێکهاتنیەوە، هەرگیز خۆی وەکو ڕێکخراوێکی مەحەللی نەناساندووە. هەر بۆیە پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی کوردستانی لە ئاسۆدا نەبووە. بۆ پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش پێویست بوو ئێمە تواناییەکانی خۆمان لە جەرەیانی خەباتی ڕۆژانەی خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێشدا و خەباتی دژ بە دیکتاتۆری شا گەشە پێبدەین. پێگەیەکی تا ئەندازەیەك باشی کۆمەلایەتی بە دەست بێنین.

لەبواری ئەزەریەوە وەڵامی پرسیارە گرنگەکانی سەردەمی خۆمان لەئێران و جیهان بدەینەوە. ئێمە نەمان دەتوانی تەنها بە ئیرادەی خۆمان ئەو حزبە پێکبێنین. مەلزوماتێکی دەویست دەبوایە لە تەدارەکی ئامادەکردنی ئەو مەلزوماتەدا بین و ئەوەش پێویستی بە خەبات و بە زەمان هەبوو.

***چەند سازمان و ڕێکخراوی ئێران وایکرد کە حزبی کۆمۆنیست دروستبێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەرەتاوە مەسەلەکە لەگەڵ زۆربەی نزیك بەتەواوی ڕێکخراوە سیاسییەکانی چەپی ئێران هاتە گۆڕێ. بەشێك لە ڕێکخراوی "پەیکار"، باڵێکی "ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران"، ئامادەبوون کە لە کۆنگرەی دامەزرێنەردا بەشداری بکەن. دیارە کادرەکانی "کۆمەڵە" و "ئیتحادی مۆبارزانی کۆمۆنیست"یش بە شێوەیەکی سەرەکی لە پێکهێنانی حزبدا بەشداربوون. هەروەها بەشێك لە ڕێکخراوێك بە ناوی "رزمندگان ئازادی چینی کارگەر" پشتیوانیان لە پێکهاتنی ئەو حزبە کرد.

**سەهەند باڵی بەهێزی حزبی کۆمۆنیست بوو**

***ئیتیحادی موبارزانی کۆمۆنیست کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ڕێکخراوێکی چەپی ئێرانی بوون، کە پێشتر لە کۆڕێکی چکۆڵەتردا کۆببوونەوە بە ناوی "سەهەند". سەهەند وەکوو ناوەندێکی ئەزەری کۆمەڵێك بابەت و نووسراوەیان لەسەر مەسەلەکانی مەربووت بە شۆڕش و بە کۆمەڵگای ئێران بڵاوکردبووە کە سەرنجی هێزە چەپەکانی ئێرانی بە موافق و موخالیف بەرەو خۆی ڕاکێشا بوو. بڵاوبوونەوەی ئەو باسە ئەزەری یانە بوو بە هۆی گەورە بوونەوەی مەحفلەکەیان و ئەو جار ناوی خۆیان گۆڕی بە "ئیتحادی مۆبارزانی کۆمۆنیست". خەباتێکی ئەزەری کە ئەوان لە دژی "خەلق گرایی" و "پۆپۆلیسم" نوێنەرایەتیان دەکرد لە ناو زۆربەی ڕێکخراوە چەپەکانی ئێران لایەنگرانی خۆی پەیدا کردبوو.

***خەڵکە بارەزەکانی ئەم سازمانە کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەنسور حیکمەت، حەمید تەقوایی، ئیرەج ئازەرین، خەسرەو داوەر، رەزا مۆقەدەم ،حەبیب فەرزاد و ژمارەیەك لە کادرە بەرجەستەکانی دیکەی ئەو ڕێکخراوەیە کە لە لایەن کۆماری ئیسلامی یەوە ئێعدام کران، وەکوو میهدی میرشاە زادە، جواد قائدی، منیرە هاشمی، زهرا دانشوەر فەزلی و چەندین کەسی دیکە.

***ئەوەی کە ئەتانویست وەکو ستراتیژ لە پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستدا تا ئێستا یان تا چەند ساڵ پێش ئێستا هەستانکرد پێی گەیشتوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بێگومان پێی نەگەیشتوین، ئەو ئامانجانە ئەمڕۆش هەر لەبەردەم ئەم حزبەدان و خەباتیان بۆ دەکات. ئێمە قەت لامان وان نەبووە گەیشتن بەو ئامانجانە کارێکی ئاسانە، تەنیا ئەوە نەبێ کە پێمانوا بووە ئەوەی کە دەیڵێین و دەیکەین لەگەڵ ڕەوتی حەرکەتی بەرەو پێشی مێژوو هاو ئاهەنگە و سەرکەوتن مومکینە.

بە نیسبەت حزبی کۆمۆنیستەوە ئەمانزانی کە ئەمە حزبێك نییە کە خۆی هەر بەم قەوارە و پێگەی ئەو وەختەی خۆیەوە بتوانێ ببێ بەستادی ڕێبەریکردنی شۆڕشی چینی کرێکار. ئێمە هەرگیز ئەوەمان نەشاردەوە کەپێگەی کۆمەڵایەتی ئەو حزبە لەناو چینی کرێکاردا لاوازە. بەڵام لامان وابوو بە کۆبوونەوەمان لە دەوری یەکتر و دانی ئینسجامی حزبی بە خۆمان باشتر دەتوانین ئەو گیروگرفتانەی لەسەر ڕێگە لابدەین.

ئەو سەردەمە کە حزب پێکهات، بەشێکی زۆر لە چەپی ئێران تووشی سەر لێشێواویەکی بەرین ببوو. شیعارەکانی دژی ئەمپریالیستی خومەینی و تەوەهۆماتی پۆپۆلیستی ڕێگای لێ وونکرد بوو. چەپی ئێران بۆ ساڵەهای ساڵ دژایەتی لەگەڵ ئەمپریالیسم پێ ئاسەی بوو، بە نیسبەت نیزامی سەرمایەداری ناوخۆ، لای وا بوو ئەگەر گرێدراوی بێگانە نەبێ و سەربەخۆ بێ دەتوانێ هاوپەیمانی چینی کرێکار بێت لە خەباتی دژی ئەمپریالیستیدا. لە لێکدانەوەی ماهیەتی ڕژێمی ئیسلامیدا، بێ توانا بوو. حزبی کۆمۆنیستی ئێران بۆ هەمووی ئەو کێشانەی ئەو وەختە وەڵامی شەفاف هەبوو.

ئەوە ڕاستە کە حزبی کۆمۆنیست بە ئامانجەکانی خۆی نەگەیشتووە، بەڵام هیچ مێژوو نوسێکی واقع بین ناتوانێ چاو لەو ڕاستییە بپۆشێ کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەرەی چەپی ئێرانی لە گێژاوەی فیکری و سیاسی لە دەورەیەکی دیاریکراودا دەرباز کرد، فەرهەنگی سیاسی ئەو چەپەی گۆڕی.

ئەوەی کە چینی کرێکار میحوەری شۆڕشی کۆمەڵایەتی داهاتووە نەك "خەڵك" بە گشتی. ئەوەی کە مارکسیسم زانستی خەباتی چینایەتییە و بۆ فێر بوونی ئەو زانستە لەجیاتی خوێندنەوەی دەستی دووهەم، ڕاستەوخۆ بچینە سۆراغی مارکس و پێداچوونەوەیەك بکەین بە هەموو ئەو شتانەی کە بە ناوی مارکسیسم فێری بووین، ئەوەی کە چ پەیوەندیەك هەیە بەینی خەباتی سۆسیالیستی و خەبات بۆ دیموکراسی، وردکردنەوەی خاڵەکانی ژیانێکی دیموکراتیك لەکۆمەڵگادا و گرتنی بە فەرهەنگێکی جێکەوتوو لە تەبلیغاتی چەپی ئێراندا، ئەمانە بەشێك لەو دەستکەوتانەن کە بێگومان مێژوو بەناوی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە تۆماریان دەکات. جگە لەوانە لە دەورەیەکدا کە دوژمنیش لە هەموو لایەکەوە هێرشی هێنابوو و خەریك بوو کەش و هەوایەك لە نا ئومێدی و بێ هیوایی بە سەر حەرکەتی چەپدا زاڵدەبوو، پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران سەنگەر بەندیەك بوو بەرانبەر بەو بەلامارە.

کەم نەبوون ئەوانەی کە بە پێکهاتنی ئەو حزبە بوژانەوە، دەستە دەستە بە نهێنی دەهاتن بۆ کوردستان و لە شوێنە رزگارکراوەکان لەژێر چاودێری "کومیتەی تەشکیلاتی شارەکان" لەگەڵ بنەماکانی سیاسی و بەرنامەیی و شێوەی کاری ئەو حزبە ئاشنا دەبوون و دوای چەند حەوتوو دەگەرانەوە بۆ شوێنی کار و ژیانیان .

بە هەمووی ئەوانەوە گومانم لەوەدا نییە کە ئەگەر بە فەرزی مەحال ئەورۆکە بگەرێینەوە. ئەو سەردەم، پرۆسەی پێکهێنانی حزبەکەمان لانی کەم لەوردەکارییەکانیدا تەفاوتی دەبێ لەگەڵ ئەوەی کە ئەوکات کردمان. بەڵام ئەوە هیچ لە حەقانیەتی ئەمرۆی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کەمناکاتەوە.

***ئەوە هەست ناکەیت مۆدێلە، هەر حەرەکەیەکی چەپ بێت، خۆی ناو ناوە بە ئەنتی ئەمپریالیزم و بەدژایەتی بۆ ئەمریکا و دژایەتی سەرمایەداری، لەکاتێکدا کۆماری ئیسلامی هەمان دیعایەی دەکرد، هەست ناکەیت ئەوە بۆتە مۆدیل؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوکات "دژایەتی ئەمپریالیسم" ناسنامەی سیاسی و ئایدۆلۆژیکی بەشێکی زۆر لە چەپی ئێرانی بوو. لەم ناوەشدا ئەوەی کەدژایەتیان لەگەڵ دەکرد ماهیەتی "سەرمایەدارانە"ی ئەمپریالیسم نەبوو، بەڵکو وەکو هێزێکی داگیرکەر و تەجاوزکار دژایەتیان لەگەڵ دەکرد. دژی داگیرکاری و دەستتێوەردانی ئەمپریالیسم لە کاروباری وڵاتەکەیان بوون. لەڕاستیدا ئەگەر ئەمپریالیسم یان وەکوو ئیزامێکی سەرمایەداری پێناسەکردبا ئەو کات دیواری چین یان لە نێوان سەرمایەداری وڵاتەکەیان و سەرمایەداری ئەمپریالیستی نەدەکێشا. ڕێگەی خۆیان لە خەباتی دژی جمهوری ئیسلامیدا وون نەدەکرد. حزبی کۆمۆنیست هەرگیز لەو خەتەدا نەبوو، چەپی ئێرانیش بە گشتی ئەمرۆکە دەمێکە ئەو قۆناغەی تێپەرکردووە و لەم بابەتەوەبالغ بووە. هەرچەند هێشتا پاشماوەشی هەر ماوە.

سەرمایەداری مۆدێلی ژیانی داهاتووی بەشەر نییە. ئەو شکافانەی کەلەنێوان فەقر و سەروەت دا و دارا و نەداردا پێکهاتووە خۆی بووەتە ڕێگر لە ڕێگەی گەشەکردنی زیاتری کۆمەڵگا. ئەو کێشەیە سەرەنجام بە قازانجی رەوتی گەشەکردنی کۆمەڵگا یەك لایی دەبێتەوە. موشکیلی ئەوکاتی چەپی ئێران ئەوە بوو کە ئەمپریالیسم و سەرمایەداری ناو خۆی جیا دەکردەوە و ڕادەیەك لەپێشکەوتنخوازی بۆ سەرمایەداری وڵاتەکەی خۆی دانا بوو.ئەمپریالیزم هیچ شتێك نییە غەیری سەرمایەداری. تۆ ناتوانی دژی ئەمپریالیزم بیت، بەڵام لەو وڵاتەی خۆتدا ئازادی نەبێت دژایەتی لەگەڵ ئەمپریالیزم ناتوانێ مەعنای ئەوەبێت کە لێرە دیموکراسی نەبێت ناتوانێ کۆماری ئیسلامی دژی ئەمپریالیزم بێت، بەڵام لێرە هیچ کام لە مافە سەرەتاییەکانی دیموکراتیکی تۆش بەرەسمی ناناسێت.

***من تەوزحیەت بۆ بدەم لەسەر پرسیارەکەی خۆم، زیاتر هەر ئەو جەرەیان و گەرایەش و مەیل و شەخسیاتانەی کە دیعایەیان دەکردو ئەو مۆدیلەیان هەڵگرتبوو خۆیان ئێستا بوونتە سەرمایەدار؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە یەکەم جار نییە لە مێژوودا شتی وا روو ئەدات. کاتێك رژێمێك یان بڵێین ئیزامێك ئەروخێنی، بەڵام هەر کەرەسەی فیکری و سیاسی و ئینسانی ئیزامەکەی پێشوو بۆ جێنشینەکەی بە کار دێنی، ئیزامی کۆن بەئاسانی دەتوانێ سەر هەڵبداتەوە. کۆیلەکان کاتێك لەدژی کۆیلەداران ڕاپەرین، چونکە کەرەسەی ئیزامێکی نوێ یان لەبەردەست نەبوو، بەشێوەیەکی ئاسایی هەر دەچوونە سۆراغی ئیزامە کۆنەکە. لەدەورەی فیئۆدالیدا، هەر لە کۆمەڵگای ئێران چەندین ڕاپەڕینی دژی دەرەبەگایەتی کراوە کە

لەناکامدا تەنیا جۆرێکی تر لە دەرەبەگ جێگای دەرەبەگی کۆنی گرتووەتەوە.

لەخەبات بۆ گۆڕینی نیزامی سەرمایەداریش ناگرێ ئەو هێزەی کە گۆڕانکاری لەسەر ئەساسی بەشداریکردنی ئەودا دەکرێ چینی مام ناوەنجی بێ، بەڵام ناوەرۆکی شۆڕشەکە کرێکاری و یان سۆسیالیستی بێ. ئەم چین و توێژانە بە مەرجێك دەتوانن لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا لەخزمەت شۆڕشێکی سۆسیالیستی و کرێکاریدا بن کە هێی سەرەکی بە ژومارە و بە ئایدئۆلۆژی و بەرێکخراو و بە بەرنامە، چینی کرێکار بێ، ئەگەر رەوتی دوارۆژی خەباتەکەمان هەر دووپاتکردنەوەی ئەزمونی رابوردو بێ، ئەو کێشەیە بێگومانیەخەی ئێمەش دەگرێتەوە. مۆدیلی ژیان کاتێك دەتوانێ بگۆڕێ کە کەرەسەی مادی و کۆمەڵایەتی گۆرینەکەت ئامادە کردبێ.

**موهتەدی دەبێتە یەکەم سکرتێری (حکا)**

***یەکەم سکرتێری گشتی حزبی کۆمۆنیست کێ بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك عەبدوڵڵای موهتەدی.

***بەڵام کاك عەبدوڵڵا پێیوایە ئیبراهیمی عەلیزادە و مەنسوری حیکمەت ئەو مەیل و گرایشەیان هێناوەتە ناو کۆمەڵەوە کە کۆمەڵە بەرەو حزبی کۆمۆنیست بڕوات، کە لەکۆمەڵەیەکی کوردستانیەوە بەرەو حزبێکی مارکسی توندرەو بڕوات ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من نکۆڵی لەوە ناکەم کە چالاکانە بەشداری پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانم کردووە و تەنانەت بەیەکێك لەشانازییەکانی ژیانی سیاسیمی دەزانم، هەرچەند ئەوەش دەزانم کەلە پرۆسەی پێکهێنانیدا دەمانتوانی باشتر هەڵسوکەوت بکەین و پلانی رێکوپێك تری بۆ دابرێژین. بەڵام ئەوە مێژووە و رابردووە و ئێستا حزبێکی کۆمۆنیستی واقیعیمان لەبەردەستە کە دەبێ بزانین چۆن لەپێناوی گۆڕانکاری قوڵی کۆمەڵایەتیدا لەکۆمەڵگای کوردستان و ئێران بە کاری دێنین. ئەوە بەشەکەی من.

سەبارەت بە بەشەکەی کاك عەبدوڵڵا پێم باشە کە هەندێك مەعلوماتتان پێبدەم. بەردی بناغەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە کۆنگرەی (٢)ی کۆمەڵەدا دارێژرا. هەمووی نزیك بە تەواوی بریارنامەکانی کۆنگرەی (٢) بەخەتی کاك عەبدوڵڵا نوسراون. کاك عەبدوڵڵا لە باسەکانی مەربوت بەبەرنامەی حزبی کۆمۆنیستدا لەگەڵ نوێنەرانی ئیتحادی مۆبارزانی کۆمۆنیست دەوری یەکەمی هەبوو. وتارە گرنگەکانی گۆڤاری پێشرەو کە زەمینە سازی پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوون لەلایەن کاك عەبدوڵڵاوە نووسراون.

کاك عەبدوڵڵا لەگەڵ دوکتۆر جەعفەری شەفیعی، مەنسور حیکمەت، جەواد مشکی، خەسرەو داوەر، ئەندەمی کۆمیتەی تەداروکی کۆنگرەی دامەزرێنەر بوون، من لەو کۆمیتەیەدا نەبووم و کاك عەبدوڵڵا وتەبێژی ئەو کۆمیتەیە بوو، کاك عەبدوڵڵا نامەیەکی ناوخۆیی هەیە کە بەناوی "شێرکۆ" ئیمزای کردووە، ناوەرۆکی ئەو نامەیە بریتییە لەوەی کە پێویستە لە پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستدا مانلی هیچ شتێکی دیکە غەیری پەیڕەوی ناوخۆ نەبین. رەخنە لەدواخستن و رارابیاندەگرێ کە بۆ پێکهێنانی حزب هەیە. کەچی لایەنی ئیتحادی مۆبارزانی کۆمۆنیست پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی کە پێویستە شێوەی کارمان لە شێوەی کاری وردە بورژواییانەوە بگۆڕین بۆ شێوەی کاری، کرێکاری، بەرنامەی کۆمۆنیستی لە کردەوەی رۆژانەماندا رەنگ بداتەوە. حزبی کۆمۆنیست نابێت تێکەڵاوبونێکی سادەی چەند رێکخراو بێ. بۆچوونەکەی کاك عەبدوڵڵا رەخنەی لێگیرا، هەرچەند لە کردەوەدا پرۆسەی پێکهێنانی حزب زۆر درێژەی نەکێشا.

جگە لە هەمووی ئەوانە کاک عەبدوڵلا بە دڵخوازی خۆی پۆستی سکرتێری گشتی حزبی وەرگرت، ئەو یەکەم کەس بوو کە لەسەر گرنگی ئەو حزبە لەگەڵ فیلم سازێك کە بۆ کەناڵێکی تەلەفزیۆنی فەرانسە کاریدەکرد بە زمانێکی پاراو قسەی کرد و لە هەموو ئەوروپا بلاو بووەوە. هەموو ئەو کارانەی ئەو کاتی کاك عەبدوڵلا بەرای من زۆر باشبوون، ئەگەر ئێستا لێیان پەشیمانە، ماف خۆیەتیو گۆڕانکاری لە فکر و بیر و بۆچوونی ئینسانەکاندا شتێکی گەلێك ئاساییە، بەلام مێژوو بە دڵخوازی ئەمڕۆی ئەم و ئەو ناگۆڕدرێ، لەبیرمە کە ئەو یەکەم کەس بوو کە لە ئاوایی "بێزۆێ" لە ناوچەی نالان بە حەماسەوە ئەو حزبەی روو بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەی ناڵان راگەیاند و دڵنیایکردن کە خەباتی کۆمەڵە لەم رێگایەوە گەشەدەکات و ئەو کات لای وا بوو کە خەڵکی کوردیش لەو رێگایەوە باشتر دەتوانێ ماف نەتەوایەتی خۆی بە دەست بێنێ.

***جا وابوو، ئەوە بۆ ئەو مەبەستەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حزبی کۆمۆنیست بۆ مەبەستی دابینکردنی ماف نەتەوایەتی کورد پێك نەهاتبوو، بەلام بەپێی بەرنامەی ئەو حزبە بە بێ چارەسەرکردنی مەسەلەیەکی دیموکراتیکی وەکوو مەسەلەی نەتەوایەتی کورد و مەسەلەکانی دیکەی پاش ماوەی دەورانی کۆن، هەنگاونان بەرەو شۆڕشی کرێکاری و سۆسیالیزم مومکین نییە. بەبڕوای من ئێستاش ئێمە وەکوو کۆمەڵە لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا باشتر دەتوانین خزمەت بکەین بە چارەسەرکردنی ستەمی نەتەوایەتی لەسەر خەڵکی کورد.

***بەلام کاك عەبدوڵلا لەگەڵ ئەوەشدا دان بەوەدا نەنێتو ئەڵێ ئێمە کە ئەو کارەمانکردووە، هەڵەبووین، کۆمەڵەمان بەلارێدا بردووە، تا ئەو کاتەی کەدیسان کۆمەڵە دروست نەکەنەوە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان ئەڵێ ئێمە تا ئێرە غەڵەت بووین، دوابەدوای ئەوە ئامادەنین ئەو غەلەتە قبوڵ کەین و کار لەناو حزبی کۆمۆنیست بکەین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە بەحسێکی ترە، ئەو رەخنەیەی کەکاك عەبدوڵلا لەرابردووی خۆی دەیگرێت، ئەوە هەڵوێستی ئێستای خۆیەتی. بەلام ئەوە هیچ شتێك لەوە کەم ناکاتەوە کە ئەو یەکێك لە سیما سەرەکییەکانی پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو وە هەموومان بەو ئیعتبارە رێزمان بۆی هەبوو. ئەو حزبەی کە ئەو لە دامەزرێنەرانی بوو کۆمەکی کردووە، بەوەی کە کۆمەڵەش دەورەیێکی سەختی ژیانی سیاسی خۆی سەربەرزانە تێپەڕ کات. خەڵك هەقیانە ئەگەر بیر لەوە بکەنەوە کەسانێك کە (١٨) ساڵ بە لارێ یاندا بردوون ، ئەگەر فەرزیش بکەن لەم رەخنە لە خۆیاندا راستگون، بۆ دەبێ بکەونە شوێن کەسانێك کە لەژیانی سیاسیاندا هەڵەی ئاوا گەورە لەمەودایەکی ئاوا دوورودرێژ دا دەکەن. چۆن دڵنیابن لەوەی کە لەمە بەدواش بە لارێیەکی دیکە یان دانابەن؟

**حزبی کۆمۆنیست لەژێر فشاری دیکتاتۆریەتدا بوو**

***لەو سمینارەی کە تۆ باسکردو تایبەت بوو بە سمیناری شیمال لە ساڵی (١٣٦١) مەنسوری حیکمەت (١٠) تێزی ئەرحکردوە لەو سمینارەدا، لەهەموو تێزێکدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە پێویستە حزبی کۆمۆنیست لە پێویستێکی تاکتیکی و قۆناغی خەباتەوە سەرچاوە بگرێتەوە، دەڵێت حزبی کۆمۆنیست نوێنەرو پارێزەری سەربەخۆیی و جیهانیەتی پرولیتاریایە، دیسان دەڵێت سەرکەوتنی حزب لە تەشکیلاتدان و پەرەگرتنی نفوزی و خۆشەویستی لەناو خەڵکدایە وە کە من لێرەدا راتدەگرم ئەو حزبە تا ئێستا نەبووە بەو خاوەنەی کە نفوزی مەنسوری حیکمەت دەڵێ تا ئەو کاتەش کەخۆی چەند دەورە سکرتێری بووە، وە**

لەحزبی کۆمۆنیستی کرێکاریش تەنها نەیتوانی کەئەو حزبە بێت کە جەماوەری و خاوەن نفوزبێت، وە خەبات دژی رێویزیۆنیزم و جەختکردنەوەیەکی لەسەر مارکسیزم، پاشان هەموو ئەو تەرحانەی کە مەنسوری حیکمەت دەیکات، دواتریش حەمیدی تەقوایی لەسەر هەمان شت بۆچوونەکانی دووبارەنەکاتەوە، ئەمە هەمووی کوتلەیەك بوون مەنسوری حیکمەت و حەمیدو رەزاو کۆرش، دوابەدوای ئەمانە کە حزبی کۆمۆنیست پێکدێت، تاوەکو کۆنگرەی هەشتەم کاك عەبدوڵڵا دیارە سکرتێر بووە و بەو قسانەش جەنابت پشتگیری لەهەموو ئەم تێزانەو لەئەم (١٠)تێزەی سیناری شیمال کردووە، ئەگەر ئێوە پێتانوابوو وە دواتریش، مەبەستی پرسیارەکەشم ئەوەیە هەم حزبی کۆمۆنیست نەیتوانی ببێتە ئەو خاوەن نفوزەی کە مەنسوری حیکمەت باسیدەکات، وە لەپلیۆنۆمی (٢٠)ی کۆمیتەی ناوەندیش کە ئەمە لەبەردەستمدایە جەنابت ئەبینی مەنسوری حیکمەت، وزۆربەی کۆمیتەی ناوەندی جیابوونەوەیان لە ئێوە راگەیەنن، ئەگەر ئێوە پشتگیرتان لەهەموو ئەم تێزانەی مەنسوری حیکمەت کرد، بۆچی هەم نەتانتوانی ببنە خاوەن نفوز لەرووی تەشکیلات و خەباتی دژی ریزویزم، وە بۆچی ئەم جەرایەنەی ساڵی (١٩٩١)دیسان تووشی ئەو ئینشیعابە بوو، وە تەنانەت ئەگەر هەڵە نەبم رەنگە بۆ خۆشت لەگەڵما بیت، گەورەترین تەنسیری مەنفیو نێگەتیڤی داناوە لەسەر کۆمەڵە، بەو پێیەی کە زۆربەی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ خۆی بردووە مەنسوری حیکمەت، تەنانەت پێموایە تۆو کاك عەبدوڵڵاو فاروقی بابە میری و یەك دوانێکی تر مانەوە لەو کۆمیتەی ناوەندیە ئەم هەموو ئاڵوگۆڕانە، من پێموایە جەنابیشت بەرپرسیت لەهەموو ئەو بارودۆخەی کەبەسەر کۆمەڵەدا هاتووە کە نفوزو گەشەو رەنگە رەنگ رێژی کۆمەڵە لەکوردستان پاشەکشەی کردووە لەبەرامبەر هەموو ئەو هەڵمەتانەی کە مەنسوری حیکمەت پێکردوون؟

ئیبراهیم عەلیزادە: قەزاوەتی من لەسەر حزبی کۆمۆنیست وەکوو هی ئێوە وا نییە، هەر چەندە لەوەدا لەگەڵتانم کە نەیتوانیوە ئامانجەکانی خۆی بەدی بێنێت. هەڵبەت بێگومان گەلێك دەستکەوتی باش و گرنگی لە ئێران بووە و لەسەر رەوتی چەپ لەو وڵاتەدا کاریگەری موسبەتی داناوە. مەسەلەی گرنگ ئەوەیە کە بزانین لێکدانەوەمان لەسەر هۆکارەکانی ئەوەی بۆچی نەیتوانیوە ئامانجەکانی خۆی بەدی بێنێت چیە؟ بۆچوونێك کە لەکاتی جیابوونەوەی جەرەیانی کۆمۆنیسمی کرێکاریدا زاڵبوو، لای وابوو هۆکاری ناکام بوونی حزبی کۆمۆنیست لەبوونی بە حزبێکی کارامە، ئامرازی دەستی چینی کرێکار لە خەباتیدا، ئەوەیە کە بیر و بۆچوونەکانی ئەو حزبە بەباشی لەکردەوەی هەڵسوڕانیدا رەنگی نەداوەتەوە، بیری ناسیۆنالیستی و رێفۆرمیستی بە سەر کردەوەیاندا زاڵبووە، ئەو بۆچوونە دەرکی ئەوەی نەدەکرد کە بۆ گەشەکردنی حزبێکی سیاسی لەئاستی جەماوەریدا ئازادی پێویستە. ریشەی کێشەکە لە مێشکی ئینسانەکاندا نییە، بەڵکو لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدایە.

حزبی کۆمۆنیست لەو کاتەوە کە پێکهات هەتا ئەمرۆش بەردەوام لەژێر زەختی دیکتاتۆریدا بووە و لە ماڵنگی جۆزەردانی (١٣٦٠)و خەرمانانی (١٣٦٧)بە دەیان کادری بەرجەستەی ئەو حزبە کەهەڵسوڕاوی بزووتنەوەی کرێکاری بوون ئێعدام کران. ئەو هەلومەرجە بە ئیرادەی من و تۆ ناگۆڕێ. لەو ساڵانەدا، کۆمەڵە بەئیعتباری هێزی پێشمەرگە و خەباتی چەکداری تاڕادەیەك توانی خۆی لەژێر زەربەی دوژمن دەرباز کات. لە هەمووی ئەو ساڵانەدا بۆ حزبی کۆمۆنیست فورسەتی ئەوە نەخوڵقا کە بتوانێ لە کەشوهەوایەکی نیوە دیموکراتیکیش بووە خۆی لە مەحەك بدات. هەر ئێستاکە تۆزقاڵێك هاوسەنگی هێز بە قازانجی بەرەی موخالیفی رژێم لە ئێران گۆڕاوە، ئێمە شاهیدی بوژانەوەیەك لە چالاکی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هەین.

لەسەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێران لە دژی ڕژێمی شا، بۆ کۆمەڵەیەك کە لەدەورەی کاری نەهێنیدا نەیتوانیبوو گەورە بێتەوە و گەشە بکات، فورسەتێکی مێژوویی خولقا کە توانی بە هۆی ڕێبازی دروست، بە هۆی شێوەکاری جەماوەری، بە هۆی ڕاستگۆیی و شۆڕشگێر بوونی وەڵامی پێویستییەکانی زەمانەی خۆی بداتەوە، گەشەیکرد و بوو بەرێکخراوێکی گەورەی جەماوەری.

بۆچی دەبێ فەرزمان ئەوە بێ کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران ناتوانێ لە فورسەتی مێژوویی لەو چەشنە لەداهاتوودا کەڵك وەر بگرێ و خۆی لە ئامانجەکانی نزیکبکاتەوە و سەرئەنجام پێیان بگات. لێرەدا دەمەوێ شتێکی تریشی پێ زیاد کەم، تۆ ناتوانی ناکامییەکانی حەرکەتی چەپ لە هەموو دونیا هەر لە ئامریکای لاتینەوە هەتا ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و چین و ئاسیا، بەسەر حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بشکێنیتەوە. حەرەکەتی چەپ و کۆمۆنیستی، بە هەموو حەقانیەتیشەوە، چەندین پاشەکشەی لەئاستی دونیادا پێ تەحمیل کراوە. ئێمە دەتوانین هیوادار بین کە بە بەشی خۆمان هەوڵدەدەین ئەو ڕەوتە هەڵگەرێنینەوە. ئێمە شکستمان نەخواردووە، بەڵام تەنانەت هەر شکستیش دەتوانێ دەرس و تەجروبەی سەرهەڵدانەوەیەکمان پێبدات. بە دەیان ساڵ لە وڵاتی یەکێتی سۆڤیەت ناسیۆنالیزمی ڕوسی بە ناوی کۆمۆنیزم لەسەر حیسابی ژیان و ماندوو بوون و چەوسانەوەی چینی کرێکار لە کێبڕکێ لەگەڵ دەوڵەتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا و بە تایبەت ئامریکادا بوو. ئاشکرابوونی نهێنییەکانی پشتی دیواری ئاسنین بوو بەهۆی ئەوە کە لە لای زۆرێك لە کرێکاران و خەڵکی دنیا هەموو ئەهامەتییەکانی سەرمایەدارییەکی بێ بەزەییانەی دەوڵەتی کەناوی سۆسیالیزمی لە خۆی نابوو بە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی کۆمۆنیستیشدا بشکێتەوە.

ئەم هەلومەرجە کاری ئێمەی وەکوو هەر کۆمۆنیستێکی دیکە لە هەر گۆشەیەکی دونیا گەلێك دژوارتر کردبوو. تەنیا چەندین ساڵ دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت دوای ئەوەی کە نیزامی سەرمایەداری ئەمپریالیستی نەك هەر نەیتوانی بەدیلێکی ئینسانی بێنێتەکایەوە و کۆمەڵانی خەڵك لە برسیەتی و شەڕ و بێ ماقی ڕزگار کات، تەپ و تۆزی تەبلیغاتی دژی کۆمۆنیستی نیشتەوە و جارێکی دیکە مەجال بۆ سەر بەرزکردنەوەی کۆمۆنیستەکان پەیدا بوو.

جگە لەوە دەمەوێ ئاماژە بە بۆچوونێکیش بکەم کە هەر لەسەرەتاوە لە حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بووە ئێستاش هەر ئیعتیباری خۆی ڕاگرتووە. ئێمە لامان وایە هۆکاری سەرەکی لەوەدا کە ڕەوتی کۆمۆنیستی پێگەی جەماوەری خۆی لە وڵاتانی پێشکەوتوی سەرمایەداری دا بە سۆسیال دێمۆکراسی ئەوە بوو کە بەرانبەر بە ڕێفۆرم و باشتر کردنی ژیانی ڕۆژانەی جەماوەر سیاسەتێکی واقع بینانە و ئۆسولی و عەمەلییان نەگرتە بەر.

ئەمانە هەمووی جێگای لێکۆڵینەوەی دور و درێژن. بەڵام بۆیە ئاماژە پێکردنیان لە وەڵامی پرسیارەکەی ئێوەدا پێویستە، چونکە لە جیهانی ئەمرۆدا هیچ ڕەوتێکی سیاسی ناتوانێ بە جۆرێك لەجۆرەکان لە کار تێکردنی هەلومەرج جیهانی بەسەر چالاکی و خەباتیدا خۆی دور بگرێت.

**مەنسوری حیکمەت گرنگی بەمەسەلەی کورد دەدا**

***تۆ تا چەند موعجیب بوویت بە تێزەکانی مەنسوری حیکمەت وەکو خۆت ئەزانی مەنسوری حیکمەت، هیمەنەیەکی تەواوی کردبوو لە ناو ڕەوتی کۆمۆنیست، تەنانەت تەنسری لەسەر کۆمەڵەش دانابوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەوەندەی کە لەگەڵ مەنسوری حیکمەت لە ناو حزبێکدا پێکەوە کارمان دەکرد

وەکوو مارکسیستێکی بە توانا ڕێزم بۆی هەبوو و پێموایە لە ڕەواجدانی زانستی مارکسی لەناو ریزەکانی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا و تەنانەت لەناو هەموو چەپی ئێران، دەورێکی گرنگی بینی.

ئەو ڕێبازی مارکس و هەروەها لینینی بە باشی دەرك کردبوو و خەلاقانە بە کاری دەهێنا. بەڵام من پێموا نییە کە تا ئەوکات کە لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بوو، شتێکی بە مارکسیسم زیاد کردبێ. تەنها دەتوانم بڵێم بەو ڕێبازە گەلێك ئاشنابوو و دەیتوانی لەگەڵ هەلومەرجی دیاریکراودا، هەڵسوراوانە بیگونجێنێ. ئەو نەك هەر لە کاری تەزەریدا چالاك بوو، بەڵکو هەوڵیدەدا لە سیاسەت دارشتن و دیاریکردنی تاکتیکی وردیشدا دەوری هەبێ. تا ئەوکات خۆی بە تیئۆریسیەن ئەدەزانی زۆرتر بەڵێنین و شێوەکاری و تەجروبەکانی موعجیب بوو.

لە بیرمە کە پێش پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست، کاتێك پەسەندکراوەکانی کونگرەی (۲)ی کۆمەڵە لە ڕێگای هاوڕێیانی تەشکیلاتی تارانەوە بە دەست مەنسوری حیکمەت گەیشت، داوای کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی لە هاوڕێیانی ئێمە لە تاران کرد و رەخنەکانی خۆی لە پەسەندکراوەکانی ئەو کۆنگرەیە لەسەر نەوار تۆمار کرد و بەنوسراوەش بۆی ناردین.

جەوهەری رەخنەکەی مەنسور حیکمەت ئەوە بوو کە کۆنگرەی (۲) تا ئەو جێگایەی کەخۆی لە داوی فکری مائۆئیستی و پۆپۆلیستی رزگار کردووە کۆنگرەیەکی پێشڕەو بووە، لە هەمان کاتدا نەیتوانیوە ڕێگایەکی باش بۆ پتەوترکردنی پەیوەندی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوەی جەماوەری لە کوردستان پێشنیار بکات. ئەو لە ئێمە لە کوردستان زیاتر گرنگی مەسەلەی نەتەوایەتی کوردی لەبەرچاو بوو، ئەو لە ئێمە زۆرتر دەوری پاشماوەکانی نیزامی فیئۆدالی لە چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و زاردا هەست پێکردبوو. ئەو تا ئەو کات کە لە بۆچونەکانی خۆی لە سەر مەسەلەی نەتەوایەتی هەڵنەگەرابۆوە لای وابوو کە کۆمەڵە گرینگی کەم بە حەیاتی بونی دەوری خۆی لە خەبات بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوایەتی داوە. ئەو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی لە مەترسییەك کە لە چەپ رەویەکانی بڕیارنامەکانی کۆنگرەی (۲)دا دەیدیت ئاگادارکردەوە. ئێمە قەناعەتمان بەرەخنەکانی ئەو هێنا. بە پەلە کەوتنیە سازدانی کۆنفرانسێك کە بەکۆنفرانسی (٦) ناسراوە و (٥ تا ٦ ) مانگ دوای کۆنگرەی (۲) بەرێوەچوو، بۆ ئەوەی کە هەڵەکانی کۆنگرەی (۲) راستکەینەوە.

با بیرەوەریەکی دیکەتان بۆ بگەرێنمەوە، مەنسور حیکمەت لە کۆنگرەی (۲)ی کۆمەڵەدا بەشداریکرد. لەکۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەدا سوخەنرانیەکی کرد کە دواجار خۆمان وەکو نامیلکەیەك بلاوماکردەوە.

**مام جەلال لەگەڵ قسەکانی مەنسوری حیکمەت بوو، بەڵام لەگەڵ دروستبوونی (حکا) نەبوو**

لە بیرمە مام جەلال کە لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو رای لەسەر پەیوەستبوونی کۆمەڵە بەحزبی کۆمۆنیستی ئێران نەبوو، بەڵام دوای بیستنی قسەکانی مەنسورحیکمەت قەزاوەتی ئەوە بوو کە: "ئەم قسانەی ئەو هاوڕێیەتان لەم کۆنگرەیەدا کردی زۆر پۆختەیە و زۆر ڕێگا دەکاتەوە بۆ بەرەو پێشبردنی بزووتنەوەی گەلی کورد لە کوردستانی لای ئێوە". ئەمە (۲) نموونە بوو لە دەوری مەنسورحیکمەت لە کۆمەڵەدا پێش پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیست و نمونەی دیکە لەو چەشنە زۆر بوون. بەبڕوای من دوای جیابوونەوەی لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران و پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری مەنسوری حیکمەت وردە وردە بە زۆربەی بیروبۆچوونەکانی پێشووتری خۆیدا چۆوە کە هەتا دەهات لە مارکسیسم دوور دەکەوتەوە و وەکو بەراستی لایەنگرانیشی ناویان لەسەرداناوە لە"حیکمەتیسم" نزیکدەبوەوە.

**ڕەوتی بەرامبەر بەمەسەلەی نەتەوەیی و مەسەلەی قەومی کورد، ئەمەوێت لەزاری تۆوە ببیستم چۆن بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە کاتی پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، چەندجار لە مەنسوری حیکمەتم بیست کە ئەوان هەڵوێستی کۆمەڵە لەم بابەتەوە تەئید دەکەن و تەنانەت وتی کە نامیلکەی "کۆمەڵە و مەسەلەی نەتەوایەتی" لە نووسینی عەبدوڵڵا موهتەدی پێ باشە. بە بوونی ئەو نامیلکەیە ئەوان بە پێویستی نازانن شتێکی تازە بنووسن و ئەوە هەڵوێستی مارکسیسمی شۆڕشگێڕە و هەڵوێستی ئەوانیشە.

مەنسور لە شەڕی ئێمە و حزبی دیموکرات دا، بەردەوام لە بیری دۆزینەوەی ڕێگا بۆ کۆتایی پێ هێنانی دا بوو، ئەو گەلاڵەکەی ئێمەی بۆ خودموختاری کوردستانی تەئید کرد و لە کۆنگرەی (٢)ی کۆمەڵەدا کە وەکو بەرنامەیەك پۆختە کرا، خۆی و هاوڕێیانی دەورێکی چالاکانەیان بۆ گۆڕانکاری تێدا گێڕا. ئەو لای وابوو کە داخوازی خودموختاری سەنگەرێکە کە خەڵکی کورد تێیدا بەرانبەر بە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی موقاوەمەت دەکات. دواجار کە هێزی پێشمەرگە شارەکانی بەجێهێشت و ئەو گوڕ و تینە جەماوەرییە بۆ دیفاع لە خودموختاری نەما، ئەو پێشنیاریکرد کە ئێمە قورسایی تەبلیغاتمان لەسەر ئەو مەسەلە هەڵبگرین و "بەیانیەی مافە سەرەتاییەکانی خەڵکی زەحمەتکێش لە کوردستان" بکەین بە بنەمای کاری تەبلیغیمان. لەو بەیانیەدا بۆ چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی لەکوردستان "مافی دیاریکردنی چارەنوس" هاتووە و تەئکیدکراوە کە خەڵکی کورد مافی خۆیەتی کە بۆ گەیشتن بەو مافە دەستبداتە چەك و خەباتی چەکداریش. ئەو بەیانیە، بەڵگەنامەیەکی گرنگی مێژوویی لە خەباتی کۆمەڵەدایە.

مەنسوری حیکمەت تا ئەو کاتەی لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بوو، بۆچوونەکانی بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی لەگەڵ ئەزموونی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو باسەکانی لێنین یەك بوو. دوای جیابوونەوەی لە حزبی کۆمۆنیست یەکێك لەو یەکەم تێزانەی کە پێیدا چووەوە و لەڕاستیدا ڕەتیکردەوە هەر "مافی دیاریکردنی چارەنوس" لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی بوو. تەنانەت چەند مانگ پێش جیابوونەوەی لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە نامەیەکدا کە بۆ کومیتەی ڕەهبەری کۆمەڵەی نوسیوە دوای ئاسایبوونەوەی ئێواسان لەگەڵ حزبی دیموکرات ئامادەیە لە نوسینی گەلاڵەی هاوبەشی خودموختاریدا لەگەڵ ئەو حزبە یارمەتیمان بدات، کە هەڵبەت مەوزوعیەتی نەبوو، ئەو بۆچونانەی ئەو هەموی گۆڕانی بەسەر دا هاتبوو.

***هەر ئەوەبوو ساڵی (١٩٩١) ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانی بەهەڵچونێکی جەماوەری ناودەبات و ئەڵێت ئەبێ بگەڕێنەوە ژێر دەسەڵاتی بەعس؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم بیستۆە کە گوتبێتی بگەڕێینەوە ژێر دەسەڵاتی بەعس، بەڵام ئەو پێی وابوو کە ئەم ڕاپەڕینە جەماوەرییە ڕەسەن نییە هەڵچونێکە کە لەژێر هاندانی ئەمریکادا ڕوویداوە.

**سەرهەڵدانی کۆمۆنیزمی کرێکاری و**

**ڕۆڵی مەنسوری حیکمەت**

***حەمیدی تەقوایی گەلاڕێزانی (١٣٦٧) لەنوتی لەساڵی (١٩٨٨) لەدیدارێکدا سەبارەت بە پلۆنیۆمی دەیەمی کۆمیتەی ناوەندی، حزبی کۆمۆنیستی ئێران کە لە ڕۆژی (١٥)خەرمانانی (١٣٦٢)بەستراوە، دەڵێ "حزبی ئێمە دەیەوێت جیاواز لەهەموو گەرایش و بۆچوونە سونەتیەکانی نێو بزوتنەوەی چەپ بەرە پێدەر و پارێزەری کۆمۆنیزمی کرێکاری بێت کە یەکجار گرنگ و حەیاتییە، من ئەپرسم مەبەست لە کۆمۆنیزمی کرێکارییە چییە هەرئەم چەمکەیە دواجار وادەکات حەمید و مەنسور و ڕەزا لە پلۆنیۆمی (٢٠)گەلە (٢٠)ئابی (١٩٩١)بەسترا جیاببنەوە، مەبەستم ئەوەیە ئەم تێزانە، هەر تێزەکانی مەنسوری حیکمەتە، تەقوایی و ڕەزاو**

**گۆڕش و دواتر دووبارەی ئەکەنەوە کۆمۆنیزمی کرێکاری وەکو مەیل و تێزێکی تازە ئەهێننە ناو بزوتنەوەی چەپ لەناوچەکەو لەکوردستان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای کۆنگرەی (٥)ی کۆمەڵەو کۆنگرەی (٢)ی حزبی کۆمۆنیست بوو، کە باسی کۆمۆنیسمی کرێکاری هاتە گۆڕێ. پوختەی بۆچوونەکانی مەنسووری حیکمەت لەسەر باسەکانی کۆنگرەی (٢)ی حزب ، لە چەند وتووێژ دا کە لەگەڵگۆڤاری "کۆمۆنیست" کراوە، شیکراوەتەوە. ئەو باسانە نیشانیدەدەن کە تا ئەو کات کۆمۆنیسمی کرێکاری لە رووی ئەزمریەوە باسێکی تازە نییە، باسەکە ئەساسی لەسەر گۆڕینی ئەولەویەتەکانە. بە پێی ئەو بۆچوونە ئەولەویەتەکانی ئەو دەورەیەی کە ناومان نابوو دەورەی "مارکسیسمی شۆڕشگێر" گۆڕاوە، چ لە رووی ئەزەری و چ لە رووی عەمەلیەوە. ئەرکی مارکسیسمی شۆڕشگێر ئەوە بوو کەکۆتایی بە سەیتەرەی پۆپۆلیسم لە بەرنامە و سیاسەت و کردەوەدا بە سەر رەوتی چەپ لە ئێران بێنێ. لامان وابوو کە ئەو دەورەیە کۆتایی پێهاتووە و ئێستا دەبێ ئەو گیروگرفتانەی کە لەسەر رێگای کرێکاری بوونەوەی ئەو حزبە هەیە چ لە باری ئەزەری و چ لە رووی عەمەلییەوە، ئەوانە بناسین. لە رووی ئەزمریەوە چوینە سۆراغی لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی شکستی شۆڕشی کرێکاری لە ئیتحادی شورەوی و چەندین ژمارە لە گۆڤاری "بەرەو سۆسیالیسم"مان بۆ ئەوە تەرخان کرد. لە رووی عەمەلیەوە باسەکانی مەربوت بە میکانیزمەکانی کاری رێکخراوەیی لە ناو چینی کرێکاردا لە جەرگەی دیکتاتۆری بورژواییدا لە ئێران.

تا ئەو کات هەمووومان دەمانگوت کە کۆمۆنیسمی کرێکاری، ئەزمریەیێکی تازە نییە، هەمان کۆمۆنیسمە و رێك ئەو پێناسەمان بۆ دەکرد کە مارکس لە "ئیدئۆلۆژی ئالمانی" دا بۆی دەکات. ئەو بەحسانە بەبڕوای من زۆر بە کەڵك بوون، ئەگەر لە رەوتی خۆی لانەدرابا، ئەگەر ئەکرابا بە ئامرازی کێشمەکێشەکانی ناوخۆیی. دەیتوانی چەند هەنگاو بەرەو پێشمان بەرێت. بەڵام بە داخەوە ماوەیەکی کورت دوای کۆنگرەی(٥)ی کۆمەڵە، ئەو بەحسانە بوون بە مەشغەڵەی تەشکیلاتێك و هێزێك کە ئەساسەن باسەکە هەر رووی لە ئەوان نەبوو. ئۆردوگاکانی کۆمەڵە و هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە بە تایبەت لەم دەورە دیاریکراوەدا کە هاوکاتە لەگەڵ ساڵانی ئەنفال و کیمیا باران لە کوردستانی عیراق، ئەو شوێنە و ئەو کاتە نەبوو کە ئەو بەحسانەی تێدا قووڵکرابایەوە و ئەتیجەی عەمەلی لێوەرگیرابا. بەنیسبەت هەڵسورانی حزبو ئۆرگانەکانی ناوەندی حزب لەدەرەوەی وڵاتیش، ئەو تەشکیلاتە، خۆی کرا بەمەوزوعی کاری خۆی، مەیل و بۆچوونی ناسیۆنالیستی و رێفۆرمیستی و سوسیال دیموکراسی ووەکو رێگر لە پەرە گرتنی کاری حزب لەناو چینی کرێکاردا لە قەڵەمدرا، نەك هەلومەرج سیاسی ئێران و سەرکوت و دیکتاتۆری و کوشت و بڕ. ئەو بۆچوونە ئەو راستییەی لە بیر دەبردەوە کە شۆڕش بە ئیرادەی ئەم حزبو ئەو حزب بەرپا نابێ، هەلومەرجی عەینی و زەینی خۆی دەوێ. حزب دەبێ لە جەرگەی خەباتی رۆژانەدا کە بەرە بەرە کۆمەڵگا لەو هەلومەرجە نزیکدەکاتەوە، خۆی بۆ رێبەریکردنی ئەو شۆڕشەش ئامادە بکات. بەبڕوای من یەکێك لە گرنگترین تێزەکانی کە جێنشینەکانی ئەمڕۆی مەنسووری حیکمەت و تەنانەت خۆشی لە ساڵانی پێش گیان لە دەستدانی پێداچوونەوە، مەسەلەی شێوەی کاری کۆمۆنیستی بوو. ئەوانە تێکەڵاوێك لە شێوەی هەڵسوکەوت و فەرهەنگی سیاسی و شێوە خەباتی لیبراڵی و وردە بورژوازیان لە جیاتی، شێوەکار و خەباتی کرێکاری دانا. ئەوان تووشی ئەو خۆش باوەڕیە بوون کە گۆیا دەکرێ بڕبڕەی پشتی حزبەکەت، چینی مام ناوەنجی بێ، بەڵام ئەم چینە رازی کەی بەوەی کە خەبات بکات بۆ بە دەسەڵات گەیشتنی چینی کرێکار.

حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری لە دەورەی مەنسوری حیکمەت و دوای ئەویش هەوڵدەدەن تونـدڕەوی و سەرگەشی ئاسایی لاوان بقۆزنەوە و بیکەن بە بنەمای حزبێك، نەك بۆ گەیشتن بە دەسەلاتی سیاسی بەڵکو بۆ ئەوەی کە وەکوو حزبێکی خاوەن نێو و مەترەح بن. (حزبی حیکمەتیست) بەبڕوای من حزبێکی وردە بورژواییە کەپێشینەیەکی کۆمۆنیستی هەیە. وەکوو زۆرێك لەو حزبە سیاسیانەی کە بە پێی ئاڵوگۆڕەکانی زەمانە ماهیەتیان گۆڕاوە.

ئەگەر کێشەکە تەنیا پێگەی کۆمەڵایەتیان بوایە، چارەسەر کردنی ئاسانتر بوو. کۆمەڵێك ڕۆشنبیر بە پێگەی کۆمەمەڵایەتی مام ناوەنجی دەتوانن، لە جەرگەی خەباتی سیاسی ناو کۆمەڵگایەکدا، بەرە بەرە لە ئامانجەکانی چینی کرێکار نزیك بنەوە، بەلام ئەوەی کاری گۆڕانکاری لەناو ئەو حزبەیدا دژوارتر کردووە ئەوەیە کە ئەوان مەوقعیەتی ئێستای خۆیان لەژێر ناوی حیکمەتیسمدا و نەکۆمۆنیسم تیئۆریزەکردووە. بە هەمووی ئەوانەوە من هیوا دارم کە ئەو ڕەوتە لە نێو ئەواندا قابیلی هەلگەڕانەوە بێ. تایبەتمەندیەك کە مەنسوری حیکمەت هەیبوو وە جێنشینەکانی نیانە ئەوەیە کە مەنسووری حیکمەت هەرگیز ئینسانێکی دوگماتیست نەبوو. عاشقی ئەو شتە نەبوو کە تەمنانەت پێشتر خۆشی وتبووی، توانای ئەوەی هەبوو کە لە گۆڕانکارییەکاندا و خالە وەرچەرخانە سیاسییەکاندا بە بۆچوونەکانی پێشووی خۆیدا بچێتەوە. بەلام بەبڕوای من ئەو کەسانەی کە ئێستا خۆیان بەدرێژە پێدەری ڕێگای ئەو دەزانن، ئەو بڕوا بەخۆیان نییە کە ئاوەها هەڵسوکەوت بکەن.

**مەنسوری حیکمەت هیچ زیادەیەکی نەخستەسەر مارکسیزم**

***کۆمۆنیزمی کرێکاری چ جیاوازییەکی هەبوو لەگەڵ کۆمۆنیزمی ڕوسی و چینی یان لەگەڵتیرۆتیسکیزمو چەپی سونەتی، ئەم کۆمۆنیزمە کرێکارییە کامە بوو کە ئەوان دیعایەیاندەکرد، ئایا ئەمە تیزێکی تازە بوو لە ڕووی ستراتیژییەوە یان تاکتیك بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشینەی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری هەڵدەگەڕێتەوە، بۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران. جیاوازیەکانی ئەوان لەگەڵ کۆمۆنیسمی ڕوسی و ئۆرۆکۆمۆنیسم و کۆمۆنیسمی چینی و هی تر هەر ئەو جیاوازیانەیە کە لە کاتی خۆیدا و ئێستاش حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەگەڵ ئەم ڕەوتانە هەیەتی. بۆ نمونە ئێمە پێمانوابوو کە ئەوە سەرمایەداریەکی دەوڵەتییە کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا پەیرەو دەکرا، نەك سۆسیالیزم. پێمانوابوو چینی کرێکار لە ڕژێمی سیاسی دەسەلاتدار نامۆ بووە و ئیتر ئەو ڕژێمە بە هی خۆی نازانێ و لە لەئومەرجێکیشدا کە ئازادی ڕادەر بڕین و خۆ ڕێکخستنی سەربەخۆی لێ دریغ کراوە، توانای گۆڕینی ئەو دەسەلاتەی نەبووە. زێدە بایی بەرهەم هاتوو لە هێزی چینی کرێکار بۆتە دەست مایەی ڕەقابەتی ئاسیۆنالیسمی ڕوسی لەگەڵ ئەمریکا لە کێبرکێ تەسلیحاتی یان لە کێبرکێ لەسەر چوونە فەزا و گۆی مانگ و هی تر.

ئیزامێك کە ناوی خۆی بنێ سۆسیالیستی، ناکرێ ژیانێکی ئاسودە و تێر و تەسەلی بۆ چینی کرێکار دوای (٧٠) ساڵ پێکەوە ئەنابێ و ئەکرێ بەرناوەردی بکەی بۆ نمونە لەگەڵ کۆمەڵگایەکی وەکوو سوید.

ئەوە ئاسیۆنالیزمی ڕووسی بوو کە لە ژێر ناوی سوسیالیسمدا، کەوتە شوێن ئەو ئامانجەی کە ئەوەی پێشووی سەرمایەداری ڕوسیە بە ئاواتیەوە بوو، بەلام پێی نەدەگەیشت. سەبارەت بە حزبی کۆمۆنیستی چین، هەر بۆچوون ئەوە بوو کە ئەگەرچی بە شێوەی کۆنکرێت دەبێ گۆڕانکارییەکانی ئابوری ئەو وڵاتە

هەڵسەنگێنێ، بەڵام ئاشکرایە کە سیستمێکی سەرمایەداری ئیوە دەوڵەتی ئیوە کەرتی تایبەت، بە کردەوە حکومەت دەکات. ئەمانە جیاوازییەکانی حزبی کۆمۆنیست لەگەڵ کۆمۆنیزمی چین و شەورەوی بوو کەدوای جیابوونەوەی حزبی کۆمۆنیستی کاریگەری هەمووی جارێکی دیکە لە "بەیانیەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران"دا لە هاوینی ساڵی (١٩٩٤) لە کۆنگرەی چوارەمی حزب فورموڵەکران، بەڵام رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری لەو ساڵانەیی دواییدا گەلێك باسی تری لەبواری جۆراوجۆردا هێنایە ئاراوە کە بەبڕوای من لەچوارچێوەی مارکسیسمدا جێگەی نەدەبووەوە، جیا لەوانە مەنسورە حکمت هیچ شتێکی زێدەی نەخستەسەر مارکسیزم.

***چیبوون ئەو باسانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەسەلەی حزبو دەسەلاتی سیاسی، روخانی رژێمی کۆماری ئیسلامی و هەلومەرجی بەرپا بوونی شۆرشی کرێکاری، دوورکەوتنەوە لە تێزە ئەساسیەکانی حزبی کرێکاری و کۆمۆنیزمی کۆمەلایەتی، و بەو مانایە سێکتاریسم، پێداچونەوە بەبۆچونەکانی لینین لـ، مەسەلەی نەتەوایەتی و گەلێك شتی تر.

***لە ئامیلکەیەکدا کە دواتر مەنسوری حیکمەت وبرادەرانی دەریانکردووە، پێیانوایە ئەو جەماعەتەی کە رۆیشتن لەناو کۆمەڵە، لەناو حزبی کۆمۆنیست چوونە دەرەوە، ئەڵێن ئەمانەوێ هەموو هەڵسوڕاوێکی سۆسیالست کە خۆی بەدەربەست بزانێ بۆ ئامانجە بنەرەتیانەی چینی کرێکاری، مەبەستیان کۆمۆنیزمی کاریگەری و سۆسیالیستە، ئەوان پێیانوابوو حزبی کۆمۆنیست چی لێهاتووە وا بەجێیانهێشت یان مەبەستیان لەم قسانە چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان لایان وابوو کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران و کۆمەڵەش وەکو بەشێك لەو حزبە سێ مەیلی جیاوازی تێدایە. ناسیونالیسمی کورد ، سوسیال دیموکراسی و کۆمۆنیسمی کرێکاری. لە مابەینی ناسیۆنالیسمی کورد و کۆمۆنیسمی کرێکاریشدا مەیلێکی ناوەراستیان دەستنیشاندەکرد کە ناویان نابوو "سانتر". ئامانجی فەوری خۆیان لەم کێشمەکێشە دا پێکهێنانی حزبێکی "یەکبونی" واتە حزبی یەك لەو مەیلانە بە تەنیایی، حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری، دیاریکردبوو. لەڕاستیدا ئەوان ئامادەبوون بۆ هەر دیاردەیەك کەرۆژانە لەدەوربەری خۆیان دەیبینن بە خێرایی تیئۆرێکی قەبە دروستکەن. بە پێی ئەو میتۆدەی کە ئەوان گرتبویانە بەر رادیکالیسم لە باری ئەزەریەوە بریتی بوو لەوەی کە تۆ پێش هەموو شتێك پێویستە جیاوازیەکانت لەگەڵ نزیکترین هاوڕێی خۆت روونکەیەوە. ئەوە ئیتر پەیوەندی بە سیاسەتەوە نیە ، لەوانەی عیلمی دەروونناسی باشتر وەلامی پێبداتەوە.

**من لایەنگری تێزەکانی مەنسور نەبووم**

***کێ بوو ئەو باڵەی نوێنەرایەتی ئەو پێگە ناسیۆنالیستەی ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەشێك لە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەڵبژێردراوی کۆنگرە شەشەم و کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە کە ناوەندێکی چکۆلە تر بوو لە نێوان دوو پلێنۆمدا کاروباری کۆمەڵەی بەرێوەدەبرد. ئەو هاورێیانە ئەو کات لە پلێنۆمی ناسراو بە پلێنۆمی شانزدەی حزبی کۆمۆنیستی ئیران (٢٠ی خەزەڵوەری ١٣٦٨ای هەتاوی) لەژێر زەختی ئەو رەخنانەی کە لێیاندەگیرا ئیستعفا نامەیەکیان بە دەستە جەمعیدا بە ئەو پلێنۆمە. کە دەقەکەی لای من هەیە، دەتوانی بیبینی، وەلامی پرسیارەکەش دەداتەوە:

***مەبەست لەسانتر چی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ساتر بە پێی ئەو بۆچونە لەبەینی ناسیۆنالیزمی کوردو کۆمۆنیزمی کرێکاریدا بوو . لەسەرەتاوە من وەکو ماکەی ئەو مەیلە ناوزەد دەکرام. کاك عەبدوڵڵا لە پلینۆمی (١٦ )هاوپەیمانی ئەوان بوو و بەیانیە بە ناوبانگەکەی خۆی کە لەسەرەتای پلێنۆمدا لەتەنیدی خەتی کۆمۆنیسمی کرێکاری پێشکەشکرد و بەشێك بوو لەو فشارەی کە هاتبووە سەر لایەنی ئیمە بۆ ئیستیعفا، چەند مانگ دواتر لەسەر باسەکانی مەربوت بە هەڵسەنگاندنی جیاواز لە راپەرینی کوردستانی عیراق لەگەڵ کاك عەبدوڵڵاش ئیختلاف نەزەریان لێ پەیدابو و لە ریزی خۆیان وەلایان نا.

***ئەوانەی باڵی سۆسیال دیموکراسی کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** چەند کەسێکیان لە سازمانی مەرکەزی حزب لە کادرەکانی غەیرە کۆمەڵەیی، جاروبار بەو عینوانە ناو دەبرد. ئەوەندەی لەبیرم بێت دیار ترینیان (حەبیبی فەرزاد) بوو کە لە کادرە قەدیمیەکانی کۆمۆنیزمی ئێران بوو. ئەویش پێموایە لە رووی چەند بۆچونێك کەگوایە ئێرە و لەوێ بە شفاهی دەری بڕیبو و هیچ بنەمایەکی مەحکەمی نەبوو.

**ناسیۆنالیزمی کورد لە کۆمەڵەدا هەبوو**

***ئەو مەیل وگەرایش و باڵانەی کەلەناو حزبی کۆمۆنیستدا مەنسور دروستیکردبوو بەفعلی هەبوون باڵێك کە نوێنەرایەتی ناسیۆنالیزمی کوردی ئەکرد، باڵێك نوێنەرایەتی سۆسیاڵ دیموکراتی ئەکرد، باڵێکیش کە ئەوان خۆیان ناونابوو کۆمۆنیزمی کرێکاری ئەمانە سەرەتاکانی دەرکەوتبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من مەیلی ناسیۆنالیسمی کورد هەر لەسەرەتای شۆرشی (١٣٥٧)وە لەناو کۆمەڵەدا هەبوو، بەڵام هیچ کەس بەشێوەیەکی دیاریکراو نوێنەرایەتی ئەو مەیلەی نەدەکرد. زۆرتر لە کردەوە و هەڵسوران و هەڵوێست گرتنی رۆژانەی ئەم و ئەو دا رەنگیدەداوە. هەر لەسەرەوە تا خوارەوەش نمونەی هەبوو. کەس وجودی ئەو مەیلەی بە رەسمی ئینکار نەدەکرد. پێمانوابوو ئاسائیە. ستەمی نەتەوایەتی و خەباتێکی گەرم و گور کە لە دژی ئەو ستمە لەئارا دابوو، مەیلی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی سیاسی خۆشیدەباتە ناو رێکخراویکەوە کە بۆ کۆتایی هێنان بەو ستەمەش خەباتدەکات و ریشەی کۆمەڵایەتی لەناو ئەو خەڵکە داکوتاوە. ئەو مەیلە لەو کاتە دا کە حزبی کۆمۆنیستمان پێکهێنا بەکردەوە بە هێزتر بوو لەو دەورانەی کە رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری پێش جیابونەوە لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران پێی هەراسان ببو. ئەوان لە ناموناسبترین کاتدا پیلەیان بە ناسیۆنالیسمی کورد لە ناو ریزەکانی ئێمەدا گرت. ئەوکاتەی کە خەباتی چەکداری پاشەکشەی زۆرتری کردبوو، کەمپەکانی ئێمە لە کوردستانی عیراق لەژێر زەختی بۆمبارانی دوو دەوڵەتی ئێران و عیراقدابوون. شاری هەڵەبجە بومبارانی شیمیایی کرابوو، (٧٢) هاورێیمان لەرووداوەکی قەراخی سیروان گیانیان لە دەستدابوو، شاڵاوەکانی ئەنفال بەرێوەدەچوون. دۆڵی بۆتی بۆمبارانی شیمیاییکرابوو. ژمارەیەکی زۆر شەهید و بریندارمان دابوو. دەور تا دەورمان پڕبوو لە خەڵکی ئاوارەی کوردستانی عیراق. رێگەی سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات و ناردنی نەخۆش و بریندار و بەساڵاچووەکان و منالان بۆ دەرەوەی وڵات تەقریبەن بەسترابوو. سەر باقی ئەوانە حزبی دیموکراتیش هەر لەسەر درێژەی شەڕ پێیدا دەگرت . دەوڵەتی عیراق هەر رۆژە ئاستەنگێکی تازەی لەم بارەوە بۆ دەخوڵقاندین. رێگەی قاچاخی تورکیا پڕ مەترسی بوو. لە وەها وەزعێکدا کە دەتوانی تەسەوری بکەی چ کەشوهەوایەکی رووحی دژوار بە سەر ریزەکانماندا لەناو کەمپەکانی کۆمەڵە لە کوردستانی عیراق زاڵبوو.

رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری ئەو کەمپانەیکردبوو بە ئامانجی خۆی. کاتێك کە دەمانگووت ئەو بۆچوونانە ی کە لە کۆنگرەی (٢) حزبەوە لەژێر ناوی کۆمۆنیسمی کرێکاری باسیان لێوە دەکری، ئەوانە باوەری هاوبەشمانە، ئێمە ئۆپۆزیسیونی ئەو خەتە نین، گۆییانئەدەدا ، وەکوو خۆیان دەیانگوت تۆپخانەیەکیان بە نوسین لە دەرەوەی ولاتەوە بەرەو کەمپەکانی کۆمەڵە دابەستبوو و لەو هەلو مەرجە سەختە دا خەریکی ژوماردنی لایەنگرانیان و راگەیاندنی سەرکەوتن بوون.

ئێمە بەراستی دەمانەویست ئەو تەشکیلاتە لە عیراق سووك بارکەین، ئەوەندەی بتوانین بیان نێرینە دەرەوە ولات. بەڵام رێگەکان ئاسان نەبوون و موعجیزەیەك نەدەکرا. بەحسی کۆمۆنیسمی کرێکاری کە قەرار بوو وەڵامێك بێ بۆ هەلومەرج جیهانی دوای رووخانی ئیتحادی شورەوی و دیواری بەرلین و کۆتایی شەڕی سارد، ببوو بەخۆراکی بەحسی دورودرێژی مالیخولیایی و ددان لێك سپی بوونەوە و ئازاردانی رووحی یەکتر دانی کەسانێك کە هەتا ئەو رۆژە لە مەیدانەکانی خەباتی پێشمەرگانە دا بە ئاسانی حازربوون گیانیان لەپێناوی پاراستنی یەکتر دا بدەن.

مێژوو نوس بۆ ناسینی واقعیەتەکانی ئەو سەردەم ناچێتە سۆراغی ئەم جوزەوە و ئەم ئامیلکەی و ئەو مقالە، بەڵکو ئەو وەزعە عەینیە کە پێشهات هەڵیدەسەنگێنێ و قەزاوەتی خۆی دەکات . لە ناو ئەو کەسانەدا کە ئەو کات بەرپرسی ئەو وەزعە بوون، بەشێکی بەرچاویان ، ئەمرۆکە کوردایەتی دەکەن وەکوو ئەوەی نە بای هاتبێ و نە باران و بەشێکیشیان ئێستاش لە بورجی عاجی خۆ بە مەرکەزی عالم زانینی ئەوکاتیان نەهاتونەتە خوارێ و پێیانوایە شۆرشی کرێکاری ئەرکی وورده بورژوایە. ببورە لەوانەیە ئە باسە پەیوەندی راستەوخۆی بە پرسیارەکەی ئێوەوە نەبوو بێ، بەڵام من پێموایە باسی ناسیۆنالیسم و کۆمۆنیسم لە ناو کۆمەڵەشدا، نەك هەر لە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بەگشتی باسێکی قەدیمی ترە و واقعیشە .

*بەڵام دواتر ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر باسمکرد ناسیونالیسم لە نێو کۆمەڵەدا هەرگیز ئاڵا هەڵگری بەرەسمی نەبووە. قبوڵکردنی بەرنامەیەکی کۆمۆنیستی، چالاکی کردن بە عەمەلی لە پێناوی وەها بەرنامەیەکدا، کردەوە و ئەخلاق و رەفتاری گونجاو لەگەڵ ئەو بەرنامەیە، ئەمانە هەمووی مەرجیبوون بە ئەندام لە ناو کۆمەڵەدا بووە. کەسی وا نەبووە کە بڵێین ناسیونالیست بێ، بەڵام بە نهێنی خۆی خزند بێتە ناو ریزی ئێمەوە، بەو هەموو خەتەر و رەنج و سەختییەی کە فەعالیەت لە ناو ریزی کۆمەڵەدا هەی بوو، کەس مەجبوور نەبوو، خۆی تووشی ئەو هەموو ژانە سەرە بکات. کە دەڵێین ناسیونالیسم لە ناو ریزی کۆمەڵەدا هەبوو، مەبەستمان ئەوەیە کە ئەوە لە کردەوەی رۆژانەدا، لە کاری تەبلیغی، لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك، لەشێوەی خەباتی پێشمەرگانە، لە ئەخلاق و رەفتاردا دەبیندرا. ئەو کەسانەی کە هەڵگری کولتور و هەڵسوکەوتی ناسیونالیستی بوون تەنانەت خۆشیان نەیاندەزانی کە بەم جۆرە لە ژێر کاریگەری عەمەلی ناسیۆنالیسمی کورد دان. خەباتی نەتەوایەتی لە کۆمەڵگایەکی وەکو کوردستاندا، بەردەوام ئەم ناسیۆنالیسمە بەرهەم دێنێتەوە، لەئەدەبیات و شیعر و موسیقا دا، لە رەفتار لەگەڵ ژندا، لە رەفتار لەگەڵ خەڵکدا، تووشی ئەبێ.

سوننەتی کوردیەتی لەناو ئێمەش دا حوزورێکی زیندووی هەبوو. بەڵام نوێنەر و پلاتفۆرمی نەبوو. ژیان و خەباتی ئێمە تێکەڵاوی خەڵك بوو، ئەو خەڵکەی کەساڵەهای ساڵ بوو، سوننەتێکی دیکە، رێبازێکی دیکەو فەرهەنگێکی دیکە غەیری ناسیونالیسمی کوردیان، نەدیتبوو.

کۆمەڵە حەرەکەتێکی جیاواز بوو لەو کۆمەڵگایەدا، بەڵام نەیدەتوانی بەئاسانی خۆی لەژێر کاریگەری ئەو فکر و سیاسەت و فەرهەنگە دەرباز بکات. بەو مانایە بوو کە وتم، مەنسوری حیکمەت کە لە ساڵانی (١٩٨٩ و ١٩٩٠)، پیلە بە ناسیۆنالیسمی کورد لە ناو ریزەکانی ئێمە دەگرێ، خۆی شاهیدی هەر ئەو ناسیۆنالیسمەیە لە ساڵی (١٩٨٢) لەناو کۆمەڵەدا بە هێزتر بوو، بەڵام بەو حاڵەشەوە لە بەر ئەوەی رەوتی ئەسڵی حەرەکەتی ئێمە کۆمۆنیسم بوو، جێگەی نیگەرانی نەبوو.

**مەنسوری حیکمەت لایەنگری (ی. ن.ک)بوو نەك ناڵای شۆڕش**

***تۆ وتت مەنسوری حیکمەت، موهتەدی بەوە تاوانبار ئەکات کەقەناعەتی وابوو کەئەم لەگەڵ مەیل و گەرایش و کۆمۆنیزمی کرێکاری دایە، بەڵام دوایی دەرکەوت کە ئەم نوێنەرایەتی باڵی ناسیۆنالیزمی کوردی عیراق ئەکات، ئەمە وابوو، ئەگەر وابوو بۆچی موهتەدی نوێنەرایەتی باڵی ناسیۆنالیزمی کوردی عیراقی دەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەنسوری حیکمەت لەو کاتە وا لێکدانەوەیەکی هەبوو لەسەر هەلومەرجەکە بەگشتی، هەوڵیدەدا فاکتی بۆ کۆ بکاتەوە. با نمونەیەکتان بۆ باسبکەم. کاتێك راپەرینی کوردستانی عیراق روویدا و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی گەڕانەوە بۆ ناو شارەکان **کاك عەبدوڵڵا موهتەدی لە دەفتەری سیاسی حزبدا پێشنیار دەکات نامەیەکی بە خێرهاتنەوە و پیرۆزبایی سەرکەوتنی راپەرینی جەماوەری بۆ یەکێتی نیشتمانی بنووسن. مەنسوری حیکمەت بە توندی دژی ئەو نامەنووسینە بوو،** تاجارێك مەنسوور بەمنی وت "دەزانی وەزعەکە چی لێهاتووە، موهتەدی دەیەوێت نامە بۆ مام جەلال بنێرێ" و دواجار وەکو فاکتێك بەنیشانەی عەتف بۆ ناسیۆنالیسمی کورد ناوی لێدەبات و نامەکە لەلایەن ئەوانەوە نانوسرێ.

که چی هەر ئەو کات، زۆر پێش ئەوەی ئەو باسانە لە ناو دەفتەری سیاسی حزبدا بکرێ، من ئەو نامەیەم نووسیبووبۆ مام جەلالم ناردبوو. ئەوەم بە تەلەفون بۆ مەنسوری حیکمەت باسکرد و پێموت، نووسینی نامەیەکی ئاوا گەلێك ئاساییە، مەگەر لە بیرت نییە کە ئێمە لە دەیان موناسبەتی جۆراوجۆردا نامەمان بۆ نوسیون، پیرۆزبایی ئەم یا ئەو سەرکەوتنی خۆیانمان لێکردون؟ لە کۆنفرانسەکانیاندا بەشدار بووین، مەبەستم ئەوەیە کە حەرکەتێکی ئاوا چکوڵە، بە لای ئەوەوە زەنگی خەتەری ناسیۆنالیستی بوو. کاتێك لە ناو یەکێتی نیشتمانیدا ناکۆکی پەیدا بوو و رەوتی ناڵای شۆڕش سەریهەڵدا و دواجاریش جیابوونەوە، مەنسوری حیکمەت لەدەرەوەی وڵاتەوە، کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی ئاگادارکردەوە لەوەی کە مەبادا تووشی وەسوەسە بن و لایەنگری لە ناڵای شۆڕش بکەن، بە خۆمی گوت کە بەبڕوای ئەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەتوانێ دۆست و پشتیوانی کۆمەڵە بێ، نەك ئۆپۆزسیۆنەکەی. بەگشتی دەتوانم بڵێم مەنسووری حیکمەت ئەو مەتانەتەی کە پێشتر بووی لە خەباتێکی ورد و بە حەوسەلە لەگەڵ ناسیۆنالیسم، لە ساڵانی (٨٩ و ٩٠)لە دەستیدا و هەر بۆیە ئەوەی ئەو کردی نە لە کوردستانی عێراق و نە لە کوردستانی ئێران، نەك هەر ناسیۆنالیسمی کوردی لاواز نەکرد، بەڵکو بەهێزیشی کرد. لە جێگەی خۆی بەتایبەت لە کوردستانی عیراق زەربەی لە نفوزی و ئیعتباری کۆمۆنیستەکاندا.

***مەنسوری حیکمەت بەو قسەیەی تۆ، زۆر خۆی بە دۆستی یەکێتی نەزانی، تەنانەت راشیگەیاندووە "کە لەو ئاڵوگۆڕانەی ناو یەکێتی، مەبەستی ناڵای شۆڕش بووە، کۆمەڵە دەستی تێوەنەدا، چونکە کەیەکێتی دۆستی**

ئێمەیە، بەڵام قسەو باس هەیە کەلەجیابوونەوەی مەنسوری حیکمەت لەگەڵ ئێوە، دواتر راوانانی مەنسوری حیکمەت لەکوردستانی عیراقەوە بەرەو بەغداو ئەوروپا، یەکێتی نیشتمانی رۆڵی هەبووە وە ئەکارەکەشی بە رەسوڵ مامەند سپاردووە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شتی وا هەرگیز نەبووە. پێش راپەڕین و لە دەورەی ئەنفالدا، سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی مەجبور کرا زۆرتری ناوەندەکانی چالاکی خۆی بگوازێتەوە بۆ ناوەوەی کوردستانی ئێران و زۆربەیان لەشاری سەقز جێگیر بوون، پەیوەندییەکانی ئێمەش لەگەڵ ئەوان بە عەمەلی زۆر کەم ببوو وە. دوای راپەڕینیش کە ئەوان هاتنەوە بۆ شارەکانی کوردستانی عیراق بچوکترین دەستتێوەردانیان لەکار و باری ئێمەدا نەبووە. ئەوانەی کە گوتراوە و ئێوە بیستوتانە بەڕاستی نازانم. دۆستایەتی یان دژایەتی مەنسوری حیکمەتیش لە گەڵ یەکێتی کە ئێوە باستانکرد، کەم یا زۆر هەر ئەوەیە کە لە نوسراوەکانی دا دەبیندرێ.

**مەنسور داوادەکات لایەنگرانی لەکامپەکانی کوردستانی عیراق بپارێزرێن**

***مەنسوری حیکمەت پێگەو نفوزێکی گەورەی هەبووە، لەناو حزبی کۆمۆنیستدا ، وە بەپێی ئەو دەلیلەش کەلەبەردەستی مندایە لەئاخرین هەڵبژاردنی دەستەی مەکتەبی سیاسی یەکەم دەنگی هێناوە، رەزای موقەدەم دووەم دەنگی هێناوە، کۆرش سێهەم، ئیرەجی ئازەرین چوارەم، تۆو کاک عەبدوڵڵا موهتەدی پێنجەم و شەشەم دەنگتان هێناوە بۆ مەکتەبی سیاسی، باشە کە مەنسوری حیکمەت ئەوەندە بەهێز بوو بۆچی ئەو حزبی کۆمۆنیستی بەجێهێشت، وە دواتریش لەناو کۆمیتەی ناوەندیدا زیاتر لە(٢٠)کەسی لەگەڵ خۆیدا بردۆتە دەرەوە، باشە مەنسوری حیکمەت کە ئەم هێزو ئیمکانیاتەی هەبووە لەرووی فکری و ئایدۆلۆژی و ئیمکانیاتی بەشەریەوە بۆچی ئەو حزبی کۆمۆنیستی بەجێهێشت، بۆچی ئێوەی نەکردە دەرەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو دەی ئەویست خۆی لە هەموو سوننەت و پێشینەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران دورخاتەوە. ئەو پێوابوو کە دەبێ حزبێکی تازە پێکبێنێت کە لەسەر هێڵێکی دیکە بڕوات، نەك لەسەر درێژەی هێڵی حزبی کۆمۆنیست. حزبی کۆمۆنیست بۆ ئەو وەکوو رێکخراوێکی دەستو پێگیری لێهاتبوو. بەشێکی سەرەکی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کۆمەڵە بوو و کۆمەڵە کۆڵێك مەسئولیەتی هەبوو لە کوردستان، دەیەویست خۆی لەژێر باری ئەو مەسئولیەتانە رزگار کات و بە وتەی خۆی بیسپێرێتەوە بەخاوەنەکانی واقیعی خۆی.

لە بیرمە لە دوایین پلێنۆمی کۆمیتەی ناوەندی حزب پێش جیابونەوەیان، داوای لە ئێمە کرد کە بەرەسمی بەڵێنی پێبدەین کە چۆن و ئەمنیەتی لایەنگرانی لە کەمپەکانی خۆمان لە کوردستانی عیراق زەمانەت دەکەین. دیارە من بەڕاشکاوی ئەو بەڵێنەم پێدا و بە باشترین شێوەی گونجاویش دواجار بەرێوەمانبرد. بەڵام هەر لەو پلێنۆمەدا یەکێك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کە لەگەڵ رەوتەکەی ئەو بوو(مظفری محمدی) بە حاڵەتێکی نیوە تورەیی ووتی من نازانم مەنتیقی ئەو قسەیەی مەنسوری حیکمەت چی یە؟ ئێمە لە کوردستان هەر لەو کەمپانەدا زۆرینەین، هەموو ئیمکاناتەکەمان بە دەستەوەیە، بۆچی دەبێ داوا لە فلان کەسە بکەین کە بەڵێنیمان پێبدات؟ مەنسوری حیکمەت وەڵامیداوە، چونکە مەسەلەی ئەکسەریەت و ئەقەلیەت نییە، مەسەلە ئەوەیە کەبە واقیعی کۆمەڵە هی لایەنی ئێمە نییە، کۆمەڵە لەگەڵ ئێمە نییە. مەبەستم لە گێرانەوەی ئەو بیرەوەریە کە لەوانەیە رستەکانی زۆر دەقیق نەبێ، ئەوەیە کە ئەو بەڕاستی دەیەویست خۆی لە مەسئولیەتی کۆمەڵە دورخاتەوە. ئەو هەمیشە لەوە نیگەران بوو کەشکستی کۆمەڵە لەداهاتووشدا، خەتاکەی بخرێتە سەر شانی ئەو، دەی گوت تەحویلی خاوەنەکانی خۆی دەدەمینەوە چی

لێدەگەن یا لێبکەن. من دەچم حزبی خۆم لەسەر بنەمایەکی تازە سەر لە نوێ پێکدێنمەوە.

***لەو پلۆنیۆمەدا ساغ بۆتەوە تەنها تۆو عەبدوڵڵای موهتەدی و فاروقی بابە میری مانەوە، وە کەسی ترتان لەگەڵ نەمابوو، تەنها ئەم سێ کەسەمانەوە، دواتر هەریەکە لە حەبیبی فەرزادو ئیبراهیم محەمەدی رەنی خۆیان نادەن، محەمەدی شافیعی و حسێنی رەحمان زادەو عوسمانی روشن تودە لەو کاتە لە دەرەوە بوون، زۆرینەی ئەوانە لەگەڵ مەنسوری حیکمەت ئەڕۆنە دەرەوە و حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری پێکدێننێ، باشە ئەنەکرا مەنسوری حیکمەت لەجیاتی ئەوەی کە تۆ وتت ئەگەر ئەو مەسەلە ئەخلاقییە نەبێت، هەر حزبی کۆمۆنیستی بگۆڕیایە بە حزبی کۆمۆنیزمی کرێکاری ئێران کە دواتر کردی وە ئەکسەریەتی لەگەڵ بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو لای وابوو بەشێکی زۆر لەو کەسانەی کە وەفاداری خۆیان بە رەوتەکەی ئەو راگەیاندوە، هاوپەیمانی هەن، بەڵام هاونەزەری نین. ئەوەی پێوابوو بۆ ئەوەی بتوانێ حزبێکی گەورەتر دروستبکات، سەرەتا پێویستە چکۆلەتر بێتەوە. بە وتەی خۆی نەیدەویست مەیل و بۆچوونەکانی تر، لە رێگەیەکی دیکەوەبێنەوە ناو حزبە تازەکەی ئەو. پێشتر باسمکرد کە ئەو لە هەوڵی پێکهێنانی حزبێکدا بوو کە تەنیا یەك مەیلی تێدا هەبێ، ئەویش ئەو مەیلە بێ کە تەسەوری لە کۆمۆنیزمی کرێکاری هەر وەکو ئەو وابێ. ئەو ناوەی کە ئەو بەم شێوەیە رشتی، ئێستا بۆتە هۆی ئەوە کە چەندین لایەن، هەر کامەیان بە پێی تەفسیرێك کەلەنەزەراتی ئەو هەیانە، حزبێکی جیاواز پێکبێنن، واتا مەنسوری حکمت دەیویست حزبی کۆمۆنیست تسفیە بکات.

*** مەنسوری حیکمەت لەنامەیەکدا کە ئەو کاتە داویەتی بە پلۆنیۆم بۆ وازهێنان دەقیقەن ئەوا ئەڵێت" من هەوڵەدەم بۆ پێکهێنانی حزبێکی کۆمۆنیستی کرێکاری، کەرووی لە وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی ئەمڕۆی کۆمۆنیزمی کرێکاری و مارکیسزم لەدەرەوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هەبێت، دیقیقەن ئەو کارەی کرد بەرەتی تۆ، توانی ئەوە بکات؟ بۆچی نەیتوانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من ئەو توانی حزبێکی تازە لەسەر بنەمای بۆچوونەکانی خۆی پێکبێنێ. حزبێکی هەڵسوراو کە پێکهاتبوو لە لایەنگرانی بەشور و شەوقی دەرەوەی وڵاتی. ستراتیژی ئەو حزبەی ئەو لە ناوەوەی وڵاتیش رێکخستنی چینی کرێکار و سازدانی بۆ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی کە رژێمی ئیسلامی بروخێنێ نەبوو، بەڵکو حیسابکردن لەسەر نەفرەتی جەوانان لە ئیسلام و لە مەحدودیەتەکانی رژێمی ئیسلامی بوو. رووخاندنی رژێم بۆ حزبێك کە ئەو لە هەوڵی پێکهێنانیدا بوو بریتی نەبوو لە ئامادە کردنی چینی کرێکار بۆ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بەڵکو رووخاندنی رژێم بوو بە هەر شێوەیەك کە بکرێ و گەیاندنی حزبەکەی ئەو بە دەسەڵات. ئەم ئێژانە هەمووی خۆی لە خۆیدا پڕ بوون لە تەناقوز و بۆ ئێمە ئاشکرا بوو کە وەها حزبێك ئەگەر زۆریش چالاك و هەڵسوراو بێ، بە ناوی کۆمۆنیسم پێگەی جەماوەری پەیدا ناکات. ئەوانە لەم بوارانەدا تەنانەت لە تێز و ئەزەرییەشدا رەقیبێکی جیدی لیبراڵەکانی ئێران نەبوون. ئەو تەناقوزات و ناتەباییانە، تەنانەت رێگای نەدا کە ئەو رێکخراوەی کە لە دەرەوەی وڵاتیش پێکیهێنابوو، مونسەجیم و یەکگرتوو بمێنێتەوە.

**گۆرشی مدرس قسەکانی مەنسوری دەوتەوە**

***گۆرشی مدرس لەونامەیەی کە تەقلیمی ئێوەی کردووە بۆ وازهێنان، شتێکی سەیری نوسیوە ئەگەر تۆ بۆم روون بکەیتەوە زیاتر، ئەڵێ " رێگامبدەن هەرلێرەدا روونیبکەمەوە کە گرفتی بنەڕەتی رەوتی ئێمە، بەڕای**

**من لەگەڵ کەسانێك نییە کە بەڕاشکاوانە دژی ئێمەن، کە دیارە مەبەستی ئێوەیە، بەپێچەوانەوە گیروگرفتی ڕێکخستنی هەڵسوڕانێکی ترە لەلایەن هاوڕێکانی خۆمانەوە"، مەبەستی چییە لەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر ئەوەم ڕوونکردەوە، کە ئەوان نیگەرانی ئەوە بوون ئەو خەڵکەی کە ئەوان بە ناسیۆنالیست و سۆسیال دیموکرات و سانتر ناوزەدیان کردبوون، بە موافەقەتێکی ڕەواڵەتی لەگەڵ ئەوان، بێنە ناو حزبە تازەکەیانەوە.ئەوان دەیانتەویست ڕەوتەکەی خۆیان بەتەواوی بپاڵێون، چۆن؟ خۆشیان باش ئەیان دەزانی، هەر بۆیە ئێستاش ئەوانەی کە خۆیان بە درێژە پێدەری ڕاستەقینەی ڕێبازی مەنسوری حیکمەت دەزانن لایان وایە کە هەر لەسەرەتای جیابوونەوەکەیاندا کەسی بێ باوەڕ و دور لە خەتی مەنسوری حیکمەت هاتۆتە ناو حزبەکەیانەوە و ئەوەیە هۆکاری جیابوونەوەکانیان.

**مەنسور، زەربەی گەورە لەکۆمەڵە دەدات**

***لە نامەیەکدا ساڵی (١٩٩١) کە ئیمزای تۆشی پێوەیە، ئێوە ڕاتانگەیاندووەو نووسیوتانە " ئێمە لەو بڕوایەداین کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران، سەرەڕای هەموو ڕەخنەیەکی پێشڕەوانە کە لەو دەگیرێت، دەستکەوتێکی بەنرخی چینی کرێکاری ئێران و بزوتنەوەی کۆمۆنیستە"، مەبەستم ئەم دێڕەیە، ئەمە لەکاتێکدا تۆ تاوانبار کرابووی بە مەیل و گەرایشتێکی ناسیۆنالیستی، کاك عەبدوڵڵا، بەنوێنەری باڵی ناسیۆنالیستی کوردستانی عیراق، هەریەکە لەوانەی تریش دیارە فاروقی بابەمیری و ئیراهیمی محەممەدی مەبەستم ئەوەیە ئەمەی ئێوە نوسیوتانە ڕاستە یان ئەو قسانەی مەنسوری حیکمەت ڕاستبووەو، ئێوە ئەمە تاکتیك بوو لەم نووسینەدا بەکارتانهێنا یا خۆتان بە پارێزەری حزبی کۆمۆنیست ئەزانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوانەی ئەو بەیانیەیان ئیمزاکردووە، هەر کامەیان پێویستە وەڵامی خۆیانی پێبدەنەوە. ئەوەندەی کە بۆ من وەکو یەکێك لەو کەسانەی کە ئەو بەیانەم ئیمزا کردووە هەڵدەگەڕێتەوە، بە تەواوی باوەڕم پێیبووە. ئەوە مانای ئەوە نییە کە ڕەخنەم لە هیچ پەسەندکراو و بەڵگەنامە و سیاسەتی رابوردووی خۆمان نەبووە. بەڵکو گەلێك ڕەخنەی ناواش هەبووە و هەیە، بەڵام ئەو بەیانیە هەوڵدەدات، ئەوە رابگەیەنێ کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران بە بەرنامە و ڕێبازی سیاسی ڕاگەیەندراویەوە، بە پەیرەوی ناوخۆ و بریارنامەکانی کۆنگرەکانییەوە، بە رۆیشتنی ئەوان هەڵناوەشێتەوە و درێژەی بە فەعالیەتی خۆی ئەدا. ئەوان ئامادەنەبوون بێنە کۆنگرەی حزبو لەوێ و لە جێگا و شوێنێکی رەسمییەو، ئەو هەڵوێستەی خۆیان رابگەیێنن. ئەوان بە رۆیشتنی خۆیان زەربەی قورسیان لە حزبی کۆمۆنیستی ئێراندابوو، بەڵام نەیانتوانی لە پێیبخەن. ئەوە بوو مەبەست و ناوەرۆکی واقیعی ئەو بەیاننامەیەی کەئێوە ئاماژەتان پێکرد.

**مەنسوری حیکمەت دەیویست ئوردوگاکان بشێوێنێت**

***من لە چەند هاوڕێی خۆتانم بیستوە، مەنسوری حیکمەت لەناو ریزەکانی کۆمەڵە لە ئۆردوگاکانی ئێوە لەناو پێشمەرگەکاندا وتویەتی هەرکەس دووساڵ پێشمەرگایەتی کردووە ئەبێ ڕەوانەی خاریج بکرێت، باوی شەڕ نەماوە، تاپێشمەرگە بەکوشت بدرێ، وەلحاسڵ کۆمەڵێك قسەی بۆ خەڵك ئەکرد کەوای لە پێشمەرگە کردبوو بڵێت ئەم قسانەی مەنسوری حیکمەت ڕاستە، ئێمە بۆ شەڕبکەین و ئێمە بۆ ڕەوانەی بۆ ئەوروپا ناکرێین ئەم وەیکرد نفوزێکی جەماوەری زۆری بۆ لای خۆی ڕاکێشێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەسەلەکە بەو ساکاریە نەبوو. سەبارەت بە ماوە دان و زەمەنی پێشمەرگایەتی بۆ هەر پێشمەرگەیەك، مەنسوری حیکمەت لەم بابەتەوە نووسراوەی هەیە و بڵاوبووتەوە و هەڵبەت هەرگیزیش

بەم شێوەیەی کە ئەو نووسیبوی بە کردەوە دەرنەهات.

مەسەلەی ناردنی کادیر و پێشمەرگەی کۆمەڵەش بۆ دەرەوەی وڵات تەنیا پەیوەندی بە دەورەی سەرهەڵدانی کێشەکانەوە نییە و سیاسەتێکی گەلێك پێشوتری کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەبوو. بە پێی ئەو سیاسەتە هەموو پێشمەرگەیەکی بریندار کە زیانێکی جەستەیی جیدی دیتبێت، هەموو ئەو هاورێیانەی کە پیر و بەساڵاچوو بوون، هەموو ئەو بنەماڵانەی کە منداڵیان زۆر بوو ئەبوایە لە مەجالی گونجاودا بەشێوەی موناسب رەوانەی وڵاتانی ئەوروپایی بکرێن بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە سووك بار بێ و باشتر بتوانی ئەرکەکانی خۆی بەریوەبەری.

گەلێك پێش باسەکانی کۆمۆنیسمی کارگەریش ژمارەیەکی بەرچاومان بە پێی ئەو سیاسەتەرەوانەی وڵاتانی ئەوروپایی کردبوو. ئەو سیاسەتە خۆی لە خۆیدا هیچ ئیرادێکی نەبوو، هەم ئینسانی بوو و هەم لە رووی سیاسی و عەمەلیشەوە پارەمەتیدەر بوو. ئیرادەکە لەو جێگایەیە کە رەهبەری ئەو کاتی حزب ئەو زەرورەتەی کرد بە ئامرازێك لە دژی موخالفینی سیاسی خۆی. ئەو رەوتە بە پێی تەبیعەتی ئیمکاناتێك کە بۆ ناردن بۆ دەرەوەی وڵات لەبەر دەستبوو نەیدەتوانی بە خێرایی بەرێوەبچێ. خەلکێکی زۆر بە ناچار لە هەلومەرجی گەلێك سەخت و دژوار لەم دەورەیەدا کە ئوردوگاکانی کۆمەڵە لەسەر شوێنە سنوریەکانی کوردستانی عیراق بە هۆی توندبونەوەی شەڕی ئێران و عیراق و بەهۆی پاشەکشەی هێزی پێشمەرگەییکیتی نیشتمانی بۆ ناوەوەی ئێران و بە هۆی ئەنفال و کیمیا بارانەکان تێکەوتبوو، لە چاوەروانیدا دەمانەوە.

رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری بە کردەوە لە ناو ئوردوگاکانی کۆمەڵە ئەو هەستە نا سەمیمانەیەی لە دژی کۆمیتەی رێبەری کۆمەڵە ووروژاندبوو کە گویە نایانەوێ ئەو پرۆسەیە بەرێوەبچێ و عەشقی ئەوان بە خاك و بە جوغرافیای مەنتەقە کە مەبەست ناسیونالیسمی کورد بوو، رێگایان پێنادا ئەو خەلکە هەرچی زووتر لەو گێژاوەیە دەربازکەن. ئەو قسانە بە کردەوە تەحریکاتی لە دژی کۆمیتەی رەهبەری دروستدەکرد، هەستی نەفرەت و بێزاری پەرە پێئەدا و هەڵبەت هێزیشی لە دەوری ئەوان کۆدەکردەوە، بەبێ ئەوەی ئەوانیش خۆیان هەر بە پێی ئەو کەمبونی ئیمکانەتە کارێکی زۆریان لەم بابەتەوە پێبکرێ. لە بیرمە ئەوان ئەوکات کۆمیتەیەکیان بۆ کاری ناردن بۆ دەرەوە کە ناوی "کۆمیتەی ئیعزام بوو" پێکهێنا کە کاك عەبدوڵڵای موهتەدی بەرپرسی بوو و کاك ئەبوبەکری مودەرسی و کاك فاروقی بابامیریش ئەندامی بوون. ئەوان هەر سێکیان ئەو کات لەبەرەی موخالیفی کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵەدا بوون، بەڵام ئەو کۆمیتەیەش پاوەکو هەموو ئیمکاناتی ماڵی کۆمەڵەشی لەبەردەست بوو، هەر وەکوو چاوەرواندەکرا هیچ موعجیزەیەکی پێنەکرا.

***ئێوە بۆ هێشتان ئەو مەیل و گەرایەشتە وابەهێزبێت لەناو کۆمەڵەدا کەوا بکات ئێوە بخاتە زێر هەیمەنەی خۆیەوە ئەوان ببن بەزۆرینە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گومان لەوە دانییە کە ئێمە دەمانتوانی جۆرێك هەڵسو کەوت بکەین کە زیانەکانی ئەم جەریانە لە ناو ریزەکانی کۆمەڵەدا گەلێك لەوە کەمتربێ. ئەوانە لە کاتی خۆیدا و کۆنگرەکانی کۆمەڵەدا قسەیان لەسەر کراوە و رەخنەیان لێگیراوە. بەڵام لەئەساسدا هۆکاری ئەوەی کە ئەم رەوتە توانی بەم شێوەیە دەستی باڵا لە ناو ریزەکانی رێکخراوی کوردوستانی حزب، واتە کۆمەڵەدا پەیدا بکات، شکست و پاشەکشەکانی یەك لە دوایییەکی هێزی پێشمەرگەو ئەو زەربە سەختانە بوو کە لەو ساڵانەی دواییدا خواردمان. ئەوانە

بوون بە زەمینەی مادی بۆ بە هێز بونی ئەوان، وەك شەڕی دیموکرات، لەناوچونی کوردانی شوان، بەعس (ئەنفال و هەڵەبجە...).

**سێبەری کۆمەڵە بەسەر کۆمۆنیزمی کارگەرییەوە ماوە**

***ئەوباسانەی مەنسوری حیکمەت ئێژی کۆمۆنیزمی کارگەری، دوابەدوای شکستی بلۆکی شورەوی نەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** خۆیان هەمیشە وتویانە کە مەوزوعی کاری کۆمۆنیسمی کاریگەری کۆمەڵە و گیروگرفتەکانی ئەو سەردەمی نەبووە، بەڵکو کاردانەوەیەك بوو بەرانبەر بە هەلومەرجی رەوتی کۆمۆنیستی لە ئاستی دونیادا و بە تایبەت دوای روخانی ئیتحادی شورەوی. بەڵام ئەوە ئیدعایەکە و نوسراوەکانیشیان هەروا دەڵێن، بەڵام ئەوەی کە منیش باسمکرد مێژووی واقیعی و کونکرێتی رووداوەکانن. تاساڵەها دوای پێکهاتنی حزبەکەشیان و ئینشیعاباتی دواجاری ناویشیان و تا ئیستاش هەر سێبەری کۆمەڵە بەسەر باسەکانیانداو بەسەر ژیانی سیاسیاندا قورساییدەکات.

**موهتەدی تا دوای کۆڕەوەکەی کوردستانی عیراق لەگەڵ مەنسوری حیکمەت بوو**

***تۆو عەبدوڵڵا موهتەدی رێبەرایەتی ئەو کوتلەیەتان ئەکرد دژی کوتلەکانی مەنسوری حیکمەت وانییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەخێر، ئێمە کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە بووین کە لە نێوان دوو پلینۆمدا کاری کۆمەڵەی بەرێوەدەبرد و ناوەندێك بوین کە دەتوانین بڵێین وەکوو دەفتەری سیاسی کارمان دەکرد. کاك عەبدوڵڵا لە گەرمەی ئەو باسانەدا لەبەرەی موخالیفی ئێمە دابوو. لە راپەرینی کوردستانی عیراقەوە و لە ئەسڵدا لە دوای کۆڕەوەکەی کوردستانی عیراقە کە کاك عەبدوڵڵا لەبەرەی ئەوان دێتە دەرێ و دێتە ناو بەرەی ئێمەوە.

*** ئەو کۆمیتەی رابەریە کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** عومەری ئێلخانیزادە، جەواد مشکی ، حبیب گەویلی و ئیبراهیم عەلیزادە، عوسمان رەوشەن تودە و کۆرش مودەرسی تا کاتێك لە ناوەوەی وڵات بوو.

***ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ وە هەڵبژێردراوی پلینۆم بوون.

***باشە بۆ کەلەکوردستان پاشەکشەیان کرد، ئیتر ئەبارەگایان ما نە نفوز نە جەماوەر هیچ وجودێکیان نەما لە کوردستانی عیراقدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای جیابوونەوە لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەسەرەتاوە بە گشتی فەعالیەت لە کوردستان لەبەرنامەی کاری ئەواندا ئەولەویەتی نەمابوو. تەنیا دەیانەویست پاشەکشەی کادیر و پێشمەرگەکانی لایەنی ئەوان وەها چاوەڕواننەکراو و کتوپڕ نەبێ کەلەگەڵ قسە و لێدوانەکانی پێشویاندا نەیەتەوە. ئەو وەزعە تا دوای راپەرینی کوردستانی عیراق و دوای کۆڕەوەکە هەر وا ئیدامەی بوو. تەنانەت لایەنگرانی رەوتی ئەوان لە کوردستانی عیراقیش هەر دەستیانکردبوو بە موهاجەرەتێکی بە کۆمەڵ. دواجار کەکوردستانی عیراق لەژێر دەسەڵاتی رژێمی بەعس هاتەدەرێ و یەکێتی نیشتمانی و پارتی هاتنە دەسەڵاتەوە و کەشوهەوایەکی واهاتەکایەوە کە لایەنگرانیان لە ناو رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری لە کوردستانی عیراق مەجالی فەعالیەت و هەڵسوڕانیان بۆ رەخسا، رەهبەری حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێرانیش هەستیان بەوە

کرد کە دەبێ ئەو گۆڕانکاریانە بەڕەسمی بناسن و خۆیان لەگەڵ هەلومەرج نوێ تەتبیق بدەن. ئەوە بوو هەوڵیاندا ئەو جار لە قالبی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراقدا بگەڕێنەوە ناوچەکە. بەڵام مەسەلە ئەوەیە حزبێکی سیاسی کە لە نوختە وەرچەرخانێکی مێژوویدا فورسەتی لە دەستدا و نەیتوانی وەڵامی پیویستی ئەو کاتە و ساتەبداتەوە و بە تایبەت ئەگەر وەڵامی نەگونجاو و نادروستیشبداتەوە ئیتر بە کاری روتین زۆر زەحمەتە بۆی قەرەبوو بکرێتەوە.

**مەنسوری حیکمەت رۆڵی گەورەی هەبوو لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق**

***یەعنی پێتوایە پەیدانەکردنەوەی گەشەو نفوزی ئەوان وەکو لە رووی جوگرافیاوە نەیانتوانی لە کوردستانی عیراق شوێنێك بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، پێتوایە یەکێتی و پارتی نەیانهێشت لەکوردستان بمێننەوە ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەسەلە ئەوە نیە رێگەی بنکە و بارەگا دانیان لە کوردستانی عیراق پێدراوە یان پێنەدراوە. ئەوان کەوتبونە مەوقعیەتێکەوە کە ئیتر نەیانـدەتوانی دەوری حزبێك ببینن کە پێگەی جەماوەری هەیە.

***پاش ئەوە مەنسوری حیکمەت بەقەناعەتی تۆ رۆڵێکی گەورەی نەبێت لە دروستکردنی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق، بە رێبەرایەتی رێبوار ئەحمەد و هەموو گروپ و جەپە بچوکانە کۆنەکانەوە، لەکوردستانی عیراق حزبی کۆمۆنیستیان بۆ دروست نەکات، پێتوایە تاچەند رۆڵی هەبووە، وە مەبەستی لەمەچی بووە ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەنسوری حیکمەت رۆڵی یەکەمی هەبووە لە پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق، وە دەتوانم بڵێم بە بێ ئەو ئەدەکرا، ئەو هاتیدان بۆ ئەوەی دەستەبەندیەکانی ناوخۆیان کۆتایی پێبێنن و لەژێر ئاڵای حزبێکی یەکگرتوو دا کۆ ببنەوە. بۆ مەنسوری حیکمەت پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق رێگەیەك بوو بۆ گەڕانەوەی جەریانەکەی ئەوان بۆ کوردستان. بە بووژانەوەی کۆمەڵە، بە لەسەر پێمانەوەی حزبی کۆمۆنیست لە کاتێکدا کە ئەوانیشی لێچووبونەدەرێ ، کۆمۆنیسمی کارگەری ئێران هەستی بەشکستێك دەکرد کە لای وا بوو لە رێگەی جەریانی کۆمۆنیسمی کرێکاری عیراقەوە دەتوانێ قەرەبووی بکاتەوە. پێیانوابوو ئەوە رێگەیەکە بۆ بە دەستهێنانەوەی فورسەتێك کە لە دەستچوو بوو.

***دوای ئەوەی کە حزبی کۆمۆنیزمی کرێکاری ئێران دروست نەبێت، لەسەر دەستی مەنسوری حیکمەت، بەڵام چوارساڵ دوای ئەوە، هەر ئەو هاوکارانەی کە بۆ ئەم مەیل و بۆچوونە لەگەڵی بوون، وەکو ئیرەجی ئازەرین و رەزای موقەدەم، جیا ئەبنەوە لێی، دوابەدوای ئەوەش جارێکی تر حەمیدی تەقوایی و کۆرشی مدرس و چەندین جیابوونەوەی تر رووئەدات لەناو ئەم حزبە وە ئێستاش تازەترین جیابوونەوە پاش مەرگی مەنسوری حیکمەت بەدروستبوونی رێکخراوێکی تازە بەناوی (حیکمەتیست)ئەم هەموو ناکۆکیانە لەناو حزبی کۆمۆنیستی کرێکاریدا بە قەناعەتی تۆ هۆکارەکانی چییە، ئەو هەموو جیابوونەوەو ئینشیقاق و ئینشیعایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جیابونەوە لە ناو حزبێکی سیاسیدا دەتوانێ رووداوێکی زۆر ئاسایی بێت ئەگەر ئەو جیابونەوە رەنگدانەوەی لانی کەمی گۆڕانکارێکی سیاسی و کۆمەلایەتی دیاریکراو لە دەرەوەی ئەو حزبە بێت. بۆ نمونە کاتی هاتنە سەر کاری ریفۆرم خوازەکانی ئیسلامی لە ئێران ، زۆر ئاسایی بوو ئەگەر لەسەر هەڵوێست و سیاسەت و ستراتیژی جیاواز بەرانبەر بەم رەوتە لە حزبێکدا دوو رێگای جیاواز رەچاو بکرێ. یان هێرشی ئامریکا بۆ عیراق و هەڵوێستی جیاواز لەسەری، جیاوازی لە سیاسەت و تاکتیکدا بەرانبەر

بەبزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکانی وەکو بزوتنەوەی کرێکاری و بزوتنەوەی ژنان و هی تر. بەڵام جیابونەوە لە حزبێکی دیاریکراو دا کە لەسەر تەفسیری جۆراوجۆر کە لە قسەی ئەم رێبەر و ئەو رێبەر دەکرێ، یان لەوەش نزم تر لەسەر شەڕی دەسەڵاتی بەرپرسانی ناوخۆی حزبە کە ، ئەم جۆرە جیابونەوانە دەکرێ روویدەن و یان روو نەدەن. جیابونەوەکانی ناو رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری پشتیتان بە هیچ گۆڕانکارێکی کۆمەڵایەتی، بە هیچ ئاڵوگۆڕێکی سیاسی گرنگ لە دەرەوەی خۆیان نەبەستوە. تەنانەت لەستراتێژ و بەرنامەی سیاسیشیاندا جیاوازیەکی جیدی نابیندرێ. لە زۆربەی ئەحزابی سیاسی وڵاتانی رۆژهەڵاتدا رێبەر و بەرپرس حزب بەرانبەر بە شکست و ناکامی لە دروشم و سیاسەتەکانی حزب بەرپرس نییە، هەربۆیە لەو حاڵەتانەشدا وەکو ئەبای هاتبێ و نە باران هەر لە جێگەی خۆیان دەمیننەوە. کە بەم هۆیەوە لە خوارەوەی حزب ئوتوریتەی مەعنەویان ئامێنی بۆ پاراستنی مەوقعیەتی خۆیان دەست بۆ هەر کارێك و یەك لەوانە ئینشیعابیش دەبەن.

**مەنسور نەیتوانی یەکگرتوویی رەوتەکەشی بپارێزێت**

***ئەو جیابوونەوانەی ئێستای ناو ریزەکانی کۆمۆنیسمی کرێکاری لە نەوعی جیابونەوەی ئەو رەوتە لە کۆمەڵە و لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە ساڵی (١٩٩٠)نەبوو کە لە ژێر کاریگەری گەلێك رووداوی گرنگی دەرەوەی خۆیدا روویدا (کۆتایی شەڕی ئێران و عیراق، ئەنفال و کیمیاباران و راپەرین و کۆرەو و رووداوی جیهانی وەکوو دارمانی بلۆکی شەرق و..)، ئەم جیابونەوانە چەند کاریگەری لەسەر مەسەلەی مارکسیزم لە کوردستان لە ئێران لە ناوچەکەیە داناوە وە پێتوانییە بە مردنی مەنسوری حیکمەت یەکێك لەهەرە ناسراوترین مەنزیرەکانی چەپ یا مارکسیزم یا کۆمۆنیزمی کاریگەری لەناوچەکەدا لەدەستداوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نوسراوەکان و خوێندنەوەی مەنسوری حیکمەت بۆ مارکسیسم تا ئەو کات کە لە ناوحزبی کۆمۆنیستی ئێراندا مابوو کاریگەرێکی بەرچاوی لەسەر رەوتی چەپ و کۆمۆنیست چ لە ئێران و چ لە عیراقدا هەبوو. بەڵام بە دوور کەوتنەوەی لە رێبازی حزبی کۆمۆنیست و بە پێداچونەوە بە هەندێك لە گرنگترین تێزەکانی مارکس و لینین لە بابەت حزبو دەسەڵاتی سیاسی و هەلومەرج و زەمینەکانی شۆڕشی کرێکاری و بە کردەوەش بە دابڕانی لە کۆمەڵە و لە حزبی کۆمۆنیست، ئیتر ئەو نفوزی کەلامەی نەما و تەنانەت نەیتوانی یەکگرتووی ریزەکانی رەوتەکەی خۆشی بپارێزێ.

***کە وایە بە مەرگی مەنسوری حیکمەت ئەو هەمموو ئینشیقاقەی ناو حزبی کۆمۆنیست روویدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشبینی ئەوەی کە بەمانەوەی مەنسوری حیکمەت حزبەکەی چی لێ بەسەردەهات ئاسان نییە و زەروریش نییە.ئەوەندەمان لێ روونە کە بەهۆی کۆمەڵێك ناکامی تاکتیکی و ماندوو بونی ریزەکانیان لە ئاکسیونی دەرەوەی وڵاتی کەم نەتیجە و بە ئەو بەناو ئەوناوەرێك کە لە مارکسیسمدا دەیکرد وردە وردە خەریك بوو سەرەتاکانی کێشە و ئیختیلاق ناوخۆیان دەردەکەوت. کە لەوانەیە جیابونەوەشی لێبکەوتایەتەوە.

***کۆرشی مودەریس ئەلتەرناتیڤی مەنسوری حیکمەتە کە ئێستا رێبەرایەتی ئەو حزبە دەکات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڕای من مەنسوری حیکمەت تایبەتمەندێکی هەبوو کە جێنشینەکانی نیانە. مەنسوری حیکمەت کە خۆی داهێنەری ئەزراتەکەی خۆی بوو هەر کات کە پێویستی زانیبا پێداچونەوەی پێدادەکردن. بەڵام بە دوای ئەو هیچ کام لە رێبەرانی کۆمۆنیسمی کرێکاری ئەو بڕوا بەخۆیەیان نییە کە

دەستبدەنە وەها کارێك و ئەگەر کردیان دەبێ خۆیان بۆ جیابونەوەیەکی تازە ئامادە بکەن.

**٭مونەزیرێکی مارکسیزم و کۆمۆنیست بوو لەناوچەکەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو خۆی پێیوابوو ئەوەی ئەیڵێت گەشەپێدانی مارکسیسمە، لەدەرەوەی خۆیان ئەویان بۆ ئەسەلاند و لە مەیدانی ئافێکردنەوەشدا سەرکەوتنێکی بە دەستنەهێنا. بەڵام سەرەرای ئەمانە لە رووی فیکریەوە ئینسانێکی خەلاق و چالاك بوو.

**پەیوەندی ئیسرائیل و کۆمۆنیزمی کارگەری رێگەپێدراوە**

**٭ئەو دیعایە چەند راستە کە گوایە حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران و مەنسوری حیکمەت پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل هەبووەو دانانی تەلەفزیۆنی ئەم حزبەش بە هاوکاری ئیسرائیل دامەزراوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من مەعلوماتی کۆنکرێتم لەو بارەیەوە نییە. سەرچاوەی ئەو ئیدعایانە بریارنامەیەکی پەسند کراوی ناوخۆی ئەو کاتی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاریە کە ئەو بریارنامەیە دەکرێ وا تەفسیر بکرێ کە وەها پەیوەندێك رێگە پێدراوە.

**٭بەرەی تۆ شتێکی ئەخلاقی و دروستە پەیوەندیکردنی حزبێکی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل کە زۆرجار لە فەرهەنگی چەپەکاندا بە زایۆنیزم یا بە داگیرکەری خاکی فەڵەستین ناوئەبرێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من هەر حزبێکی لاواز کە لەگەڵ دەوڵەتێکی بە هێز پەیوەندی بگرێ بە کردەوە، ناتوانێ سەر بەخۆیی بریاردانی خۆی بپارێزێ. پەیوەندی گرتنی حزبێك کە بەناوی کۆمۆنیسمەوە کار دەکات لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل بە مانای خۆکوژی سیاسی ئەو حزبەیە.

**بۆ پەیوەندی لەگەڵ بەعس پرسمان بەیەکێتی کرد**

**٭ئەی پەیوەندی کۆمەڵە لەگەڵ دەوڵەتی عیراق چ پاساوێکی هەبوو ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە نوێنەرایەتی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بە هێزیدەکرد. ئەو بزووتنەوەیە پێی نابووە قۆناغێکی موقاوەمەتێکی بەرینی چەکدارانەوە، بە پانایی هەموو کوردستان. بە هەزاران کەس رووبانکردبووە ریزەکانیەوە، شەرێکی سەخت لەنێوان هێزەکانی ئێمە و رژێمی کۆماری ئیسلامی لە ئارادابوو، بەرێوەبردنی ئەو موقاوەمەتە پێویستی بە چەك و تەقەمەنی و پشتی جەبهەیەك بۆ دەرمانکردنی بریندارەکانی بوو، پێویستی بەوە بوو کە رێگا بۆ دەرەوەی وڵات هەبێ. بە لەبەرچاو گرتنی رادەی توندوتیژی ناکۆکی نێوان دەوڵەتی عێراق و ئێران و بە تایبەت شەرێك کە لە نێوانیاندا لە ئارادا بوو، کۆمەڵە دەیتوانی پێبنێتە ناو ئەو دیپلۆماسیەتەوە، و پشتوانێ سەربەخۆیی خۆی لە بریاردانـدا بپارێزێ. هاوسەنگی واقیعی هێز لەو هەلومەرجە دیاریکراوەدا، ئەو ئیمکانەی پێدابووین. هەر ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٩٦٨)ەوە کە پێکهات تا ساڵی (١٩٧٩)کە شۆرشی گەلانی ئێران لە دژی رژێمی شا بەسەرکەوتن گەیشت، نە زەروری بوو و نە بۆی هەبوو، نەك هەر لە دەوڵەتی عێراق، بەڵکو لە هیچ دەوڵەتێکی بورژوایی دیکە، یارمەتی ماڵی و تەکنیکی وەربگرێ. ناگرێ هەر کات حزبەکەمان بێ پارە بوو، بچین لەگەڵ دەوڵەتێکی بورژوایی پەیوەندی بگرین.

جگە لەمەسەلەی هاوسەنگییەکی دیاریکراو یان زەرورەتێك لەو چەشنەی باسکرد، ئەو نەوعە پەیوەندییانە دەبێ لە رووی مەسلەحەتی سیاسییەوە هەڵبسەنگێندرێ و بە قازانج بێ. هەر ئەو کاتە لە بیرمە کە ئێمە بۆ بەرقەرارکردنی ئەو پەیوەندیە، پرسمان بەیەکێتی نیشتمانی کوردستان کە ئۆپۆزسیۆنی دەوڵەتی عیراق بوو، کرد و تەنانەت بە تەشویقی ئێمە رێکەوتننامەیەکی چوار قۆڵی لە نێوان یەکێتی و حزبی دیموکرات و دەفتەری مامۆستا شێخ عزالدین و ئێمە ئیمزا کرا کە

تێیدا تەئکیدکراوە لەسەرئەوەی، پەیوەندی لەگەڵ عیراق لە هیچ هەلومەرجێکدا نابێ زیان بە خەباتی خەڵکی عیراق لە دژی رژێمەکەی بگەیەنێ. لەم لاشەوە ئێمە، پرسمان بە چەندین لایەنی هاوپەیمانی خۆمان لە ناو هێزە چەپەکانی ئەو کاتی ئێران کرد و رەزایەتی ئەوانیشمان وەرگرت. لەناو خۆشماندا لەکۆنفرانسێکی تایبەتیدا کە ٦ مانگ دوای کۆنگرەی ٣ی کۆمەڵە بەرێوە چوو، باسمان لە لایە جۆراوجۆرەکانی ئەو پەیوەندیەکرد و بریار نیهاییمان لەسەردا و سنورەکانیمان دیاریکرد. هەر بۆیە پەیوەندی ئێمە و دەوڵەتی عێراق و پارمەتی وەرگرتن لێیان، پەیوەندیەکی ئاسان نەبوو. دەوڵەتی عیراق هەرگیز لە ئێمە ئەمین نەبوو و دەیان قوربانیمان لەو پێناوەدا، داوە.

*پەیوەندی ئێوە و مەنسور و حزبەکەی چۆن بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە، هیچ پەیوەندیمان نەبوو.

## مەنسوری حیکمەت کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیست و هێزی پێشمەرگەی لاواز کرد

* ئایا ئێستا پەیوەندیەکتان لەگەڵ لایەنەکانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری هەیە؟

**ئیبراهیم عەلیزادە،** هەلومەرجی جیابوونەوەکەوبیرەوەریە ناخۆشەکانی کاریکی وایکردبوو کە پەیوەندیگرتن لەگەڵ ئەو حزبە تازەیە بۆ ئێمە کارێکی ئاسان نەبووە. تا ئێستا هیچ پەیوەندیەکی بەرەسمی سیاسی لەنێوانماندا دانەمەزراوە و ئەم یا ئەو هاورێ ئەگەر بە شەخسی لەگەڵ هاورێیەکی قەدیمی خۆیدا لەم حزبەدا پەیوەندی شەخسییان هەبووبێ، لەوە زیاتر نەبووە. لە جەرەیانی بانگەوازی مانگرتنی گشتی (١٦)ی گەلاوێژی (٢)ساڵ لەمەوبەردا کە خەڵکی کوردستان بە تێکرای دەنگ بە دەم داوای کۆمەڵەوە بۆ مانگرتنی گشتییەوە هاتن، باڵی حیکمەتیستی ئەم حزبە پشتیوانی لەم بانگەوازەکرد.

لە مانگەکانی سەرەتای ئەم ساڵیشدا(٢٠٠٦) هەوڵێکدرا بۆ ئەوەی کە هەموو بەرەی چەپی ئێران بەیانێکی هاوبەش لەسەر هەلومەرجی سیاسی ئێستای ئێران و ئەو مەترسییانەی کەهەرەشە لەم کۆمەڵگایە دەکات، دەر بکەن، کە حزبی کۆمۆنیستی کاریگەریش لەناو ئەو بەرەیەدا حیسابی بۆ کرابوو. ئەو هەوڵەش بێئاکام ماوە. بێجگە لەمانە زەرورەتێکی سیاسی ئەوتۆ بۆ بەرقەرار کردنی ئەو پەیوەندییە نەبووە، هەرچەند من بە شەخسی لام وایە لەگەڵ باڵەکانی ئەم رەوتەش وەکو بەشێکی زۆر لە ئۆپۆزسیۆنی جمهوری ئیسلامی پێویستە پەیوەندیەکی ئاسایی هەبێ و ئیتر دەمێکە کاتی ئەوە هاتووە کە رووداوەکانی دەورەی جیابوونەوەکان فەرامۆشبکرێن و ئەوەندەی کە پێویستە ئەساسێکی نوێ بۆ پەیوەندی دابرێژرێت.

*بە رۆیشتنی مەنسوری حیکمەت و ئەو جەماعەتە، حزبی کۆمۆنیستی ئێران تا چەند لاواز بوو؟

**ئیبراهیم عەلیزادە،** ئەو رووداوە زەربەیەکی قورس بوو لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران و لە کۆمەڵەش، ئەوان لە هەر سێ بەشی رێکخراوی ناوەوەی وڵات، رێکخراوی دەرەوەی وڵات و لەناو هێزی پێشمەرگەشدا، زۆربەی کادر و ئەندامانیان یا لەگەڵ خۆیان برد وە یا کەنارەنشینیان کردن. بەڵام نە کۆمەڵە و حزبی کۆمونیستی ئێران بەم حەرەکەتەی ئەوان لە ناوچوو وە نە ئەوانیش توانیان ئەو هێزەی کەبەمجۆرە لە دەوری خۆیان کۆکردبووە، بپارێزن. کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران، سەر لەنوێ بووژانەوە و پێگە و جێگە و شوێنی خۆیان بە دەستهێناوە. ئەوان با وجوودی ئەوەی کە زۆرینە بوون، بەڵام ئامادە نەبوون حزبەکەی خۆیان لەسەر هێڵی حزبی کۆمۆنیستی ئێران حەرەکەت بدەن. ئەوان پێیانوابوو کە دەبێ خۆیان لە هەموو سوننەتی حزبی کۆمۆنیستی ئێران جیاکەنەوە. حزبەکەی ئەوان نە دەبوایە لە هیچ رووێکەوە وەکوو حزبی کۆمۆنیستی ئێران بچێ. ئەوان نەیاندەویست خۆیان بە میراتگری حزبی کۆمۆنیستی ئێران

بناسن. بەڵام حزبی کۆمۆنیستی ئێران بە بەرنامە و ستراتیژ و ڕێبازی سیاسی و سوننەتی فەعالیەتی حزبییەوە، دامەزراوێکی جێکەوتوو بوو کە ئەو لاواز بوونە نەیتوانی بناغەکەی دەربێنێ.

بە نیسبەت کۆمەڵەشەوە، زۆر زوو مەقەرەکانی لەکوردستانی عێراق ئاوەدانبوونەوە، لاوانی شۆڕشگێری کوردستان ڕوویانکردە ریزەکانی کۆمەڵە، هەڵسوراوانی ناوەوەی وڵات پەیوەندییەکانیان دامەزراندەوە، حەرەکەتە کرێکارییەکان لە مانگرتنی کورەخانەکانەوە، بگرە هەتا ڕێ و ڕەسمەکانی (١)ی مەی و گەڵێك ئیعترازی جەماوەری، لە ژێر کاریگەری کۆمەڵەوە دەستییپێکردەوە. چاپەمەنییەکانی حزب و کۆمەڵە بوژانەوە، رادیۆکان ڕەونەقی رابوردووی خۆیان وە دەستهێنایەوە. لە دەرەوەی وڵاتیش ژمارەیەك لەو کادیرانەی کە تووشی نائومێدی و بێ تەفاوتیبوون و کەنار گیریان کردبوو ئەوانەش کەم کەم هاتنەوە ناو کۆڕی خەبات. مەبەستم ئەوەی لەسەرەتاوە بە جیا بوونەوەی ئەوان گەلێك لاواز بووین، بەڵام ئەو لاوازبوونە کاتی بوو.

**حزبی کۆمۆنیست بەهێزترین باڵی چەپی ئێرانە**

*ئێستا حزبی کۆمۆنیست لە چ وەزعێکدایە، ئەتانەوێت حزبی کۆمۆنیست بەرەوکوێ بەرن؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە ئێستا حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە چاو باقی هێزەکانی چەپی ئێران لە هەلومەرجێکین لەبارتر دایە و ئیمکانی گەشە و پەرەسەندنی زۆرە. بەو حاڵەشەوە پێمانوانییە کە حزبی کۆمۆنیست بە تەنیا خۆی دەبێتە ئەو ناوەندە کە هەموو حزب و گروپ و ڕێکخراوە سیاسییەکانی بەرەی چەپی کرێکاری ئێران لە خۆیدا کۆ بکاتەوە. بەو مانایە پێمانوا نییە کە ناوەندی ڕێبەریکردنی شۆڕشی کرێکاری داهاتووی ئێران لە پەرە گرتنی چەندایەتی حزبی ئێمە پێکدێت. ئەوە داهاتووە کە دیاریدەکات ستادی ڕێبەری شۆڕشێکی کرێکاری لە ئێران چۆن شکڵ دەگرێت. حزبی کۆمۆنیستی ئێران دەتوانێت قورسایەکی زۆری هەبێ لە شکڵ گرتنی وەها پرۆسەیەکدا. حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەرنامەیەکی ڕۆشنی سیاسی هەیە، ستراتیژی خۆی بۆ گەیشتن بەو بەرنامەیە دیاریکردووە، پێشینەیەکی سیاسی روون و جێگای ڕێزی هەیە. ڕاستگۆ بووە و هەمیشە هەموو ڕاستییەکانی بە خەڵك گوتووە. کەموکوڕییەکانی خۆی ناسیوە و هەوڵیداوە لە بەینیان بەرێ. ئەگەر بە خاوی چۆتە پێش و ئەگەر نەیتوانیوە کە وەڵام دەرەوەی هەموو ئەو چاوەڕوانیانە بێ کە لێی هەبووە، بەڵام دەتوانێ نیشانیبدات کە بە هەموو توانا‌وە، بە بێ سازان و لادان بۆی تێکۆشاوە. لە هەلومەرجی ئێستادا کە بوژانەوەیەك لە ناو بزوتنەوە کومەڵایەتیەکانی رادیکاڵی ئێران وەکو بزوتنەوەی خوێندکارانی زانکۆکان، بزوتنەوەی کرێکاری، بزوتنەوەی ژنان دەبینرێ کەس ناتوانێ دەوری ڕەوتی ئێمەی تێدا نەبینێ.

***کامانەن گروپە چەپەکانی ئێستای ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شاخەکانی چریکی فیدائی، رەنجبەران، راە کارگەر، یەکێتی کۆمۆنیستەکان و یەکێتی سۆسیالیستی کرێکاری و باڵەکانی کۆمۆنیزمی کرێکاری و چەند گروپی دیکەن.

***ئەو شتانەی کە حزبی کۆمۆنیستی پێناسرایەوە وەکو دروشمی کرێکارانی جیهان یەکگرن، ئارمی چەکوش و، داس هەست ناکەیت ئێستا کەم بۆتەوە، بۆ نمونە لەناو بارەگاکانتان نابینین، لەسەر ریکلامەکانتان کەمتر نەبینرێ، ئەوە دەلالەت لەو ئاڵوگۆڕانە ئەکات، کە دوای شکستی شورەوی و یەکێتی شۆڤیەت روویاندا، یان ئەوە لە چ ئەزرو تیۆرێکەوە ئێوە پێگەیشتن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هەرگیز باوەڕمان بەوە نەبوو لە ناوەڕاستی ساڵەکانی دەیەی (٢٠)ی زایینی وە ئیتر چینی کرێکار لە یەکێتی سۆڤیەت لەسەر دەسەڵاتە، بەڵام لە ئاکامەکانی ئەم بومەلەرزە گەورە سیاسییە واتە هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت بێ نسیب نەماین. ئێمەش بە بەشی خۆمان کەوتینە ژێر کاریگەری ئەوە پروپاگەندەی کە سەرمایەداری سەرکەوتووی رۆژئاوا لە دژی کۆمۆنیسم دەستیپێکردبوو. لەو پروپاگەندەیەدا، سەرەتا کۆمەڵگای یەکێتی سۆڤیەت بە ناڕەوا بە کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی پێناسەدەکرا و ئەو جار هەموو ئەو دیاردە دزێوانەی کە لەوێ روویاندابوو، دەیانکرد بە کوتەك بۆ سەر ئامانجی شەریفی کۆمۆنیستی. پێویست بوو ئێمە بەرانبەر بەم پەلامارە جیهانییە لە هەموو رویەکەوە رابوەستین، لە بواری نەزەری، لەبواری عەمەلی و تەنانەت لە هێما و نیشانەکانیشدا جیاوازی خۆمان بەیانکەین، بۆ ئەوەی بە ناڕەوا نەکەوینە بەر ئەم پەلامارە. لاچوونی عەلامەتی چەکوچ و داس پەیوەندی بەو تێبینییەوە هەبوو. دروشمی کرێکارانی جیهان یەکگرن هەر لە جێگای خۆیەتی و ئێستا لەگەڵ گلۆبالیزاسیۆنی سەرمایەداری زیاتر لە هەمیشە پێویستی بەرز کردنەوەی ئەو دروشمە بە عەمەلی هاتۆتە گۆڕێ.

***واتا رەبتی نەبوو بەو شکستانەی کە تووشی بلۆکی شورەویی هات، باشە ئەو شکستە یا ئەو وەزعەی کە لەدوای (١٩٩٠)ەوە روویدا پاش تێزەکانی گۆرباچۆف و لەسەر ئاستی دونیا چ کاریگەری سلبیان کرد لەسەر رەوتی کۆمۆنیست و مارکیسزم و کۆمۆنیزم لەسەرتاسەری دونیا، بەتایبەت لەسەر حزبی کۆمۆنیستی ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شۆڕشی کرێکاری لە یەکێتی سۆڤیەت لە ناوەڕاستی ساڵەکانی(١٩٢٠_ ١٩٣٠) زایینیدا وردە وردە شکستی خوارد و ئامانج و ئاواتەکانی ناسیۆنالیسمی روسی لە ژێر دەسەڵاتی نیزامێکی سەرمایەداری دەوڵەتیدا جێگای ئامانج و بەرنامەی چینی کرێکاری گرتەوە. بەڵام ئەم بۆچونە هەرگیز نەیدەتوانی نە ئێمە و نە هیچ رێکخراوێکی کۆمۆنیستی لە دونیادا بەرانبەر بەهێرشێکی بەرینی تەبلیغاتی کە لە دژی کۆمۆنیسم کەوتبوە رێ و تەڕ و وشکی پێکەوە ئەسوتاند، زەمانەت بکەین.

ئەم هەلومەرجە لە روی عەینییەوە ئێمەشی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە و لەڕاستییدا کاری ئێمەی دژوارتر کردبوو. کەمتر لە (١٠) ساڵ دواتر هەموو ئەو تەپ و تۆزە نیشتەوە و مەعلوم بوو کە بەدیلی سەرمایەداری بۆ ژیانی داهاتووی ئینسان جگە لە شەڕ و ماڵوێرانی و بێ مافکردنی زیاتری هیچی تری بە دەستەوە نییە.

**حزبی کۆمۆنیست موقەدەس نییە**

***کەواتا ئێوە کەی واز لە حزبی کۆمۆنیست دەهێنن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە ئامانەوێ واز لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران بێنین، بەڵام هەر وەکوو پێشتر ئامازەم پێکرد، لە پێناوی پێکهێنانی یەکگرتوویییەکی چینایەتی و سەرانسەری بەهێزتردا قاڵبی ئێستای حزبی کۆمۆنیستی ئێران خۆی لە خۆیدا مۆقەدەس نییە و دەتوانێ بگۆڕدرێ بەدیاردەیەکی دیکە کە بزووتنەوەکەمان بەرەو سەرکەوتن بەرێ.

***جیاوازی چییە لەنێوان ئەو ئامانج و ئەهدافانەی کە کۆمەڵە بۆی تێئەکۆشێت، لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست، کەوتە بۆ هەر لەناوکۆمەڵەدا کارئاکەن و بەوئەهداف و ئامانجانە بگەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هیچ جیاوازیەکی ئوسوڵی نییە، تەنیا ئەوە نەبێ کە کۆمەڵە ئامانجی بە سەرکەوتن گەیاندنی بزووتنەوەی خەڵکی کوردیشی بە تایبەتی لەسەر شانە و بە پێی ستراتیژی دیاریکراوی خۆی بۆی

تێدەکۆشێ. بەڵام ئەگەر مەنزور کۆمەڵەیەکی کوردستانییە پێمانوایە وەها قاڵبێک گەلێک مەحدودماندەکاتەوە لەبە کارهێنانی ئەو زەرفیەتە سیاسیو کۆمەڵایەتییە عەزیمەی کە خەباتێکی سەرتاسەری لە ئێران لە خۆیدا کۆی کردۆتەوە. پەیوەستبوونی ئێمە بە بزوتنەوەیەکی سەرانسەری ئێران، بێگومان جێگا و شوێنی کۆمەڵە لە کوردستانیش بەهێزتر دەکات.

***پێتوایە جیاوازیەك هەیە لە رووی ئیدیۆلۆژی، سیاسی، ئەزمری، پراکتیکی و ستراتیجیەوە لە نێوان کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیستدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من نییە، نا. ئەوە دابەشکردنی کارە، یەعنی ئێمە لە کوردستان ئەولەوێتێکمان هەیە، ئەو ئەولەوێتە دەبێ بەجێبگەیەنین بۆ نمونە ئێمە پێمانوایە کە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان دەتوانێ سەرکەوتنی خۆی هەبێ، یەعنی دەتوانێ سەربەخۆ لەوەی کە بزوتنەوەی سەرانسەری چ رەوتێك دەگرێتە بەر، بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانە لە کوردستان دەتوانێ بەدەرەجەیەك سەرکەوتنی خۆی هەبێ، جا ئەو سەرکەوتنە ئایا، بەردەوام دەبێ چەندە لەباری کۆمەڵایەتیەوە، قووڵ دەبێتەوە، ئەمە بەحسێکی دیکەیە، بەڵام بزوتنەوەی کوردستان خۆی ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر چارەنووسێکی جیاوازی لە بزوتنەوەی سەرانسەری لە هەموو ئێران هەبێ.

***تۆ پێتوانییە هەموو ئەو سەرکەوتنانەی کە لەرابردوودا روویانداوە، وە لەداهاتوشدا روو ئەدەن، کۆمەڵە پێشڕەوایەتی ئەکاو حزبی کۆمۆنیست بەرهەمەکەی ئەخوات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کێشە ئەوە نییە کام لا بەرەمی کام لا دەخوات، کۆمەڵە ئەو ئەرکانەی کە لە کوردستان هەیەتی بەرێوەیان ئەبات. بەڵام کۆمەڵە ناتوانێ وەڵامدەرەوەی ئەو پێویستیانەبێت کە لە ئاستی ئێراندا حزبی کۆمۆنیست لەبەردەمێتی.

***زەروورن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، زۆر زەروورن، ئەو مەجالە تا ئێستا ئەرەخساوە تا حزبی کۆمۆنیستی ئێران هەموو زەرفیەتەکانی خۆی لەو ئاستەدا دەر بخات. لەگەڵ قوڵتربوونەوەی ئەزمەی سیاسی لە ئێران، لەگەڵ گۆرانی هاوسەنگی هێز لە نێوان جەماوەر و رژێمدا و گرانەوەی کەشوهەوای سیاسی ئێران، حزبی کۆمۆنیستی ئێران دەتوانێ بە خێرایی گەشەبکات و ببێتە یەکێك لە رێکخراوە زۆر گرنگەکانی بەرەی چەپی رادیکاڵ و کرێکاری لە ئێران.

**لەکاتی خۆیدا حزبی کۆمۆنیست بەهانای کۆمەڵەوە دێت**

***ئەگەر وایە بۆچی هەر هێشتاەندامانی لە مێژینەی کۆمەڵە، وەکوردەکان، رێبەرایەتی تەنانەت حزبی کۆمۆنیست و زۆرینەی حزبی کۆمۆنیست دەکەن، بە پێچەوانەوە ئێوە کەمترین خەڵکی پێکهاتەکانی تری وەکو فارس و تورك و بلوچتان لەگەڵیدایەو کە پێویست بوو ئەو حزبە لانی کەم بەشی زۆر لەوانی تیابێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەو فرسەتە لە دەورەی راپەرینی جەماوەری لە ئێران بۆ روخانی رژێمی شا و دواجار لە چەرەیانی موقاوەمەت بەرانبەر رژێمی ئیسلامی تەنها بۆ ئەو بەشە لەحزبی ئێمە لە کوردستان رەخسا کە بتوانێ لە ئاستێکی جەماوەریدا کادر پەروەردە بکا، لە ئاستێکی جەماوەریدا تێکۆشەرانی سیاسی بێنە ناو ریزەکانیەوە. بەڵام ئێمە ئامانەوێ لەو فرسەتەی کە بۆ کۆمەڵە رەخساوە تیئۆریەك بۆ هەموو بزوتنەوەی سیاسی لە ئێران وە هەموو بزوتنەوەی چینایەتی لە ئێران دابرێژین. ئێمە

دەزانین کە بزووتنەوەی کوردستان وە کۆمەڵە تێدا لەگەڵ هەموو دەستکەوتەکانیش کە هەیەتی، خاڵی لاوازیشی زۆرە کە ئەو خاڵە لاوازانە یەبێ بەشدارێکی سەرانسەری خەڵکی چەپ و رادیکاڵ و چینی کرێکار و زەحمەتکێش لە ئاستی ئێران پڕ نابێتەوە. ئەم بزووتنەوە سەرانسەریە لەکاتی خۆیدا دێتە هانای کۆمەڵەیەکیشەوە کە دەکەوێتە ژێر فشاری کۆماری ئیسلامی وە یان هەر رژێمێك کە لە مەرکەز لەسەر کار بێت.

**حزبی کۆمۆنیست دەبێ بەحزبی سۆسیالیست؟**

***ئەگەرێك هەیە بۆ گۆڕینی ناوی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بۆ حزبی سۆسیالیستی ئێران یا بۆ هەر ناوێکی تری لەو شکڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، ئەو گۆڕینی ناوە بە پێویست نازانین، گۆڕینی ناو لە نێو حزبە بە ناو کۆمۆنیستەکاندا دوای روخانی یەکێتی سۆڤیەت بوو بە باو. ئەو ناو گۆڕینە رەمزی بادانەوە و رەمزی لادان بوو، رەمزی پێداچوونەوە بە بیر و بۆچوونەکانی پێشویان بوو، بۆ ژمارەیەکیان رەمزێك بوو بۆ نزیکبوونەوە لە دەوڵەتانی رۆژئاوا. بەڵام هەر وەکوو پێشتر ئاماژەم پێکرد کە ئەگەر قەرار بێ یەکگرتوویەکی بەهێز لە نێوان هێزە چەپەکانی ئێران، لە ناو تێکۆشەرانی ریزی خەباتی کرێکاریدا پێکبێت. لە پێناوی وەها پرۆسەیەکدا، ناو دەورێکی جیدی نابینێ و دەتوانێ لە کاتی خۆیدا ئەگەر پێویست بێ دەتوانێ ناوەرۆك گەشەبکات و ناو بگۆردرێ.

**هیچ کات سکرتێری حزبی کۆمۆنیست نەبووم**

***با یەك پرسیارت لێبکەم، لە کۆنگرەی یەك و دوو سێ و چوار کە عەبدوڵڵای موهتەدی سکرتێری حزبی کۆمۆنیستی ئێران بووە، بە پێچەوانەوە تۆ تا ئێستا سکرتێری حزبی کۆمۆنیست نەبووی لەهیچ کام لە دەورەکاندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ وایە من لە هیچ دەورەیەکدا سکرتێری حزب نەبووم، بەڵام لە ناوەندەکانی سەرکردایەتی حزب وەکو دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی بەریەوەبەردا بووم.

***لەم ئاڵوگۆڕانەیە موتەناقیسێك ئەبینم ئەویەکە پاش چەند ساڵ عەبدوڵڵای موهتەدی بەبیانوی رەخنەگرتن لەو ئیدئولۆژی و فکروتێرانە واز لەم بەرنامانە دێنێ ئەبێ بەسکرتێری کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستان ئێران بەپێچەوانەوە تۆکە خۆت سکرتێرنەبووی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەناقوزێك لێرەدا نییە، من هەمیشە کۆمەڵەم وەکو رێکخراوێکی کۆمۆنیستی دیوە وە پێموابووە پێویستە ئەوخەت و رێبازە فکری وسیاسی و بەرنامەیە لەکۆمەڵەدا بپارێزین . من تەناقوزێك نابینم لەبەینی حوزوری خۆم وەکاری خۆم لەکۆمەڵەدا لەگەڵ ئەو ئامانجانەی کەبۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران دامانناوبوو، هەروەکو وەختی خۆی کاك عەبدوڵڵا نەی دەبینی . کادرەکان بەپێی توانای خۆیان لەشوێنەکان رێکدەخرین و سازمان دەدرێن، بە بۆنەی زەرفیەت و ئیمکانات و توانایەی کەهەم بوو کوردستان بۆ من مەیدانێکی موناسیبتر بوو وە بۆ حزبی ئێمە وا بەقازانج بوو کە لەداهاتوودا کە ئەو کادیرانە لە شوێنی خۆیان رێك بخرێن**موهتەدی لەکۆمەڵە چووە دەرەوە**

***تۆ پێتوایە کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان لە کۆمەڵە دەرچوون یا لەحزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە راستیدا لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی ئەوان لە کۆمەڵە دەرچوون، یەکیان، هۆکای

ڕێکخراوەیی و ئەوی تریان هۆکاری سیاسییە. ئەوان چ لە ناو کۆمیتەی ناوەندی، چ لە ناو ئەندامانی کۆمەڵە بە گشتی و چ لە ناو نوێنەرانی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی (٩)دا، چ لە ناو هێزی پێشمەرگە و ڕێکخراوی ناوەوەی وڵاتیشدا کەمایەتی بوون. ئەگەر بە لانی زیادیشەوە بۆیان حیساب بکەین ڕێژەیان بە گشتی نەدەگەیشتە (٢٠) لە سەدی ڕیزەکانی کۆمەڵە لە هە هەموو ئاستێکدا.

لە رووی سیاسیشەوە ئەوان لە راستیدا ڕێبازی تا ئەو کاتی کۆمەڵەیان گۆڕی. ئەوەی ئەمڕۆ دەیڵێن و یان بە کردەوە دەیکەن پەیوەندی بە هیچ دەورەیەك لە ژیانی کۆمەڵەوە نییە. بڕواننە کۆنگرەی رابوردووی کۆمەڵە، لە کۆنەوە تا ئێستا و بەراوردی بکەن لەگەڵ ئەوەی ئێستایان، بزانن ئەوان دەتوانن خۆیان بە کامیانەوە گرێ بدەن؟

**رەوتێکی نوێ لەناو کۆمەڵەدا پەیدا دەبێت**

***لە کۆنگرەی (١٢) کە مانگی (٨ی ٢٠٠٦)دا بەستان، هەمدیسان مەیلێك یاخود گەرایشێکی لەو جۆرە هەیە کەداوا دەکات حزبی کۆمۆنیستی ئێران نەمێنێ، تەنها بە ناوی کۆمەڵەوە کار بکرێت، بەڵام پێموایە ئەو مەیلە کەمینە بوو لەناو کۆنگرەداو نەیتوانی دەنگێکی وا بەدەست بهێنێ، ئەم مەیلە تازەیە چییە؟ وهێتانوانییە لەگەڵ زیادبوونی ناڵۆگۆڕەکانی داهاتوو، ئەم مەیلە لەناو کۆمەڵەدا زیاد دەکات، وە مەبەستم ئەوەیە ئایا ئەمە زیاد دەکات و لە حاڵەتێکیشا ئەگەر هاتوو ئەم مەیلە لە کۆنگرەدا زۆرینە بوون ئێوە مل بەوە ئەدەن کە تەنها بەناوی کۆمەڵەوە کاربکەن و واز لە حزبی کۆمۆنیست بهێنن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو مەیلە لە ناو ئێمەدا پێش ئەو کۆنگرەیەش هەر هەبوو. لە کاتی جیابوونەوەی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان ئەوان نەیانویست لەگەڵ ئەوان بچن و هەستیان بە گەلێك ناکۆکی دەکرد لەگەڵیان. ئەوەی کە ئایا ئەو رەوتە لە ناو ئێمەدا گەشەدەکات یان نا، بەبڕوای من بە دەرەجەی یەکەم پەیوەندی هەیە بەوەی کە ئێمە چەندە بتوانین ئەو ئەرکانەی کە بۆ کۆمەڵە لە کوردستان و بۆ حزبی کۆمۆنیست لە ئاستی ئێراندا دیاریمان کردووە جێبەجێبکەین. ئەم رەوتە لە ناو ڕیزەکانی خۆماندا کەمتر ئیمکانی گەشە کردنی هەیە. رەنگە خۆیان زۆرتر هیوایان بەڕاکێشانی سەرنجی هەڵسوراوانی قەدیمی کۆمەڵە کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتن و پەیوەندییان بە هیچ بالێکەوە نییە هەبێ، داهاتووش نازانم چی دەبێ.

**کۆنگرەی چوارەمی بەهێزکردنی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە**

***لێرە باسەکانی تایبەت بە حزبی کۆمۆنیست کۆتایی دێت، ئەگەر بەبیرخۆتی بهێنیتەوە، پێموایە ئەمانە یادەوەری کۆنگرەی سێهەم بوون. ئێستا ئەچینە سەرباسەکانی کۆنگرەی چوارەم، بۆیە پێمخۆشە بە شکڵی کۆنگرەکان بڕۆین، لەبەر ئەوە تەشکیلی حزب زیاتر پەیوەستە بە کۆنگرەکانەوە هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە پێکدێن لە دەرئەنجامی کۆنگرەکانەوە دروستدەبن، پێمخۆشە ئێستا باسی کۆنگرەی چوارەمان بۆ بکەیت، کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵە کەی بەسترا؟ وە ئەو ئاڵوگۆڕە جیدیانەی کە لە کۆنگرەی (٣)دا قسەتان لەسەرکرد تا چەند کارتان پێکرد وە، کۆنگرەی چوارەم چ ئاڵوگۆڕێیکی لەناو کۆمەڵدا پێکهێناوە لە کوێ بەستراوە چ کاتێك بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵە ساڵی (١٣٦٢) لە شوێنێك بەناوی گەڵاڵە کە دەکەوێتە نزیك شاری ماوەت لەکوردستانی عێراق و ناوچەیێکی دوور لە دەسەڵاتی ڕژێمی عێراق بوو، بەسترا. شوێنێکی ئەمنی لە نزیك مەقەراتی ناوەندی کۆمەڵە بۆ دیاریکرابوو، بۆ ئەوەی لە تۆپبارانی ئەرتەشی ئێران کە بەردەوام دەکرا، بپارێزرێ. مام جەلال و کۆمەڵێك لە کادیرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە کۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەکەدا بەشدار بوون و مام جەلال دوای خوتبەیەکی کورت وەڵامی پرسیاری بەشدار بووانی کۆنگرەی لەسەر هەلومەرجی خۆیان لە کوردستانی عێراق دایەوە. ڕۆژێك دوای ئەوە کۆبوونەوەکانی کۆنگرە دەستیپێکرد. نوێنەرانی دەفتەری سیاسی حزبی کۆمۆنیست، مەنسوور حیکمەت، عەبدوڵلا موهتەدی، ئیرج ئازەرین لەم کۆنگرەیەدا وەکوو چاودێر بەشدار بوون.

کۆنگرە لە هەلومەرجێکی دژوار کە بۆ خەباتی چەکداری لە کوردستانی ئێران پێکهاتبوو بەسترا. هێزی پێشمەرگە لە هەموو شوێنێك کەوتبووە ژێر زەختی ڕژێمی ئێرانەوە بۆ ئەوەی ناوچە ئازاد کراوەکان جێبهێڵێ و بە تەواوی ڕوو بکاتە شێوەی خەباتی پارتیزانی. مەقەراتی ناوەندی کۆمەڵە هەر لە ژێر ئەو زەختەدا بوو کە گوازرایەوە بۆ ناوچەی ئازادەکانی کوردستانی عێراق. لەناستی هەموو ئێرانیشدا کۆماری ئیسلامی ئێران هەموو حەرەکەتێکی موقاوەمەت و ئازادیخوازانەی بە بیانووی شەڕ لەگەڵ عێراقەوە سەرکوت کردبوو. جموجۆڵ لە زانکۆکانی ئێران بڕا بوو. بەشی زۆری کرێکاران لە کارگا و کارخانەکانەوە ڕاپێچی مەیدانەکانی شەڕ کران. وڵات بە شێوەی سیستمێکی جیرە بەندی جەنگی بەڕێوەدەچوو.

بەشی نهێنی تەشکیلاتی کۆمەڵەش کەوتبووە ژێر زەخت و ژمارەیێکی زۆر لە هاوڕێیانی ئەو بەشە گیرابوون و لەژێر زەخت و ئەشکەنجەدا بوون و ژمارەیێکیشیان ئێعدام کرابوون. کۆنگرە ئەرکی سەرەکی خۆی بە مەحکەمکردنی ڕیزەکانی تەشکیلات بە تایبەت لەناو هێزی پێشمەرگەدا دانابوو. بڕیارەکانی ئەو کۆنگرە زۆربەیان ڕووی لە مەحکەمکردنەوەی پێچ و مۆرەکانی ڕێکخراوەییدا بوو. هەوڵی ئەوە بوو کە لەم هەلومەرجە دژوارەدا کاری هەڵسووڕانی ئێمە لە هەموو بوارێکدا نەقشەمەند بکات. تەنانەت سەرخەتی سیاسەتی جەنگیشمان بەرانبەر بەرژێم هەر لەژێر کاریگەری پەسەندکراوەکانی ئەو کۆنگرەیەدا داڕێژرا.

بەبڕوای من کۆنگرە تەئکیدێکی زیاد لە پێویستی لەسەر پلان دارشتن بۆ هەموو بوارێکی کاری ڕێکخراوەیی بە ورد و درشتییەوە کرد. بە جۆرێك کە بەشی زۆری پەسەندکراوەکانی دوواجار لە کردەوەدا بەڕێوەنەچوون. خاڵی لاوازی کۆنگرە بریتیبوو لە دوورکەوتنەوە لە لێکدانەوەیێکی قووڵی سیاسی و پێش بینی واقیع بینانە بۆ داهاتوو. بۆشایی ئەو لێکدانەوەیە بە کۆمەڵێکی زۆر قەرار و بڕیاری فۆرماڵ پڕکرایەوە.

نەخشەمەندکردنی هەموو بووارەکان پێویست بوون، بەڵام پێش ئەوە ئەبووایە ریزەکانی کۆمەڵە لەسەر لێکدانەوەیەکی قووڵ و هەمەلایەنەی سیاسی ئەو سەردەم ساغ بوو بانەوە.

**کۆنگرەی کۆمەڵەو دیموکرات بەیەکەوە بەستڕا**

*** ئەو کاتە شەڕی چەکدارانەی ئێوە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی، لەگەڵ حزبی دیموکرات شەڕێکی توندبوو، ئەوانە تا چەند کاریگەریان لەسەر کارو چالاکیەکانی ئێوە هەبوو، هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە تا لەو دەورانەدا لە چ حاڵەتێکدا بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەر وەك ئاماژەم بۆ کرد، شەڕێکی توند لەگەڵ کۆماری ئیسلامی لە کایەدا بوو، بەڵام شەڕی سەرتاسەریمان لەگەڵ حزبی دیموکرات دەستپێنەکردبوو. وردە تێکهەڵچوون لێرە و لەوێ هەبوو کە پێش بە تەشەنەکردنی دەگیرا. پێویستە ئەوەش بڵێم کەهاوکات لەگەڵ کۆنگرەی (٤)ی ئێمە، لە دۆڵێکی ئەولاتردا کۆنگرەی (٦)ی حزبی دیموکراتیش بەرێوەدەچوو. ئەو کۆنگرەیە کەنامیلکەی "کورتە باسێك لەسەر سۆسیالیسم"ی دکتۆر قاسملۆی تێدا پەسەندکرا و چەندین کێشەی لە ناو حزبی دیموکراتدا، نایەوە و دوای ئەو کۆنگرەیە ژمارەیەك لە کادرەکانیان وازیان لە حزب هێنا.

*** دوابەدوای ئەوەی کە پاشەکشەتان کرد لەناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵات هاتنە ئەمبەرەوە، ماوەیەکی زۆر لەناوچەکانی شینکایەتی و سەفەرەو زەروونو مالومە مانەوە، بۆچی ئەو ناوچانەتان هەڵبژارد بە پێچەوانەوە نەچوونە لای قەڵادزێ، سەرکردایەتیتان نەبردە لای پێنجوێن و هەڵەبجە و ئەوانە بۆچی ئەو ناوچانەتان هەڵبژارد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەرەتاوە دەوڵەتی عێراق زۆری هەوڵدا کە پاشەکشەی ئێمە بەرەو شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بێت. بەڵام ئێمە بەوە رازی نەبووین و گواستمانەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە رژێمی بەعس جۆڵێکردبوون و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان تێیاندا جموجۆڵی هەبوو. بەو مانایە ناوچەیێکی رزگار کراو بوو.

**لەگەڵ یەکێتی یارمەتی یەکترمان دەدا**

***هاوکاری و یارمەتیدانی خەڵکی ئەو ناوچانە چۆن بوو بۆ ئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەروەك باسمکرد خەڵکی ئەو ناوچانە هەمووی راگوازرا بوون بۆ موجەمعەکان و مەنتەقەکە چۆڵبوو. تەنیا لێرە و لەوێ کەس وکاری پێشمەرگە و خەڵکی ئاوارە دەبیندران. بەڵام ئەوەندەی کە خەڵکی تێدا مابوو، بە هەموو هەژارییانەوە، بەکجار زۆر بەسۆزەوە یارمەتییاندەداین. با وەکوبوونی ئێمە لەو ناوچانە دەبووە هۆی ئەوە کە بەردەوام لە مەترسی بۆمباران و تۆپبارانا بین، بەڵام هەرگیز ناوچاوانیان لێگرژ نەکردین. جگە لەوە پەیوەندیمان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانیش لەو ناوچانە زۆر دۆستانە بوو، یارمەتی یەکترمان دەدا و گەلێك جار لە پێناوی ئەو پەیوەندییانەدا دەکەوتینە بەر تووڕەیی رژێمی عێراق و شوێنەکانی ئێمەش بێ جیاوازی تۆپباران دەکرا.

**پارتی(قیادە مؤقەت)، شەڕی کۆمەڵە- دیموکراتی دەکرد**

***تۆ باسی ئەوەت کرد هەم لە کۆنگرەی سێهەم، لە کۆنگرەی چوارەم، دیارە کۆنگرەکانی دواتریش مام جەلال بەشداری لەکۆنگرەکانی ئێوە کردووە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە وەفدێکی باڵا هەمیشە بەشداری**

**ئەكرد، پەیوەندیتان لەگەڵ حزبەكانی تر وەكو پارتی، سۆسیالیست و پاسۆك و شیوعی و ئەوانە بەو شكڵە لاواز بوو یا كەستان بانگ نەئەكردە كۆنگرەكانتان یا ئەو پەیوەندیەی نێوەو یەكێتی چۆن چۆنی بوو بەتایبەتی لەگەڵ مام جەلال؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پەیوەندی ئێمە لەگەڵ یەكێتی نیشتمانی دەگەڕێتەوە بۆ پێش رووخانی رژێمی شا. لە ساڵانی پێش رووخانی رژێمی شاوە ئێمە پەیوەندییەكی رێكخراوەییمان لەگەڵ كۆمەڵەی رەنجدەران و یەكێتی نیشتمانی كوردستان دامەزراندبوو. بە پێی توانا یارمەتیمان پێدەگەیاندن. دوای هاتنە سەركاری كۆماری ئیسلامیش ئەو پەیوەندییە هەر بەردەوام بوو. جگەلەوە ئێمە مەقەراتی خۆمان گواستبووەوە بۆ ئەو شوێنانەی كە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو. هەڵبەت هێزەكانی دیكە وەكوو پارتی لەو كاتەدا لەناوەوەی كوردستانی ئێران بوون و شوێنێكی ئازادیان بە دەستەوە نەبوو. جگە لەمە ئەو كات بە داخەوە هێزەكانی پارتی كەوتبوونە دژایەتی هێزی پێشمەرگەی كوردستانی ئێران و چەندین شەڕی خوێناوی لە نێوان ئێمە و حزبی دیموكرات لەلایەك و هێزەكانی پارتی كە ئەو كات بە "قیادە مۆوەقەت" دەناسرانەوە روویدابوو. هەر بۆیە هەموو ئەو هێزانەی كە لەبەرەی پارتیدا بوون نەیاندەتوانی رێگایان بۆ ناو كۆنگرەكانی ئێمە هەبێ.

## پەیوەندی بەعس و كۆمەڵە

***ئێستا پێمخۆشە لەم بەشە لە دیدارەكەمان بێینە سەر پەیوەندی كۆمەڵە لەسەرەتاكانی دروستبونیەوە تا ئەكات بە ئێستا لەگەڵ حزب و لایەن و دەوڵەتانی ناوچەكەیە. لەسەرەتاوە ئەپرسم پەیوەندی ئێوە لەگەڵ بەعس كەی چۆن دەستپێكرد، گوایە ئەو پەیوەندیەی ئێوە پەیوەندییەكی زۆر توند تۆڵ بوو لەگەڵ بەعس؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر توونـد بوون یـان لاواز بوونی ئـەو پەیوەندییە با جارێ بە پەلە قەزاوەت نەكرێ، دایبنێین بۆ دوای بیستنی قسەكانی من. بوونی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بە كورد و غەیرە كوردەوە لە خاكی عێراقدا پێشینەیەكی دوورودرێژی هەیە و هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ناكۆكی مێژوویی نێوان دوو دەوڵەتی دەسەڵاتدار لەم دوو وڵاتەدا.

ئەوەی كە هێزێكی كوردی ئێرانی دەتوانێ لە عێراقدا درێژە بە چالاكی خۆی دژی رژێمی ئێران بدات دیاردەیەكی ناسراو و قبولكراو بوو بۆ خەڵكی كوردستانی ئێران. بۆ وێنە ساڵەها پێشتر حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران ئەو پەیوەندییەی بەرقەرار كردبوو و بە مانایەك رێگاكەی هەموار كردبوو. ئێمە تا كاتێك كە بەشێك لە شارەكانی كوردستانمان بە دەستەوە بوو و دواجار لە بەشێكی زۆری كوردستان توانیبوومان شوێنی رزگاركراو بپارێزین پێویستیمان بەو پەیوەندییە نەبوو.

هەر بۆیە تاماوەیەك خۆمان لێبوارد و سەركردایەتی كۆمەڵە بریاریدا كە جارێ لە دامەزراندنی ئەو پەیوەندییەدا پەلەنەكات. بەڵام وردە وردە كە بزووتنەوەی پێشمەرگانە كەوتە ژێر زەخت و بەرەو ئەوە دەچووین كە ناوچە ئازادەكان لە دەستبدەین، هەستمان بەوە كرد كە پێویستیمان بە پشتی جەبهەیێك هەیە بۆ دەرمانكردنی بریندارەكانمان، بۆ حەوانـدنـەوەی پیر و بەساڵاچووەكانمان كە نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە بۆ شارەكانی ئێران، بۆ راگرتنی پەیوەنـدی لەگەڵ دەرەوەی وڵات و تەنانەت دواجار بۆ وەرگرتنی چەك و تەقەمەنیش.

لە كۆنفرانسێكدا كە شەش مانگ دوای كۆنگرەی دووهەمی كۆمەڵە لەناوایی (عیلم ئاباد) لە ناوچەی

بۆکان بەسترا بریاردرا کە ئەو پەیوەندییە دوای پرسکردن بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەهەندێک لە هێزە چەپەکانی ئێرانی، دابمەزرێ. ئوسوول و سەرەتاکانی ئێمە لە وەها پەیوەندییەکدا هەر لەو کۆنفرانسەدا دیاریکرا و دوواجار لە نامەیلکەیەکی ناوخۆییدا بە ناوی "مەشعەل" بۆ هەموو ئەندامان و پێشمەرگەکان بڵاوکرایەوە. هەم یەکێتی و هەم (ئیتحادی موبارزانی کۆمۆنیست) کە ئەو کات هاوپەیمانی ئێمە بوون، ئەو پەیوەندییەیان لاپەسەند بوو. ئەوەش بڵێم کە دەمێک بوو دەوڵەتی عیراق لە کەناڵی جۆراوجۆرەوە بۆ دامەزراندنی ئەو پەیوەندییە پەیامی بۆ دەناردین. لە یەکەم پەیوەندی رەسمیدا کاک "فاروق بابامیری"مان کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە بوو بۆ خۆشکردنی ڕێگای دیدار، وەفدێکی رەسمی نارده عیراق.

***بۆ کاک فاروقی بابەمیری؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** فەرقی نەدەکرد، کەسێک دەبوایە بناردرایا، تایبەتمەندییەک لەبەرچاو نەبوو.

با لێرەدا ئاماژە بە خاڵێک بکەم کە لە وەڵامەکەی پێشوودا لە بیرم چوو. هەر لەو ساڵەدا بوو، کۆبونەوەیەک لە لای یەکێتی نیشتمانی کرا کە حزبی دیموکرات، دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین و یەکێتی نیشتمانی و ئێمە تیایدا بەشداربووین وە لەو کۆبوونەوەیەدا باسی ئەو پەیوەندییە کرا، باسی ئەوە کرا کە ئایا ئێمە بۆمان هەیە لەگەڵ دەوڵەتی عیراق پەیوەندی بگرین و یارمەتی لێوەربگرین؟ هەروەها یەکێتی نیشتمانی بۆی هەیە پەیوەندی بگرێت لەگەڵ دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی یارمەتی لێوەربگرێت؟ لەو کۆبونەوەیەدا ئێمە بە تێرو تەسەلی قسەمان لەسەر سەرەتاکانی چاودێر بەسەر ئەو پەیوەندیانەدا کرد و ئەو مافەمان بۆ هەموو لایەنەکان بەرەسمی ناسی، بەو مەرجەی کە ئەو پەیوەندیانە لە دژی ئۆپۆزسیۆنی هیچ لایەک، لە دژی خەباتی خەڵکی هیچ لایەک بەگشتی بە کار نەیەت. وا بزانم تەنانەت لەو بابەتە بەڵگەنامەیەکیش ئیمزاکرا. ئەوە بوو بە سەرەتایەک وە ئێمە هیچ کات پەیوەندییەکانی خۆمان لەگەڵ دەوڵەتی عیراق لە یەکێتی نیشتمانی نەدەشاردەوە وە ئێمە کتومت گوزارشی کۆبونەوەکانمان، قسەو گفتوگۆکانمان وە ئەوەی کە لە بەینمانندا لەگەڵ دەوڵەتی عیراقدا هاتۆتە گۆرێ لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی لە کاتی چاوپێکەوتنەکانماندا باسدەکرد، ئەوان ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانی ئەو پەیوەندییانەی ئێمە و دەوڵەتی عیراق بوون. وە ئەوان دەزانن کەئەو پەیوەندییە هیچ کات لەدژی ئەوان لە دژی خەڵکی عیراق نەک هەر بەکار نەهات بەڵکو ئارادەیێکی بەرچاو یارمەتی دەریشیان بوو.

**بەعس تۆپبارانی مقەرەکانی کۆمەڵەی دەکرد**

***بەعثی لەسەر ئەو چەمکە کارتان نەکرد، دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، ئێمە هەرگیز ئەو چەمکە بەکار ناهێنین. دوژمنی دوژمنەکەم شەرت نییە دۆستی ئێمە بێ. بە تایبەت کە ڕژێمی بەعس هەرگیز هەر ناچێتە خانەی دۆستەوە. هەلومەرجێکی سیاسی دیاریکراو هاوسەنگییەکی هێزی دیاریکراو، پێویستییەک کە ئەم دوو لایەنە بە یەکتر بوویان، ئیمکانی بەرقەرار بوونی پەیوەندییەکی دیاریکراوی پێکهێنا بوو. ئێمە لەسەرەتاوە پرەنسیپی خۆمان هەبوو و پێموایە هەرگیز لێمان لانەدا. کەم نەبوون ئەو تێکۆشەرانەی کە لەسەر لایەنگری لە ڕێبازی ئێمە لە عێراق ئەشکەنجە دراون و ئێعدام کراون. مەقەرەکانی ئێمە لە کوردستانی عێراق چەندەها جار کەوتوونەتە بەر هێرشی ئەرتەشی عیراق و بە دەیان قوربانیمان داوە. ئەو پەیوەندییە هەرگیز پەیوەندییەکی ئاسان و بێ ژانە سەر نەبوو بۆمان.

**بەعس(٨٢) پێشمەرگەی کۆمەڵە شەهید دەکات و چەکی کیمیاوی دژی کۆمەڵە بەکاردەهێنێت**

***کارەساتی بۆتێ، پێموایە (٣٢)شەهیدتان داوە لەکارەساتی هەڵەبجەش نزیکەی (٧٢) شەهید واتە لە گوردانی شوان بەشێکی زۆر ئەو هاوڕێیانە گیانیان لەدەستدا، بەعس کیمیایی پیاکردن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، لە ڕووداوەکەی بۆتێدا ڕژێمی عیراق بە ئەنقەست و بە پێی پیلانی داڕێژراو مەقەڕەکانی ناوەندی ئێمەی لە بۆتێ بۆمبارانی کیمیایی کرد و هەروەکوو ئێوەش وتتان (٣٢)کەسمان شەهیدبوون و (١٥٠)کەسیشمان بریندار بوون. بەڵام لە ڕووداوەکەی گوردانی شوانیدا سەرجەم شاری هەڵەبجە و دەوروبەری کەوتنە بەر بۆمبارانی کیمیایی ڕژێمی عیراق و هاوڕێیانی ئێمەش کە لەو ناوچەیە بوون مەسموم بوون و دواجار لەو حاڵەتەشدا کەوتنە بەر پەلاماری هێزەکانی کۆماری ئیسلامی. (٦١)کەسیان هەر لەوێ گیانیان بەختکرد و (١١)کەسیشیان بە برینداری بەدیلگیران کە دواجار ڕژێمی ئێران ئێعدامیکردن. هەروەك وتم ئێمە (١٥٠) نەفەر بریندارمانبوو، دەوڵەتی عیراق چەند خەستەخانەیەکی دیاریکراوی ڕاسپاردبوو کە بریندارەکانی ئێمە تەداویبکەن. بەڵام زۆر درەنگ ئەو کارەیانکرد وە ئێمە توانیبوومان پێشتر بەشێوەی ژێربەژێر بە یارمەتی پزیشکەکانی سلێمانی و ڕانیە بەشێکی بریندارەکانمان تەداویبکەین و ئاتروپین و ئەو شتانەی کە پێویست بوو بۆ تەداوی ئەوانەی وا مەسموم بوون بەدەست بهێنین، جیا لەوانە بەعس زۆر لەخەڵکی کوردستانی عیراقی ئەشکەنجە دەدا بەهۆی دۆستایەتی ئێمە.

***ئەی بۆ ئێوە لە هیچ ڕاگەیاندنێکی خۆتاندا، تا پێش ڕوخاندنی بەعس، هەرگیز باسی ئەوەتان نەکرد، کە بەعس کیمیاوی لێداون و کەبەعس پێشمەرگەی کوشتوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم قەزیەیە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی ئەو کاتەی کە ئێمە تێیدا لە دۆڵی بۆتێ کیمیابارن کراین. ئەوکات ئێمە یاداشتێکی ئیعتڕازیماندا بە دەوڵەتی عیراق و داوای تەوزیحمان لێکردن. هاوکات وەفدێکیشمان نارد بۆ بەغدا بۆ لێکۆڵینەوە لە مەسئەلەکە.

**وەفدی کۆمەڵە و موخابەراتی عیراق کۆدەبنەوە**

***هەیئەتی عیراقییەکان کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەفدێکی باڵای دەزگای مۆخابراتی عیراقی بوون.

***هەیئەتەکەی ئێوە کێ بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەیئەتەکەی ئێمە هاوڕێی گیانبەختکردوو کاك سدیق کەمانگەر، حەسەن شەمسی،محەمەد شافعی و من بووین.

***بەڵێ، باسی چیتانکرد لەوێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەوێ ئێمە ئیعتڕازمان پێکردن، وە ئەوان مەعزەرەتیان هێناوە لێمان، وە وتیان سەهو بووە. وتیان ئەو سەهوە بۆیە ڕوویداوە کەمەقەڕاتی ئێوە زۆر تێکەڵاون بە مەقەڕاتی موخالیفینی ئێمە. ئەوەندە نزیکن کە جاری وایە تەقەکانمان لە لێدانی گەراو نیشانەکان تووشی هەڵەدەبن. بەڵام ئەوە دیارە پەیامی ئەوان بوو بۆ ئێمە کە بەم شێوەیە پێیاندەگوتین بۆچی ئەو ناوچەیە چۆڵناکەن و نایێنە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حکومەت. ئێمە داوامان لێکردن کە خۆیان لەڕاگەیاندنێکی ڕەسمیدا هەڵەبوونی ئەو ڕووداوە ڕابگەیەنن.

ئەوان وتیان ئەو کارە ناکەین، چونکە دوژمنمان ڕژێمی ئێران کەڵکی لێوەردەگرێ. بەرامبەر بەو داوایەی ئێمە ئەوان وتیان کەئامادەن نوێنەرانێك بنێرن بۆ مەقەڕەکانی ئێمە و بۆ ئەوەی لە زمانی خۆشیانەوە ئەو عوزرخواهییە لە نزیکەوە ڕابگەیەنن. کاتێك ئێمە لەسەر داواکەی خۆمان پێداگریمانکرد، ئەوان وتیان خۆتان

ئەو کارە بکەن و ئەو عوزرخواهییەی ئێمە لە زمانی خۆتانەوە رابگەیەنن، بەڵام باسێك لە کیمیایی بوونی بۆمبارانەکە مەکەن.

بەمجۆرە گفتوگۆکان ئامانجێکی ئەوتۆیان نەبوو و ئێمە زانیمان کەئەگەر بێت و لەراگەیاندنی رەسمیدا باس لە کیمیایی بوونی ئەو بۆمبارانە بکەین لەگەڵ کاردانەوەی توندتری ئەوان بەرەو روو دەبین و ئەوەمان پێ مەسڵەحەت نەبوو. ئێوە دەزانن کە ئەو رووداوە هاوکات بوو لەگەڵ شاڵاوەکانی ئەنفال و گرتنەوەی هەموو ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عیراق. ئێمە ئەوکات شەش ئۆردووگامان لەسەر سنوورەکان لە دیوی کوردستانی عیراق هەبوو. ئێمە نەماندەتوانی وەکوو هێزەکانی یەکێتی و پارتی پاشەکشە بکەین و بچینەوە کوردستانی ئێران. ئەو کاتە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە بۆ پاراستنی ئەمنیەتی ئەم خەڵکە زۆرە، بۆ پاراستنی ئیدامەکاری خۆشی لە کوردستانی عیراق لە کۆبونەوەیەکدا بریاریدا ئەو سازشە بکات. بەڵام هاوکات بە نوێنەرایەتی خۆمان لە دەرەوەی وڵاتمان راگەیاند کە بە شێوەی ناراستەوخۆ هەوڵبدەن بۆ ئەوەی میدیاکان و ناوەندەکانی جیهانی لە ناوەرۆکی راستەقینەی رووداوەکە ئاگادار بن و ئەو کارە کرا. ئێمە ژێر بە ژێر گەلێك کارمان کرد بۆ ئەوەی بەکار هێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە بە گشتی دێزە بە دەرخونە نەکرێ.

**★ لەو دانیشتنەی ئێوەو موخابەراتی عیراقی باسی چیتانکردو لەسەر چی رێکەوتن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کۆبوونەوەیە لە مانگی گوڵانی (١٩٨٨) لە بەغدا بەرێوە چوو. پێشتر یاداشتی نارەزایەتی ئێمە ناردرابوو و ئەوان بە شێوەی شەفاهی لە رێگەی نوێنەرەکەمانەوە داوای لێبوردنیان کردبوو. ئێمە بەوە قائیل نەبووین و بە پەلە وەفدێکمان نارد بۆ بەغدا. لەسەرەتاوە ئەوان دەستیان بە قسە کرد و وتیان: رووداوێکی تەئەسوفبار بووە، فەیلەقی پێنج راپۆرتی هەڵەی پێگەیشتووە. هێزی ئاسمانی ئێمە ناوچەیەکی بۆمبارانکردووە کە زۆر نزیکە لە مەقەرەکانی موعارزینی ئێمە، ئەم نزیکی و تێکەڵاوییە بۆتە هۆی ئەو رووداوە و ئێمە هیواداریـن دووپات نەبێتـەوە. (ئەوەی کە دەیڵێم زۆر نزیکە لە قسەکانیان بەڵام دەقی ئەو قسانە نییە). ئێمە لەوەڵامدا وتمان: کە ئەوە کافی نییە ئێوە لێرە لەو کوبوونەوەیەدا داوای لێبووردن بکەن، چونکە ئەو رووداوە لەناو خەڵکی کوردستانی ئێران لە ناو ریزەکانی خۆماندا ئەو تەسەورە پێکدێنێ کە گۆیان ئێمە و ئێوە لە حاڵەتی شەڕ لەگەڵ یەکتردا بین و ئەوە نیگەرانی پێکدێنێ. هەروەك وتم ئەوان ئامادە نەبوون بە رەسمی و لەراگەیاندندا ئەو کارەبکەن. وتیان ئێوە خۆتان بیکەن و باس لەو داوای لێبووردنەی ئێمەش بکەن، بەڵام ناوێك لە سیلاحی کیمیایی مەبەن. وتیان وەفد دەنێرین مەقەر بە مەقەری ئێوە کۆبوونەوە بکات و لەم بارەوە بۆ ریزەکانتان روونکردنەوە بکات. ئێمە ئەو کارەمان پێباش نەبوو، هەر چەند لای خۆیان رەدمان نەکردەوە، بەڵام دواجار بە عەمەلی رێگامان نەدا ئەم کارە سەر بگرێ.

**★یەکسەر پێتان وتن، کە ئێوە کیمیاویتان بەکارهێناوە ئەو کاتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ئەوان دانیان بەوەدا هێنا کە بۆمبارانەکە کیمیایی بووە. بەڵام دەزانین کە ئەو کاتە لە ئاستی جیهانیدا بێ دەنگییەك بەرانبەر بە بەکارهێنانی چەکی کیمایی لە لایەن دەوڵەتی عیراقەوە لە ئارادا بوو. دەوڵەتانی گەورە رێگایان نەدەدا مەعلوماتی ورد سەبارەت بەم مەسەلەیە بگاتە میدیاکان. ئەو کاتە شاهیدیانی هێزێکی سەربەخۆی وەکوو ئێمە لەسەر ئەم مەسەلەیە بۆ دەوڵەتی عیراق زۆر گران تەواو دەبوو. هەر بۆیە ئێمەش دەمانزانی لە هەلومەرجێکدا نین کە بتوانین راستەوخۆ ئەو کارە بکەین.

***دواجار بەچی کۆتاییهات، بەو یاداشتەی ئێوە کۆتاییهات و بەس؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە دوایی بەیانێکمان دەرکرد، لەو بەیانەدا مەسەلەکەمان تەوزیحداوە، وتمان دەوڵەتی عیراق داوای لێبوردنیکردووە.

**نەمانتوانی بڵێین بەعس چەکی کیمیاوی لەهەڵەبجە داوە**

***ئەی سەبارەت بەکارەساتەکەی هەڵەبجەو گوردانی شوان بۆ بەیاننامەیەکتان دەرنەکرد، کە ئەوە بەعس ئەو کارەی کردووە، یان دواتر بەعس چی ووت بۆ ئەو مەسەلەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر رووداوەکەی هەڵەبجە بەیاننامەدەرکرد و محکوممان کرد، بەڵام ئەو کاتیش باسێك لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەکرا. ئەو کاتەش بە توندی لەژێر زەخت دابوین، کە لەم بابەتەوە تەبلیغاتێك نەکەین. پێشتر بە توندی لەسەر وتوێژێك کە من لەگەڵ رۆژنامەی سویدی " داگز نەهێتر" کردبووم، ئیعتزازی هەرەشە ئامێزمان لەلایەن دەوڵەتی عیراق لێکرابوو . ئەو چاوپێکەوتنە کێشەی زۆری لەگەڵ بەعس بۆ دروستکردین‌و پێویستی کرد وەفدی ئێمە بچێتە بەغداو بەعس زۆر لێمان توڕەبوو هەڵبەت چ پێشتر و چ ئەو کات ئێمە لە گەلێك کاناڵەوە هەوڵماندەدا بە شێوەی نهێنی مەعلومات لەسەر ئەو روداوانە لە دەرەوەی وڵات بڵاوبێتەوە. بۆ نموونە رێکخراوی " مدیکۆ ئەنترناسیونال "ی ئاڵمانی بە سەرپەرەشتی هەڵسوراوی ناسراوی بواری چالاکی بەشەردۆستانە "هانس برنشاید" لە هەموو ئاڵمان کەمپەینێکی لەسەر بەکار هێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتی عیراقەوە بەرێوەبرد کە ئێمە لە نزیکەوە لەگەڵی لە پەیوەندیدابوین و کار ئاسانیمان بۆ دەکرد.

***لەهەردوو ئەو زیانانەی ئێوە لە دۆڵی بۆتێ و لەکارەساتی هەورامان یا لەهەڵەبجە لێتان کەوت بەعس چۆن قەرەبووی کردنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەعس هیچ قەرەبوویەکی بە هیچ شێوەیەك لەشێوەکان بۆنەکردینەوە. تەنانەت ئەوەی کە قەوڵیاندا بریندارەکانمان تەداوی بکەن بە تەواوی بەرێوەیان نەبرد. ئێمە (١٥٠) بریندارمان نارده ناو ئوتێلەکەی سەرچنار کە ئوتێلێکی رووخاوبوو وێران بوو لەوێ جێمانکردنەوە. بەعسیەکان تەنانەت ئیمکاناتیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو ئوتێلە پێنەدابن.

**بەعس چەك و پارە دەداتە کۆمەڵە**

***پێتانوانەبوو بەعس بە ئەنقەست ئەوەی کردبێ لەبەر ئەوەی ئێوەشی وەکو کورد حساب کردوە، یا وەکو ئەوەی کە ئێوە لانیکەم یارمەتی خەڵکی ئەو ناوچەیە و هێزی پێشمەرگەتان داوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەموو نیشانەکان وادەڵێن کە بۆمبارانی بۆتێ و تۆپبارانەکانی پێشوتریش لە مالومە کە ئەویش چەندین شەهیدی لێکەوتەوە بەئەنقەست بووە. ئەوە باجی ئەو پەیوەندیە بوو کە لەگەڵ خەڵکی کوردستانی عیراق، لەگەڵ تێکۆشەرانی لەشارەکان، لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەمانداوە. دەرگای ئوردوگاکانی ئێمە هەرگیز بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتی دانەخرابوو.

***ساڵانە یان مانگانە چۆنچۆنی یارمەتی پارەو مادەو چەك‌و ئەسلیحەی دەدان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەعس هەم بەپارە یارمەتی ئەدابن هەم بەچەك و تەقەمەنی، یارمەتی چەك و

تەقەمەنیەکەی زۆر کەم بوو. یارمەتی پارەش گەلێك لەپێداویستیەکانمان کەمتر بوو.

***ئەتاندا بە یەکێتی و حزبە کوردستانیەکان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لەگەڵ یەکێتی پەیوەندیمان باش بوو و هیچ لایەکمان لە یارمەتیدانی ئەوی ترمان لە هەموو روویەکەوە، دریغی مان نەبوو.

***پارەی چەند ئەدانێ بەعس مانگانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** میزانی ئەو یارمەتیە لە بەڵگەنامەکانی ئیمە دا تۆمارکراوە، کولیاتەکەی ئەوەیە کە باسمکرد.ووردەکاریەکانی ئەگەر پێویست بێ، لە کاتی خۆیدا بە رەسمی لە لایەن ناوەندی کۆمەڵەوە دەبێ بلاو بکرێتەوە.

***چی ئەدانێ لەبواری چەك و تەقەمەنی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان بەس چەکی سووك وەکو کلاشینکۆف و تیربار و ئارپیجیان پێئەدایِن. خۆیان لەدانی چەکی قورس دەپاراست. تەنها لە دوو ساڵی ئاخری پێش راپەرین، برێك گوللەی هاوەنی (٨٠)میلی میتریان پێداین کە چەکەکەی خۆمان هەمانبوو.

**بەعس یارمەتی گەورەی موجاهیدین دەدات**

***ئەو میگزەمینی و پاس و شتانە هی بەعس بوو ئەیدانێ، خەڵك هەمیشە وایدەگوت، ئەوە میگزەمینی بەعسە بەدەست کۆمەڵەو دیموکرات و موجاهیدنی خەڵکەوەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەشێك لە سەیارەکانمان ئەوان پێیاندابووین و بەشێکیان خۆمان لە کوێت کریبومانن. لە دانی یارمەتی بە ئێمەدا زۆر سەرقورس بوون، ئەوەی کە بە ئێمەیان دەدا بە هیچ شێوەیەك بەرناوەرد ناکرێ لەگەڵ ئەوەی کە بە لایەنەکانی دیکە و لەوانە بە مۆجاهێدینی دەدا.

***تۆ سەدامت بینیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەخێر

***هەوڵت ئەدا بۆ ئەوەی ببینی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئیمە هەوڵمان ئەدا کە ئاستی پەیوەندیەکە لە باری دیپلۆماسیەوە بەرینە سەرێ، بۆ نمونە ئێمە دەمان ویست پەیوەندییەکەمان لەجیاتی ئەوەی کە لەگەڵ دەزگای موخابەرات بێ لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە بێ، ئەو داوایەمان هێنا گۆرێ.

**قاسملۆ سەدام حسێن دەبینێت**

***بۆ نەچووە سەر؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەچووە سەر، بەڵام بۆ ئەوەی کە بچێتە سەر داوامانکرد سەدام ببینین و لەرێگەی ئەوەوە داوابکەین پەیوەندیەکەمان لەگەڵ وەزارەتی دەرەوە بێت.

***ئەی جوابەکەی چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان جوابی رەتیانداوە، وە تەقریبەن بۆ هەموو ئۆپۆزسیۆنیش هەروابوو وە دەزگایەکی تایبەتیان دانابوو کەلەژێر چاوەدێری مودیری موخابەرات دابوو . ، موجاهیدینی خەڵکیش هەر

لەگەڵ ئەو دەزگایە تەرەف بوو، تەنها مەسعود رەجوی جاروبارو دکتۆر قاسملۆ ئیمکانی ئەوەیان هەبوو سەدام ببینن.

***تۆ پێتخۆش بوو سەدام ببینی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەکو پێخۆش بوون قەد پێمخۆش نەبووە، بەڵام ئەگەر بۆمانکرابا ئاستی پەیوەندیەکە بەرینە سەر بۆ دیپلۆماسیەتی کۆمەڵە بەکەڵك تر دەبوو .

***ئێستا ئەبینی بەعس چی لێهاتووە، ئەوە چ خوێندنەوەیەکت بۆی هەیە تۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە رێبەرانیان لە ناو قەفەس دا دەبینم (٢٠٠٦) هەست بە خۆشحاڵیدەکەم. ئەو رژێمە زۆری بە بەرەوە نەمابوو، حەزم دەکرد بە هێزی جەماوەر لەدەسەڵات هاتبانەخوار و جەماوەر ئیمکانی ئەوەی بوایە لە هەموو وردەکاریەکانی دەورانی دەسەڵاتیان ئاگاداربێت و نەتوانن هیچ رازێك لەگەڵ خۆیان بەرنەگۆرەوە.

**سەدام دیکتاتۆرو خوێنرێژ بوو**

***سەدام حسێن دیکتاتۆر بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیکتاتورێکی خوێنرێژ و بێ بەزەیی بوو، بەڵام لە هەمانکاتدا لە پێناوی پاراستنی دەسەڵاتی خۆیدا ئامادە بوو تەنازولێك بکات. ئەو ناسیۆنالیستی عەرەبیش نەبوو، ئەو هەموو سەرشۆڕییەی کە لە ساڵانی دوای شەڕی کوەیتەوە سەدام قبوڵیکرد، چاوەڕوان ناکرێت، هیچ سەرکردەیەکی دەمارگرژ قەبوڵی بکات.

***ئێوە مەعلوماتی موخابەراتیتان ئەدا بەعیراق؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە ئەو کارەمان نەکردووە، تەنیا بۆ هاتوچۆکردنی هێزەکانمان لەسەر سنوور، بۆ ئەوەی نەکەونە بەر تەقەی هێزەکانی عیراقی لەناستی مەحەللیدا بەعزێك هاوئاهەنگی عەمەلیمان دەکرد.

***نوێنەرایەتیتان لە بەغداد هەبوو، کێ نوێنەرایەتی ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە زۆرتری ساڵەکاندا کاك حەسەن شەمسی نوینەری کۆمەڵە بووە لە عیراق. کاك عبدوڵڵا بابان، کاك فاروق بابا میری کاك محەممەد ئەبەوی، کاك رەحیم عەزیز پور، کاك موزەفەر پاکسرشت و کاك غوڵام محەممەدی و کاك رەشید رەزاقیش هەر کامەیان بۆ دەورەیەك ئەم نوێنەرایەتییان کردووە.

**بەعس داوای کاری تیرۆریستیی لەکۆمەڵە دەکات**

***بەدرێژایی ئەوەندەی پەیوەندی کۆمەڵە بە بەعسەوە ، بەعس داوای شتێکی زۆری لە ئێوەکرد، ئێوە نەچوونە ژێرباری، بۆ نموونە لەبەرامبەر کوردی کوردستانی عیراق، لەبەرامبەر ئێران چی، چ تەڵەبێکی هەبوو زۆر قورس وگەورە بێ و ئێوە نەچووبنە ژێرباری یا کردبێتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سەیر ئەوەیە کە هیچ وەخت بەعس داوای لە ئێمە نەکرد، کە لە جەبهەکانی شەڕدا کارێکی گرنگ بکەین، بەڵام یەك داوای کرد لە ئێمە کە بەتوندی رەدمانکردەوە، ئەویش ئەوە بوو کە وتیان، ئێمە ئیمکانیاتتان لە ئیختیار دەنێین کە بەعزە تەقینەوەیەك لە شارەکانی ئێران بکەن،وئیمە بەتوندی رەدمانکردەوە، داخوازییەکەیان هێنایە خوارتر و ووتیان پرۆژە ئابوورییەکانی رژێم لە کوردستانی ئێران لێبدەن، ئەوەشمان رەدکردەوە و هیچ کات حازر نەبووین هیچ پلانێکی نیزامی لەوان قبوڵبکەین .

*** هیچ هەوڵی مفاوەزاتێکیان بۆ نەدابوون لەگەڵ ئێران بە درێژایی ئەو ماوەیەی بەعس؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نە، ئەخێر هیچ هەوڵێکیان لەو بابەتەوە نەداوە.

***ئەی هەوڵێنەداوە رێکەون لەبەرامبەر تەسلیمکردنی لایەنێکی کوردستانی عیراق بە عیراق و لەبەرامبەر تەسلیمکردنی ئێوە بە ئێران شتێکی ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر هەڵوێست بەرانبەر بە ئۆپۆزسیۆنی یەکتر ئەم دوو دەوڵەتە تا کاتێک کە رژێمی بەعس لەسەر کاربوو هیچ جەشنە رێککەوتنێکی بە ئاشکرایان نەبووە. ئەوان ناکۆکییەکانیان تووندتر لەوە بوو کە بگەنە ئاستی وەها رێککەوتنێك. بەڵام لە هەر حاڵدا ئێمە هەوڵماندواە خۆمان وەها رێکبخەین کە نەتوانن بە هاسانی وەها سات و سەودایەکمان لەسەر بکەن، سەبارەت بەپەیوەندی ئێمەو یەکێتی، پێمان وتبوون ئەو پەیوەندیە بۆ دژایەتی ئێوە بەکارناهێنن.

**کۆمەڵە شەڕی (عیراق-ئێران) دەخاتە ملی ئێران**

***سەرنجت رائەکێشمەو بیرت دەهێنمەوە بە تەئریخی (٢٩) پوشپەری (١٣٦٧) بەرامبەر بە ئوتی (١٩٨٨) واتا تەنها دوو رۆژ پاش وەستاندنی شەڕی عیراق - ئێران لە(٢٧) پوشپەری (١٣٦٧) بە پێی بڕیاری (٥٩٨) نەتەوە یەکگرتوەکان، کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەیاننامەیەکی دەرکردووەو خەڵکی جەواشە کردووە، دەڵێ "پاش هەشت ساڵ شەڕ، ئێران تەسلیمی شەڕ بوو و شکستی خوارد، دەڵێ " کۆماری ئیسلامی دەبێ شەڕو تاوانی هەموو جینایەتەکانی خۆی بۆ کرێکاران و زەحمەتکێشان ببژێرێت"، پێموایە کە ئێوە خەڵکتان جەواشە کردووە، بەپێی ئەم بەیاننامەیە بەم دەلیلانە- ئایا رەوایە شەڕێك عیراق دروستیکردو رایگرت و شکستی خواردوو زیانەکانیشیان پێ ژمارد بەپێی بڕیارێکی (UN)کەچی ئێوە وادیعایەتانکرد کە عیراق وەستاندویەتی لە کاتێکدا ئێران سەرکەوتووبوو لە شەڕەکەدا.**

دوو: ئەوە دیفاع نەبوو لە رژێمی بەعس و سەدام حسێن کە ئەمریکا و غەرب پشتیوانیاندەکرد.

سێیەم: دژی خەڵکی ئێران نەبوو کە شەڕێکی هەشت ساڵەی بەسەردا سەپێنرابوو لەلایەن بەعسەوە، ئایا ئەوە بەمەسڵەحی حزبی کۆمۆنیست بوو، نابێ حزب واقیعی بێ بەتایبەتی لەو وەزعانەداو بۆ ئێوەش؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو بەیاننامە دێنم و سەیری دەکەین، بەبڕوای من ئەو خوێندنەوەی ئێوە بۆ ئەو بەیانییەی کە باستانکرد لە جێگای خۆی نییە. لام وایە باشترین رێگە ئەوەیە دەقی ئەو بەڵگەنامەیە کە لە چاپەمەنییەکانی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هاتووە بێنین بۆ ئەوەی بەری هەر جەشنە سوئی تەفاهۆمێك بگیرێ و قەزاوەتی دروست لەو بارەیەوە بکرێت، سەرەڕای ئەو بەڵگەیە کە خۆی مەبنایەکی باشە بۆ هەر جەشنە قەزاوەتێك ، دەمەوێ بۆ روونکردنەوەی زۆرتر ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ لەم پەیوەندییەدا بکەم: یەکەم، راستە کە ئەو شەڕە لەسەرەتاوە رژێمی بەعسی عیراق هەڵیگیرساند، بەڵام زۆر زوو ئەو راستییەی لێ حاڵی بوو کە ئەم پارووەی بۆ قووت نادرێ و رایگەیاند کە ئامادەیە موساڵحە بکات. بە تایبەت دوای پاشەکشەی ئەرتەشی عیراق لە شاری خۆرەمشەهر هەلی لەبار بۆ تەواو کردنی شەڕ خوڵقا.

لەو کاتەوە ئیتر ئەوە کۆماری ئیسلامی بوو کە قازانجی خۆی لەبەردەوامی شەڕەکەدا دەدیت و دروشمی ئازادکردنی قودس لەرێگەی کەربەلاوەی بەرز کردبووە. خومەینی شەڕێکی پان ئیسلامیستی راگەیاندبوو کە گەلێك لەبەرەکانی شەڕی عیراق واوەتر دەچوو. خاڵی دووەم ئەوەیە کە ئێمە خۆمان لە بەرەیەکی

دیاریکراودا خەباتماندەکرد ئەویش بەرەی خەبات لە دژی کۆماری ئیسلامی بوو.

شەڕی ئێران و عیراق لە هەر دووك لایەنەوە شەڕێکی کۆنەپەرستانە بوو هەروەکوو چۆن لە هەموو تەبلیغاتی ئەو کاتی ئیمە دا بە سەراحەتەوە باسیکراوە. دروشمی ئێمە کۆتایی هاتنی دەس بە جێی شەڕ بوو. بەڵام کاری ئێمە هەوڵدان بۆ رووخاندنی رژێمی ئێران بوو. ئێمە لەدوو بەرەدا لەگەڵ هەردووك لا وەکو یەك دەرگیر نەبووین، کە وایە ئاساییە ئەگەر زەختی تەبلیغاتی ئێمە لەسەر رژێمی ئێران بووبێت. رژێمی ئێران ئەم شەڕەی وەکو بەرەکەتێك چاولێکرد و لە ژێر سێبەری ئەو بەرەکەتەدا شۆرشی ئازادیخوازانەی خەڵکی ئێرانی نوقمی خوێن کرد و دیکتاتۆرییەتێکی بێبەزەییانەی مەزهەبی بە سەر خەڵکی ئەم وڵاتەدا سەپاند. ئەگەر تاوانی دەستپێکردنی شەڕەکە لەسەر دەوڵەتی عیراقە، تاوانی حەوت ساڵ درێژەدانیشی لەسەر رژێمی ئێرانە.

**بەعس دەبوو هەر بڕوخێ**

***رووخانی بەعس چۆن ئەبینی ئەو فاکتەرانە چیبوون لە پشت روخانی بەعسەوە بوون، بەعس کۆتایی هات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رژێمی عیراق بەتایبەتی دوای پاشەکشەی لە کوەیت و دوای گەمارۆی ئابووری و دوای دیاریکردنی زۆنی (٣٦)دەرەجە، گەلێك سووك و لاواز ببوو. وردە وردە خەریك بوو مەجالی ئەوە دەرەخسا کە ئەو رژێمە بە شێوەیەکی تەبیعیتر و لە ئاکامی خەباتی جەماوەری خەڵکی ئەو وڵاتە بروخێت. بەڵام زەختی ئەمریکا و بۆمبارانی نێو بە نێوی شارەکانی عیراق و گەمارۆی ئابووری هەمووی ئەوانە بە کردەوە یارمەتی دەربوون بۆ دەوامی ئەو رژێمە. ئەمریکا رێگای نەدا کە رژێمی عیراق بەشێوەیەکی تەبیعی و لە ئاکامی وەبەر هاتن و گەشە کردن و بووژاندنەوەیەکی سیاسی لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا، برووخێت. لەم دوایانەدا بەڕاستی ئاسەواری گەندەڵبوون و دارزین و دارمان بە سەرتاپای ئەو رژێمەوە دیار بوو. دیارە دەوڵەتی ئەمریکا بەو قەناعەتە گەیشتبوو کە بەرژەوەندییەکەی لەوەدایە ئەو رژێمە بە گورزێکی سەربازی برووخێنێت. هەڵبەت ئاکامەکەشی بۆ جەماوەری خەڵکی ئەو وڵاتە ئەوەیە کە دەیبینی.

***سەرنجت بۆ یەك پرسیاری گرنگ رادەکێشم، تکایە سەرنجم بدە، پاش رووخانی بەعس، رژێمێکی تازە لە عیراق دێتە سەر کار، کە ئەو رژێمە زۆر کەس بە رژێمێکی تا رادەیەك دیموکراسی و مۆدێرن ناوی ئەبەن، ئەمەوێت بزانم بە قەناعەتی تۆ وەکو سیاسەتمەدارێك، دواین چارەنووسی ئەم حکومەتە تازەی عیراق بۆ کوێ ئەچێ، لە نێوان ئەو هەموو ململانێی تایفی و رەگەزی و دینییەدا، پێتوایە کورد چارەنوسی چی ئەبێ، پێتوایە عیراق لە ژێر سەیتەرەی ئەمەریکا لەژێر ئەم نەخشانەی ئەمەریکا دەیکێشێت بۆ چەند دەوڵەتێکی تایبەت بە کورد و شیعە و سوننە وە ئاکامەکانی ئەو وەزعەی کە ئێستا لە عیراق هەیە سەرئەنجام عیراق بەچی ئەگات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشبینیکردنی وردی داهاتووی عیراق بەو هەموو ئاڵۆزییەی کە تێیکەوتووە کارێکی ئاسان نییە، تەنیا دەتوانین تەئکید لەسەر ئەو حاڵەتانە بکەین کە کەم و زۆر سەرەتاکانیشیان دەرکەوتوون و بەو پێیە بتوانین بڵێین کە عیراق بەرەو کوێ دەچێ.

یەکەم: پێگەی جەماوەری حزبە شیعەکان لە جنووبی عیراق بەرەو لاوازتر بوون دەچێ. دەسەڵاتی ئەو چەند ساڵەی ئەوان لەجنووبی عیراق ئەکسەرییەتی خەڵکی بێزارکردووە، یاساکانی شەریعەتی شیعە، شێوەی

حکومەتکردنی ملیشیایی لە پاڵ نەبوونی هیچ جەشنە ئاسایشێك، لە پاڵ لەخوارەوە بوونی ئاستی خزمەتگوزاری گشتی، ئەوانە هەموویان دەستیانداوەتە دەستییەك و خەڵكیان لێ نارازیكردووون. ئەگەر هێشتا هەر بەشێك لە خەڵك پشتیان پێدەبەستن و پشتیوانیان لێدەكەن، تەنیا بە هۆی ئەو ناكۆكی و تەعەسوباتەیە كە بەرانبەر بە سوننەكان دنەدراوەو لایان وایە كە ئەگەر ئەو حزبانە نەبن سوننەكان توویان دەبڕنەوە.

حکومەت كردن لەسەر بنەمای ئەو ئەفرەتە ناتوانێ بەری زۆر درێژ بێ. جنووبی عیراق و بگرە سەرتاسەری عیراق بە پێی پێشینە و رابوردووی لەگەڵ حکومەتێكی مەزهەبی زۆر هۆگر نییە. سوننەتی ژیانی سكۆلار تێیدا بەهێزە و سەرئەنجام ئەم زۆرینەیەی كە ئێستا بێ دەنگە بەشێوەیەك لە شێوەكان ئیرادەی خۆی دەردەبڕێ.

دووهەم: ئەلقاعیدە و توندڕەوە ئیسلامییەكان لە مەركەز هیچ پرۆژەیەكیان بۆ رێكخستینی ژیان پێ نییە. لە هەر شوێنێك بۆ ماوەیەكی كورتیش دەسەڵاتیان بووبێ، خەڵكیان بێزاركردووە. خۆ تەقاندنەوە و ئەو شێوە كارەی كە گرتوویانەتە بەر نەك هەر لە عیراق بەڵكو لە هەموو شوێنەكانی دیكە سەرچاوەكەی لە بێ هیوایی و بێ ئاسۆیی ئەوان دایە. ئەوانە هەرگیز ناتوانن بەم شێوازە لە ئیشكردن پێگەی جەماوەری پەیدا بكەن، تەنیا وەكو گرووپی فشار بۆ سەر ئەم دەسەڵات و ئەو دەسەڵات دەمێننەوە.

بەم حاڵەشەوە مەودای مانەوە و دەوامیان لە عیراق گرێدراوە بە حزووری سەربازی ئەمریكایی لەسەر شەقام و كۆڵانەكان و هەڵسوكەوتی ئەرتەشی ئەمریكا لەگەڵ خەڵك.

سێهەم: گرووپە سوننەكانی دیكە و ناسیۆنالیستەكانی عەرەب، بە كەمبوونەوەی حزووری ئەمریكا لە عیراق دەوریان دەگۆڕێ و لە نەیاری ئەمریكاوە دەبن بە هاوكار و هاوپەیمانی و هەوڵدەدەن لە پێكهاتەی دەسەڵاتی داهاتووی عیراقدا، دەوری سەرەكی ببینن، بۆ ئەو مەبەستە هەوڵدەدەن تەنانەت خۆیان لە ناسیۆنالیستەكانی عەرەبی بە مەزهەب شیعە نزیك بكەنەوە.

چوارەم: لە هەرێمی كوردستان نە هیچ هێزێك هەیە كە بۆ جیاكردنەوەی ئەو ناوچەیە لە عیراق هەوڵبدات و نە ئەمریكا كە دەسەڵاتداری سەرەكی ئەمڕۆی عیراقە، سیاسەتی ئەوەیە. وڵاتانی عەرەبی، توركیا و ئێرانیش بە توندی لە دژی وەها رەوتێكن و ئەگەرچی خەڵكی كوردستان ئارەزووی وەها رۆژێك دەخوازێ، بەڵام حزبە سیاسییەكانی توانای بەسیج و رێكخستنی خەڵكیان بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە نەماوە. هاوسەنگی هێز ئەوەندە نییە كە بتوانن ئیرادەی خۆیان لەسەر مەسەلەی كەركووك و شوێنەكانی دیكەی دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم بە سەر دەوڵەتی مەركەزیدا بسەپێنن.

پێبەپێی ئەوەی كە پێگەی جەماوەرییان لاواز دەبێ و دەسەڵات لەناوخۆی كوردستانیش بە لای یەكێك لە حزبە سەرەكییەكاندا دەشكێتەوە، زیاتر تەسلیمی داخوازییەكانی دەوڵەتی مەركەزی دەبن و مەودای دەسەڵاتیان لەچوارچێوەی سیستمی فیدرالیدا بەرتەسكتر دەبێتەوە. بەو مانایە، لە هەر دووك بەشەكەی كوردستان، چە ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی فیدرالیدا دەبێ، چ ئەو بەشەی دیكەی كە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی مەركەزیدا دەبێ، چارەسەری كێشەی نەتەوایەتی بە هەڵپەسێردراوی دەمێنێتەوە و ئەوەش خۆی رێگا خۆشكەر دەبێ بۆ سەرهەڵدانی گرووپ و رەوتی دیكە لە داهاتوودا.

پێنجەم: حوزووری ئەرتەشی ئەمریکا لە عیراق ناتوانێ درێژماوە بێ، بەڵام عیراق بۆ درێژماوە لەچوارچێوەی هاوپەیمانانی عەرەبی-ئەمریکا لە ناوچەکەدا دەمێنێتەوە. هێزەکانی ئەمریکا وردە وردە خۆیان لە تێکهەڵچوونەکان و لە حوزووری هەموو کات و ساتێك لەسەر شەقامەکان دەکێشنەوە. ژمارەیان لە عیراق گەلێك کەمدەکەنەوە و لە ناو پایگا و پادگانەکانیاندا، چاودێری وەزعەکە دەکەن و هەر کات هەستیانکرد کە پێویستە دەورێکی دیاریکراو بنوێنن دەستیان ناواڵە بێت. ئەرتەشی عیراق سەرلەنوێ رێکدەخەنەوە و کارەکانی پێدەسپێرن. ئابووری عیراق و بە تایبەت نەوت بە بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە گرێدەدەن و ئاڵقەی مەحکەمی ئابووری بۆ راگرتنی عیراق لەچوارچێوەی هاوپەیمانەتی خۆیان دروستدەکەن.

شەشەم: مەیدانی مانۆڕی کۆماری ئیسلامی و تورکیە و دەوڵەتانی عەرەبی لە عیراق بەرتەسکتر دەبێتەوە و دوای ماوەیەك کێشەکێش سەرئەنجام بە تەعادول و رێککەوتنێکی رەسمی یان عەمەلی لەگەڵ ئەمریکا دەگەن و کێشەکانیان لە خانەی عیراقەوە دەگوازرێتەوە بۆ کێشە لەسەر دابەشکردنی کار و بەرژەوەندی لە ئاستی هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

حەوتەم: بەتێکهەڵکێش کردنی هەموو ئەو فاکتۆرانە دوو حاڵەت بۆ داهاتووی عیراق پێشبینیدەکرێ، یەکیان دەورێکە کە ئەرتەشی عیراق دەتوانێ لە داهاتووی ئەو وڵاتەدا ببینێ. لە وڵاتێکی وەکوو عیراقدا، ئەرتەشێکی بەهێز و مونسەجیم، ناکرێ لە دەسەڵات دوور بخرێتەوە. بە شێوەی کۆدەتای خوێناوی بووە یان بە خشکەیی دەسەڵات دەگرێتە دەست. خەڵکیش کە لەو هەموو کوشت و کوشتارە وەگیان هاتوون و ئاسایشیان دەوێ، رێبەرایەتییێکی کەم و زۆر خۆش نێوی نیزامی بە لایانەوە لەو وەزعەی ئێستا پەسەند تر دەبێ و هیچ نەبێ بۆ ماوەیەك پێشوازی لێدەکەن.

حاڵەتی دووهەم، بوونی عیراقە بە دەوڵەتێکی یەکگرتووی وەکوو میسر، سودان و وڵاتانی دیکەی هاوچەشنی ئەوان بە پێکهاتەیەکی سیاسی و پارلمانی ناسراو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەگەر سەرنجتاندابێ، دەمێکە دروشمی رەسمی ئەمریکاش لە عیراق لەدیموکراسییەوە گواستراوەتەوە بۆ "ئاسایش". ئامانجی رەسمی ئەمریکا بەرقەرار کردنی ئەمنییەتە نەك دیموکراسی، ئەوە جەوهەری راپۆرتەکەی "بیکەر_ هامیلتۆن"یشە.

هەشتەم، کە کوشت و کوشتار کەم و زۆر کۆتایی پێهات، کە ناتوانێ هەتا سەر هەروا بێ و هەر کۆتایی پێدێت، کە وڵات سەقامگیرییەکی نیسبی بە خۆیەوە بینی، مەجال بۆ خەباتی ئێعتڕازی و مەدەنی دەکرێتەوە. دەوڵەتی سەقامگیر کە میراتگری ئەو هەموو وێرانی و دواکەوتوویە ئابوریەیە، لەچوارچێوەی ئەو سیستەمەدا هیچ موعجزەیەکی ئابووری پێناکرێ. خەباتی سیاسی و مەدەنی لەو وڵاتە بە خێرایی پەرە دەستێنێ و دەوڵەت لەگەڵ کێشەوگیروگرفتی تازە بەرەو روو دەکات. عیراق ناتوانێ بە وڵاتێکی کەش و ماتی وەکوو سوریە تەبدیل بێت. لە کوردستانیش خەباتی سیاسی و نارەزایەتی دەربڕین لە شێوەی نوێ سەر هەڵدەدات و دەوڵەتی مەرکەزی جارێکی دیکە و بە شێوازێکی دیکە دەکەوێتە ژێر گیرو گاز. فورسەت بۆ گەڵاڵەبوونی بەدیلێکی دیکە بۆ داهاتووی عیراق دەخولقێ.

**لەگەڵ دیموکراسیدام**

***پێتوایە بە هیچ شێوەیەك ئەگەری دروستبوونی دەوڵەتی کوردی هەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ناکرێ بڵێین بە هیچ شێوەیەك ئەو ئەگەرە نییە، بەڵام هەروەك ئاماژەم پێکرد ئەو

ئەگەرە لە هەلومەرج ئێستادا گەلێك لاوازە. چوونكە ئەحزبە سیاسییەكانی ئەوەیان دەوێ، نە جەماوەری خەڵك كە بێگومان وەهاناواتێكی هەیە بۆ ئەو مەبەستە ساز دراوە، ئەدەوڵەتی ئەمریكا كە لە بنەرەتدا هەلومەرجی ئێستای لەو وڵاتەدا خوڵقاندووە وەها سیاسەتێكی هەیە.

***پێتخۆشە دەوڵەتی كوردی دروست بێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەرانبەر بەو بەدیلانەی كە ئێستا لە عیراقدا چاوەروان دەكرێ پێكهاتنی دەوڵەتێكی سەربەخۆ لە كوردستان ئەگەر هەرەشەی شەڕ و داپۆلیسینی لەسەر نەبێ، بە نیسبەت بەرژەوەندییەكانی خەڵكی كورد، دەتوانێ كەم زیانتر لە هەمووان بێ. بەڵام هەروەكوو وتم زەمینەی سیاسی لەبار بۆی نییە.

*** بەس لە بەرامبەر بەدیل دانانی یاوەكو كارێكی واقیعی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڕای من ئەگەر بە فەرز لە عیراق دەوڵەتێك لەسەر كاربووایە كە دیموكراسی و مافە سەرەتاییەكانی خەڵكی بە رەسمی ناسیبا و و دوور با لە گەندەڵی و رێگای گەشەكردنی ئابووری ئەو وڵاتەی گرتبایە بەر، هەوڵیدابا بۆ بە یەكەوە ژیانی هاووڵاتیانی عیراق بە بێ هەڵاواردن و ستەم، بە كورتی دەوڵەتێكی بۆ وێنە هاوشێوەی كانادا كە دەوڵەتێكی سەرمایەدارییشە، كە ئەوە لە حاڵی حازردا فەرزێكی محاڵە، ئەوكات من مانەوەی كوردستانم لەچوارچێوەی عیراقدا پێباشتر دەبوو لە جیا بوونەوە و پێكهێنانی دەوڵەتێك كە بەشێوەی ئێستا ئیدارە بكرێ و لەژێر زەختی بەردەوامی توركیە و ئێران و دەوڵەتانی عەرەبیدابێ. كە وایە مەسەلەی جیابوونەوە و جیا نەبوونەوە، مەسەلەیەكی كۆنكرێتە كە بە بێ لەبەرچاو گرتنی هەلومەرجی دیاریكراو، ناكرێ بریاری ئەزەری لەسەر بدرێ.

*** لەنێوان مۆدێرنترین و نوێترین دەوڵەت و دیموكراسیترین دەوڵەتی عیراق لەلایەك و دروستبونی دەوڵەتێكی كوردی، تۆ لایەنگری كامیان دەكەیت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پەیوەندی بەوە هەیە كە لە وەها هەلومەرجێكی فەرزیدا ئەگەری هاتنە سەر كاری چ جۆرە دەوڵەتێك و بە چ ناوەرۆكێكەوە، لەئارادا دەبێ؟ ئەگەر هەر دووكیان وەكو یەك وابن، بەو مەرجەی كە كوردستانی ئازادكراو هەرەشەی شەڕ و داپلۆسین و گەمارۆی ئابووری لەسەر نەبێ، پێكهاتنی حكومەتی سەربەخۆی كوردستانم پێ باشترە، چونكە، بەمجۆرە لە هەمانكاتدا، ماف دیاریكردنی چارەنووسیش بە دەستدێت و ئەم كێشەیە كۆتایی پێدێت.

***ئەگەرەكانی نزیكە، پێتوایە یان دوورە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێم وایە دوورە، بەڵام بەقەدەر جاران دوورنییە.

***كارت بۆ كردووە، یا كاری بۆ ئەكەیت تۆ وەكو سكرتێری حزبێك و شەخسێكی سیاسی كوردی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێداگرتنی ئێمە لەسەر ماف دیاریكردنی چارەنووس و ماف پێكهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ، هەڵوێستێكی ئیدئۆلۆژیك و ئەزەری نییە، بەڵكو لە ناوەرۆكی ستراتیژی ئێمە جێگەی هەیە و بەو پێیە، هەوڵمان بۆ داوە و هەوڵی بۆ دەدەین.

**كۆمەڵەپەیوەندی لەگەڵ توركیا و سوریا نییە**

***فایلی پەیوەندییەكانی كۆمەڵەو عیراق و بەعس تەواو بوو، پێتخۆشە ئەگەر بەكورتی لەسەر پەیوەندییەكانی كۆمەڵەو توركیا هیچ پەیوەندییەك هەیە یان چۆن بووە تا ئێستا؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە هیچ کات هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە نەبووە. نە ئێمە هەوڵێکمان بۆ داوە و نە ئەوانیش عەلاقەیەکیان بۆ وەها پەیوەندییەك دەربڕیوە، بگرە میت زۆر دژی ئێمەو دۆستایەتی ئێمە بوو.

***پەیوەندیتان لەگەڵ دەوڵەتی سوریا هەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەرگیز.

**کۆمەڵە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا نییە**

***پەیوەندیەکانتان لەگەڵ ئەمریکا چۆنە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ ئەمریکا نەبووە.

***ئێستا پەیوەندییەکتان نییە، لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا لەعیراق؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هیچ پەیوەندیەکمان نییە. ئەوان بە حوکمی ئەوەی کە لە عیراق دەسەڵاتدارن چەند جارێك سەردانی مەقەری ناوەندی ئێمەیان کردووە و هەوڵیانداوە زۆرتر بمان ناسن، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی بەردەوامی لێنەکەوتووەتەوە. ئاخر جار پێمانووتون ئێمە حەز ئەکەین ئەگەر کێشەیەك هەیە لە ڕێگای یەکێتی نیشتمانییەوە چارەسەری بکەین کە هاوپەیمانی خۆتانە.

**نابێ ئەمریکا دەست لەناوخۆی ئێران بدات**

***ئێوە حەز ناکەن پەیوەندیتان هەبێ لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە دامەزراندنی ئەم پەیوەندییە بە پێویست و بە قازانج نازانین.

***بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە پێمانوایە نابێ بە هیچ شێوەیەك پاساو بۆ دەستێوەردانی هێزەکانی ئەمریکا لە کوردستانی ئێران دروستبکرێت، نابێ شەرعییەتی پێبدرێت، نابێ ڕێگای بۆ خۆشبکرێ. بەڵام ئەگەر وەها ڕووداوێك بوو بە ئەمری واقیع ئەو کاتە ئێمە بە شێوەی دیاریکراو بڕیاردەدەین کە چۆنی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین. ئەوان بە شوێن بەرژەوەندی خۆیانەوەن و ئێمە پێمانوا نییە کە دەتوانێ بەرژەوەندی هاوبەشمان هەبێ.

***یەعنی ئەمریکا داوای هاوکاری لە ئێوەو حزبی دیموکرات و ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی نەکردووە، بۆ دژایەتی ئێران یان بۆ ڕوخاندنی ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** داوایانکردووە و وەڵامی پێویستیان پێدراوەتەوە.

***ئەگەر کەوتنە ژێر فشارەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەوڵدەدەین بە هێزی خۆمان و پشتیوانی جەماوەر خۆمان لەژێر هەر فشارێك دەرباز بکەین، بەڵام لاموانییە ئەوان وەها فشارێك بۆ ئێمە بێنن. کاتێکیش بۆ ئەو مەبەستە داوایان لێکردین، داواکەیان لە قاڵبێکی دۆستانەدا دارشت. وەڵامی ئێمەش ئەگەرچی ڕەتکردنەوە بوو بەڵام بەرهەڵستکارانە نەبوو. هەر دوولا لە یەکتر تێگەیشتین.

***ئەگەر ئەمریکا ئێران بڕۆخێنێو ئەو سیناریۆیەی عیراق دووبارە بێتەوە، ئەوە لە ئێران دووبارە بێتەوە ئێوە ئەوکاتە ناچارن ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بکەونە ژێر تەنسیری ئەمریکاوە لەو هاوکێشە سیاسیەدا مل**

بۆ داواکانی ئەمریکا بدەن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە لە هەموو کاتێکدا بە پێی ستراتیژی خۆمان چ بۆ رووخاندنی رژێمی کۆماری ئیسلامی، چ بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی نوێ، سەربەخۆ لە دەستێوەردانی ئامریکا و هەر هێزێکی دەرەکی دیکە کاری خۆمان دەکەین. هەوڵدەدەین بۆ ئەوەی جەماوەری خەڵك خۆیان دەسەڵاتی خۆیان تەنانەت لە هەلومەرجیکی فەرزیشدا کە ئەمریکا ئێرانی داگیرکردبێ، بەرقەرار کەن و مل بۆ داواکان و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دانەنوێنن.

*پێتانوایە بەبێ هاوکاری ئەمریکا ئێوە بتوانن کۆماری ئیسلامی بڕوخێنن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: پێموایە کە دەستێوەردانی ئەمریکا هەم تەمەنی رژێمی کۆماری ئیسلامی درێژتردەکاتەوە و هەم ئەگەر هات و رووخاندیشی، کاری بنیاتنانەوەی ئەو وڵاتە لەسەر بنەمایەکی پێشکەوتوو و ئینسانی دژوارتر دەکات.

پەیوەندیمان لەگەڵ ئیسرائیل نییە

*ئەمە لە بەحسێکی تردا دێینەوە سەری، بەڵام پێمخۆشە پەیوەندییەکانی کۆمەڵەو ئیسرائیل بزانم؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هەرگیز هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل، نەڕاستەوخۆ نەناراستەوخۆ نەبووە.

کۆمەڵە (TV) هی ئیسرائیل نییە

*ئەی بۆ باس لەوە ئەکرێ (t V)کۆمەڵە بە هاوکاری ئیسرائیل و ئیسرائیل هاوکاریکردوون ئەو دیعیایە تا چەند راستە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەوە لە سەدا سەد ناراستە.

*ئەمریکاش هاوکاری نەکردوون؟

ئیبراهیم عەلیزادە: نە ئەمریکا، نە هیچ دەوڵەت و هێزیکی دیکە لەم بابەتەوە هاوکاری نەکردووین و بەرهەمی تێکۆشانی خۆمان و پشتیوانی خەڵکە.

ئوردن ویستی کۆمەڵە نوسینگە بکاتەوە

*پەیوەندییەکانتان لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی چۆنە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: لە دووای ساڵی (١٩٩١)کە فرۆکەخانەی بەغدا داخرا، ئێمە ناچار بووین هاتوچۆکانمان بۆ دەرەوەی وڵات لە ڕێگەی ئوردۆنەوە بکەین. بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی هاتوچۆ، پەیوەندیمان بە دەوڵەتی ئوردۆنەوە گرت و ئەوانیش بەڕادەیەکی مەحدوود ئەو ئیمکانەیان پێداین. هەرچەند ئەوان بێ مەیل نەبوون کە ئێمە نوسینگەیەکیش لە عەمان دابنێین کە ئاسانکاری بکات بۆ هاتوچۆکان، بەڵام ئێمە ئەوەمان بە پێویست نەزانی و تەنها لە ڕێگەی فاکس و تەلەفوونەوە لەگەڵ نوێنەرایەتی کۆمەڵە لەدەرەوەی وڵات پەیوەندیمان لەگەڵ بەرقەرارکردن.

*بۆ قبوڵتان نەکرد، نوسینگە دابنێن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە لە دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتاندا بە گشتی سیاسەتمان ئەوە بووە کە زەرەیەك لەوەیکە پێویستە زیاتر نەچینە پێش. بەو پێیە هەر ئەوەندە بۆ پێوەندی راگرتن لەگەڵ دەوڵەتی ئوردۆن بەس بوو.

***پەیوەندییەکانتان لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپا لەچ ئاستێکدایە، وە باشترین دەوڵەت کە ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵی هەیە کێیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لەگەڵحزبە سۆسیالیست و سۆسیال دیموکراتەکانی ئەورووپا لە کۆنەوە کەم و زۆر پەیوەندیمان هەبووە، دیارە زۆربەی ئەو حزبانە هەر کامە لە دەورەیەکدا لە وڵاتەکەی خۆیاندا دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتووە. بەعزێکیان لەوانە دەوڵەتی فەرانسە لە چوارچێوەی یاسایی خۆیاندا بۆ ویزا هەندێك کار ئاسانییان بۆ کردووین. یارمەتی بۆ پەنابەرانی کوردی ئێرانی لە دەورەیەکدا کە لەشوێنەئازاد کراوەکانی کوردستان لەدەوروبەری مەقەرەکانی ئێمە دەژیان لە ڕێگەی خاچی سوورەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکانی وەکوو "پزیشکانی بێ سنوور"، "مێدیکۆ ئینترناسیۆنال"، "ئێکس مینوس وای" و "دیاکۆنی" لە لایەن ئەو حزبانەشەوە کارئاسانی بۆ دەکرا.

**کۆنگرەی پێنجەمی کۆمەڵە لەمالومە – ١٣٦٥**

***ئێستا ئەمەوێ باسی کۆنگرەی پێنجەمم بۆ بکەی، کەلە بەفرانباری (١٣٦٥) بەستراو، تازەترین ئاڵوگۆڕو بەحسەکانی ناو ئەو کۆنگرەیە چیبون، بەتایبەتی ئەو رێ و شوێنانە کە کۆمەڵە گرتیەبەر. دوای ئەوەی کە لە کۆنگرەی سێیدا بڕیاردرا حزبی کۆمۆنیستی ئێران دروستبکرێت ئەوانە چ رەنگدانەوەی هەبوو لەسەر کۆنگرە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حزبی کۆمۆنیستی ئێران دوای کۆنگرەی سێی کۆمەڵە پێکهات. کۆنگرەی پێنجی کۆمەڵە و کۆنگرەی دووی حزب لە یەك شوێن و لە مەقەرەکانی کۆمەڵە لە نزیك ئاوایی مالومە، لە "گۆمە سارد" و بە فاسیلەی چەند رۆژ لە یەکتر بەسترا.

گرنگترین باسی کۆنگرەی پێنجی کۆمەڵە بریتیبوو لە پێویستی دارشتنی ستراتێژێکی نوێ بۆ خەباتی سیاسی و نیزامی و جەماوەری لەکوردستانی ئێران. هەلومەرجەکە لە چاو دەورەی کۆنگرەکانی (٣ و ٤)گۆرا بوو، خەباتی چەکداری پاشەکشەی زیاتری پێکرابوو، شۆڕشی گەلانی ئێران بۆ ئازادی کە پاش رووخانی رژێمی شاش بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە گوروتاو نەکەوتبوو، لەم دەورەیەدا بە تەواوی تێك شکا بوو و رژێمی کۆماری ئیسلامی خۆی سەقامگیر کردبوو. هەرچەند لەم کۆنگرەیەدا ئەو ستراتێژە بە تەواوی دانەرێژرا، بەڵام خاڵەسەرەکییەکانی دەستنیشانکرا و دوو ساڵ دواتر لە کۆنگرەی (٦)دا بوو کە پەسەندکرا. لام وایە ئەم کۆنگرەیە دەوری گرنگی هەبووە لە جیاکردنەوەی ئێراوانەتری ئێمە لە سیاسەت و لە شێوەکار و لە بۆچوونی ناسیۆنالیستی لە ناو کۆمەڵەدا.

لەم کۆنگرەدا کە بە روونی دەگوترێ هەبوونی بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی کوردستان نابێ تەنیا خۆی لە خەباتی چەکداریدا ببینێتەوە، سەرکەوتنی ئەو بزوتنەوەیە لە گرەوی لە یەك هەڵپێکرانی خەباتی کرێکاران و خەباتی جەماوەری بۆ باشتر کردنی ژیان، خەباتی چەکداری و خەباتی سیاسیدایە. هەموو مەیدانەکانی ئەو خەباتە دەبێ لە ستراتێژی ئێمە و لە کردەوەی رۆژانەماندا هەر کامەیان جێگا و شوێنی خۆیان هەبێ.

**مەسەلەی ناسیۆنالیزمان تەنها بۆ دیموکرات جێنهێشت**

***لەم سەرو بەندەدا رەخنەی ئەوە هەبووە لەتۆ وە پێموایە ئەمە رەخنەی (عەبدوڵڵا موهتەدییە)لە تۆ کە سەید برایم و حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەروی ئامۆژگارییەکانی (مەنسوری حیکمەت) لەروی خەت و رێبازی ئەوەوە لەو بڕوایەدان، وە ئێستاش لەو بڕوایەدان، کە کێشەی نەتەوەیی ئەبێ بەدەست ئەحزابی بۆرژوازییەوە چارەسەربکرێت. وەلحاسڵ ئێوە لەو کۆنگرەدا لەوسەردەمانە راتانگەیاندوە "کە پێویستە حزبی بۆرژوازی مەسەلەی قەومی و نەتەوەیی کوردبگرێتەدەست و چارەسەری بکات، ئێمە تەنیا مەسەلە چینایەتیەکان بگرینە دەست، لەمبارەیەوە نەزەرت چییە، ئایا ئەوەبوو وایکرد حزبی دیموکرات گەشەیەك بکات یان ئەو ئیشکالانە چیبون توشی ئێوەبوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو بەحسە لە کۆنگرەی (٥)دا نەبوو، ئەوە پەیوەندی بە ساڵەکانی دوای جیابوونەوەی رەوتی کۆمۆنیسمی کرێکاری هەیە. کۆنگرەی (٥) نەك هەر هیچ بۆشاییەکی بۆ حزبە ناسیۆنالیستەکان بە جێنەهێشت، بەڵکو هەوڵیدا بۆ ئەوەی رێگای واقع بینانەتر بۆ سەرکەوتنی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان و گەیشتنی خەڵکی کورد بە مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان، دیاری بکات. گرنگیدان بە خەباتی جەماوەری و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگای چالاکی عەلەنی و قانونی لە کۆمەڵگای ژێر دەسەڵاتی

دیکتاتۆریدا لەناکامەکانی ئەو کۆنگرەیە بوو.

بەڵام سەبارەت بەو وتەیەی کە لە کاك عەبدوڵڵا مۆهتەدی نەقڵتانکرد، هەرچەند جێگاکەی لەوانەیە لێرە نەبێ، بەڵام ئێستاکە باسەکە هاتووەتە گۆڕێ پێویستە بڵێم کە من هەرگیز نەم وتووە و نەمنوسیوە کە پێویستە حزبی بورژوایی مەسەلەی نەتەوایەتی چارەسەر بکات و ئەوە ئیشی ئێمە نییە. من وتوومە و نووسیومە کە حزبی ئێمە بۆ ئەوەی بتوانێ سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردستان بکات، نابێ تەنها پشت بە کێشەی نەتەوایەتی ببەستێ، چونکە ئەگەر وایکرد، تەفاوەتێکی نابێ لەگەڵ‌حزبی دیموکرات کە بۆ ئەو مەبەستە سوننەتی خۆی، بەرنامەی خۆی، مێژووی خۆی و رێبەرانی خۆی هەیە.

ئێمە بۆ ئەوە بتوانین بزووتنەوەی نەتەوایەتی بە ئەنجامی خۆی بگەیەنین، پێویستە لە هەمان کاتدا هاندەر و بەرێوەبەری بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی وەکو بزووتنەوەی کرێکاران، بزووتنەوەی ژنان بین. بریارنامەی پەسەندکراوی گەلێك رۆشن لەو بابەتەوە هەیە، کە باسی پێویستی هەوڵدانی کۆمەڵە بۆ بە دەستەوە گرتنی رەهبەری بزووتنەوەی خەڵکی کورد بۆ رزگاری لە ستەمی نەتەوایەتی، دەکات. وەڵامی کاك عەبدوڵڵام لە نامیلکەیەکدا کە لەسەروبەندی جیابوونەوەیان لە کۆمەڵە بڵاوبۆتەوە، داوەتەوە.

***ئێستا ئێوە خۆتان بە نوێنەری هەردوو مەیلەکە ئەزانن، مەیل و گەرایشێکی چەپ‌و مارکسی، هەم مەیل و گەرایشێکی قەومی و نەتەوەیی لە کوردستانی ئێراندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی بەشێك لە لانیکەمی بەرنامەی ئێمەیە وەکو حزبێکی چەپ و سۆسیالیست. بۆ ئەو مەبەستە هەم بەرنامەی دارێژراومان هەیە، هەم ستراتیژی رۆشنمان هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەو بەرنامەیە. پێشینەی حەرەکەتی ئێمە لە (٣) دەیەی رابردوودا نیشاندەدا کە لەپێناو وەدیهێنانی ئەو بەرنامەیەدا، گەلێك فیداکاریشمان کردووە. دیارە ئامانجی نیهایی ئێمە گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستییە، بەڵام لەو مەسیرەدا پێویستە هەموو مەسەلە چارەسەرنەکراوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی بورژوازیش چارەسەربکەین و بەم شێوەیە رێگای هەنگاو هەڵگرتن بەرەو سۆسیالیسم هەموارتر بکەین. کە وابێ لە ستراتیژ و بەرنامەی ئێمەدا بۆشاییەك نییە کە حزبێکی ناسیۆنالیست بتوانێ پری بکاتەوە. گەلێك هۆکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە کە نیشاندەدا حزبەکانی ناسیۆنالیست توانای چارەسەر کردنی نیهایی ئەو کێشەیان لە دەستداوە.

***بە کورتی ئەتوانی ئەو هۆکارانەم پێ بڵێی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم هۆکاری، گەشەی سەرمایەداری و گۆرانکاری ئابوورییە. بورژوازی کورد ئەمرۆکە پێویستی بەوە نییە کە خۆی بە بازاری ناوخۆوە ببەستێتەوە. بەرتەسککردنەوەی سنوورەکان لە قازانجی خۆیدا نابینێ. گلۆبالیزاسیۆن وایکردووە کە هیچ سەرمایەدارێك ناتوانێ تەنیا دڵی بەوەخۆش بێ کە لە سنووری وڵاتەکەی خۆیدا چالاکی بکات. نە ئەو بورژوازییە و نە تەنانەت چینی مامناوەنجیش کە ئاواتی بوون بە سەرمایەدار لە دڵیدایە و ئەو ئاسۆیە بۆ خۆی دەبینێ، ئیتر وەکو دەورەی پێشتر بە ئاواتی دەوڵەتی سەربەخۆ وە سەرنانێتەوە. ستەمی نەتەوایەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا زیاتر لە هەمیشە بەسەرشانی خەڵکی کرێکار و هەژار و فەقیردا دەشکێتەوە.

ئەم وەزعە وایکردووە کە حزبە ناسیۆنالیستەکان، لە ئارمانی کوردایەتی دووردکەونەوە و تەنیا بەوە رازی بن کە بەشێك لەدەسەڵات بە حزبەکەی خۆیانبدرێت، یا مەسەلەی نەتەوایەتی بە هەڵپەسێردراویش

مابێتەوە. کە مەسەلەکە بوو بە کێشەی خەڵکی کرێکار و چەوساوە ئەو جار، ئەو راستییە دێتەکایەوە کە تۆ ناتوانی تەنیا بە بەرزکردنەوەی دروشمی نەتەوایەتی ئەو جەماوەرە بەسیج بکەی. تەنانەت بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتیش پێویستە جەماوەری هەژار و زەحمەتکێش بە چارەسەربوونی باقی ئازار و بێ مافییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەشیان دڵخۆش بن. ئەمڕۆکە ئەو دروشمە بە تەنیا توانایی بەسیجی بەرتەسکە.

***بۆ ئێوە ئەو دوو مەیلە، کەمیان لەپێشترە یان هاوتەریب ئەڕۆن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** باسی پاش و پێش نییە. هەردووکی ئەو ئامانجە پەیوەندی ئۆرگانیکیان پێکەوە هەیە. بە بێ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی، چینی کرێکار بەڕاشکاوی رواڵەتی راستەقینەی سەرمایەدار و چەوسێنەری ناوخۆیی نابینێ و ئەو ستەمە وەکو نەتەوە قورسایی بەسەر زەین و مێشکیدا دەکات.

**نوێنەری چەپ و ناسیۆنالیزمین**

***خۆتان بە نوێنەری هەردوو باڵەکە ئەزانن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەو مانایەی کە باسکرد بەڵێ، خۆمان بەنوێنەری هەردوو باڵەکە دەزانین.

*** ناسیۆنالیستەکانو عەبدوڵڵای موهتەدی هەر ئەم رەئیەی تۆیان هەیە، کەواتە جیاوازییەکەمتان لەچیدایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رەنگە کاک عەبدوڵڵا ئەوەی بەتۆ وتبێ، بەڵام لەبەرنامەیاندا وانییە، ئەوەی کە لە گفتوگۆیەکدا باسیدەکەن، یان لە نووسراوەیەکدا دەینووسن، پێویستە لەگەڵ کردەوەی واقیعیشیان بەراوەردبکرێ. بەبڕوای من ناسیۆنالیسمی چەپ هەر بە قەدەر ناسیۆنالیسمی سوننەتی بێ ئاسۆ و بێ ستراتیژە و خۆشی بە روونی نازانێ چیدەوێ.

***هەموو گروپە چەپەکان هەم ناسیۆنالیستەکان هەمان ئەو رەئیەی تۆیان هەیە کە خۆیان بە نوێنەری چەپو ناسیۆنالیزم دەزانن بۆ نمونە حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراقو حیکمەتیست دەڵێن پێویستە رەسمەن دەوڵەتی کوردی خەڵکی کوردستاندا چارەنووسی خۆی بگرێتەبەر وەلحاسڵ ئەوانیش پێیانوایە کە هەردوو ئەم مەسەلە پێویستە بەیەکەوە قسەیان لەسەربکرێ هەمان ئەو رەئیەی تۆیان هەیە. کەواتە جیاوازییەکە چییە مەبەستم ئەوەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەحزابی سیاسی تەنیا لەرووی ئەوەی کە خۆیان ئیدعای دەکەن قەزاوەت ناکرێن، بەڵکو هەروەك باسکرد هاوکات پێویستە کردەوەشیان و مێژوویان و پێگەی چینایەتیان هەڵبسەنگێنین. لەمێژووی کوردستاندا کەم نین ئەو حزبو رەوتانەی کە پشتیان لەچارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی کردووە و بە ئیمتیازاتی گەلێك بچووك کە بەشێك لەدەسەڵاتی حزبەکەیان دابین بکا رازی بوون و یان تەنانەت خەیانەتیشیان پێکردووە، کە چی لەوانەیە بەرنامەی گەلێك رێکوپێکیشیان بووبێ.

***کەواتە ئەوەی تۆ جیا ئەکاتەوە لەو تەرحو لەو بۆچونانە ئەوەیە کە تۆ پێتوایە بۆچونە سیاسییەکانی ئێوە بۆچونێکی مومکینە وە لەروی ئەخلاقی و ئەدەبی سیاسیشەوە ئیشتان بۆ کردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ پێموایە بۆچوون و کردەوەی سیاسی ئەمڕۆمان و مێژووی رابردووشمان ئەوە ئیسبات دەکات.

*** لەئێستادا تازەترین تەرحو بۆچونی ئێوە چییە بۆ ئەو مەسەلەیە، کە بتوانن هەردوو ئەو مەیلو گەرایشە**

**لەناو کۆمەڵە کۆبکەنەوەو تەقوییەی بکەن، بۆ نمونە زۆرجار ئەوە ئەوترێ کە سەید برایم سکرتێری حزبی کۆمۆنیستەیان ئەم حزبە کۆمۆنیستە بڕوایان بە مەسەلەی قەومی و نەتەوەیی نییە، ئێوە زۆرجار بەوە تاوانبار ئەکرێن، لەکاتێکدا ئەم بۆچونانەی تۆ رەدی ئەوانەو پێچەوانەی ئەوانەیە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: نەیارانی کۆمۆنیسم ئێمە بە گەلێك شتی لەو چەشنە تاوانباردەکەن، ئەمە دەچێتە خانەی پڕوپاگەندەی سیاسییەوە. پێموایە وەڵامی رووتمان بۆ ئەو مەسەلەیە هەیە. داوام ئەوەیە ئەگەر ئەشکرا هەموو "بەرنامەی ئێمە بۆ دەسەڵاتدارەتی جەماوەر لە کوردستان" زەمیمەی ئەو وتووێژانەت بکەی، لانی کەم چەند پارگرافێك کە پەیوەندی بە ماڤ دیاریکردنی چارەنووسەوە هەیە، بێنی.کردەوەشمان، دیارە و دەگرێ فەزاوەتی بابەتی لەسەربکرێ.

**ئێمەو عەبدوڵڵای موهتەدی زۆر شتمان جیاوازە**

*** ئەگەر ئەم بۆچون و مەیلەی ئێوە لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی چۆتە پێش کە قەناعەتتان پێیەتی، کە دەبێ ئەم دوو مەیلە هاوتەریب بەیەکەوە بڕۆن، هەم مەسەلەی چەپ و هەم مەسەلەی ناسیۆنالیست وە(کاك عەبدوڵڵا)ش هەمان بۆچونی هەیە. باشە کە خۆشتان پاستانکردوە پێشتر سەبەبی جیاکردنەوەکان ئەوەبوە کە ئەوان قەناعەتیان بە کوردایەتی هەبێ و کوردایەتی بکەن. ئەگەر هەردووکتان ئەم بۆچوون قەناعەتتان هەیە ئەم جیابوونەوەیە لەبەی چی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جیاوازییەکان ئەگەر لەسەرەتاشەوە لە کاتی جیابوونەوەکەدا روون نەبووبن ئێستا هەم لە بەرنامە و هەم ستراتیژ و هەم لە سیاسەتی رۆژدا، ئاشکران. ئەوان فیدرالیسم بە رێگاچارەی کێشەی نەتەوایەتی دەزانن، ئەوان دەچنە هاوپەیمانی لەگەڵ‌حزبە نەتەوەییەکانی ئێران، ئەوان خوازیاری هاوپەیمانی لەگەڵ ئەمریکان و ناواتی دووپات بوونەوەی سیناریۆی عیراق دەخوازن. ئەوان هەڵسەنگاندنی جیاوازیان لەسەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئێستای کوردستان هەیە و دەورێکی زۆر بۆ چینی کرێکار دانانێن، لەبزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی ئێستادا وەکو بزووتنەوەی کرێکاری، بزوتنەوەی ژنان، بزوتنەوەی خوێندکاران، ئەوان رەوتێکی لیبراڵی تەعقیب دەکەن. هاوپەیمانانی ئێرانی ئەوان و ئێمە جیاوازن و گەلێك نمونەی دیکە. هەمووی ئەوانە ئەو راستییە تەئکید دەکەنەوە کە ئێمە دوو رەوتی جیاوازین با چەند وشەیەکمان لەسەر مەسەلەی نەتەولیەتی یان کێشەی چینایەتی وەکوو یەك بچێ.

**لەگەڵ بۆچوونەکانی خەسرەوی داوەرین**

*** لەسەردەمی کۆنگرەی پێنج و پێش ئەوە واتە لە (١٥)ی گەلاوێژی (١٣٦٣) یەعنی لە (٦)ی ئوتی (١٩٨٤) (خوسرەوی داوەر) کە ئەوکاتە لەناو کۆمەڵەیا پلەوپایەوئیمکانییەتێکی هەبوە لەژێر ناونیشانی (هەربژی دەسەڵاتدارانی شوراکان) بابەتێکی نوسیوە، کە پێیوایە پێویستە کورد دەوڵەتی هەبێ و خەڵکی کورد پێویستە وەك میللەتێك بەرەسمی بناسرێن، مەبەستم ئەوەیە ئەم بۆچونە هەر لەگەڵ ئەو قسانەی تۆ یەکدەگرێتەوە ئێستا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ لە ناوەرۆکدا ئێمە هەر ئەو رێبازەمان هەیە.

***ئەمە بۆچونی رەسمی کۆمەڵەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ئەوە بۆچوونی رەسمی کۆمەڵەیە و لە دوایین کۆنگرەی کۆمەڵەدا لە بەرنامەیێك لەژێر ناوی "بەرنامەی کۆمەڵە بۆ دەسەڵاتداریەتی خەڵك لە کوردستان" جارێکی دیکە بە

وردەکارییەوە فۆرمۆلە کراوەتەوە.

**عیراق و ئێران تۆپبارانیان دەکردین**

*** لەو سەروبەندەدا لە کۆنگرەی پێنجەم تا کۆنگرەی شەشەم ئێوە زیاتر هاتنە ناو قوڵایی خاکی کوردستانی عیراقەوە، پایەگاوچاپخانەکانتان دێننە کوردستانی عیراقەوە، وردە وردە لە سنوورەکانی ئێران یان بڵێم لەناو کوردستانی ئێران دورئەکەونەوە ئەمە چ تەئسیرێکی هەبوو لەسەر هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە، کاروباری هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە چۆن بەڕێوەچوو لەم مەنتیقەدا توشی گیروگرفت نەبون کێشەتان نەبوو لەو بارەیەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیارە هەر پاشەکشەیەك لەگەڵ خۆی گیروگرفتی خۆی پێکدێنێ. کاریگەری رۆحی لەسەر هێزی پێشمەرگە دادەنێ. ئێمە لە کۆنگرەی (٥)ی کۆمەڵەدا هەوڵماندا کە ئەو راستییە زیاتر بخەینە بەرچاو کە بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی خەڵکی کوردستان، تەنیا بەلاواز بوون یان بەهێز بوونی هێزی پێشمەرگەوە هەڵناسەنگێندرێ. ئەو بۆچوونە پاش ماوەیەك لە ناو ریزەکانی ئێمەدا جێکەوت و مەعنەویاتی هێزی پێشمەرگە جارێکی دیکە و لە دەورەی خەباتی پارتیزانیشدا بەرز بووەوە.

واحیدەکانی هێزی پێشمەرگە بۆ حەسانەوە و بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش و بریندارەکان، دەگەرانەوە بنکەکانیان کە لە چەندین شوێنی سەر سنوورەکان لە دیوی عیراق دامەزرابوون. تەداروکات و پێویستییەکانی ژیان و چالاکی پێشمەرگانە، هەم لە ئێران و هەم لە عیراقەوە دابین دەبوو. ئەم دەورەیە لە هەمانکاتدا، گەرمەی شەڕی ئێران و عیراقیش بوو.

گەورەترین کێشەی ئێمە ئەوە بوو کە چۆن هێزەکانمان لە ناوری ئەو شەڕە بپارێزین و حەرەکەتی سەربەخۆی خۆمان لە قووڵایی کوردستانی ئێراندا درێژە پێبدەین. رۆژ نەبوو لەو پێناوەدا تووشی گیروگرفت و تەنانەت خەسارەتیش نەبین. مەقەرەکانی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە لە زیاتر لە (٦) ئۆردووگای سنووریدا جێگیر بوون. کە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەردەوام لە ژێر هەرەشەی هێزەکانی کۆماری ئیسلامیدا بوون، گەلێك جار دەکەوتنە بەر پەلاماری تۆپخانە و ئاسمانی هێزەکانی عیراقیش.

**ژنان و هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە**

*** پێمخۆشە لەم مەجالەدا باسی هێزی پێشمەرگە کۆمەڵە، بەتایبەتی هێزی پێشمەرگەی ژنان بکەین، من قەناعەتم وایە یەکێك لەو هێزانە کۆمەڵەیە کە ژنی چەکدار کرد، پێتوایە ئەم بۆچوونەی راستە، وە ئەمە چۆن چۆنی پەرەی گرت ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە تەنانەت پێش رووخانی رژێمی شا و هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، کاتێك کە بیری لە خەباتی چەکداری و شۆڕشی درێژ خایەن دەکردەوە، هەرگیز لای وانەبوو کە جیاوازییەك هەیە لە بەشداریکردنی ژنان لە هەموو بوارێکی وەها شۆڕشێك و لەوانە لەخەباتی چەکداریش.کاتێکیش موقاوەمەتی چەکدارانە بەرانبەر بە هێرشی رژێمی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان شکڵی گرت، هەر بیرمان لە جیاوازییەك لەو بوارەدا نەدەکردەوە، بەڵام لەسەرەتاوە بەرانبەر بە چۆنیەتی راهێنان و ئامادە کردنی ژنان، چۆنیەتی رێکخستنیان، کۆمەڵێك مۆحافزەکاری هاتە گۆرێ. تا کاتێك کە شارەکان بە دەست هێزی پێشمەرگەوە بوون ژنان گەلێك بواری خۆ دەرخستنیان بۆ خەباتی سیاسی بۆ خولقا بوو، کە شارەکان گیرانەوە، مەسەلەی چەکدارکردنی هاوڕێیانی ژنیش هاتە دەستورەوە، بەڵام هەر وەکو باسمکرد بە پارێزەوە

دەستمان بۆ برد و دەمانەویست هەنگاو بە هەنگاو کاردانەوەی ئەو حەرمەتە لەناو خەڵکی دێهاتەکانی کوردستان، کە لامانوابوو لەم بابەتەوە مۆحافزەکارترن تاقیکەینەوە.

ئەوە بوو کە لەسەرەتاوە دەستە پێشمەرگەی جیاوازمان لە هاوڕێیانی ژن ڕێکخست کە دەستیانکرد بە جەولەی سیاسی لەناو ئاواییەکان. زۆر زوو لێمان حاڵیبوو کە نیگەرانییەکەی ئێمە لە جێگای خۆی نییە، کۆمەڵگای کوردستانی ئێران نەك هەر پەزیرای ئەو حەرمەتەیە بەڵکو بە گەرمی پێشوازی لێدەکات. ئەوە بوو لە هەموو ناوچەکان، کچان و کوران هاوشان لە فێرگەکاندا وەر دەگیران و دواجار وەکوو یەك لە واحیدەکانی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەدا دەستیاندەکرد بە چالاکی.

گیروگرفتی ژنان لە ناو هێزی پێشمەرگەدا کە زۆربەیان پیاو بوون، کەم نەبوو، ئەوان بە راستی گەلێك ماندووتر دەبوون لە پیاوان و لەگەڵ گەلێك گیروگرفتی زیاتر لە پیاوان دەست و پەنجەیان نەرم دەکرد، بۆ ئەوەی جێگای خۆیان بکەنەوە. هاتنی ژنان بۆ ناو ریزەکانی هێزی پێشمەرگە، بە خێرایی کاریکردە سەر کەش و هەوای کۆمەڵایەتی کوردستان بە نیسبەت سەرجەم ژنانەوە. بروا بە خۆیەکی زیاتری بە ژنان بەخشی. کەم نەبوون ئەو ژنانەی کاتێك لە ناو بنەماڵەکەیاندا لەگەڵ زوڵمێك بەرەو روو دەبوون، هەرەشەیاندەکرد کە بە هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە پەیوەست دەبن و یان شکایەت دەبەنە بەردەم پێشمەرگەکانی کۆمەڵەوە.

هەڵبەت پێشمەرگایەتی ژنان لە خەباتی خەڵکی کوردستاندا لە رابوردو لە کوردستانی عیراق بێ وێنە نەبوو، پێشتریش ژنانی چەك لە شان لە ناو ریزی پێشمەرگەدا لە کوردستانی عیراق بیندرا بوون. جیاوازی کاری ئێمە لەم بابەتەوە لەوەدا بوو کە یەکەم، ئەو کارە لە ئاستێکی بەریندا کرابوو و بە پانتایی هەموو کوردستان و دووهەم، خەباتی پێشمەرگانە بە خەبات بۆ رزگاری ژنان لە ستەمی رەگەزییەوە گرێدرابوو وە دروشمەکانی لەرێگای ژنان و پیاوانی پێشمەرگەوە بەردەوام تەبلیغی بۆ دەکرا.

**کۆمەڵە یەکەم هێز بوو ژنانی چەکدار کرد**

***ئەو کێشەو گیروگرفتانە چیبون هاتەرێگاتان لەوبارەیەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم گرفت، پاشماوەکانی بیروبۆچوونی پیاو مەزنی بوو لە ناو پیاوانی پێشمەرگەدا. هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە ئەگەرچی تاڕادەیەك بە بیروبۆچوونی سۆسیالیستییەوە پەروەردەکرابوو، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە هەستی گیان سەختی پیاو مەزنی بە ئاسانی لە دەروونیاندا پاك بووبێتەوە. بەو پێیە بێباوەری بە ژنان، تاڕادەیەك بە چاوی سووك تەماشا کردنیان لێرە و لەوێ دەبیندرا. ژنان ناچار بوون بە دوو قات زیاتر فیداکاری بکەن کە بە قەدەر پیاوێکی پێشمەرگە جێگای خۆیان بکەنەوە.بۆ نمونە دەورانی قاعیدەگی بۆیان بە سەختی تێپەر دەبوو، کەمتر ریعایەت دەکران، حەمام کردن و ئەزافەت راگرتنی خۆیان بە ئاسانی وەکو پیاوان جێبەجێ نەدەبوو. دیارە ژمارەیان کەمتر بوو لە پیاوان و ئەوەش بە تایبەت لە ناو ئەو واحیدانەدا کە تەفاوەتەکە زۆر بوو، گرفتاری زیاتری بۆیان پێکدەهێنا.

**گوڵێ قوبادی و جەمیلەی رەحیمی یەکەم پێشمەرگەی ژن بوون**

***لەبیرتە یەکەم ژن کێ بوو کە هات بوو بە پێشمەرگەی کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هاوڕێیان گوڵێ قوبادی و جەمیلە رەحیمی.

***یەکەم ژنە شەهیدی پێشمەرگە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکەم پێشمەرگەی ژن کە لە شەڕ دا گیانی بەخت کرد ئەشرەفی ڕادپوور بوو و یەکەم ژنێکی هەڵسوڕاوی کۆمەڵە کە لە زینندانی کۆماری ئیسلامی تیرباران کرا نیرەی ئەعزەمی بوو، هەردووکیان لە ساڵی( ١٣٥٨)ی هەتاوی.

**(٪٢٠) پێشمەرگەی کۆمەڵە ژنان بوون**

***لەدەورانی کۆمەڵەدا زۆرتری ڕێژەی ژنان یا پێشمەرگەی ژنان چەندبووە یا بەشداری ژنان چەندبووە لەناو کۆمەڵەیا؟ یەعنی گەیشتۆتە سەدی چەند؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموایە دەتوانین سەرجەم بە لە سەدا بیست بەراوەردیبکەین.

***ئەو ڕێژەیەکەم نەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیارە کەم بوو.

***ئەی بۆ نەتانتوانی زیادیکەن یان فاکتەرەکانی چیبون ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لاموایە سێ فاکتەری سەرەکی هۆکاری کەمبوونی ژنان لە ناو ریزی پێشمەرگەی کۆمەڵەدا بوون.

یەکەمیان: فاکتەری کۆمەڵایەتی. هاتنی ژنان بۆ ناو ریزی پێشمەرگە، لە لایەن بنەماڵەکانیانەوە بەربەستی زۆری بۆ دروستدەکرا. راستە کە کۆمەڵگای کوردستان سەرجەم واقعیەتی پێشمەرگایەتی ژنانی قبوڵکردبوو و تاڕادەیەکیش پێشوازی لێکرد، بەڵام هێشتا ئەو پێشوازییە لە چاو ئەوەی کە بۆ پیاوان هەبوو، کەمتر بوو. بیروبۆچوونی سوننەتی و تەبلیغاتی دژی کۆمۆنیستی کۆنەپەرستی ناوخۆ لەم مەسەلەیەدا دەوری دەبینی.

دووهەمیان: گیروگرفتی عەمەلی بوو لە ڕێگای پەیوەستبوونی ژنان بە ریزی پێشمەرگە. کوران دەیانتوانی خۆیان دۆڵ بە دۆڵ و شاخ بە شاخ بە شوێن واحیدەکانی پێشمەرگەدا بگەرێن و بیان دۆزنەوە و پێیان پەیوەست بن، یان تەنانەت ئەوکات کە فێرگەکانمان لەدیوی کوردستانی عیراق بوون، کوران بە ئاسانی دەیانتوانی لە سنوورەکان تێپەر بن، ئەو کارە بۆ کچان بەو ئاسانییە نەبوو.

سێهەم: هۆکار ئەوە بوو کە پێشتر ئامازەم بۆ کرد، پاشماوەی رۆحی پیاو مەزنی، وایکردبوو کە ژنان لە ناو ریزی پێشمەرگەدا، لەژێر زەختدابوون و کەشوهەواکە، گەلێک جار بۆیان دڵپەزێرنەبوو.

***بەشداربونی ژنان لەریزی پێشمەرگەی کۆمەڵە، ئەمە شۆڕشێکی سیاسی چەکداری و ژنانە بوو یان شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بوو یان هەرسێکیان بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** خەباتی پێشمەرگانە لە کوردستان، خەباتێکی پارتیزانی دابراو لە خەڵکی نەبوو. پشتیوانی و پێشوازی جەماوەر لەو خەباتە جیاوازی ئەساسی پێشمەرگایەتی لە کوردستان، لە چاو بۆ وێنە خەباتی پارتیزانی لە ئەمریکای لاتین بوو. بەو مانایە، رووتێکردنی ژنان لە پێشمەرگایەتی، دەکرێ بڵێین حەرەکەتێکی کۆمەڵایەتی بوو لە بواری خەباتی چەکداریدا.

**کۆنگرەی شەشەمی کۆمەڵە ، عەبدوڵڵای موهتەدی کۆنگرە بەجێدەهێڵێت**

***سەبارەت بەرەخنەکانی عەبدوڵڵا موهتەدی لە ئێوە لە کۆنگرەی شەش، گوایە ئەو کۆنگرەیە لە دانیمارک لەماڵی(مەنسوری حیکمەت) بەستراوە، هەموو رێوشوێنەکانی تۆ ومەنسوری حیکمەت گرتوتانەتەبەرو بەشێکی زۆر لەبرادەرانی کۆمەڵە ئاگایان لێنەبووە، کاک عەبدوڵڵا لەم بارەیەوە گلەیی هەیە، ئەو گلەییانە تا چەند راستە؟ هەر ئەو دەمەشە کاک عەبدوڵڵای موهتەدی وازی هێناوە لە سکرتێری حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە**، کۆنگرەی (٦) نەك لە دانیمارك، بەڵکو لە "بۆتێ" لە نزیك شاری رانیە گیرا. ئەوکات بەشێك لە سازمانی مەرکەزی حزب لەوڵاتی دانیمارك بوو. کاك عەبدوڵڵا لەوانەیە، مەبەستی مەسەلەیەکی دیکە بووبێ کە پەیوەندی بە خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو کۆنگرەیە بوو. کاك عەبدوڵڵا و مەنسووری حیکمەت لە مەکتەبی سیاسی حزبدا، باسی ئەو کۆنگرەیە دەکەن و مەنسووری حیکمەت، کۆمەڵێك پرسیار تەرحدەکات و بە کاك عەبدوڵڵا دەڵێ کە ئەگەر بمانەوێ لە رێبەریکردنی بزووتنەوەی کوردستاندا سەرکەوتوو بین، دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە و داوا لە کاك عەبدوڵڵا دەکات کە ئەو وڵامانە بداتەوە.

کاك عەبدوڵڵا خۆی وەڵامیان ناداتەوە و دەقی پرسیارەکان بە خەتی مەنسووری حیکمەت بۆ من دەنێرێ. ئەو پرسیارانە بە دەست خەتی مەنسووری حیکمەت بە زمانی فارسی لای من هەیە و کۆپیتان دەدەمێ کە ئەگەر بە پێویست تان زانی بڵاویکەنەوە. کاتێك ئەو پرسیارانە بەدەستم گەیشت، هەستم کرد کە ئەمانە نەك هەر پرسیار بەڵکو کۆمەڵێك راوبۆچوونی دیاریکراویشیان لە پشتە. چووم بۆ دانیمارك و چاوم بە مەنسووری حیکمەت کەوت و داوام لێکرد کە خۆی چی لەم بابەتەوە لە ئەزەر دایە پێمان بڵێ، چونکە من پێشتر لە هەمووی ئەو بابەتانەوە لە مەجالی جۆراوجۆر قسەم کردبوو، هەوڵدا لە بۆچوونی ئەو ئاگادار بم. ئەویش قبوڵیکرد و سەرەتا وەڵامەکانی خۆی بە من داوە کە بە ئەوار زەبتم کرد و نوسخەیەکی ئەوارەکەشمدا بە کاك عەبدوڵڵا.

دواجار، مەنسوری حیکمەت ئەو قسانەیکرد بە باسێکی پوختەتر و سمینارێکی لەسەر تەرتیبدا، کە من لەو سمینارەدا بەشدار نەبووم، بەڵام کاك عەبدوڵڵا بوو. ئەوارەکانی ئەو سمینارەش درا بە هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لە کوردستان. سەرجەمی ئەو باسانە بوون بە ناوەرۆکی، بریارنامەکانی کۆنگرەی (٦)ی کۆمەڵە. کاری سەرەتایی ئەو کۆنگرەیەش لە پلینۆمێکی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لەشاری سلێمانی بە بەشداری عەبدوڵڵا موهتەدی و مەنسوری حیکمەت، جێبەجێکرا، عەبدوڵڵا موهتەدی لەم پلینۆمەدا، رای مۆخالیفی بەرانبەر بە رەش نووسی هیچ کام لە بریارنامەکان دەرنەبری بەڵام کەم قسە بوو، تاڕادەیەك بێدەنگبوو.

مەنسووری حیکمەت پێش دەستپێکردنی کۆنگرە گەرایەوە دەرەوەی وڵات و کاك عەبدوڵڵاش لە رۆژی یەکەمی کۆنگرەدا بەشدار بوو و هەر لەوێ، داوای لێبوردنیکرد لە بەشدار بووان کە بە هۆی هەندێك گیروگرفتی ئیداری کە پەیوەندی بە پاسپۆرتەکەیەوە هەیە، ناتوانێ تا کۆتایی کۆنگرە دابنیشێ ئەویش گەرایەوە بۆ دەرەوەی وڵات، پێشمانخۆشبوو کاك عەبدوڵڵا بمێنێتەوە هەر دوای ئەوەش دوای شەش مانگ، عەبدوڵڵا موهتەدی دەکەوێتە نووسین وتەنیدی هەموو کۆنگرەی شەش دەکات و تەنانەت رەخنە لەکۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە دەگرێ کەبەئەندازەی پێویست بە گردەوە لە سەر خەتی کۆنگرە نەچووەتە پێش و نیشانیدا کە ئەگەریش پێشووتر و لە پلینۆمدا بێدەنگ و کەم قسە بووە، ئێستا بە تەواوی ساغ بۆتەوە و دیفاعی لێدەکات و

داوایدەکرد کە کۆمیتەی ناوەندی حزب لە رووی تەشکیلاتیشەوە بەرانبەر بە لادانی کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە لە رێبازی کونگرەی شەش هەڵویست وەربگرێ. ئەوە راستیەکە کە بە پێی بەڵگەنامەکان حاشای لێ ناگرێ. هەم لە گوڤاری "کومونیست" دا لەسەر نوسیووە و هەم لە بەیانیەی پلینۆمی شازدە دا بە تێرو تەسەلی لەم بابەتەوە قسەی کردوە. لە ساڵانی دواتردا دەکرێ هەڵویستی گۆرابێ و ئەوە خۆی لە خۆی دا ئیرادێکی نیە، بەڵام مێژوو لە سەر جێگەی خۆیەتی.

***موهتەدی دەڵێ هیچ دەورو نەخشێکم نەبوە، ئەمەش ئەگەرێنێتەوە بۆئەوەی کە تۆو مەنسوری حیکمەت ویستوتانە بنەماکانی کۆمەڵە بگۆڕن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ هەمووی ئەو قسانەی کە باسمکرد، بەڵگەنامەی حاشا هەڵنەگر هەیە. بەشی زۆری ئەواری هەموو کۆنگرەکان و پلینۆمەکانمان لەسەر تۆری ئینتەرنێت بۆ ئاگاداری هەمووان دانراوە، هەموو کەس دەتوانێ دەسترەسی پێی هەبێ.

**موهتەدی: عەلیزادە موعجیبی حیکمەتە**

*** موهتەدی دەڵێ: مەنسوری حیکمەت ویستویەتی ئەو خاڵو مەوقیعیەتەی کە کۆمەڵە سەبارەت بە مەسەلەی کورد هەیەتی بیگۆڕێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی (٦) کۆنگرەیەکی پێشکەوتوو بوو، لە درێژەی خەباتی تا ئەوکاتی ئێمەدا هاتبووە ئاراوە، بریار و بریارنامەکانی کارساز و واقیع بینانە بوون. کەمتر لە ساڵێك دوای ئێپەربوونی ئەو کۆنگرەیە کاك عەبدوڵلا لەبابەتێکدا کە لە گۆڤاری کۆمۆنیستدا چاپکراوە دیفاع لە بریارەکانی ئەو کۆنگرەیە دەکات و رەخنە لە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە دەگرێ کە بە باشی هەوڵی جێبەجێکردنی پەسەندکراوەکانی ئەو کۆنگرەیەی نەداوە.

***کاك عەبدوڵلا دەڵی ئەوکاتە بەکاك برایمم وتوە تۆ ئەم شتانە هەڵەیە، وە زۆریش موعجیب بوە بە مەنسوری حیکمەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من ئەوکات لەسەر پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی (٦) لەگەڵ مەنسووری حیکمەت هاوڕای بووم، کاك عەبدوڵلاش ئەوکات دژیان نەبوو و دواجاریش بە نوسراوە دیفاعی لێکردن و هەر وەکو گوتم لای وابوو کە ئێمە لەبەکردەوە دەرهێنانیاندا کەمتەرخەمی دەکەین.

***ئەو پێیوایە ئەو کاتە مەسەلەی کورد کراوە بە مەسەلەیەکی لاوەکی بەپێی ئەو بیرویۆچوونەی تۆ و مەنسوری حیکمەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو هەڵسەنگاندنە راست نییە، چونکە بەڵگەنامەکان بە پێچەوانەی ئەوەمان پێدەڵێن. لام وایە کاك عەبدوڵلا، بۆچوونی ئێستای خۆیەتی کە دەیباتەوە ئەو مەقتەعە مێژووییەوە، مێژوو لەسەر جێگای خۆیەتی، کاك عەبدوڵلا گۆڕاوە.

***ئێوە ناسنامەی حزبی قەومی یا حزبی کوردیو ناسیۆنالیستانداوە بە حزبی دیموکرات ئەوەش یەکێکی ترە لەو رەخنانەی کە هەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە گوتومانە حزبی دیموکرات حزبێکی ناسیۆنالیستە وە ئێستاش هەر ئەوە دەڵێین. کاك عەبدوڵلا خۆی پێش قەدەم بوە لە نووسینەکانیدا لە پێناسەکردنی حزبی دیموکرات بە حزبێکی ناسیۆنالیستی بۆرژوایی لە کوردستان.

*** لەو کۆنگرەیا مەوزوعو بەحسێك هاتۆتە پێشەوە کە ئێوە حزبی بزووتنەوە نین ئێوە حزبی بزووتنەوەی کوردستانی نین ئێوە حزبێکی چەپن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شتێوا نەبووە. بۆ رِوونکردنەوە دەتوانی بریارنامەکانی ئەو کۆنگرەیە هاوپێچی ئەو وتووێژانە بکەیت تا راستییەکان ئەو جۆرەی کەهەن دەرکەون.

***ئەی ئەوە چی بوە ئێوە پێتانوتون کادری جونبشین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە هیچ بەڵگە نامەیەکدا ئەو دەستەواژەیە بە کار نەهاتووە. لەوانەیە لێرە و لەوێ کەسانێك کادرەکانی کۆمەڵەیان بە وەها وشەیەك پێناسە کردبێت، بەلام ئەوەندە گرنگ نییە کە جێگای باس بێت. بۆچوونێکی نامەربووتە.

**عەبدوڵلای موهتەدی واز لەسکرتێری حزبی کۆمۆنیست دەهێنێت**

*** عەبدوڵلای موهتەدی ئەو کاتە بۆ وازی هێنا لە سکرتێری حزبی کۆمۆنیست و چووە دەرەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەمانی کاك عەبدوڵڵا موهتەدی لە پۆستی سکرتێری حزبدا، پەیوەندی بەم کۆنگرەیە و باسەکانیەوە و پێوەندی بە چونی بۆ دەرەوەی وڵات نییە و هەڵدەگەرێتەوە بۆ پلینۆمێکی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێران کە دوو ساڵ پێش ئەوە لە شوێنێك نزیك شاری پاریس بەرێوە چوو.

ئەو کات پلینۆم شێوەی دابەشکردنی کاری لە ناوخۆی کۆمیتەی ناوەندیدا گۆڕی و لەو پلینۆمەدا بوو کە بڕیار درا لە جیاتی پۆستی سکرتێری گشتی حزب، تەنیا دەبیرێکی کۆمیتەی ناوندی حزبمان هەبێ. مەنسووری حیکمەت ئەو کات لایوابوو کە ئەو پۆستە لە ژێر ئەو ناوەدا تەشریفاتییە، و بۆ حزبی ئێمە پێویست نییە. پێویستە ئیدئالیزەی نەکەینەوە وگۆڕینی لە هەر کاتێك دا ئاسان بێ. ئەو رای وابوو کە ئەگەر بە هۆی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەلایەتی کۆمەڵە لە کوردستان لەو کاتدا ئەو شێوەیە لە دابەشکردنی کارمان بۆ بەرێوە ناچێ پێویست ناکات لەم بابەتەوە لاسایی کۆمەڵە بکەینەوە. لەو کاتەوەش، پۆستی دەبیری کۆمیتەی ناوەندی حزب نێو بە نێو دەدرا بەم یا بەو ئەندامی کۆمیتەکە.

چوونە دەرەوەی کاك عەبدوڵلاش هەڵدەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٤)، کە بە پێی بڕیاری مەکتەبی سیاسی حزب، هاتبووینە سەر ئەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیست لە دەرەوەی وڵات مۆستەقەر بێ. سەرەتا شۆعەیب زەکەریایی و حەمید تەقواییمان نارد و بە دوای ئەوان عەبدوڵلا موهتەدی و مەنسووری حیکمەت چوون.

**موهتەدی رۆڵی سەرەکی بوو لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیست**

***کاك عەبدوڵڵا پێیوایە ئەوە مەنسوری حیکمەت بوە رۆڵی هەبوە لەوەی کە تۆ ببی بەسکرتێری کۆمەڵە، چونکە پێیوایە تۆ زۆر دۆستی مەنسوری حیکمەت بوی، بە پێچەوانەوە کاك عەبدوڵلا لەگەڵ زۆربەی رەئیەکانی مەنسوری حیکمەت نەبووە، هەر ئەوەیە مەنسور ئیسراریکردوە کە تۆ لەو کاتەدا سکرتێری کۆمەڵە بی و کاك عەبدوڵلاش سکرتێری حزبی کۆمۆنیست بێ، مەبەستی لەوەیە ئێوە ویستوتانە(عەبدوڵلای موهتەدی) دورخەنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك عەبدوڵڵا دەوری سەرەکی بوو لە پێکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، ناسۆی روونی بۆ ئەو حزبە دەدیت. بێگومانەم وەرگرتنی پۆستی سکرتێری حزبی پێخۆشبوو هەم ئەوکات بە لایەوە پۆستێکی گرنگتر بوو. لێدوانەکانی ئەو کاتی کاك عەبدوڵلا لەگۆڤارەکاندا، لە سوخەنرانییەکانیدا، تەنانەت لە وتووێژێکدا لە چەند کەناڵی تەلەفزیۆنی ئەورووپاییەوە بڵاو بووەوە، هەر ئەو راستییە نیشاندەدا. ئەوکات بڕیاردرا کە رێبەرایەتی کۆمەڵە لە کوردستان موستەقەر بێ و رێبەرایەتی حزب لەدەرەوەی وڵات. هاوکات

لەگەڵئەو بڕیارە کە بە کۆی دەنگ پەسەند کراوە، من لە پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەدا، وەکو سکرتێری یەکەمی کۆمەڵە هەڵبژێردراوم.

***بەڵام دەقیقەن رەئی عەبدوڵڵای موهتەدی ئەمەیە، دەڵێ مەنسورو بریمی عەلی زادە بوون بەکوتلەیەك بۆ دژایەتی من تاوەکو ئامانجەکانی خۆیان تاقیبکەن لەناوکۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیست، وەڵامی ئەو ئەوەیە "عەمەلەن وابوو، پێانخۆش بوو دەستی من لە کوردستانو کۆمەڵە کورت بکەنەوە، بۆ ئەو کارەتانکرد دژی موهتەدی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەمجۆرە لێدوانە لەگەڵسوننەت و پرنسیپەکانی ئەوکاتی ناو جەرەیانی ئێمە گەلێك نامۆیە. غەدرێکە کە لە رابوردویەکی پاکی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیست دەکرێ. بڕیارێك بە دەنگی ئازادانەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیدراوە. ئەوکات نەك هەر کێشە لەسەر ئەم پۆست و ئەو پۆست نەبوو، بەڵکو لە پەیوەندییەکی هاوڕێیانەدا هەرکەس پاڵ دەستییەکەی خۆی پێ توانائر بوو بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرەوەتر. دەبوایە گەلێك هەوڵتدابایە تا کەسێك رازیبکەی پۆستێکی سەرەوە وەربگرێ. ئەوە بەشێکە لە ئەفرەتێك کە کاك عەبدوڵا ئەمڕۆ لە ڕابوردووی خۆی دەیکات.

ئەوەی کە کاك عەبدوڵڵا باسیدەکات فەرهەنگی ئێمە نەبوو، کاك عەبدوڵڵا هیچ کات نەیویستووە سکرتێری حزبی کۆمۆنیست نەبێو ببێتە سکرتێری کۆمەڵە و بە داخەوە کاك عەبدوڵڵا لەم ساڵانەی دواییدا، عادەتیگردووە کە بەم فەرهەنگە بدوێ. ئەوکات وا نەبوو .کێشەکان و ئەمایۆلی کاك عەبدوڵڵا بۆ وەرگرتنەوەی پۆستی سکرتێری کۆمەڵە هەڵدەگەرێتەوە بۆدەورەی دەستپێکردنی بەحسەکانی کۆمۆنیزمی کاریگەری. ئەوکات کە کاك عەبدوڵڵا لەگەڵ ئەو رەوتە بوو، کۆمیتەی رەهبەری ئەوکاتی کۆمەڵە بۆ ئەوەی کێشەکان زۆر قوڵ نەبنەوە و مەجال بۆ هیچ جیابوونەوەیەك پەیدا نەبێ، لە رێگەی منەوە پێشنیاری ئەوەی بەعەبدوڵڵا موهتەدی کرد کە ببێ بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەو پێمگوت کە ئەمایۆلی ئەوە هەیە کە لە یەکەم پلینۆمیشدا، وەکوو سکرتێری یەکەم دیاری بکرێی.

**موهتەدی، نەیویستووە ببێتە سکرتێری کۆمەڵە**

***ئێوە پێشنیارتان پێکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ من ئەو پێشنیارەم پێ کرد و هەڵبەت ئەو، قبوڵی نەکرد، چونکە پێموایە، ئەو لای وابوو گڵۆڵەی کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە لە لێژییە و ئەم پێشنیارە بۆ ئەوەیە کە خۆی بگرێتەوە. ئەگەر کاك عەبدوڵڵا لە بیری نەمابێ دەتوانم تەنانەت شوێنی پێشنیارەکە و باقی قسەکانیش کە کردمان، بیری بخەمەوە. ئەوە هەڵدەگەرێتەوە بۆ بەهاری ساڵی(١٩٨٩).

**موهتەدی، لەگەڵ مەنسوری حیکمەت گەوتبوو**

*** مەیلێك هەبوو بۆ ئینشعاب ئەو کاتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، ئەو مەترسییە هەبوو. کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە ئەوکات لای وابوو کە بە چوونی عەبدوڵڵا موهتەدی لەگەڵ رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری، کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەش دابەش دەبێ و کۆمەڵەش دوو لەت دەبێ.

***ئێوە نەترسان لەگەڵ مەنسوری حیکمەت بڕوا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە مەترسی واوەتر بوو، ئەو لەگەڵ رەوتەکەی ئەوان کەوتبوو، بەڵام ئینشعاب روویندەدابوو، ئێمە هەوڵماندەدا کارێک بکەین کەمتەگەر مەنسوری حیکمەت و هاوفیکرانی جیابوونەوە، کۆمەڵە نەبێ بە دوو، بوونی عەبدوڵڵا موهتەدی لەگەڵیانەوان، بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە کۆمەڵێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە، بە دەوروبەری ئەوەوە بوون، ئەو مەترسییەی زیاتر دەکرد.

***ئەی بۆ کاتێ کەلە پلینۆمی بیستەمی کۆمیتەی ناوەندی (١٩٩١) جەماعەتی مەنسوری حیکمەت رانەگەیەنن کە لەگەڵ کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیست نامێنن و حزبێکی تر دروست ئەکەن.( عەبدوڵڵا موهتەدی) ئەمێنێتەوە لەناو کۆمەڵەدا، تۆ و کاک عەبدوڵڵا چەند لە هاورێیان ئەمێننەوەو باقییەکەی لەگەڵ مەنسوری حیکمەت ئەرۆن کاک عەبدوڵڵا بۆ نەرۆیشت ئەو کاتە ئەگەر وابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کاتە، لە ناو رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاریدا لە نێوان عەبدوڵڵا مۆهتەدی و مەنسووری حیکمەت کێشەیەکی تازە دەستی پێکردبوو، ئەوان ئیتر عەبدوڵڵا مۆهتەدییان وەکوو کەسێکی لە خۆیان نزیک چاو لێنەدەکرد.

***لەسەر چی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوو هەڵسەنگاندنی جیاوازیان لەسەر راپەرینی کوردستانی عیراق و رووداوەکانی دوای شەڕی کوەیت هەبوو. بە کردەوە لە ناو خۆیاندا دەورێکی گرینگیان بۆ کاک عەبدوڵڵا دانەدەنا.

**موهتەدی و عەلیزادە دژی مەنسوری حیکمەت یەکدەگرن**

*** تۆ بۆ نەرۆیشتی لەگەڵ مەنسوری حیکمەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای کۆتایی شەڕی ئێران و عیراق لەسەر ئەو کارانەی کە دەبێ وەکوو کۆمەڵە بەرانبەر بەو هەلومەرجە نوێیە بیکەین لەگەڵ مەنسوری حیکمەت ئیختلافمان هەبوو، دوو بریارنامەی جیاوازمان لەسەر ئەو مەسەلەیە دابوو، یەکیان لە مەکتەبی سیاسی حزبدا و یەکیان لە کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵەدا. دواجاریش کەراپەرینی کوردستانی عیراق روویدا و بە شوێنیدا کۆرەو هات هەر هەڵسەنگاندن و تاکتیکی جیاوازمان هەبوو. لەم دەورەیەدا عەبدوڵڵا موهتەدی و لایەنی ئێمە لە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەدا لێک نزیکبووینەوە و کەوتینە بەرانبەری مەنسووری حیکمەت و هاوبیرانی.

***تۆ لەگەڵ ئەو بۆچونانەی کاک عەبدوڵڵا بوی سەبارەت بەوەی کە مەنسوری حیکمەت راپەرین بەهەڵچونێکی کاتی ناو ئەبا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من و کاک عەبدوڵڵا لەسەر ئەم مەسەلەیە رەئیمان وەکو یەک وابوو.

***باشە من ئەمەویٚ ئەوەت لێبپرسم، ئێوە هەر خۆتان مەنسوری حیکمەتتان هێنا کردتانە کەسایەتییەکی بەهێزو خاوەنی تیۆرو تەرحی تازە سەبارەت بە کۆمۆنیزم، مارکسیزم و تاوایکرد هەیمەنەی کردبەسەر کۆمەڵەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو خوێندنەوە بۆ مێژووی کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیستی ئێران دروست نییە. نزیکبوونەوەی ئەو بەشە لە حەرەکەتی کۆمۆنیستی ئێران کە مەنسور حیکمەت تێیدا بوو، پێویستیەک بوو کە ئێمە لە کاتی خۆیدا وەڵاممان پێدابووە. مەنسووری حیکمەت خۆی بەئیعتباری خۆی کەسایەتیێکی دیاری ناو بزووتنەوەی چەپی ئێرانی بوو. لە ناو ئێمەشدا بە هۆی بیروبۆچوونەکانییەوە و بە هۆی پێداگری لەسەر خەت و رێبازێک کە هەی بوو، نفوزی پەیدا کردبوو، کاتێکیش ئەو رێبازەی وەکو هەر ئینسانێکی سیاسی دیکە گۆڕانی بەسەردا هات، رێگای خۆی جیا کردەوە کە ئەوەش لە جێگەی خۆیدا کەڵێک ئاساییە.

***هەر ئەوکاتە کە تۆ دەبیتە سکرتێری کۆمەڵە، بۆچونی هەندێ برادەران هەبوو دژی تۆ نارەزاییەك هەبووە سەبارەت بەئیدارەدانی کۆمەڵەو سەبارەت بەوەی کەتۆ دەبیر ئەوەڵی کۆمەڵە بی، ئەو نارەزاییانە چیبون لەسەر تۆ؟ بەرامبەر بە تۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە چ دەورەیەکدا؟

***لەدەورانی کۆنگرەی شەشەمدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە کۆنگرەی (٦)دا من هەموو دەنگەکانم بە دەستهێنا، ئەوە (٦) مانگ دوای کۆنگرەی (٦) بوو کە لەناو ژمارەیەك لەکادێرەکانی کۆمەڵەدا کە لایەنگری رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری بوون، ئەو جۆرە مۆخالەفەت و نارەزایەتییانەی کە باسیدەکەن، دەستیپێکردبوو.

**موهتەدی، پەلەی بوو لەدروستکردنی حزبی کۆمۆنیست**

*** کاك عەبدوڵڵای موهتەدی یەکێك بووە لەبنیات نەرانی حزبی کۆمۆنیست و راکێشەرانی مەنسوری حیکمەت و گروپی سەهەند بۆ ناو کۆمەڵە. بەڵام ئەو لەوبارەیەوە پێیوایە کە دروستکردنی حزبی کۆمۆنیست لەوکاتەیا زوو بوو، پێویست بوو دروست بوونی حزبی کۆمۆنیست لەناو کۆنگرەی کۆمەڵەدا بڕیاری لەسەر بدرێ، بەڵام پێیوایە ئەمە رەئی سەید برایم و کۆمەڵێك لەبرادەران بوە کە رایانکێشاوە بەلای خۆیانا تا، تا زووە کاربکەن بۆ دروستکردنی حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك عەبدوڵڵا ئەوکات رەئی وابوو کە پێویستە لە پێکهێنانی حزبدا پەلەبکرێ، خۆی ئەندامی کۆمیتەی ئەداروکی کۆنگرەی دامەزرێنەر بوو. تەنانەت ئەوکات لە ئامیلکەیەکی ناوخۆییدا بابەتێکی نووسی کە بە ناوی "شێرکۆ" ئیمزایکردووە و تێیدا باس لەوە دەکات کە پێویست ناکات زۆر خۆمان سەرقاڵی "بەرنامەی حزب " بکەین، بەڵکو بە بۆچوونی ئەو رێککەوتن لەسەر پەیڕەوی ناوخۆ کافیە و ئاڵقەی سەرەکی بۆ پێکهێنانی حزبی بە گەیشتن بە "پەیڕەوی ناوخۆ" واتە ئەساسنامە دەزانێ. بەرانبەر بەو بۆچوونەی ئەو، مەنسووری حیکمەت لای وابوو کە نەك هەر رێککەوتن لەسەر بەرنامە زەروورییەکان بەڵکو دەبێ شێوەی کاریشمان وەکو یەك وابێ. ئەو بۆچوونانەی خۆی لە وتارەکانی لە ژێر ناوی "سبك کار"دا فورموڵە کردووە.

کاك عەبدوڵڵا لەسەر چەند خاڵێکی بەرنامەیی نارۆشنی هەبوو، بەڵام زۆر زوو لەسەر ئەمانەش ساغبۆوە. ئەو گەلێك زیاتر لە من و لە هەر هاورێ یەکی دیکەمان لەساغکردنەوەی رێزەکانی کۆمەڵە بۆ پەیوەستبوون بە حزبی کۆمۆنیست دەوری بینی. من هیچ رەخنەیەکم بۆ ئەو هەوڵانەی ئەو کاتی لەسەری نییە، بەڵام پێویستە مێژووی واقعی چۆن بووە، باسبکرێ. چونکە بۆ هەمووی ئەمانە بە دەنگ و بە نوسراوە بەڵگە هەیە.

***کاك عەبدوڵڵا پێیوابوو ئەو بۆچونەی کەلە کۆنگرەی هەشتدا دەری ئەبڕێ سەبارەت بەمنێوە، هەر ئەو بۆچونانەبووە کەلە کۆنگرەی شەش هەیبوە بەڵام قسەی نەکردووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** خۆ من غەیبم نییە، کاتی خۆی باسی نەکردبێ من چۆن زانیبێتم؟.

***مەبەستت ئەوەیە بیخاتە بواری واقیعیەوە یان موناقەشەی بکا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەندەی لە بیرم بێ لە کۆنگرەی (٨)ی کۆمەڵەشدا، باسێکی هەمە لایەنە و جیدی لەم بابەتەوە نەکردووە. رەخنەی لە یەك فۆرمولبەندی کە لە ناو راپۆرتێکدا هاتووە گرتووە، کە هەر ئەوکات لە کۆنگرەدا روونکردنەوەماندا و وەکو خراپ لە یەك گەیشتن چاوی لێکرا، و هیچ موناقشەیەکی هەڵنەگیرساند. هیچ بڕیارنامەیەك لەم بابەتەوە پەسەندنەکرا. باسەکەش لەسەر پاراگرافێکی ناو راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بوو کە من پێتانی ئەدەم. (٨) ساڵ دواتر کە کاك عەبدوڵڵا موهتەدی رەوتەکەی خۆی لە

کۆمەڵە جیاکردەوە و دەگەرا بە شوێن پاساوێکی سیاسی بۆ جیابوونەوەکەی، ئەو پاراگرافەشی بیرکەوتەوە و لەسەری نووسی کە منیش لە نامیلکەیەکدا وەڵامم داوەتەوە.

**کۆمەڵە پشتیوانی حزبی دیموکرات- رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ دەکات**

***هەر لەو کۆنگرەی شەش قسە لەسەر جیابوونەوەی باڵی (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ) کراوە، ئێوە چ رەبتتان هەبوو بەو مەسەلەوە یا ئێوە پێیتانخۆشبوو باڵێک لەگەڵ حزبی دیموکرات جیابێتەوە ببێ بە دۆستی ئێوە کە ئەوکاتە ئێوە لەگەڵ دیموکراتدا لە کێشەو ململانێ و تەنانەت لەشەڕی ناوخۆشدا بوون ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەم کۆنگرەیەدا، لەسەر جیابوونەوەی دووباڵی حزبی دیموکرات و لەسەر شەڕی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەش، بریارنامەیەك پەسەند کرا، کە بلاّوکراوەتەوە. ئەو بریارنامەیە مەنسووری حیکمەت و من بە هاوبەشی نووسیمان. سەرەتاکەی من نوسیومە و خاڵە تاکتیکییەکانی مەنسووری حیکمەت نوسیوەتی. لەو بریارنامەدا، ئێمە لێکدانەوەی سیاسی خۆمان لەسەر کێشەکانی ناوخۆی حزبی دیموکرات بەیانکردووە. دیارە بە عەمەلی ئێمە ئەو جیابوونەوەمان پێ ناخۆش نەبوو، چونکە ئێمە و ئەوان بە داخەوە لە حاڵی شەڕدا بووین. لامان وابوو کە لاواز بوونی حزبی دیموکرات یارمەتیدەدات بە کۆتایی هاتنی زووتری شەڕەکە.

***جیابونەوەی رێبەرایەتی شۆڕشگێر لە حزبی دیموکرات دەستی ئێوەی تیابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، جیابونەوەی دەستی ئێمەی تیانەبوو، بەڵام کاتێك ئەوان هاتنە بەرەدەم جیابونەوە ئێمە یارمەتیماندان.

***یارمەتی چییاندان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یارمەتی بە هەموو جۆرێك. بەپارە بە چەك ، بەهەرچی پێویستیان بووبێ.

*** کارێکی باشتانکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من ئەو کارە پێویست بوو، چونکە هەروەك وتم بوو بە هۆی ئەوەی کە شەڕەکەمان زووتر کۆتایی پێبێت.

***پێیتانوانییە لە جیابونەوەی کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان، حزبی دیموکرات ئەو هەڵوێستەی بەرامبەر ئێوە هەبوو یا بەپێچەوانەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو دوو هەلومەرجە جیاواز بوون، پێموا نییە لە هەلومەرجی ئێستادا ئێمە بۆمان هەبێ دەورێکی وەها ببینین بۆ جیابوونەوەی عەبدوڵڵا موهتەدی و هاوبیرانی لە کۆمەڵەش لاموا نییە حزبی دیموکرات دەورێکی گرنگی گێرا بێ. پێموا نییە لەسەرەوە هەوڵیان بۆ ئەو کارە دابێ.

*** شەڕێکی راگەیەنراوەتان، هەیە ئێوە و حزبی دیموکرات بەردەوام ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە شەڕێکمان لە گەڵیان نییە، ئێمە مۆخالیفی سیاسی یەکترین. بە زمانێکی نەرم جار و بار رەخنەیان لێدەگرین.

*** پێتانخۆشبوو دوژمنی دوژمنەکەتان دۆستتان بێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە کێشەمان لەگەڵ هیچ لایەنێك لەسەر ئەساسی وەها بۆچوونێك دانەمەزراندووە. ئەو دەستەواژەیە ناتوانێ بەیانی سیاسەتی ئێمە بکات.

**مەنسوری حیکمەت هەوڵی راگرتنی شەڕی دیموکرات و کۆمەڵە دەدا**

***کاک عەبدوڵڵا ئەڵێ هەر ئەو کاتە من رەئیم وابوو، کە پێویستە ئێمە وەکو کۆمەڵە ئاگر بەست راگەیەنین لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەڵام هەرئەوکاتە سەید برایم و مەنسوری حیکمەت پێیانوابوو ئەوە هەڵگرتنی ئاڵای سپی و خۆ تەسلیمکردنە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رێك بە پێچەوانەیە. بریارنامەی ئاگربەستی یەك لایەنە لەسەر پێداگرتنی مەنسووری حیکمەت و بە دەس خەتی ئەو نوسراوە. پێشتریش بریارنامەی پێشنیاری عەبدوڵڵای موهتەدی لەسەر هەڵسەنگاندنی شەری کۆمەڵە و حزبی دیموکرات لە مەکتەبی سیاسی حزبدا پەسەندنەکرا. بۆچوونی کاك عەبدوڵڵا لەسەر ئەم شەرە هیچ کات نەبوو بە سیاسەتی رەسمی ئێمە. سیاسەتی رەسمی و عەمەلی ئێمە گەلێك مۆنعەتێف تر بوو لەوەی کە کاك عەبدوڵڵا گوتویەتی و نووسیویەتی. هەرچەند دەتوانم بەراشکاوی بڵێم بەرپرسایەتی شەرِی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات، نوسراوەکانی کاك عەبدوڵڵاشی لەگەڵ بێت، هەر لەسەر شانی حزبی دیموکرات بوو.

***کاک عەبدوڵڵا پێیوایە ئەم بۆچوونەی کە من بە تۆم وت، یەکجارە باس ئەکرێ و کۆمەڵێ لەهاورێیانی خۆتان ئەزانن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستا مەسلەحەتی سیاسی کاك عەبدوڵڵای موهتەدی وا هەڵدەگرێ کە ئەو قسەیە بکات. ئەو پەیوەندی بە مێژووەوە نییە. ئەوە هەڵگەراندنەوەی مێژووە لە پێناوی بەرژەوەندی ئەمرۆدا.

**قاسملۆ ناهێڵێ شەرِی دیموکرات- کۆمەڵە بوەستێت**

***چەند لەبرادەران پێیانوابوو کە رۆڵی شەهید (د. قاسملۆ) وە رۆڵێکی نێگەتیڤ بوو لەشەرِی ناوخۆ، پێی وابوو پێویستە شەرِی سەرتاسەری بکرێ لەگەڵ کۆمەڵەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەداخەوە دکتۆر قاسملۆ یەکێك لەو کەسانە بوو کە نەیدەهێشت رێککەوتن نامەی ئاشتی لە نێوانماندا ئیمزا بکرێت. کاتێك کە بە نێوبژیوانی (٦) حزبو جەرەیانی سیاسی کورد و ئێرانی نزیکبووینەوە لە رێککەوتن نامەیەك لەگەڵ سەرکردایەتی حزبی دیموکرات، دکتۆر قاسملۆ کە ئەوکات لە دەرەوەی وڵات بوو بە پەلە پەیامێك دەنێرێ بۆ مەکتەبی سیاسی خۆیان و داوا دەکات کە دەستڕابگرن تا خۆی دەگەرێتەوە. کە خۆی گەراوە گەڵاڵەی رێککەوتن نامەکەی هەڵوەشاندەوە و شەرِ درێژەی پەیدا کرد. حزبی دیموکرات دیسانیش لەسەر پێشنیارەکانی دژی دیموکراتیکی خۆی بۆ ئاشتی کە هەر لەسەرەتاوە بە وەسیلەی دکتۆر قاسملو فۆرموڵە کرابوو پێی داگرت.

***ئەمەوێ پێت بڵێم ئەو هەموو خەڵکەتان بە کوشتدا بۆ؟ کۆمەڵێ خەڵکو پێشمەرگەی ئازاو کۆمەڵێ خەڵکی شۆرِشگێر لەوشەرِەدا بەکوشتدران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مێژوو و بەڵگەنامەکان ئەو راستییەمان پێدەڵێن، کە کۆمەڵە هۆکاری هەڵگیرساندنی شەرِ لەگەڵ حزبی دیموکرات نەبوو. پاوانخوازی حزبی دیمۆکرات و ئەوەی کە خۆی بە سەرکردەی بێ بێنەوبەرەی هەر خەباتێك لە کوردستان دەزانی و ئەو بۆچوونە بۆ ساڵەها چوو بووە ناخی سەرکردایەتییەکەیانەوە، لە بنەرەتدا هۆکاری هەڵگیرساندنی شەرِ بوو. ئەوان تەحەمولی بیستنی رەخنەی سیاسیشیان نەبوو. ئەوان بە راشکاوی بە ئێمەیان دەگوت: "پێشمەرگەکانی ئێمە بێ سەوادن و بەم جۆرە رەخنانەی ئێوە دەر هەڵدەبن و کاردانەوەیان دەبێ" ئەوە وتەی یەکێك لە رێبەرانیانە کە خۆم لێم بیستووە. کە وایە ئێمە شەرِمان بە حزبی دیموکرات نەفرۆشتووە و کەسمان بە کوشت نەداوە، شەرِ بەری دەرگای پێگرتووین

و پارێزگاریمان له خۆمان و له خەباتەکەمانکردووه.

***لەو ماوەیەدا بەرەبەرە پەیوەندییەکانی نێوان ئێوەو ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر دەچێتە پێش، چەندین بەیاننامەی هاوبەشتان لەوکاتە دەرکردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هاوکاریکردن لەگەڵحزبی دیموکرات هەر لەسەرەتای ڕووخانی ڕژێمی شاوە هەمیشە لە دەستووری کاری ئێمەدا بووە و لامانوابووە کە ئێمە و ئەوان دەتوانین بەرانبەر بە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی هەڵوێستی وەکوو یەك یان لە یەك نزیکمان هەبێ و ڕێگا نەدەین کەلێنێك پێك بێت کە ئەو ڕژێمە بتوانێ کەلکی لێوەربگرێ. پێکهێنانی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد لە ساڵەکانی (١٩٨٠ و ١٩٨١)یەکێك لەو بوارانە بوو. کاتێك ئەو جیابوونەوە لە حزبی دیموکراتدا ڕوویدا ئێمە لەگەڵ باڵی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر چوینە سەر ئەو پرنسیپانەی کە پێش شەڕ بوومان بۆ هاوکاریکردن.

*** ئەو چوونە پێشە لەسەر ئاستی پەیوەندییەکی سیاسی ئەخلاقی بوو یان تاکتیکانەبوو کە ئێوە دژی دیموکرات نەتانکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هاوکاریکردنێکی ڕاستگۆیانە لەسەر ئەساسی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستان و پرنسیپە جێکەوتووەکانی خۆمان بوو. کاتێکیش لەگەڵ هەردوو باڵەکەی حزبی دیموکرات پەیوەندییەکانمان ئاسایی کرانەوە، ئەو هاوکارییە سیاسەتی ڕەسمی ئێمە لەگەڵ هەردووك لایەنیان بوو.

**هەوڵماندا شەڕی یەکێتی و پارتی و (pkk) ڕابگرین**

***ساڵی (١٩٩٤) کە شەڕی نێوان یەکێتیو پارتی دەست پێدەکات،(کۆمەڵە و حزبی دیموکرات- ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر) وەفدێکتان نارد بۆ لای مەکتەبی سیاسی یەکێتیو پارتی، بۆچی لەگەڵ حزبی دیموکرات نەچوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە خوازیاری کۆتایی هاتنی دەست بەجێی شەڕی ناوخۆیی بووین و لە هەر دەرفەتێك بۆ ئەوەی بتوانین کاریگەرییەکمان لەو جیهەتەدا هەبێ، کەلکمان وەردەگرت. ئەوکات ئەو وەفدەمان بەوجۆر بوو، بە مانای ئەوە نییە کە ئامادە نەبووین لەگەڵ باڵەکەی دیکەی حزبی دیموکراتیش بە هاوبەشی کارێکی وا بکەین. بۆ نموونە کاتێك شەڕی یەکێتی و پارتی لەگەڵ (pkk) بوو، ئێمە لەگەڵ باڵەکەی دیکەی حزبی دیموکرات، هەوڵماندا کارێکی هاوبەش بکەین.

***مەترسی ئەو شەڕە چیبوو بۆ ئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەوانەیە مەترسیەکی ڕاستەوخۆی بۆ سەر ئێمە نەبووبێ، هەرچەند ئاور کە هەڵگیرسا پریشکی بۆ ئێرە و ئەوێش دەچێ. بەڵام ئێمە خۆمان بەرانبەر بە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کورد لە کوردستانی عێراقیش بە بەرپرس دەزانی و ئەو شەڕە بە پێچەوانەی ویست و بەرژەوەندی ئەو خەڵکە بوو.

**ئیدارەی هەولێر و سلێمانی هیچیان نەکرد**

*** لە (١٩٩٦/٤/١٥) (کۆمەڵەو حزبی دیموکرات- ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر) بەیاننامەیەکی هاوبەشتان دەرکردوە ڕاتانگەیاندوە تاساڵی (١٩٩٦) ،(١١٠) پێشمەرگەی ئێرانی لە کوردستان عێراق بەدەست تاقمی ئیتلاعات لەناو ئیدارەی حکومەتی هەرێمدا تیرۆرکراون، ئێوە داواتان لە نووسەران و شاعیران کردوە کە لەوبارەیەوە هاوکاری ئێوە بکەن. ئەو لیستە کۆمەڵێ پێشمەرگەی (ئێوە، ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر، دیموکرات و خەبات) بوون، ئەو لیستە لە چییەوە سەرچاوەی گرت؟ حکومەتی هەرێمی کوردستان لەبەرامبەر ئەو بەیاننامەی ئێوەو**

**رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ لەوبارەیەوە هەڵوێست چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەکوو دەربڕینی هەڵوێستی رەسمی حکومەتی هەرێم، ئیدارەی سلێمانی یان هەولێر کاریگەریان نەکرد. بەڵام یەکێتی نیشتمانی لەشاری سلێمانی و دەوروبەری هەندێک نیجرائیاتی کاریگەری لە دژیانکرد.

***مەبەستت ئیعدامی کۆمەڵێک لەوانەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەهەر شێوەیەک بووبێ سنوورێکی بۆ دانان و ژمارەیەکیان لە ناوچوون.

***لەژێر فشاری ئێوەدا ئەو خەڵکانەی ئیعدام کرد، لەژێرفشاری کۆمەڵەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نامەوێ ناوی بنێم زەخت هێنان، ئێمە داوامانکرد کە رێگە لە جموجۆڵیان لە دژی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە کوردستانی عیراق بگرن.

**خەڵکی سلێمانی کۆمەڵەیان زۆر خۆشدەوێ**

***با، چەندین جار پێشمەرگەی دیموکرات و سەرکردایەتی دیموکرات تیرۆرکران بەڵام کەسی ئیعدام نەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە داوای جیدی ئێمە بوو. خەڵکی شاری سلێمانیەش عەتفێکی زۆریان بەرانبەر بە کۆمەڵە هەبوو. ئەو رووداوانە ویژدانی خەڵکی ئازار دەدا.

**ئێران (١٠٦) پێشمەرگەی کۆمەڵەو دیموکرات تیرۆر دەکات**

***لەو لیستە(١٠٦) کەسییە (٢٢) کەسیان سەر بەرێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بوون (١١) کەسیان سەر بە کۆمەڵەبوون (٤٦) کەسیان سەر بە دیموکرات بوون(١)کەسیان سەربەخەبات بووە(٢٥) کەسیشیان بێ لایەن بوون، مەبەستم لەوەیە، لە نێو ئەو گروپەدا بۆچی کۆمەڵە لەچاو هەردوو دیموکراتەکەدا کەمتر خەڵکی لێ تیرۆرکراو شەهیدکرا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە دەرەجەی یەکەم هەڵدەگەرێتەوە بۆ ئامادەیی و وشیاری خۆمان و رێکوپێکێک کە لە کارەکانماندا پێکمان هێنابوو. رەنگە ئەوەش بێ کە ئێمە دوژمنی خۆمان باشتر ناسیبوو.

***چەندجار پێموایە موشەکبارانی مقەرەکانی ئێوەش کراوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، موشەکی دورهاوێژیان لە مەریوان دامەزراندبوو وەلەوێوە زرگوێزی گەورەیان پێ دەکوتا.

***ئەوە چیبوو، جارێک قسەیەکی وا هەبوو کە کۆماندۆی ئێرانی ویستویانە لەزرگوێز دابەزن، شتی وا هەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەم شێوەیە هەرگیز نەبووە. بەڵام چەندجارێک ماشێنی سپاس پاسداران دەهات تا نزیک عەربەت و لەوێوە شەوانە بە خۆمپارە لەمەقەرەکانی ئێمە لە زرگوێزیان دەدا.

**ئێران ئەنسارو ئیسلام بەهێزدەکات**

***لەسەروبەندی دەستبەکاربوونی(ئەحمەدی نەژاد) ترسی ئەوە هەیە کە مەسەلەی تیرۆر زیادبکات جارێکی تر بەرامبەر بەرێکخراوە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رژێمی کۆماری ئیسلامی بە ئەحمەدی نەژاد و بێ ئەحمەدی نەژادیش هەوڵدەدات بە هەر شێوەیەک کە بۆی بکرێ، زەربە لەئۆپۆزسیۆنی خۆی بدات، تیرۆر و کوشتن یەکێک لەو شێوانەیە. بەڵام

ئەمرۆکە رژێمی ئێران وەکو رابردوو لە کوردستانی عیراق دەستی ئاواڵە نییە. ئەگەریش بیانەوێ، کارێکی وا ئاسان نابێ بۆیان. ئێستا بە زۆری سنوورەکان تۆپباران دەکەن و ئەنساری ئیسلام تەقویەت دەکەن. شێوازی کارەکانیان لە کوردستانی عیراق گۆڕاوە. لە ژێر ناوی کۆمپانیای بازرگانی و بەڵێنداری حوزوری خۆیان چڕتر کردۆتەوە.

**ئێران هەمیشە دەیەوێ من تیرۆر بکات**

---

***تۆ ناترسی ئەو تیرۆرانەی کە بەرامبەر کۆمەڵە دەکرێ، تۆ یەکێک بی لە مەبەستەکان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بێگومان هەمیشە ئەو ئیمکانە هەیە و ئەوان ئەگەر فورسەتی ئاوایان بۆ هەڵکەوێ لە دەستینادەن. بەڵام خۆشبەختانە هاورێیانی ئێمە وریان و بە فیداکارییەوە پارێزگاری لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەکەن.

*** ئەوەندەی لە تیرۆر ئەترسی، ئەوەندە لە روبەروبوونەوەی چەکدارانە ئەترسی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئاساییە کە هەر کام لەوانە، جۆرێک لە مەترسی لە ئینساندا پێك دێنن. بەڵام لاموا نییە تووشی حاڵەتی ترس بووبیم.

**هەوڵی تیرۆرکردنی عەلیزادە پوچەڵدەکرێتەوە**

***جارێك لەرێگای دوکان روبەروی ئەوە بویتەوەو یەکێ لەو تیرۆرستانەشتان کوشت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، بەرپرسێکی ئیتلاعاتی رژێمی ئێران لە نزیک کاروانەکەی ئێمە تێپەر دەبوو، ئەگەری ئەوە هەبوو خەریکی زانیاری کۆکردنەوە بۆ کەمین دانان و کردەوەیەکی تیرۆریستی بێ لەسەر رێگای مەسیرەکەمان. هاورێیانی ئێمە سەیارەکەیان پێراگرت و کاتێك کە ئەو ئامادە نەبوو چەکەکەی تەحویل بدات و پێی لەسەر گاز دانا کە دەربچێ، پێشمەرگەکانی کۆمەڵە تەقەیان لێکرد و کوژرا.

*** دوایی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی تووشی کێشە هاتن و چەند پێشمەرگەی ئێوە دەستگیرکران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ وابوو، (٦) کەسی ئێمە کەوتنە زیندانەوە. ماجەراکەوا بوو کابرا کاتێ هاتە ناو سەقی سیارەکانی ئێمەو داوای ئاسنامەمان لێکرد، بەڵام ئەو دەستی بۆ دەمانچەکەی بردو ویستی بڕواو تەقەمان لێکردو کوژرا.

***دواتر، دوای ئەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رژێمی ئێران زەختێکی زۆری خستبووە سەر یەکێتی نیشتمانییەوە. یەکێتی ئامادەنەبوو تحویلی ئێرانیان بداتەوە دوای ئەوەی کە زیاتر (٤٠) کەس لە محامییەکانی شاری سلێمانی ئامادە بوون بە شێوەی خۆبەخش بەرگری لەو هاورێ یانە بکەن، حکومەتی هەرێم خۆی بڕیاریدا کە ئەو دادگایە نەکرێ. خەڵکی سلێمانیش کە پێشتر زۆر بە تیرۆرەکانی رژێمی ئێران لە ناو شارەکەیانەوە سەخڵەت بوون، بەم بڕیارە خۆشحاڵبوون.

**ئەدهەم بارزانی (ئەندامی پەرلەمانی کوردستان)و بزووتنەوەی ئیسلامی پێشمەرگەی دیموکرات تەسلیم بەئێران دەکەنەوە**

*(١٩٩٤) حزبوڵڵای شۆڕشگێری کورد کە (ئەدهەم بارزانی) سەرۆکایەتی ئەکرد و(ئێستا ئەندامی پەرلەمانی کوردستان)ە دووپەنابەری کوردی ئێرانی تەسلیمکردەوە ، ئێوە لەو بارەیەوە رەئیتان چی بوو ئەوکاتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەم ئەو کاری حزبوڵڵای کورد و هەم کارەکەی بزووتنەوەی ئیسلامی کە چەند پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی تەسلیمی رژێمی ئێران کردەوە، لە لایەن ئێمەوە بە کارێکی نامرۆڤانە راگەیەندرا و مەحکوم کرا.

**ئاگری سوورو پارتی ڕاپەڕین (ئاسک) و (پرک) ئیتلاعات بوون**

***دوو رێکخراوی تر بەناوی(ئاگری سوری کوردستان)و(پارتی راپەرینی کوردستان) هەبوون ئەوانە زۆر دژایەتی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیان دەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەمانە هەمووی دەستکردی ئیتلاعاتی رژێمی ئێران بوون.

***ئەمانزانی ئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، بە باشی ئەمانزانی و دەزگاکانی پێوەندیدارمان لێرەش لێ ئاگادارکردبوو.

***ئەی بۆ چالاکی و هەڵسوورانیان بەردەوام بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە هەڵدەگەرێتەوە بۆ هەلومەرجی ئەوکاتی کوردستان، کە هێشتا سنوورێکی جیدی بۆ چالاکییەکانی ئیتلاعاتی ئێران دانەنرا بوو.

***تا ئێستا چەندین جار پێشمەرگە هاتوە بۆ پێشمەرگایەتی بۆ ناو کۆمەڵە، بەڵام دەرکەوتووە ئەوانە سەر بەئیتلاعات بوون، ئێوە لەوبارەیەوە چ ئیجرائاتێکتان کردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ماوەیەك کە لاموانییە زیاتر لە ساڵێك درێژەی کێشابێ لە زیندان راماننگرتوون و دواجار بەڵێنیمان لێوەرگرتوون کە دەست لەو کارانە هەڵبگرن و رەوانەی ئێرانمان کردوون. نمونەی واش هەبووە کە بە زەمانەت تەحویلی بنەماڵەکانیانمان داونەتەوە.

**کۆمەڵە کەسێك ئیعدام دەکات**

***خەڵکتان ئیعدامکردوە لەو کەسانەی کە هاتون بۆ پێشمەرگایەتی، یان دەرکەوتووە کە ئەوانە بۆکاری تیرۆرو ئیتلاعات هاتون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ماوەی (١٥) ساڵی رابردوودا یەك نمونە بووە کە کەسێکی زۆر جینایەتکار بوو و تاوانی کوشتنی چەندین کەسی لەسەر بوو، بریاری ئێعدامی درا.

***ئەوە دژی مافی مرۆڤ نییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستا بوویە ئەو کارەمان نەدەکرد، ئێمە بە گشتی دژی حوکمی ئێعدامین.

***پاش ئەوەی (عوسمانی فەرمان) و (عوسمانی کیانی) لەسەرجادەی رزگاری ئەکوژرێن، ئێوە فشارتەخەنە سەر یەکێتی نیشتمانی کەپێویستە قاتلەکانیان چۆن دەستنیشانکرد پێویستە ئیعدام بکرێن، لە ژێرفشاری ئێوەدا یەکێتی نیشتمانی چەندکەس ئیعدام ئەکا، یەکەم جاریشە کە حکومەتی هەرێم لەو کاتەدا خەڵکێك بەو لەوبارەیە ئیعدام ئەکات چۆن جۆنی بوو ئەو فشارتە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە داوای ئێعدامی کەسمان نەکردووە. ئێمە وتوومانە تاوانبارانی ئەو جینایەتە بە

سزای عادلانەی خۆیان بگەیەنن. داوامانکردووە پلانەکانی لەمەوبەدواشیان پوچەڵ بکەنەوە.

**کۆمەڵە دوو کەسی تر ئیعدام دەکات**

***ساڵی(١٩٩٢) ئێوە کوڕێك بەناوی(تاهیر بەیگی) کە ویستویەتی بەرپرسێکی ئێوە بکوژێ دەستگیرتەکەن، و دواتر ئیعدامتان کرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کەسەم بیر نایەتەوە، بەڵام ئێمە هەروەك وتم یەکجار ئەو بڕیارەمانداوە.

***نمونەیەکی تـرت بـۆ بێنمـەوە لـە جولای (١٩٩٤) (سـەلامی وەیسی) هـاتوە لـەناو مقـەرەکانی ئێوە بۆمبێك بتەقێنێتەوە، پاش ئەوەی دەستگیری ئەکەن، ئیعدامی ئەکەن؟**

**ئیـبراهیم عـەلیزادە:** ئەوەشـم بـیر نایـە. ئـەوەی کـە بـە رەسمـی بڕیـاری ئێعـدامکردنی لـە لایـەن کۆمیتـەی ناوەندییەوە دەرچوو بێ هەر ئەو یەك نموویە بووە لە(١٥) ساڵی رابردوودا.

*** تائێستا چەند کەستان ئیعدامکردوە بەو بۆنانەوە؟**

**ئیـبراهیم عـەلیزادە:** دەقیقـەن نـازانم خـاڵی هەڵوەشـاندنەوەی سـزای ئێعـدام لـە دوای سـاڵەکانی (٩٠)ەوە هاتووەتە ناو بەرنامەی ئێمەوە. لە ساڵانی پێش ئـەوە و دوای هاتنـە سـەر کاری رژێمی کۆمـاری ئیسلامی چـەند نموونەیـەکی وا هـەبووە کـە کۆمەڵـە بـە پێـی حوکمی دادگا بڕیاری ئێعـدامی بـەڕێوەبردووە. بـەڵام دەزانم کـە ژمارەیان زۆر نەبووە و دواجاریش دەرگردنی حوکمی ئێعدام بە تەواوی رەتکراوەتەوە

***ئێوە دەزگایەکی تایبەتتان هەیە بۆکاری ئەمنییەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ هەمانە .

***بەناوی چییەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** واحیدی تەحقیق.

***هەردەقیقەن ناوەکەی وایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵی.

***کاری کۆکردنەوەی مەعلوماتو کاری ئیتلاعاتیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاری کۆکردنەوەی مەعلوماتە و پوچەڵکردنەوەی ئەو جۆرە پلانانە.

**دەزگای ئێمە وەکو پاراستن و زانیاری نییە**

***هاوشێوەی دەزگای پاراستن و زانیاری پارتییە و یەکێتی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە تەنیا یەك کۆمیتەیە، نە لە خوارەوەی خۆی و نە لە دەوروبـەری خـۆی تەشـکیلاتی نییە. دامەزراوەیێکی ساکارە کە لەرێگای دەزگاکانی دیکەی کۆمەڵەوە ئیش و کارەکانی جێبەجێ دەکات.

***بۆ بۆی دروستناکەن؟ پێیتانوانییە زەرور بێ؟**

**ئیـبراهیم عـەلیزادە:** بەپێویستی نـازانین. بناغـەی کـاری ئێمـە لەسـەر متمانـە بـە ڕێکخراوەکـانی خۆمـان دامـەزراوە. ئەگـەر دامـەزراوەکانی دیکـەی کۆمەڵـە کـاری خۆیـان بـە ڕێکـوپێکی بکـەن پێداویسـتییەکانی ئـەو کۆمیتەیـەش لـەبواری زانیارییـەوە کـەمو کەسرییەکی نـابێ و تـەنیا کـاری ئـەوە دەبـێ کـە هـەڵیان بسـەنگێنێ و جەمع و جۆریان بکات و ئەنتیجەی لێوەربگرێ.

**غوڵام کشاوەرز و سدیق کەمانگەر تیرۆر دەکرێن**

***یەکێکیتر لەو قوربانیانەی دەستی تیرۆر (سدیقی کەمانگەر) ساڵی(١٩٨٩) لەلایەن ئیسکۆرتەکەی خۆیەوە (تۆفیق گرژاڵی) دەکوژرێ، بۆچی ئەو زەربەیەتان خواردو ڕێگریتان نەکرد لەو زەربەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کەسەی ئەو تیرۆرەی کرد پێشمەرگەی پارێزگاری لە کاک سدیق بوو. ئەو کەسە، چەند ساڵ پێشتر بۆ ماوەیەك چوو بۆوە بۆ ئێران و خۆی تەحویلی ڕژێمدابۆوە، دواجار گەڕابۆوە و چەند ساڵێك لە دەوروبەری کۆمەڵە ژیا بوو و بەداخەوە متمانەی هاوڕێیانی ناوچەی سەردەشتی ئێمەی بە دەستهێنابوو و سەرلەنوێ وەرگیرا بووەوە و سەرئەنجام وەکو سەهمیەی ناوچەی سەردەشت بۆ پارێزگاری ناوەندی کۆمەڵە ناردرابوو. ئەو تەجرەبەیە کە بە قیمەتێکی زۆر گران تەواو بوو، بوو بە هۆی ئەوە کە ئەو کەسانەی کەجارێك تەسلیم دەبنەوە بە هاسانی سەر لە نوێ وەرنەگیرێنەوە.

***(غوڵامی کشاوەرز)یش هەر بەوەشێوەیەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تیرۆری هاوڕێ غوڵام کشاوەرز بە شێوەیەکی دیکە بوو. بنەماڵەکەی لە ئێرانەوە هاتبوون بۆ مۆلاقاتی لە شاری "لارناکا" لەوڵاتی قوبروس، هەر لە ئێرانەوە دەزگاکانی جاسوسی ڕژیم ئەو بنەماڵەیان بەهەمان فرۆکە تەعقیب کردبوو و بەم شێوەیە شوێنی مولاقاتەکەیان لە لارناکا دۆزیبووەوە و ئێوارەیەك کە لە قەراخ دەریا خەریکی پیاسەکردن بوون، تیرۆریان کرد.

***تیرۆری (د. قاسملۆوشەرەفکەندیو کازمی رەجەوی و سدیقی کەمانگر) ئەو هەموو تیرۆرە تا ئێستا بۆ رەنیمکی دژی ئێران لە لایەن دەوڵەتانی ئورووپاییەوە دەرنەچووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ دەوڵەتانی ئەورووپا بەرژەوەندی ئابووری لەسەروی هەموو پرنسیپێکدایە. ئێران وڵاتێکی دەوڵەمەند و بازارێکی ئاراەیەك پان وبەرینە کە بەردەوام وەسوەسەیان دەکات و هەر بۆیە چاوپۆشی لێدەکەن. بۆ نمونە نەمسا بە ئاشکرا بکوژەکانی دکتۆر قاسملوی تەسلیمی ئێران کردەوە، تەنیا لەبەرئەوەی زیان بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆی لەو وڵاتە نەگەیەنێ.

**سەعید یەزدان پەنا تیرۆر دەکرێ**

***ساڵی(١٣٧٠) (سەعیدی یەزدان پەنا) ی سکرتێری یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستانی ئێران بەو بۆنەیەوە تیرۆر ئەکرێ، ئێوە لەوبارەیەوە رانگەیانندنێکتان بڵاوکردەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هەمیشە و بە گشتی وەکوو هەڵوێستێکی رووتین ئەو تیرۆرانەمان، مەحکوم کردووە.

***بۆچی هەمیشە سکرتێرو بەرپرسە یەکەمەکان ئامانجی تیرۆرکردنن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆماری ئیسلامی ئەگەر ئەوانی دیکەشی بۆ هەڵکەوێ، دەستیان لێناپارێزێ. بەڵام دیارە زۆرتر بۆ تیرۆری ئەو کەسانە هەوڵدەدات کە کاریگەرییان لە حزبەکەیاندا زۆرتر بێ. لە بیرمە کە سەرەتای ساڵەکانی ئەوەد ئیتلاعاتی ڕژێمی ئێران، هەر لە لایەنگرێکەوە تاپێشمەرگەیەك تا ئەندامێك تا بەرپرسێك، تا ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی، نرخی جۆراوجۆری بۆ تیرۆریان دیاریکردبوو.

***چەندجار ، تائێستا هەوڵی تیرۆرکردنی تۆ دراوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پلان هەبووە کە بووچەڵکراوەتەوە. هیچ هەوڵێکی راستەوخۆ نەبووە.

**هاوڕێکانم زۆر دەمپارێزن**

***زۆر خۆت دەپارێزی لەوە وانییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من خۆم ناپارێزم، بە دەرەجەی یەکەم هاوڕێیانم ئەمپارێزن.

***نازیزترین رەفیقێك هاوڕێیەك لەناو کۆمەڵەدا کە بەهۆی تیرۆرەوە گیانی لەدەستدابێ کێیە بۆ تۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەموویان بۆ من زۆر نازیز بوون، بەڵام بە هۆی نزیکایەتی زۆرم لە کاك سدیق کەمانگەر، تیرۆری ئەو زیاتر کاریکردە سەرم.

***پێتوایە ئەگەر تیرۆرنەکرایە، ئێستا لەگەڵ تۆ بوو یا لەگەڵ کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان دەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کەس ناتوانێ فەرزاومتێکی فەتعی ناوا بکات. بەڵام هەستێکی دەروونی کە سەرچاوەکەی لە ناسینی کاك سدیق دایە پێمدەڵێ کەلەگەڵ لایەنی ئێمە دەبوو.

***کۆمەڵێك هەن کە دەستیان هەبووە لەتیرۆری کۆمەڵەدا پێشمەرگەکانی کۆمەڵەدا ئێستا لەناو ئێران دانەنیش، بۆ هەوڵتان نەداوە ئەوانە تیرۆربکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە راستە کە ئێمە هەوڵمان نەداوە. خەباتی چەکداری ئێمە ریگا و شوێنی جێکەوتووی خۆی هەیە و ئێمە لەگەڵئەو شێوەکارەدا نین.

***ئەگەر کاتێ کوردستانی ئێرانی ئازادبوو ئێوە ئامادەن دادگاییان بکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** قەتعەن دەبێ دادگایی بکرێن و بە سزای شیاوی خۆیان بگەن.

**پاریدەدەرێکی سەیاد شیرزای دۆستی کۆمەڵە بوو**

***ئێستا لە کوردستانی عیراق مۆدێلێك باوە، ئەوانەی کە فایلەکانیان دەرکەوتوە جاشبوون، یان تیرۆریست بوون پیاوی رژێم بوون، بەڵام قسەکە ئەمەیە، فلانـە مەسئول رایسپاردوە، تا ئێستا کارێکی واتانکردوە خەڵکێکی خۆتان بنێرنە ناو ئێرانەوە بۆئەوەی کاری جاسوسیتان بۆبکات و ئامادەن سبەینێش پشتگیری لێبکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هەر کارێك کە کردوومانە قابیلی ئەوە هەیە کە سبەی رۆژ لە حزوری جەماوەری خەڵکدا دیفاعی لێبکەین. بۆ نمونە با هەر ئێستا پێتانبڵێم بۆ ماوەیەك یەکێك لە پاریدەدەرەکانی سەرهەنگ "سەیاد شیرازی" سەرۆکی عەمەلیاتی رۆژئاوای ئێران لە دژی هێزی پێشمەرگە، ئەندامی ئێمە بوو. کاتێکیش ئاشکرا بوو خۆی دەرباز کرد و گەیشتەوە ریزی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە. بوونی ئەو لەو شوێنەدا بوو بە هۆی ئەوە کە زەرەر و زیانی کەمتر لە شەڕەکاندا لە پێشمەرگە بکەوێ.

*** پیاوی رژێم بوو، بەڵام دۆستی ئێوەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کارمەندێکی روکنی دووی ئەرتەشی ئێران بوو و هاورێی ئێمەبوو گیانی سەدان پێشمەرگەی پاراست.

*** پشگیری لە جاشەکان ناکەن سبەێنی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر ئەو کەسانەی هاوکاری رژێم بوون هەرچی دادگا حوکمیان لەسەر بدات، هەر ئەوە دەبێ، بەڵام لە نمونەی وەکوو ئەو هاورێیەی ئێمەدا پێویستە بە بەڵگە و بە روونی لە کاتی خۆیدا واقعیەتەکان بۆ خەڵك روون بکرێتەوە، نەك ئەوەی پاساو بۆ دەربازکردنی ئەم و ئەو لە سزای عادلانە بدۆزرێتەوە.

**کۆنگرەی حەوت و ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە –١٩٩٢**

***سەبارەت بە کۆنگرەی حەوت کە لە تیر مانگی (١٣٧١) واتە لە ئۆگستی (١٩٩٢) بەسترا، ئەو ئاڵوگۆڕانە دیسان چی بوون پاش ئەوەی جەماعەتی (مەنسووری حیکمەت) لە کۆمەڵە ئەچنە دەرەوە ، کۆمەڵە توشی وەزعییەتێکی خراپ هات، بەشێکی زۆر لەکادرەکانی و پێشمەرگەکانی کەوتنە گەڵ مەنسوری حیکمەت ، لە کۆنگرەی حەوت ئەوبۆچونە تازانەی کە هاتنەناو کۆنگرەی و ڕەنی و قەتعنامە سەبارەت بە ڕۆیشتنی مەنسوری حیکمەت وە دواین بڕیارو سپاردەی ئێوە لەو کۆنگرەیە چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گرنگترین مەسئەلە لە کۆنگرەی حەوتدا ئەوە بوو کە کۆتایی بەو پەرژ و بڵاوییە بهێندرێ کە بە شوێن جیا بوونەوەی ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاریدا پێکهاتبوو. پێویست بوو یەکگرتوویەکی نوێ لە ناو ریزەکانی کۆمەڵەدا دابمەزرێتەوە. ئەگەرچی لەم کۆنگرەیەدا هەموو مەسەلەیەکی سیاسی ئەو سەردەم باسی لێکرا و هیچ بۆشاییەك لە بواری سیاسەت و تاکتیك و ستراتیژەوە بەجێ نەما.

بەڵام بەمەشەوە هەر لام وایە ئەم کۆنگرەیە زیاتر کارکردی ناوخۆیی هەبوو. لەو کۆنگرەیەدا دوای ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەڵبژێردراوی کۆنگرەی شەش لەگەڵ ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری ڕۆیشتبوون، کۆمیتەی ناوەندییەکی نوێ هەڵبژێردرا.

***ئەو کۆنگرەیە دوو ساڵ دواکەوت، هۆکاری دواکەوتنەکانی چیبوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە دوای ئەو جیابوونەوەیە گەلێك لاواز ببوو. بۆ بەستنی کۆنگرە پێویستبوو جارێکی دیکە سەرحیسابی تەشکیلاتی ناوەوەی کوردستانمان ببین، پێویستبوو فرسەت بە سەرجەم هاورێیانمان لەناوەوە و دەرەوەی وڵات بدەین کە بیری خۆیانی لێبکەنەوە و بەراشکاوی ڕێگای خۆیان هەڵبژێرن. بەڕێوەبردنی بە پەلەی کۆنگرە لەوانە بوو ئێمە لە توانایەکانی زۆرێك لەو کادیرانەی هاتنەوە ناو ریزەکانی ئێمە بێبەشکات.

***هەستانکرد بەڕۆیشتنی مەنسوری حیکمەت کۆمەڵە بەتەواوی لاوازبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ئەوە زۆر بەرچاو بوو.

***نەتەکرا ڕێگری لەو جیابونەوەیە بکەن‌و نەیەڵن بڕۆن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر هەوڵدرا، بەڵام ئاکامێکی وای نەبوو. ئەساسەن بە هۆی ئەوەی کە ئەوان دوای کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق ئیتر هیچ مەجالێکیان بۆ مانەوە و چالاکی لەو چوارچێوەی ئەو کاتە کە کۆمەڵە تێیدا بوو، نەدەدیت. جگە لەوە سەرەتاکانی ئاڵوگۆڕی فیکریش بەرانبەر بەسەرجەم بنەماکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە مەنسور حیکمەتدا دەرکەوتبوو.

ئەو ئیتر نەك هەر کۆمەڵە بەڵکو حزبی کۆمۆنیستیشی بەو ئامرازە نەدەزانی کە ئامانجەکانی بەرئاوەردە بکات. ئەم جیاوازیانە دواجار و چەند ساڵ دوای جیابوونەوە ئاشکراتر و شەفافتر دەرکەوتن. ڕەنگە ئەگەر لە جیابوونەوەکەدا پەلەیان نەکردبایە، بۆ جەماوەری خەڵك ڕوونتر هۆکارەکانی جیابوونەوەیەکی چارە هەڵنەگر دەر دەکەوت.

**مەنسور دەیویست کادرەکان بچنە ئەورووپا**

***چیبون ئەو فاکتەرانەی پشت(مەنسوری حیکمەت)وایکرد جگە لەوەی زۆربەی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ**

**خۆی بەرێ، کۆمەڵێك کادرو پێشمەرگەی زۆریش بەرێ، ئەو بەحسە ئەزمەرییانە چیبون کە مەنسوری حیکمەت وایکرد ئەو هەموو خەڵکەی لە دەور کۆبێتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کاتە مەنسور حیکمەت لە کەشوهەوایەکدا بوو کە نەیدەویست حزبەکەی حزبێکی گەورە بێت. ئەو پێوابوو کە پێویستە لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە هاوبیرانی خۆی حزبێکی وا دابمەزرێنێ کە هیچ چەشنە مەیل و بۆچوونێکی غەیری ئەوەی کە خۆی باوەڕی پێی بوو، تێدا نەبێ. هەرچەند لام وایە دوای جیابوونەوە ئەو تەسەوورەی مەنسور حیکمەت گۆڕا و بە تایبەت کاتێك کەهەستی بەوەکرد لە کوردستانی عیراق ژمارەیەکی زۆر لە هێزە چەپەکان لایەنگری لێدەکەن، مەیل بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستانیش تێدا بەهێزتر بوو. لێکدانەوەی من لەسەر هۆکارەکانی ئەو جیابوونەوەیە و ناکامەکانی لە وتووێژ و راپۆرتێکی تەشکیلاتیدا بە وردی هاتووە، لام وایە ئەگەر بکرێ هاوپێچی ئەم پرسیار و وەڵامەیکەی بەکەڵك دەبێ. ئەو قسە و باسانەی ئەوان، ناوەرۆکەکەی هەرچی بووبێ وەکوو ئاوازی کەڵەشێری ناوەخت وابوو. کادرەکانی ئێمە تووشی نائومێدی بوون، مەنسوری حیکمەت ئەی ووت "کاتێ حزبی تووده شکستی خوارد کادرەکانی چوونە ئەورووپا، بۆچی پاشەکشەی ئێمەش بەرەو ئورووپا نەبێ؟"، کێ دەڵێ سبەینێ ئێران و عێراق مامڵەمان پێوە ناکەن؟

**شەڕی کوێت و راپەڕین زۆر شتی گۆڕی**

*** قسەکانی (مەنسوری حیکمەت) تاکتیکانەو فریودەرانەبوو بۆ لاوازکردنی ئێوە و کۆمەڵە یان پشتی بەچەند تێور و تەرحی ئەزمەری دەبەست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە جیاوازی ئەزەری ئەو کات دەورێکی گرنگی نەبوو لە جیابوونەوەکەدا، هەر چەند دواجار و وردە وردە و بە تایبەت ئیستا ئەو جیاوازیانە گەلێك کونکرێت و واقیعین. ئەو لای وابوو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان ناخیرییەتی، هەلومەرجێکی واقیعی و عەمەلی کە ئەوکات کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیست تێیدا بوون زیاتر دەوری هەبوو. دژواربوونی باروودۆخەکە وایکرد کە ئەوان پەلەبکەن لە جیابوونەوەیاندا، هەر بەهۆی ئەو دژوارییانەشبوو کە توانیان بەشێکی زۆر لە هێزەکانی ئێمە لەگەڵ خۆیان بەرن. هەڵبەت شەڕی کوەیت و راپەڕینی کوردستانی عیراق گەلێك لە حیسابەکانی گۆڕی. بەڵام ئەوانە کاتێك بوون کە ئیتر جیابوونەوە خەریك بوو دەبوو بە ئەمری واقیع و کار تەواو ببوو.

***بۆچی زۆربەی کۆمیتەی ناوەندی باوەڕی بەو فکرانەی مەنسور هێنا، بۆ ئێوو کاك عەبدوڵڵا و چەند برادەری تر قەناعەتتان بەوبۆچوونانەی ئەوان نەهێنا، یەعنی مەبەستەکەم ئەوەیە ئێوە نەتانویست دەستبەرداری کۆمەڵەنەبن‌و واز لە کۆمەڵەنەهێنن‌و کۆمەڵە نەفەوتێ، یان ئێوە قەناعەتتان بەو تەرحانەی ئەوان نەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەرەتاوە کاك عەبدوڵڵا موهتەدی لە بەرەی ئەواندابوو و بەشێك لەو زەختنە بوو کە کەوتبووە سەر کۆمیتەی رەهبەری ئەوکاتی کۆمەڵە.

**مەنسووری حیکمەت، موهتەدی قبوڵ ناکات**

***یەعنی مەبەستت ئەوەیە لەگەڵ مەنسوری حیکمەت بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ لەگەڵ ئەوان بوو. لە پلێنۆمی شازدەدا کە لە سوید بەرێوە چوو چوار کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لەژێر ئەو فشارانە ئیستعفایاندا، کاك عەبدوڵڵا لەو کەسانە بوو کە

بەیانێکی تێر و تەسەلی لە دژی لایەنی ئێمە خوێندەوە.

کاک عەبدوللا خۆی بەرپرسی پرۆژەیەك بوو کە لە لایەن ئەوانەوە بۆ بردنە دەرەوەی بەشی زۆری کادرەکانی کۆمەڵە دارێژرا بوو. بەڵام ساڵێکی پێنەچوو کە ئەوان کاک عەبدوللاشیان وەخۆ نەگرت و خۆیان لێدوورخستەوە. کەڕاپەڕینی کوردستانی عیراقیش روویدا، هەڵسەنگاندنی جیاوازیان لە نێواندا پەیدا بوو.

**کۆمونیزمی کارگەری، تەنها مارکسیزم بوو**

***یەعنی ئەو فاکتەرە بوو(عەبدوللا موهتەدی) نەچوو لەگەڵ مەنسوری حیکمەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەنسوور حیکمەت خۆی سەرەڕای ئەوەی کە کاک عەبدوللا پێی گوتبوون کە خۆی بە هاوجیهەتی ئەوان دەزانێ، بەڵام هەر متمانەیان پێنەدەکرد و لە راستیدا بە سەرفورسی لە ریزی ئەواندا مابۆوە. بۆچوونی جیاواز لەسەر رووداوەکانی کوردستانی عیراقیش بێگومان یەکێك لە فاکتەرەکان بوو.

***بۆ متمانەیان پێنەدەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** عەبدوللای موهتەدی خۆیشی نەیدەزانی کە هۆکاری ئەو متمانە پێنەکردنە چییە؟ تەنانەت رۆژێك خۆی دەچێت بۆ لای مەنسوور حیکمەت و ئەو پرسیارەی بە ڕاشکاوی لێدەکات. لەو گفتوگۆیەدا مەنسوور حیکمەت(نادر) چەند هۆکارێکی شەخسی و سیاسی بۆ باسدەکات. سەرئەنجام پێیدەڵێت: بۆ ئەوەی کە لە ناو ریزی ئێمەدا جێگا و شوێنی خۆت بە دەستبێنی پێویستە بە نووسین و بە عەلەنی زیاتر لەسەر ئەو خەت و جەهەتەی ئێمە بابەت بنووسی و بڵاوی بکەیەوە. ئەلبەت کاک عەبدوللا ئەوکات شتی لەم بابەتەی نوسیبوو. بەڵام ئەوان لایان وابوو ئەم نوسینانەی زۆر مەحافزەکارانەیە و راشکاوانە نین و کەمن.

***تۆ و کاک عەبدوللای موهتەدی، هەردووکتان لەگەڵ تێزەکانی مارکسیزم بوون و کارتانکردوە، دیفاعتان لە حزبی کۆمۆنیست دەکرد، بەڵام قسە ئەوەیە لەپاش ئەوەی مەنسوری حیکمەت خۆی ساغدەکاتەوەو ئەچێتە دەرەوە. ئێوە قەناعەتتان بە کۆمۆنیزمی کارگەری نەبوو یان بڕواتان بە مارکسیزمو تێزەکانی مارکسیزم مابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمۆنیزمی کرێکاری وەکوو بۆچوونێکی ئەزەری تا ئەوکات کە پێکەوە بووین و باسی لێدەکرا، هیچ شتێك نەبوو غەیری بنەما فیکرییەکانی مارکسیزم و کۆمۆنیزم. جیاوازییەکان کاتێك دەرکەوتن کە ئەم بۆچوونە ئەزەرییانە دەهاتنە مەیدانی سیاسەت و کردەوەدا. چەند ساڵی پێچوو تا روونبۆوە کە کۆمۆنیزمی کرێکاری مەبەستی مەنسور حیکمەت جیاوازی هەیە لەگەڵ بنەماکانی مارکسیزم. لەسەر و بەندی جیابوونەوەدا ئەم جیاوازییانە دیار نەبوو. بۆیە بڕوا بە مارکسیزم و کۆمۆنیزم شتێ بەرامبەر نییە لەگەڵ بڕوا بە بۆچوونەکانی ئەو رەوتەی کە خۆی بە کۆمۆنیزمی کرێکاری پێناسە دەکات.

***ئەوبۆچونە راستی بوو، کە پێیانوابوو بەجیابوونەوەیان لە حزبی کۆمۆنیستو دروستکردنی حزبی کرێکاری یا کۆمۆنیزمی کارگەری ئەتوانن جارێکیتر خزمەتی باشتر بەچینی کرێکار بکەن، گوایا حزبی کۆمۆنیست ئەو ئەرکەی ئەگرتۆتەوە ئەستۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وایان دەگوت و وایاندەویست بەڵام ساڵانی دواتر چینی کرێکار لە کردەوە و کولتووری سیاسی ئەواندا چووە پەراوێزەوە. ئەوان هیچیان نەخستە سەر مارکسیزم، بۆچوونی ئەوان تەکامولی

مارکسیزم نەبوو، کە بێگومان وەکو هەر زانستێکی دیکە پێویستە تەکامۆل بکات. لە تیئوریەکانی ئەواندا پۆپۆلیزم زیندوو بووەتەوە، جەوهەری سیاسەتەکانیان لیبرالیە.

**کۆمۆنیزمی کارگەری دەبنە چەند لەت**

*** مەبەستم ئەوەیە کۆمۆنیزمی کارگەری چیتری نیزافەکرد بۆ چینی کرێکاران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە بواری تەزەرییەوە لە زانستی خەباتی چینایەتی کرێکاران دوورکەوتنەوە و لە بواری کردەوەشدا زیانیان بە رەوتی کۆمۆنیستی گەیاند. ئەوان نەیانتوانی لە ئامانجەکانی دیاریکراوی خۆشیان نزیك بنەوە و هەر بۆیە بوون بە چەند لەت.

*** بۆ نەیانتوانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دەبێ لەخۆیان بپرسی. بەبڕوای من ئەوان لە نێوان بیری چەپ و مارکسیستیدا و بۆچوونی لیبرالیدا نەیانتوانیوە خۆیان بە هیچ بارێکدا ساغ بکەنەوە. ئەوان بەردەوام لە نێوان توندرەوی و موحافزەکاریدا لە هاتوچوون دان. سەرچاوەی توندرەوییەکانیان دەبەنەوە سەر مارکسیزم و بۆ مۆحافزەکارییەکانیان دەچنەوە سەر بنەماکانی لیبرالی لە کردەوەدا.

**حەمیدو رەزاو ئیرەج دوای مەنسور کەوتن**

*** ئەمە قەناعەت بوو بەو تەرح و تێزانەی کە مەنسوری حیکمەت هێنابووی، یان لاساییکردنەوە بوو کە ئیرەجی ئازەرین و رەزای موقەدەم و حەمیدو شەهلا و هەمویان یەکسەر دوای جیابوونەوەی پلینۆمی بیستەم دوای مەنسوری حیکمەت کەوتن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی لە پلێنۆمی بیستەم و لە دەرەوەی پلێنۆم لەگەڵ رەوتی مەنسور حیکمەت چوون، بە راستی باوەریان بە بۆچوونەکانی ئەو هەبوو. مەنسور حیکمەت لە دەورەیەکدا کە ئەوان تووشی بێ هیوایی ببوون، ئاسۆیەکی نوێی بەرەو روو کردبوونەوە. مەنسوور حیکمەت ئەوانی بەو قەناعەتە گەیاندبوو کە لە دوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت و بە دوای بێناکام مانەوەی خەباتی ئەوان لە کوردستان رێگایەکی نوێی گرتووەتە پێش کە وەڵامدەرەوەی هەلومەرجی نوێی جیهان و ناوچەکەیە. من هەرگیز ئەو رەوتە و کردەوەکانیان لەگەڵ ئەوەشدا کە لە گەڵیان نەبووم، بە پیلان هەڵناسەنگێنم، ئەوە گەلێك ئاساییە کاتێك کەسانێك هەست بەوە بکەن کە ناتوانن خۆیان لەگەڵ رێبەرایەتی حزبێکی دیاریکراو بگونجێنن، بەشێوەیەکی شارستانییانە لێی جیاببنەوە.

***بەڵام دەرئەنجامی یۆتۆپیا بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، وایە سەراب بوو. لام وایە هۆکاری چەند پارچەبوونیشیان بە دەرەجەی یەکەم هەر ئەو راستییەیە.

***بەڵام ئەوان بۆ خۆیان وانییەو پێیانوایە پێگەو نفوزێکی جەماوەری زۆریان هەیە لەناو ئێران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وانییە، سەرجەم رەوتەکەیان بە هەموو باڵەکانیەوە لە ناو بزووتنەوەی خوێندکارانی ئێراندا تارادەیەکی نە زۆر نفوزیان هەیە لەکوردستانیش بە پێی پێشینەی کادێرەکانیان کە لە کۆمەڵەدابوون و فەعالیەتی ئەو چەند ساڵەی خۆیان دەکرێ وەکو یەکێك لە حزبەکانی ئێستای هەڵسوراو لە کوردستان حیسابیان بۆ بکرێ. هەرچەند دڵنیام کە رەوتەکەی ئەوان لەو ناوچەیە روو لە گەشە نییە.

***باشە لەوسەرو بەندەدا چی وایکرد کە تەنها تۆ و عەبدوڵڵا موهتەدی وەکو دوو شەحسیەتی سیاسی لەناو کۆمەڵەدا بمێننەوە، بە پێچەوانەی ئەوانەی ترەوە هەرچەندە خیلافتان هەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەنیا ئێمە نەبووین، ژمارەیەکی بەرچاو لە کادرەکان و لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ لایەنی ئێمە بوون. سەرەڕای هاودەنگی لەسەر مەسەلە نەزەری و سیاسییەکان دوو خاڵی سەرەکی کە ئەوکات ڕێککەوتن لەسەریان پێویست بوو، ئێمەی یەکدەخست.

یەکیان، پاراستنی هێزی پێشمەرگە و مانەوەی تەشکیلاتی ئاشکرای ئێمە لە کوردستانی عیراق. ئەوی تریشیان، پێویستی درێژەدان بە خەباتی سەراسەری لە چوار چێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا.

*** لەو نامەیەی کە تۆ و عەبدوڵڵای موهتەدی، فاروقی بابەمیری، ئیبراهیمی محەمەدی، حەمەی شافعی نوسیوتانە، وە تۆش ئیمزات لەسەرکردوە، نوسیوتانە، لاوازبوونی حزبی کۆمۆنیست بەزەرەری چینی کرێکارو بە ڕەوتی سۆسیالیستییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوکات وابوو و ئێستاش هەروایە.

***هەردوولاشتان ئەویوجونەتان هەبوو، حزبی کۆمۆنیست سەرەڕای هەموو ڕەخنەیەك دەستکەوتێکی بەنرخە بۆ کرێکاران و بزووتنەوەی کۆمۆنیستی، یەکەم پێم بڵێ ئەو هەموو ڕەخنەیەك مەبەستتان چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ڕەخنە و کەموکوری لە هەر حزبێکدا کە چالاکی سیاسی جیدی هەبێ شتێکی ئاساییە. ئێمەش لە هەموو پلێنۆم و کۆنگرەیەکدا بە چاوێکی ڕەخنەگرانە ڕابوردووی خۆمان لێکداوەتەوە و هەوڵمانداوە چارەیکەین. لەم بەیانیەدا کە باس لە ڕەخنە کراوە مەبەست ئەوەیە کە دەرگاکە کراوە بێ بۆ ئەو هاوڕێیانەی کە لەم یا لەو بواردا ڕەخنەیان لە حزب هەبووبێ. پەیامی ئەم بەیانیە ئەوەیە، هاوڕێیان سەرەڕای هەر ڕەخنەیەکیش کە هەتانبێ ئەو حزبە حزبی خۆتانە و پێویستە لەو قۆناغەی کە تێیکەوتووە دەربازیکەن و بەهێزیکەن. بۆ نموونە گەلێك لەو شێوەکارانەی کە لە یەکساڵ و نیوی پێش جیابوونەوەدا ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەناو ڕیزەکانی ئێمەدا گرتبوویە بەر جێگای ڕەخنە بوون.

لەوانە هەڵسوکەوتی فراکسیۆنی کۆمۆنیزمی کرێکاری و لایەنگرانی لە پلینۆمی شازدە کە پێشتر ئامازەم بۆ کرد. یان بەرنامەی کاری مەکتەبی سیاسی حزب بە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران و عیراق لەکوردستان، یان هەڵوێست بەرانبەر بەڕاپەڕین لە کوردستانی عیراق، ئەمانە هەمووی مێژووی هاوبەشی ئێمە بوون لە ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا کە جێگای ڕەخنەن. ڕەخنەی ورد تریش لە ڕابوردوو کەم نین کە لەوانەیە لە وەها گفتوگۆیەکدا نەگونجێن.

**موهتەدی، بڕوای بەکۆمۆنیزم نەما بوو**

***باشە کە هەردولاتان ئیمزاتانکرد ئێوە ئامادەنین ئەو حزبە بکەنە قوربانی هیچ شتی لەبەرئەوەی ئەوە لە قازانجی کرێکارانایە لەسەر ئەوە ساغبونەوە بۆچی دواتر هەر خۆتان هەر تۆو کاك عەبدوڵڵا تووشی ململانێ و کێشە ئەبن جیابونەوەیەکی تر روئەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کێشانە هەشت، نۆ ساڵ دواتر سەریان هەڵدا. ئەمانەش لە جێگای خۆی سەرچاوەکەیان لە جیاوازی بۆچوون و بەرنامە و ستراتیژی سیاسیدا و لە شێوەکار و هەڵسوکەوتی نادروستی تەشکیلاتیدا بوو، تەنیا بریتی نەبوو لە ململانێی من و عەبدوڵڵا مۆهتەدی، بەڵکوو هەموو حزبی ئێمەی گرتبۆوە. لام وایە کێشەی کاك عەبدوڵڵا پێش ئەوەی کە لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست بێ لەگەڵ کۆمۆنیزم و جیهان بینییەکەی بوو. ئەو لە چوار چێوەی ئەو ڕێبازەدا جێگایەکی شەخسی ئەوتۆی بۆ داهاتووی خۆی

نەدەدیت.

**دەبێ کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بێنەوە سەر ڕێبازی کۆمەڵە**

***ئەم هەموو جیابونەوانە چەند زەرەری بە کۆمەڵە گەیاند؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** باسی زەرەر و زیان ناتوانێ بمانباتە ناو قوڵایی کێشە سیاسییەکانی واقیعی ناو کۆمەڵگا. لە خەباتی سیاسیدا جیاوازی لە بۆچوون و بەرنامە و ستراتیژدا بە شێوەیەکی ئاسایی دێتە گۆڕێ. ئەم جیاوازییانە جاری وا هەیە کە تەنها لە جیابوونەوەی لایەنێك لە لایەنەکەی دیکە چارەسەر دەکرێ. مەسەلە ئەوەیە کە ئەم ڕەوتە شارستانییانە بچێتە بەرەوە، ورە و متمانەی جەماوەری خەڵك دانەبەزێنێ. جیاوازییە سیاسییەکان شەفاف بن، تا کاتێك ئەم جیاوازییانە بۆ جەماوەری خەڵکیش روون نەبنەوە، جیابوونەوەی پێشرەس ڕوونەدا. هەوڵی ڕاستگۆیانە بدرێ بۆ ئەوەی هیچ فرسەتێك بۆ ئیدامەی چالاکی سیاسی هاوبەش لە دەستنەچێت. گەئەوانە هەموو لە بەرچاو بگیرێ، خەڵکی ئەو وڵاتەش بەوە ڕابێن کە بە ڕووداوی جیابوونەوە لە ناو حزبێکدا کارەسات ناقەومێ و ئەوان لە خەباتی عادلانەی خۆیان نابێ دڵسارد بنەوە. خەڵك دەبێ بەوە ڕابێن کە ئەحزاب و فراکسیۆن و گروپە سیاسییەکان نەك هەر لە رووی ئەوەی وا خۆیان سەبارەت بە خۆیان دەیلێن، بەڵکو لە روی کردەوەشیانەوە هەڵبسەنگێنن.

***ئێوە کەی لەگەڵ عەبدوڵڵای موهتەدیو کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشان بەنیازن یەکبگرنەوە، ببنەوەیەك کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ماوەی ئەم چەند ساڵە کە ئەوان لە کۆمەڵە و لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران جیا بوونەوە، هەتا هاتووە جیاوازییە سیاسییەکان زیاتر و شەفافتر بوون. هەر بۆیە ئێستا ئیتر دەبێ ئەم دوو ڕەوتە وەکوو دوو حزبی جیاواز چاویان لێبکرێ. بەڵام هیوادارم و بەش بە حاڵی خۆمان هەوڵی بۆ ئەدەین کە ڕیزی لایەنگران و دڵسۆزان و هەڵسوراوانی کۆمەڵە لە ناو خۆی کۆمەڵگای کوردستان. ئەوانەی خۆیان بە ڕێبازی کۆمەڵە پابەند دەزانن، یەکگرتوو بکەین. لام وایە ڕەوتی ئێمە ئەو ئیستعدادە و ئەو ئیرادەیەی هەیە. ئەوە جیاوازە لەگەڵ مەسەلەی یەکگرتنەوەی ئێمە و ئەوان، مەگەر ئەوان ڕۆژێك لەڕۆژان بێنەوە سەر ڕێبازی کۆمەڵە و بە کردەوەش ئەوە نیشان بدەن.

***دەتەوێ بڵێی کەی ئەوان گەڕانەوە سەر مەیلی مارکسیزم و کۆمۆنیزم ئێوە ئامادەن یەکبگرنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەها حاڵەتێك بەبڕوای من تەنیا لە پەیدا بوونی هەلومەرجێکی شۆڕشگێرانەدا ئیمکانی هەیە و ئەوە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی دەبێ کە لە ئێستاوە قەزاوەتکردن و بڕیاردان لەسەری، ئارادەیەك خەیاڵاوییە.

***کاك عەبدوڵڵاش تەرحێکی هەیە بۆ یەکگرتنەوە لەگەڵ ئێوە، پێیوایە کەی ئێوە لە حزبی کۆمۆنیست هاتنەدەرەوە ئەو ئامادەیە یەکبگرێتەوە لەگەڵتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە وتەیەکی دیپلۆماسییانەیە و پەیوەندی بە مەیلی یەکگرتنەوە نییە، مانای وانییە دەیەوێ، واتا دەبێ ئێمە بەپرۆژەکەی ئەوەوە پەیوەست بین.

***ئێوە هەردوکتان دو پرۆژەی جیاوازتان هەیە گەواتە هەروەك ئێستا هەر جیا ئەبن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستا ئەو جیاییە جێگیر بووە و جیاوازییە سیاسییەکان چەند قۆناغی توند

چوونەتە پێشوە. کوردستان کۆمەڵگایەکی زیندوو و پڕ جۆشو خرۆشە و ئاساییە ئەگەر ئێمە و ئەوان و چەندین حزبی دیکەش تێیدا چالاکییان هەبێ.

***ئەو زوڵمە چییە ئێوە لەئەوانتان کردوە؟ ئەوان ناوی ئەنێن زوڵم؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە نەك هەر هیچ زۆڵێکمان لێنەکردوون، بەڵکو هەوڵمانداوە جیا بوونەوەکە بە شێوەیەکی تەواو هێمنانە و شارستانییانە بەڕێوە بچێ و هەروایش بوو. لە سەدا هەشتای کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەگەڵ ئێمە بوون، کۆمیتەی ناوەندییەکەی لەکۆنگرەیەکی شەرعیدا کە ئەوانیش تێیدا بەشداربوون و رەخنەیەکیان لێی نەبوو، هەڵبژێدرابوون، ئەوان لە کۆمەڵە دەر نەکران بەڵکو بە حەزی خۆیان چوونە دەرەوە.

**موهتەدی زوو بوو بەخاوەنی هەموو ئیمکانیاتێك**

***ئەی بۆ کاك عەبدوڵڵا ئەڵێ حزبی کۆمۆنیست زوڵمی زۆری لەئێمە کردوە، کادرەکانمان دەیانووت دەچینە بەر بەفر، بەڵام ناچینە ناو حزبی کۆمۆنیستەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە ئەگەر قەزاوەتێکی وای کردبێ بە ئینساف نەبووە. لە کاتی جیابوونەوەیاندا ئۆردوگایەك بە بێکێشە بە هەموو کەل و پەلەکانیەوە پێشکەشیانکرا. لایەنگرانیان هەمووی بە چەك و چۆڵ و پێداویستییەکانی ژیانی خۆیانەوە گواستیانەوە بۆ ئۆردوگاکەی ئەوان. ئیمکاناتی هات و چوون بە پێی پێویستی خۆیان و ئیمکاناتی ئێمە بۆ دابینکرا. بڕیاردرا تا ئەوکاتەی کە خۆیان پێویستیانە، تەداروکات و ئیمکاناتی رۆژانەی ژیانیان بۆ دابین بکرێ. بەڵام هەڵبەت ئەوەتان پێبڵێم کە ئەوان زۆر زووتر لەوەیکە خەڵك لەوانە بوو چاوەڕوانی بکەن، بوون بە خاوەنی هەموو ئیمکاناتێك و پێویستیان بە یارمەتی ئێمە نەبوو.

***ئەی ئەوان ئەڵێن ئەسنادو بەڵگەنامەو دۆکۆمێنتەکانیان هەموی حجز کردوە لای خۆیان، ئامان دەنێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە زۆر ئاساییە، خۆ ئەو حزبە هەڵنەوەشاوەتەوە کە کەلوپەلەکانی لە نێوان ئەم و ئەودا دابەش بکرێ. لە ساڵانی رابردوودا گەلێك کەس بە تاك یا بە کۆمەڵ لە حزب چوونە دەرێ، ئایا دەکرێ هەر کام لەوانە تەوەقۆعی ئەوە بکەن بەشی خۆیان لە بەڵگەنامە و ئارشیوی حزب پێبدرێ؟ داواکەی ئەوان مەنتقی نییە. سەرەڕای ئەوە ئێمە بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی رابردووی کۆمەڵە و حزب و لەوانە دەقی سورەت جەلەساتی پلێنۆمی کۆنگرەکانمان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت داناوە، ئەوانیش وەکوو خەڵکی دیکە دەتوانن بچن ببیبنن.

***باشە بۆ بە هەردولاتان ئەسڵی کۆمەڵە دروست ناکەنەوە( کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) کە پێشتر ئێوە لەسەر ئەو ناوە کارتانکردوەو خۆشەویست بووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مانەوە و ئیدامەکاری حزبی کۆمۆنیستی ئێران و کار کردنی هەم لە چوارچێوەی ستراتێژی ئێمەدایە و هەم کەم ئازارترین و هەڵەترین رێگایەکیشە بۆ ئەوەی خەڵکی کورد بە مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی بگات.

*** بۆ خەڵکی کورد زەرورەتەکەی لە چیدایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە تەنها لە کوردستانەوە رژێمی ئێران ناگۆڕێ، بە بێ گۆڕینی رژێمی ئێران گەیشتنی

خەڵکی کورد بە مافەکانی خۆیان گەلێك دوورتر و دژوارترە.

***ئاخر ئەو پشتیوانیە حزبی کۆمۆنیست ئێران نییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حزبی کۆمۆنیستی ئێران دەرگایەکە بەرەو ئەو ئاسۆیە، دەرگایەکە بەرەو ئەو بزوتنەوەیە، ئێمە نامانەوێ ئەو دەرگایە لە خۆمان داخەین.

**داهاتووی چەپ و سوسیالیست لەئێران روونە**

***دەتوانی ئەوە تەئکیدکەی لە داهاتوی ئێراندا، لە داهاتوی ئاڵۆگۆڕەکانی ئێراندا، ئەو پشتیوانییە بەهۆی حزبی کۆمۆنیستەوەیە لەقەزییەی کوردی دەستەبەر دەبێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من یەکێك لە ئامڕازەکانی ئەوەدەبێ.

***زۆر لاواز نییە ئەو ئەگەرە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** داهاتووی حەرەکەتی چەپ و سۆسیالیست لە ئێراندا روونە، لام وایە نەك هەر لە ئاستی ئێراندا، بەڵکو لە ئاستی جیهانیدا، بووژانەوەیەك بۆ ئەو حەرەکەیە ئەبینەرێ. ئەو لێکدانەوەیە وابێو وانەبێ، لە هەر حاڵێکدا ئێمە لامان وایە کە سۆسیالیزم بەدیلی سەرمایەدارییە و ئێمە نابێ و ناتوانین تەسلیمی نیزامی سەرمایەداری بین و بکەوینە شوێن بەدیلی کۆنەپەرستانە بۆ ئەو نیزامە. ئەگەر ئەمرۆ رەوتی کۆمۆنیستی، لاواز دێتە بەرچاو، بەڵام وەکو ئاورێکی ژێر خۆڵەمێش وایە کە خەریکە با لێی دەدات و بەرە بەرە دەگەشێتەوە.

لەجەرەیانی شۆڕشی (١٩٧٩)ی ئێراندا، حەرەکەی چەپی ئێرانی، گەلێك بەهێز بوو، بەڵام بە هۆی پرژ و بڵاوی و سیاسەتی نادروست نەیتوانی دەوری شایستەی خۆی ببینێ. ئەمرۆکە چەپی ئێران چ لە رووی ئەزموونەوە، چ لە رووی ئەزمەرییەوە، چ لە رووی کارەوە، گەلێك بەهێزترە لەو کاتەی کە پێی نایە ناو شۆڕشی ئێرانەوەوە. هەربۆیە بۆ ئێستاش لام وانییە ئەم ئەگەرە لاوازبێ.

**کۆمەڵە تەرحەکەی مام جەلالی رەتکردوە**

***کاك عەبدوڵڵا ئەڵێ "هەرئەو کاتە کاك برایم خۆی تەرحی ئەوەیکردوە کە مام جەلال بێتەناو مفاوەزاتەکانەوە، بەڵام دوایی تەرحەکانی مام جەلالیشی قبوڵ نەبوە، ئێوە نەدەکرا لەسەرئەوە رێکەون و بەر بەو ئینشعاب و ئینشقاقەبگرن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر تەرحەکەی کە مام جەلال پێشنیاریکرد و دەیویست ئێمە وەکو دوو فراکسیۆن بمێنینەوە، خراپ لە یەك تێگەیشتنێك هاتە گۆرێ. کاتێك مام جەلال تەرحەکەیدا بە ئێمە، ئێمە لە ناو خۆماندا باسمان لێکرد و لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە ئەو تەرحە وەکوو مەبنای گفتوگۆ قبوڵبکەین. ئەوان لە ئێمە وا تێگەیشتن کە ئێمە دەقی تەرحەکەمان پەسەند کردووە. ئێمە دەقی ئەو تەرحەمان رەتکردەوە، لەبەر ئەوەی کە پێمانوابوو ئەگەرچی لەوانەیە چەند مانگێك جیابوونەوەکە دووا بخات، بەڵام دوای ماوەیەك ئەو جیابوونەوەیە لە هەلومەرجێکی خراپتردا بۆ ئێمە، بەسەرماندا دەسەپا.

***چی تەرحێکی تری هەبوو مام جەلال جگە لەو تەرحە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەر ئەو تەرحە بوو. جەوهەری تەرحەکەی مام جەلال ئەوە بوو کە داوای دەکرد ئێمە و ئەوان لە نیوچە بەرەیەکی هاوشێوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا پێکەوە بین.

**موهتەدی لەیەکێتی نزیکترە**

*** ئەی بۆچونێك لەنێو ئێوەدا هەیە، کە یەکێتی لە پشتی ئەو ئینشقاق و ئینشعابەوە هەبووو رۆڵی هەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە ئەوان بە بیروبۆچوون و سیاسەتەوە لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان نزیکن، گومانی تێدا نییە، بەڵام جیابوونەوەکە لەژێر کاریگەری یەکێتی نیشتمانیدا نەبوو، بەڵکو هەڵقوڵاوی کێشەکانی سیاسی و تەشکیلاتی ناوخۆی کۆمەڵە بوو.

**عەلیزادەو موهتەدی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی رووبەڕوو ئەنجامدەدەن**

***سەبارەت بە هەموو ئەو بەحسانەی کە من و تۆ کردمان کاك عەبدوڵلا دەڵی "من ئامادەم لەگەڵ کاك برایمدا لە موناز‌ەرەیەکی تەلەفزیۆنیدا( تۆ) بەڕێوەی بەرە، دانیشم بۆ ساغکردنەوەی هەموو ئەو کێشانە کە خەتای من بووە یاخەتای کاك برایم بووە، ئێمە راستین یان ئەوان، فکرەو ئیدیۆلۆژیای ئێمە واقیعی ترە یان ئەوان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو قسەیە بە تەعارۆفێك دەزانم و پێم جیدی نییە. بەڵام کاتێك ئامادەم ئەو کارە بکەم کە پێشتر بەڵگەنامە سەرەکییەکانی مەربوت بە مێژووی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران بڵاوکردبێتەوە. چونکە تەنیا لەو حاڵەتەدایە کە مۆنازەرەکە نابێت بە قسە بەشەڕدان، بەڵکو پێی لەسەر ئەرزی واقیع دەبێ.

***بڵاوبوونەوەی ئەوبەڵگەنامانە چ سودێکی هەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سوودەکەی ئەوەیەکە کەس ناتوانی لە گفتوگۆی شەفاهیدا، بینەرانی ئەم تەلەفزیۆنە یان ئەم موناز‌ەرەیە چەواشە بکات، مومیکن نابێ بۆی بکرێت.

***ئەو چەواشە کارییانە چین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گۆرینی رووی راستییەکان، ئاوەژوو نیشاندانی مێژووی ئەم جەرەیانە، دەرباز کردنی خۆ لەبەرپرسایەتی، پاساو هێنانەوە بۆ ئەم یا ئەو هەڵە و گەلێك شتی دیکەی لەم چەشنە.

**کۆنگرەی هەشتەم، ڕێکخستنەوەی بەشی تەشکیلاتی نهێنی -١٩٩٥- کوردستانی عیراق**

*** کۆنگرەی هەشتی کۆمەڵە ڕۆژانی (٢٨ تا ٣٠) تیر مانگی (١٣٧٤) واتە لە (١٧-٢١)ی ژوئەنی (١٩٩٥) لە کوردستانی عیراق بەستراوە، هەلومەرجی ئەو کاتەی کۆنگرە چۆن بەڕێوەچوو؟ کۆنگرە تاچەند جیاوازبوو لە کۆنگرەکانی تر؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سەرجەم کۆنگرەکانی، حەوت و هەشت لەکەش‌وهەوایەکی کەم و زۆر وەکو یەکدا بەڕێوە چوون، ئەویش بریتی بوولەهەوڵدانی کۆمەڵە بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی هەموو ئەو ئۆرگان و میکانیزمە تەشکیلاتیانەی کە بە بۆنەی جیابوونەوەی ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکارییەوە تێکچووبوون.

کۆنگرەی حەوت پێشتر بەشێك لەو کارەی کردبوو، تارادەیەك ڕێکوپێکییەکی لانی کەمی پێکهێنابوو. بەڵام لە نێوان کۆنگرەی حەوت و هەشتیشدا هەوڵدەدرا بۆ ئەوەی کە هیچ بۆشاییەکی سیاسی لە هەڵوێست و بۆچوونەکان و لێکدانەوەمان لەسەر هەلومەرجەکە نەمێنێ. بە نیسبەت هەلومەرج سیاسی لە ئێراندا و لە کوردستان کۆنگرەی هەشت لەدەورەیەکدا بەڕێوەدەچێت کە ڕژێمی کۆماری ئیسلامی داوا لە خەڵکی ئێران دەکا دەرفەتی پێبدەن وێرانییەکانی شەڕی (٨) ساڵە قەرەبوو بکاتەوە. ڕەفسەنجانی بە کۆمەڵێك بەڵێنی تازە هاتۆتە سەر کار و ئیدعا دەکات کە دەیەوێت ئابووری ئەو وڵاتە ببوژێنێتەوە. خەڵکی ئێرانیش کە زۆر بە شەڕ و وێرانیەکانی شەڕو کوشت و کوشتار و بێ سەر و سامانی ژیان لە دەورەی شەڕدا سەخڵەت بوون.

لە ڕاستیدا ئەو دەرفەتەیان بە دەوڵەتی ڕەفسەنجانیدا و بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان چ لە کوردستان و چ لە ئاستی سەرانسەری ئێراندا تا ڕادەیەك بێدەنگبوون.لەوکاتەدا بۆ ئێمەش ئەولەویەت بریتی بوو لە بنیاتنانەوەی سەر لە نوێی ڕێکخستنەکانی بەشی نهێنی، گرتنە بەری شێوەکاری دروست و کۆ کردنەوەی ئەزموونەکانی ئەو زەربانەی کە تەشکیلاتی نهێنی ئێمە لەدەورەی شەڕی ئێران و عیراقدا خواردبووی. پێشبینی ئەوەماندەکرد کە ڕژێم بۆ ماوەیەکی زۆرتر دەوام دێنێ و پێویستە ئێمەش خۆمان بۆ کار کردن لە وەها بارودۆخێکدا ئامادە بکەین. لە دەرەوەی وڵاتیش و دوای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆمەڵە لە ڕێگەی تورکیەوە خۆیان گەیاندبووە وڵاتانی ئەورووپایی و کانادا و ئوسترالیا، چووینەوە سۆراغیان و ئەوانەی ئامادەبوون لەگەڵ کۆمەڵە درێژە بەچالاکی بدەن، لەو کۆنگرەیەدا، نوێنەرایەتیکران.

*** لە دوابەدوای کۆنگرە وتووێژێك لەگەڵ تۆ کراوە، لەو وتووێژەدا تۆ ئەڵێیت "ئێمە خەریکی وەگەڕخستنی ڕادیکاڵیزمی کۆمەڵایەتین، ئێمە حزبێکی توندڕەوی چەپ نین، بەڵکو ئێمە ڕەوتێکی سۆسیالیستین" ، مەبەستت لە ڕادیکاڵیزمی کۆمەڵایەتی چییە؟ زۆر کەسیش ئێوە بەچەپێکی توندڕەو ئەناسن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مانای ئەوە بوو کە دروشم و هەڵوێستی ڕادیکاڵ دەبێ لە جەرگەی خەباتی کۆمەڵانی خەڵکدا خۆی نیشانبدات. ئەوە بەس نییە کەئێمە لەسەر ئەم یا ئەو مەسەلە هەڵوێستی ڕادیکاڵمان هەبێ، بەڵکوو دەبێ هەوڵبدەین کە ئەو هەڵوێستەی ئێمە مەقبولیەتێکی کۆمەڵایەتیش پەیدا بکات. بتوانێ ببێ بە هێز لە خەباتی ڕۆژانەی ناو کۆمەڵگادا. مەبەست ئەوە بوو کە ئێمە دەبێ بتوانین، پێشڕەفتی ستراتیژی خۆمان لە ناو خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێشدا، لە ناو ژنانی یەکسانیخوازدا، لە جەرگەی خەباتی شۆڕشگێڕانە لە کوردستاندا ببینین. ئەو بۆچوونە ئەوکاتە بۆیە تەئکید دەکرایەوە چونکە ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاریش گەلێك هەڵوێست و دروشمی هاو چەشنی ئێمەی بەرز کردبووەوە. ئێمە لەو ساڵانەی دوای جیابوونەوەکەدا ئەو جیاوازیەش کە زۆرتر مانای عەمەلی هەبوو، نیشانبدەین. ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری بە شێوەکاری

خۆیان، بە فەرهەنگێك كە بە تایبەت لە یەك ساڵی پێش جیابوونەوەدا لەناو ریزەكانی ئێمەدا رەواجیان دابوو، حەرەكەتی ئێمەیان لەم جیبهەتەدا خاو كردبووەوە.

رەوتی سۆسیالیستی لەناو ئێمەدا دوای ئەو رووداوانە پێویستی بە پێداچوونەوەیەك هەبوو لە مەیدانی كردەوەدا. كۆنگرەی (٨) بە بەشی خۆی هەوڵێدا هەنگاوێك لەم جیبهەتەدا بنێ.

**هەوڵدان بۆ سۆسیالیزم**

***ئەو سۆسیالیستەی كەلەو كاتەشدا تۆ باسكردووە، تا ئەگات بە ئێستاش كام سۆسیالیستەیە؟ ئەو سۆسیالیستەیەكە دەیەوێت عەدالەتی ئیجتماعی دروستكات، یا ئەو سۆسیالیستەیە كە لەیەكێتی سۆڤێت هەبوو، شكستی هێنا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە پێمانوا نەبوو و پێمانوا نییە كە لە یەكێتی سۆڤیتدا هەرگیز نیزامی سۆسیالیستی دامەزرا. بەڵكو پێمانوایە كە چینی كرێكار لەرێگەی شۆرشێكی كرێكارییەوە بە دەسەڵات گەیشت وە ماوەیەكیش لە دەسەڵاتدا ماوە. بەڵام بە هەموو هەوڵێكیش كە دای، بە هۆی گەلێك هۆكاری سیاسی و رێكخراوەیی و هەلومەرجی بابەتی، نەیتوانی سۆسیالیزم دابمەزرێنێ و دواتریش لە ساڵەكانی كۆتایی دەیەی (١٩٢٠)دا نەیتوانی لە دەسەڵاتیشدا بمێنێتەوە. وەكو بەرنامەی كۆمەڵایەتی و بەرنامەی ئابوری ئەوەی كە لەو وڵاتەدا بەرێوەچوو ئارەزوەكان و ئاواتەكانی ناسیۆنالیزمی روس بوو كە بەرێوەچوو، وەكو حزب وەكو دەسەڵاتی سیاسی ئەوەی كە جێی گرتەوە دەسەڵاتی حزب بوو لە جیاتی دەسەڵاتی چینی كرێكار، ناو خۆی حزبیش بۆ ئەنجامی وەها مەبەستێك چەندجار تەسفیەكرا و رێكخرایەوە.

لەروانگەی منەوە سۆسیالیزم تەنیا یەكسانی نییە، بەڵكو لە هەمان كاتدا ریفاه و خۆشگوزەرانیشە. یەكسانییە لە بەهرەمەندی لە ئیمكاناتی فراوان و پێشكەوتووی ژیاندا. بەڵام ئیمكاناتی پێشكەوتووی ژیان چۆن پەیدا دەبێت؟ شۆرشی كرێكاری رووداوێكی كەم و زۆر كورت ماوەیە، بەڵام بەرهەمهێنانی كۆمەڵایەتی كاتی دەوێ و وردە وردە بەرەدەستێنێ. چینی كرێكار وەكوو چینێكی كۆمەڵایەتی خۆی رێكدەخا و دەسەڵاتی دەوڵەتی لەسەرەوە بۆ خوارەوە بە دەستەوە دەگرێت. بەڵام ناتوانێ سۆسیالیزم بە یەك زەربە دابمەزرێنێ. لە روانگەی ئێمەوە ئەوەی كە لە رووسیا بەرێوەچوو سۆسیالیزم نەبوو، بەڵكو دەسەڵاتی سەرمایەداری دەوڵەتی بوو بە سەر ئابووری ئەو وڵاتەدا.

ئاسۆی ئێمە بۆ سۆسیالیزم بریتییە لە گەشەپێدانی ئابووری، گەشەپێدانی كۆمەڵایەتی بە گشتی كە ئیمكانی بەهرەمەندی ئینسانەكان لە رەفاهیاتی ژیان ئامادە دەكات، بەڵام ئەم كارە لە ژێر چاودێری بە سەركردایەتی چینی كرێكار دەكرێت.

***ئەوەی لە دەیەی حەفتاكان تا ئەگا بە سەرەتای دەیەی نەوەدەكان، رەوتی سۆسیالیزم، رەوتی كۆمۆنیزم، لە گەشەیەكی بەرچاوابوو لەسەرتاسەری دنیادا، یا گەرایش و مۆدێلێكی بەرچاوبوو، زۆریەی مەنتیقەی گرتبووە، بەڵام لەگەڵ سەرەتای دەیەی نەوەدەكان و شكستی بلۆكی سۆڤێت و سەركەوتنی باڵی لیبراڵ بەرابەرایەتی ئەمەریكا، پێتوایە گەرایشی چەپ و سۆسیالیستی لەسەرتاسەری دونیادابەرەو لاواز بوون چوو، ئەمەوێ بڵێم ئیسلامی سیاسی یان فەندەمیتاڵیزم بووە بە دیلی سۆسیالیست وە گەشەیەكی بەرچاوی نەكردو سەرتاسەری وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەراست بە تایبەتی بگرێتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشتر ئەوە بڵێم كە پاشەكشەی سۆسیالیزم لە ئاستی كۆمەڵایەتیدا هەڵدەگەرێتەوە

بۆ ساڵەکانی (١٩٢٥ تا ١٩٢٨)لە یەکێتی سۆڤیەت. ئەو ڕەوتەی کە لە ساڵانی دوای دەیەی (٣٠)ی لە ئاستی جیهانیدا لایەنگری لە حزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت دەکرد، یان تەنانەت ئەو ڕەوتەی کە دوای شۆڕشی چین و دوای سەربزێوی ئالبانی و یۆگسلاوی هاتە کایەوە، یان ئەو ئەزموونەی کە لە وڵاتی کوبا بەڕێوەچوو، هیچ کامیان نوێنەرایەتی ڕەوتی سۆسیالیزمی زانستی و ئامانجەکانی چینی کرێکاریان نەدەکرد.

لەراستیدا ئەو پاشەکشەیەی کە ئێوە باسیدەکەن گەلێک پێش ئەوانە دەستیپێکردبوو. سەرمایەداری دەوڵەتی بەرانبەر بەسەرمایەداری بازاری ئازاد ڕیز بەستنێکی سیاسی و سەربازی لە ئاستی دنیادا پێکهێنا بوو کە دەورانی دووردرێژی شەڕی ساردی لێکەوتەوە. بەڵام تەبلیغاتی هەر دوو بەرەی ئەو کێشەیە وایکردبوو کە جیهان سۆسیالیزم هەر بەوە بزانێ کە مەوجوود بوو. دەنگی حزبو ڕەوتی چکۆڵە و رادیکاڵ لە گۆشە و کەناری دونیا لە ژێر هەرا و هوریای ئەو پڕوپاگەندەیەدا کپببوون. کە بلۆکی ڕۆژهەڵات هەڵوەشایەوە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ تەبلیغاتی دژی کۆمۆنیستی هەموو جیهانی داگرت.

سەرمایەداری بازاری ئازاد بەڵێنی خۆشبەختی و داهاتوویەکی پڕ لە ئاسایش بۆ هەمووانـدا. نیئۆلیبرالیزم وەکوو بەدیلێکی نوێ هەوڵیدا وەڵامی قەیرانەکانی ئابووری ئەو سەردەم بداتەوە و جارێکی دیکە و دوای کۆتایی جەنگی جیهانی دووهەم ڕەونەقێك بە بازاری سەرمایەداری بداتەوە. ئەڵبەت تاڕادەیەکیش لەم پڕۆژەیەدا سەرکەوتوو بوو. بەڵام هەروەکو پێشبینیش دەکرا جارێکی دیکە ئەزمەی ئابووری ڕوویکردەوە ئەو سیستەمە و بنەستەکان و بێتواناییەکانی نیئۆلیبرالیزمیش لە ساڵەکانی ناوەڕاستی دەیەی نەوەد وردە وردە دەرکەوتن.

فاندەمانتالیزمی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ئێران هەوڵیاندا بۆ ئەوەی کە بەرانبەر بەم ئەزمەیە و بەرانبەر بە هێرشی گلۆبالیزاسیۆن بەدیلێك بێننە گۆڕێ. لە نموونەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دیتمان کە ئەم بەدیلە هیچ پڕۆژەیەکی ئابووری جیاوازی پێ نییە و سەرەڕای هەوڵو تەقەلاکانی سەرەتایی بۆ زیندووکردنەوەی یاساکانی ئیسلامی لە بواری ئابووریدا، سەرئەنجام هەر چووەوە سەر ڕەوتی نیئۆلیبرالی زاڵ بە سەر دونیادا.

لە شوێنەکانی دیکەش تا ئێستا نەك هەر نەیتوانیوە ڕێگایەکی باشتر بۆ ژیان نیشانبدات، بەڵکو لەڕووی سیاسیشەوە بێتوانایی و بێ ئاسۆیی ئەم ڕەوتە دەرکەوتووە. سەرمایەداری جیهانی بەسەرکردەیی ئەمریکا هیچکام لە کێشەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی سەردەمی ئێمەی لە هیچ شوێنێك پێ چارەسەرناکرێ. دەست بۆ هەر پڕۆژەیەك دەبات بە دەستیەوە نایێت و بە بێ هیچ پلانێکی ڕۆشن بۆ داهاتوو لە تاریکیدا پەل دەکوتێ. لە وەها هەلومەرجێکدا سەرەتاکانی بوژانەوەیەك دەبینین کەبەدیلی سۆسیالیستی بە بیروبۆچوون و بە بەرنامەی کۆمەڵایەتی و بە ڕێگا چارە سیاسییەکانی خەریکە لەئاستی جیهانیدا جارێکی دیکە مەقبولیەت پەیدا دەکاتەوە.

**ئیسلامی سیاسی، ئەڵتەرناتیڤی سۆسیالیزم نییە**

*** جوابی پرسیارەکەی منت نەدایەوە، گەشەی خێرای فەندەمێنتالیزم دەرەنجامی شکستی سۆسیالیست بوو لەوسەردەمەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئیسلامی سیاسی وەکو ئێوە باستانکرد بەدیلی سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو بەدیلی بێ

توانا و نەزۆکی ئەزمەیەك بوو كەسەرمایەداری جیهانی داگرتبوو. زەعفی ڕەوتی سۆسیالیستی و ئەزموونی شکستخواردووی سەرمایەداری دەوڵەتی لەژێر ناوی سۆسیالیزمدا، بۆ ماوەیەك ئیمکانی گەشەکردنی بە فەندەمەنتالیزمی ئیسلامیدا و ئێستا خەریکە ئەو جێگا و شوێنەی خۆی لە دەستدەدات. نەك هەر ئەو ڕەوتە بەڵکو ناسیۆنالیزمی باو لە وڵاتانی دواکەوتووی سەرمایەداریش نەیتوانی بەدیلێك بەرانبەر بە ڕەوتی جیهانگیری سەرمایە پێکبێنێ.

**لەترسی ئێران کۆنگرە لەزرگوێزەوە بۆ سلێمانی**

*** لەسەروبەندی کۆنگرەدا ، کەسانی سەر بە ئێران، دیارە مەبەستم ئیتلاعاتە ویستویانە تۆپبارانی مقەرەکانی کۆمەڵەو کۆنگرە بکەن، وە شەڕ ڕوویداوە لە کاتی کۆنگرەدا، شتی وا هەبوو؟ چۆن بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەو دەورەیەدا ئیتلاعاتی ئێران و سوپای پاسدارانی بە بەربڵاوی لە کوردستانی عیراق چالاکییان هەبوو، هەم خەڵکی خۆیان دەنارد، هەم خەڵکیشیان لێرە ئەکڕی، کەسانێکی زۆریان لە ئێمە و لە حزبەکانی دیکە تیرۆر کرد. بۆ هاتوچۆیەکی زۆر ئاسایی بەینی ئێرە و سلێمانییە، مەجبور بوین کاروانێکی ئیزامی بخەینەڕێ، مەجبور بوین هەر سەد مەتری ئەمین دابنێین و کەمین دابنێین بەدۆشکاوە حەرکەت بکەین، تازە بەوانەشەوە هەر توشی شەڕ دەبوین. لەمبەری جادەی عەربەتەوە بارەها و بارەها پیکابیان دەهێنا کە خۆمپارەی لەسەر دامەزرابوو و لەوێوە زرگوێزیان ئەکوتا. لەسەر ئەو ملانەی دەورووبەر دەهاتن بە (RPG) لە مقەرەکانی ئێمەیان دەدا، وە بێجگە لە هەموی ئەوانە لە باشماخ پایگای موشەکیان دامەزراند بوو و ئێرەیان بە خەستی موشەك بارانکرد. بۆیە ئێمە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد کە هێرشمان بکرێتەسەر. لەسەرەتاوە چاو و ڕاومان خستە ڕێ کە کۆنگرەکە لە زرگوێز دەگرین، بەڵام لە دوایین کاتەکاندا شوێنەکەیمان گواستەوە بۆ سلێمانی.

***هیچ ڕویدا لەو کاتەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو هێرشەی کە ئێوە باستانکرد بە ئاسانی پوچەڵکراوە و زیانێکی بە ئێمە نەگەیاند. تیمێك بوون هاتبوونە ئەو نزیکانە تەقەمان لێکردن و برینداریکیان دا و دەرچوون و هەندێك کەلو پەلیان لێ بەجێما و ئاگادار بووین کە بریندارەکەشیان بردەوە بۆ ئێران.

***کێ بون ئەو تیمانەی تۆپبارانی ئێوەیان دەکرد؟ ناسیتانن، سەر بە چ گروپێك بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئیتلاعاتی جمهوری ئیسلامی هاندەریان بوون، بەڵام لێرەش دۆستو هاوکارییان بوو.

***دواجار ئێوە سەرکەوتن بەسەر ئەو مەسەلانەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە توانیمان ئەمینیەتی خۆمان بەڕادەیەکی باش بپارێزین، بەڵام وردە وردە بارودۆخی سیاسی کوردستانی عیراقیش گۆڕانکاری بەسەرداهات، وە بەتایبەتی کە پرۆژەی ئەوت بەرابەری خۆراك تاڕادەیەك باری ژیانی خەڵکی سوکتر کرد، ئیتر جمهوری ئیسلامی بۆی ئاسان نەبوو ئەم و ئەو لە بەر برسێتی و لەبەر بێ دەرەتانی بکڕێ و بە گیانی ئێمە مانانیاندا بکات. ئەوانە هەموویان دەستیاندایە دەست یەك، سەرجەم کەشوهەواکەیان ئارامتر و ئاسوودەتر کرد.

**یەکێتی نەچووە ژێر فشاری ئێران**

***هەر لەو کاتەدا لەسەر و بەندی کۆنگرە و ساڵی (١٩٩٥) گوایە ئێران فشاری خستۆتە سەر یەکێتی نیشتمانی**

**بۆ داخستنی بارەگاکانی ئێوە و فشار لەسەرتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەردەوام ئەو فشارەبووە، بەڵام یەکێتی لەبەرامبەر ئەو فشارانەدا مقاوەمەتی کردووە.

**خەڵکی زرگوێز کۆمەڵەیان خۆشدەوێت**

***بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هۆکاری جۆراوجۆری هەبوو. پەیوەندی دۆستانەی ئێمە لەگەڵ یەکێتی، کۆن و جێکەوتوو بوو. جگە لەمە یەکێتی نیشتمانی دەیزانی کە ئەمە بیانوویەکە بۆ دەستتێوەردان لە کاروباری کوردستانی عیراق و بەوەش کۆتایی پێنایەت و رژێمی کۆماری ئیسلامی جێگەی بڕوایان نەبوو و دەیانزانی کە بەردەوام ئەوەقۆعیان دەچێتەسەرێ و پێویستە سنووریك بۆ ئەو داواکاری و زەختەی رژێمی ئێران دابندرێ.

جگە لەوانە پەیوەندی مێژوویی خەباتی گەلی کورد لەم دوو پارچەیە و بە تایبەت بە هانای یەکەوە چوونیان لە سێ دەیەی رابوردوودا وایکرد بوو کە کۆماری ئیسلامی نەیدەتوانی خەڵەلی بنچینەی تێدا پێکبێنێ. خەڵکی کوردستانی عیراق ئێمەیان خۆشدەویست و نارەزوومەندانە لای دەستی ئەوان درێژەمان بە چالاکی خۆمان دەدا. هەموو تۆپباران و موشەکباران و تیرۆر و هەڵگرتنی ئاسایش لە خەڵکی سنوورەکان و لە ئاوایییەکانی دەوروبەری ئێمە تەنانەت بۆ یەك جاریش نەبووە هۆی ئەوەی کە خەڵك لە دژی ئێمە هەڵویستێك دەر ببرن و یان ناوچاوانمان لێ گرژکەن.

رژێمی ئێران تەنانەت نەیتوانی خەڵکی ئاوایی زرگوێز کە ئەو هەمووەش ئەرکمان بە سەریانەوە بوو، ئەو هەمووەش بە بۆنەی ئێمەوە ئاسایشیان تێکچوو بوو لە دژی ئێمە هانبدات. دیارە ئەو بارودۆخە لە سیاسەتی یەکێتی نیشتمانیدا بەرانبەر بە ئێمە رەنگیدەداوە.

**هاتنی پاسداران بۆ کۆیە هەڵەبوو، بەڵام ئێران مەبەستی یەکێتی بوو نەك دیموکرات**

*** باشە خۆ هەر ئەو کاتانە بوو، هەرلەوسەردەمانەبوو، هەر ئەو دۆستایەتیە بەڵام سوپای پاسداران دێتەسەر بارەگاکانی حزبی دیموکرات لەکۆیە، بەڵام نایەتە سەر بارەگاکانی کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکێتی نیشتمانی بەرانبەر بە زەختی کۆماری ئیسلامی ئێران لەرادەیەکی سنووردارادا سازشی سیاسی دەکرد. دیارە بێگومان رێگە پێدان بە هێزی پاسداران کە بچێتە سەر مەقەرەکانی حزبی دیموکرات، ئەگەرچی لە ژێر زەختی زۆری رژێمی ئێراندا بوو، بەڵام سیاسەتێکی هەڵەبوو و زەربەی قورسی لە متمانەی خەڵکی کوردستانی ئێراندا. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەش بزانن کە حزبی دیموکرات پێشتر لە هێرشەکە ئاگادار کرا بووەوە و هەر بۆیە زیانێکی پێنەگەیشت. لە واقیعدا مەبەستی رژێمی ئێران، حزبی دیموکرات نەبوو، بەڵکو مەبەستی شکاندنی سومعەی یەکێتی بوو، حزبی دیموکرات بوو بە بیانووی بەرێوەچوونی ئەو پلانە کە تائێستاش لەسەر شانی یەکێتی قورسایی دەکات.

*** سازشی سیاسی هەیە سنوداربێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بوونی چالاکی ئێمە و حزبەکانی دیکەی کوردستان لە سنوورەکانی دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کە هەتا ئیمرۆش بەردەوامە نیشانەیەکە بۆ سنووردار بوونی ئەو سازشانە.

***پێتانوایە لەو سەردەمانەدا ئەگەر لەژێر ئیدارەی پارتی دیموکراتی کوردستان بونایە، وەزعییەتان وەکو ئێستا باش نەبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پەیوەندی ئێمە و پارتی دیموکراتی کوردستان مێژوویەکی جیاوازی هەیە. ئەو پەیوەندییە هەمیشە وەکو ئێستا دۆستانە نەبووە. ئەوان لە ساڵەکانی دەیەی (١٩٨٠) لەگەڵ هێزەکانی رژێمی ئێران لە دژی ئێمە و حزبی دیموکرات بە شەڕ هاتن. ساڵەکانی دواتریش کە مەقەرەکانی ناوەندی ئێمە هاتە ناو کوردستانی عیراق، ئێمە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانیدا بووین. لەم ساڵانەی دواییشدا کە پەیوەندییەکان گۆڕان و شەڕ و نێوان ناخۆشی تەواو بوو، پارتی بە پارێزەوە لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێران هەڵسوکەوتی دەکرد.

**پارتی، هاوکاری ئێرانی دەکرد دژی کۆمەڵەو دیموکرات**

***لە نێوان ئێوە و پارتی دیموکراتی کوردستان شەڕ روویداوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، ئەوکات سەرکردایەتی پارتی لەژێر ناوی "قیادە موەقەت"دا کاریدەکرد و هێزەکانی لەناوچە سنووریەکان و لەناو خاکی ئێراندا دامەزرابوون.

***کەی؟ چۆن؟ بۆچی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو رووداوانە هەڵدەگەرێنەوە بۆ ساڵەکانی (١٩٨٠ تا ١٩٨٢)ی زایینی. لە ناوچە سنووریەکانی شنۆ، سەردەشت و مەریوان روویاندا و چەندین هاوڕێی ئێمە تێیدا گیانیان بەختکرد. لەسەر داوای رژێمی ئێران بوو. پێموایە باجێك بوو کە لە پێناوی مانەوەی خۆیان لەئێران دەیاندا و زەربەی سیاسی و مەعنەوی قورسی لێدان.

***وەڵحاسڵ دەتەوێ بڵێی دۆستایەتی ئێمە لەگەڵ یەکێتی دۆستایەتیەکی مێژویی ترە، ئەحزابی کوردستانی ئێران بەو شێوە لەگەڵ پارتی نییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وایە.

**پارتی لەدیموکرات نزیکترەو ئێمەش لە یەکێتی**

***سەرەڕای ئەوەی کە تۆ باستکرد، ئەو کاتەی کە قیادە موقەتە هێرش ئەکاتە سەر کۆمەڵە و دیموکرات، بەڵام لە ئێستادا وە چەند ساڵە پێش ئێستا پەیوەندییەکانی حزبی دیموکرات و پارتی دیموکراتی عیراق زۆر چاکتە پێشەوە، ئەکرێ ئەمە لەبیرکردنی مێژووبێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە دوای چەند ساڵ سەرئەنجام پارتی بە سیاسەتی خۆی بەرانبەر بە هێزەکانی کوردستانی ئێراندا چووەتەوە و هەوڵیداوە پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ دابمەزرێنێتەوە. ئەو پەیوەندییە لەگەڵ حزبی دیموکرات نزیکتر بووە و بۆ ئێمەش لە ئاستێکی دیاریکراودا، ئاسایی بووە.

# کۆنگرەی نۆیەمی کۆمەڵە

٢٠٠٠

(زرگوێز)

**کۆنگرەی (٩)ی کۆمەڵە بەرەو جیابوونەوەی عەبدوڵڵای موهتەدی -٢٠٠٠- زرگوێز**

*** پێمخۆشە بێینەسەر کۆنگرەی (نۆ) ئەو کۆنگرەیە کە پڕ کێشەیە، چۆن ئەو کاتەی کە مەنسوری حیکمەت و کۆمۆنیزمی کارگەری کۆمەڵە جێ ئەهێڵن، ئینشعابێك دروست ئەبێ، و فشارێکی نێگەتیڤانە جێ ئەهێڵێ لەسەر کۆمەڵە، لە کاتی کۆنگرەی نۆ جارێکی تر (عەبدوڵڵا موهتەدی) لەژێر ناوی (کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) وکۆمەڵێك حیجە بەشداری کۆنگرە ناکەن و ئەچنە دەرەوە، دواتر ئەوەی کە حزبێکی تازە دروست ئەکەن، باسی کۆنگرە لە گەلاوێژی ساڵی (١٣٧٩) لەئوتی (٢٠٠٠)دا دیسان لە ئۆردوگای (زرگوێز) نزیك شاری سلێمانی بەڕێوەدەچێ لە کوردستانی عێراق، ئەو کۆنگرەیە کۆنگرەیەکی پڕ کێشەو ئاژاوە بوو پێمخۆشە سەرەتا باسی ئەو کۆنگرەیەم بۆ بکەی، ئەو کۆنگرەیە بۆ بەو وەزعە بەڕێوەچووو؟ بۆچی نەئەکرا ڕێگری و پێشگیرییەکی لێبکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی (٩)ی کۆمەڵە خۆی کێشە و پشێویکی تێدا نەبوو، ئەوەی کێشە بوو پێش بەڕێوەچوونی کۆنگرە و لە جەرەیانی تەداروکی کۆنگرەدا ڕوویدا. ئەو هاوڕێیانەی کە ئامادەنەبوون بێنە ناو کۆنگرە و ئامادەنەبوون پابەند بن بەبڕیارەکانی کۆنگرە، دواجار لە کۆمەڵە جیابوونەوە و ڕێکخراوێکی دیکەیان پێکهێنا. لە سەدا (٢٠)ی نوێنەرانی کۆنگرە لە لایەنگرانی ئەوان پێکهاتبوون کە ئامادەنەبوون لە کۆنگرەکەدا بەشداربکەن.

ئەوان داوایان دەکرد کە کۆنگرە بۆ ماوەی (٦) مانگ تا ساڵێك دوا بکەوێ و لەو ماوەیەشدا کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە بە تەوافوق پەنجا بە پەنجا لە بەینی هەر دوولا دابەشبکرێ.

لایەنی ئێمە ئەمە قەبوڵ نەبوو، چونکە ئەگەر کۆمیتەی ناوەندی ئەو کاتی کۆمەڵە وەها فۆرموڵێکی قبوڵ کردبا، بە مانای ئەوە بوو کە بە شێوەیەکی غەیرە دیموکراتیك، کۆنگرەکەی پێشووی خۆی پێشێلکردووە و کۆمیتەی ناوەندیەکی دیکەی کە شەرعیەتی لە هیچ کۆنگرەیەك وەرنەگرتووە لەجێگا داناوە. ئێمە ئەمان دەتوانی، ئەندامانی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی پێشوو لەسەر کار لابەین و لە سەدا (٥٠)ی کەسەکانی ئەوان لە جێگایان دابنێین.

جگە لەوە ئەندامانی هەڵبژێردراو بۆکۆنگرەی (٩) چ لە ڕێکخراوی ناوەوەی وڵات و چ لە ڕێکخراوەکانی دەرەوەی وڵاتەوە هاتبوونە بەردەم ساڵۆنی کۆنگرە و زۆربەی هەرە زۆریان داوای بەڕێوەچوونی کۆنگرەیان دەکرد و ئامادە نەبوون بۆ دواخستنی کۆنگرە، چ جای ئەوەی کە بە سەر سەری ئەوانەوە کۆمیتەیەکی ناوەندی تازەش بە تەوافوق دیاری بکرێ.

ئەو پێشنیارەی ئەوان بۆ دواخستنی کۆنگرە بۆ ئەوە بوو کە پشێوی لە ناو ڕیزەکانی لایەنی ئێمە پێکبێنن. خۆ ئەگەریش پەسەندمان کردبا و هیچ کێشەیەکیش لە ناو ڕیزەکانی لایەنی ئێمە بەرانبەر بە وەها بڕیارێکی نادیموکراتیك ڕووی نەدابا، ئەوان چەند مانگ دواتر هەر جیادەبوونەوە.

بەڵام بە خەیاڵی خۆیان دەیانەویست بە دەستێکی لە بواری تەشکیلاتییەوە پڕتر جیاببنەوە. دواجار ئەو ڕاستییە ئاشکراتر بووکەجیاوازییە سیاسییەکان قووڵتر لەوە بوون کە پێکەوەمانەوەمان ئیمکانی هەبێ. کێشەی نێوان ئێمە و ئەوان ئەگەرچی لەسەر مەسەلەی هەڵەیەکی تەشکیلاتی دیاریکراو بوو کە تەقییەوە، بەڵام لە جەوهەر و ناوەرۆکی واقیعی خۆیدا ڕیشەی لە گۆڕانکاریەکدا بووکەلەستراتیژی و

بیروبۆچوون و سیاسەتی ئەواندا پێکهاتبوو. کاتێك بە هۆی ئەو هەڵەیەکۆنگرەی (٧)ی حزبی کۆمۆنیست، عەبدوڵڵا مۆهتەدی هەڵنەبژاردەوە و بە هۆی ئەوهەڵەیەوە رەخنەی لێگرت.کاك عەبدوڵڵا دوایی بەیانێکدا کە بڵاویکردەوە وردە وردە پێینایە رێگایەکەوەکەناگاهانە بەرەوجیابوونەوەی دەبرد.

***کۆنگرەی حەوتی حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ لەو کۆنگرەیەدا، کاك عەبدوڵڵا نەك هەر خۆی کاندیدکرد بۆ کۆمیتەی ناوەندی حزب، ئەو حزبەی کە حەوتوویەك دواتری کەوتە مۆخالەفەت کردنی جیدییەوەلەگەڵیەڵکوگەلێك هەوڵیداکە هەڵبژێردرێتەوە. هەرچەند کاك عەبدوڵڵا بە هۆی ئەو هەڵەیەوە کە کردبووی لە کۆنگرەدا رەخنەی لە خۆی گرت و داوای لێبوردنی لە کۆنگرە کرد، کۆنگرە لەگەڵ ئەوەشدا کەسەمپاتی بە رەخنە لە خۆکەی نیشاندا، بەڵام لە کاتی هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی حزبدا، کە دەنگدان بە پێی قاعیدە نهێنییە، زۆرینە دەنگی بۆ نەدا.

*** کێشەکە ئەوەندەی پەیوەندی هەبوو بە مەسائیلە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەوە، ئایا ئەوەندە پەیوەستبوون بەمەسەلەی ئیدیۆلۆژیو حزبی کۆمۆنیستوفکریو چەپو مەسەلەی ناسیۆنالزم؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەو کاتەدا،کێشەکان پەیوەندییان بە ئیدئۆلۆژی و سیاسەت و رێبازەوە دیار نەبوو. ململانێی فکری و سیاسی لە ناو ئێمەدا ئەوەندە گەشەی نەکردبووکە سنووری جیاوازییەکانمان بەروونی دیاربێ. بەڵام دواجار دەرکەوت کە کاك عەبدوڵڵا وەکوکەسی یەکەمی ئەوجەرەکەتەی ئەوان هەر شتێك هاندەری بووبێ، ئەو کەسانەی کە هێزی جیابوونەوەکەی بوون و ئامادە بوون لە گەڵی برۆن، بێگومان هەستیان بە جیاوازی لە رێبازی سیاسی خۆیان و لایەنی ئێمەکردبوو و ئەو لایەنە خۆیان ئاگایانە هەڵبژارد بوو. ئەوان بەرواڵەت داوای هەڵوەشاندنەوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان وەکو یەك چوارچێوەی رێکخراوەیی دەکرد، بەڵام لە راستیدا لەگەڵ هەر سێك وشەکەی حزب و کۆمۆنیست و ئێران، بە جیاجیاکێشەیان هەبوو. ئەوکات بەروونی باسی ئەوکێشەیەیان نەدەکرد. پێکهێنانی ئەو حزبەیان بە هەڵە دەزانی، بەکۆمۆنیسم و رێبازی کۆمۆنیستی بێباوەر ببون و لایان وابوو کە پێداگرتن لەسەر ئەو رەوتە بۆتە مایەی لاواز بوونی کۆمەڵەلەلە بزووتنەوەی کوردستاندا، ئەیانەویست حزبێکی سەرانسەری لە ئێران بن، بەڵکو رێکخراوێکی بە تەنیا کوردستانییان گەرەك بوو. سەرجەمی ئەم هەڵوێستانەیان کە لەچوارچێوەی بوژاندنەوەی کۆمەڵە"دا باسدەکرد، نیشانیدەدا کە ئەوان لەرووی ئامانج و بەرنامەی سیاسییەوە بەرەو ناسیۆنالیسمی کورد چوون و لە سۆسیالیسم دوور کەوتوونەتەوە. ئەمانە ئەوکات تەنها سەرەتاکانی دیار بوو، بەڵام دواجار روونتر و شەفافتر لە رێبازی رەسمی حزبەکەیاندا دەرکەوت.

**هەوڵماندا جیابوونەوە نەبێ**

***ئەنەکرا،هەرلەناو ئەوکۆمەڵەدا لایەنەکانی چەپ و گەرایشێکی مەیلەوناسۆنالیستو هەموو ئەو گەرایشانە بەیەکەوە کاربکەن، ئەو جیابوونەوەیە رووی نەدایە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە بە هیچ جەشنێك پێداگریمان نەکرد لەسەر جیابوونەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێمان باش بوو بمێننەوە و هەوڵبدرێ ئەو جیاوازییە سیاسییانەی کە لە نێوانمان دایە، بە شەفاف بۆ خەڵکیش لە دەرەوەی خۆمان روون ببنەوە. لە ئاکامدا ئەگەر جیابوونەوەیەکیش روویدا با بۆ جەماوەری خەڵك ئاسایی بوو و هەمووان دەیان سەلماند. کێشەکە ئەوە بوو، ئەوان بۆ ئەو مانەوەی خۆیان، هەروەك

پێشتر باسکرا، باجێکیان لە ئێمە دەویست کە دانی ئەو باجە بۆ ئێمە ئیمکانی نەبوو. دانی ئەو باجە بەردی بناغەی حەرەکەتی ئێمەی وەکو جەرەیانێکی شۆڕشگێڕ و کۆمۆنیست دەر دەهێنا. تەنانەت ئەوکات ژمارەیەك لە هاوڕێیانی ئێمە بوون کەهەڵوێستێکی بەیناینەنییان بوو، ئەوانیش بە سەهمی خۆیان گەلێك هەوڵیاندا کە لایەنەکەی کاك عەبدوڵڵا رازیبکەن بەوەی کەواز لە جیابوونەوە بێنن و هەر وەك دیتمان سەمەری نەبوو.

*** ئێستا ئەم کتێبەی کەلەبەرچاوتایە، گوزارشی کۆمیتەی ناوەندی بە کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانە، پاش ئەوەی کە لە (١٣٨٠)ی هەتاوی چاپکراوە، موهتەدی نوسیویەتی ئەڵێ" دوژمنان بە تەمای لەت لەت بونی کۆمەڵە و تەنانەت تێکهەڵچوونی چەکدارانەی باڵەکانی بوون و زۆر لە دۆستانو دڵسۆزان ویستیان رێگری لەم کارەبکەن، بەڵام دەرەنجام ئەو کارەکەئەوان نەیانویست سەرنەکەوت و دەرەنجام ساغکردنەوەی کۆمەڵەی لێکەوتەوە". کێ بوون ئەوانەی کە ئەیانویست کۆمەڵە لەت لەت بێ و شەڕو تەقە لەنێوانتان رووبدا دواجار بە ساغکردنەوەی کۆمەڵە کۆتایی پێهات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەنیا دەتوانم رژێمی جمهوری ئیسلامی بۆ وەها هەوڵێك دەستنیشان بکەم. لام وایە رژێمی ئێران ناراستەوخۆ و بە وردی کاری بۆ وەها رووداوێك کردووە. بە خۆشییەوە ئەو خەونەیان نەهاتە دی، جیابوونەوەکە گەلێك هێمنانە و شارستانییانە بوو و هیچ کێشەیەکی ئەوتۆی لەو چەشنەی لێنەکەوتەوە.

**ئێران کێشەکانی ئێمەی تەعقیب دەکرد**

*** کۆمەڵە لەت لەت بوو ئیتر چی ماوەکە لەت لەت نەبێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بێگومان هۆکاری جیابوونەوەکە سەرچاوەی لە کێشە سیاسی و تەشکیلاتییەکانی ناوخۆی خۆماندا بوو. رژێمی ئێران کە هەستی بەهەبوونی ئەو ناکۆکییانەکردبوو، پلانی ئیتلاعاتی تایبەتی بۆ دادەرشت. چەند نیشانەیەك هەیە لەوەی کە ئەو پلانە لە رێگای دەزگای ئیتلاعاتی رژێمەوە بە ناوی رەوتی رێفۆرمخوازی ئەوکاتی ناو رژێم دارێژرا بوو.

**ئێران دەستی هەبوو لەپارچەبوونی کۆمەڵەدا**

*** ئەو پلانە لە کوێوە بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جارێ پێش هەموو شتێك پێویستە ئەوە بڵێم، کاتێك کە باسی پلان دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە کە هیچکام لەو هاوڕێیانەی پێشووی ئێمە کە جیابوونەوە، پەیوەندییان بە رژێمەوە بوو بێ، تا ئەو جێگایەی کە بەم قەزیەی مەربووتە، پلانگێر هەر دەزگاکانی ئیتلاعاتی رژێم بوون. بەڵام ئەوان لەسەر جیاوازییەکانی ناو ئێمە بۆ بەرەوپێشبردنی پلانەکەیان کەڵکیان وەرگرت. دۆستێکمان هەبوو کە هیچ پەیوەندیەکی رێکخراوەیی بە ئێمەوە نەبوو، بەڵام وەکو دۆست لەگەڵ کۆمەڵە هەڵسوکەوتی دەکرد.

لە کاتی هاتنە سەرکاری خاتەمی و هاتنە گۆڕی رەوتی رێفۆرم خوازی ناوخۆی رژێم، ئەو بەم قەناعەتە گەیشتبوو کە دەکرێ لە رێگەی دەوڵەتی خاتەمییەوە دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ رژێم لەسەر مەسەلەی کورد بکرێتەوە. خۆی لە ئەوروپا ئەم بۆچوونەی خۆی لێرە و لەوێ تەبلیغ دەکرد و هەوڵیدەدا روناکبیرانی کوردی لە دەرەوەی وڵات لە دەور کۆبکاتەوە. ئەو کەسە خۆی نامەیەکی بۆ خاتەمی نووسی و ئامادەیی خۆی دەربڕی کە لەم بابەتەوە هەوڵبدات. لە درێژەی ئەو نامە نووسینەدا، ئیتلاعاتی ئێران پەیوەندییان بەم برادەرەوە گرت و هانیاندا بوو کە هەوڵەکانی درێژە پێبدات و تەنانەت تەرتیبی چاوپێکەوتنێکیان لە دیمەشق دابوو.

دوای یەکەم پەیوەندی کە لەم ڕێگەیەوە لەگەڵ چەند مەئمورێکی ئیتلاعاتی ئێران لە دیمەشق گرتی و لە شاری لەندەن بە حوزوری دوو هاوڕێی دیکەی ئێمە بۆی گەڕاندینەوە، و وتی کە پێیوتون پرۆژەی ئێمە بۆ کێشەی کورد مەعلومە، دەمەوێ بزانم پرۆژەی ئێوە چییە؟ و ئەوان ئێستا شتێکی دیاریکراویان نەگوتووە و تەنیا ئەوە نەبێ کە دەڵێن، ئێمەش لەناوخۆماندا گیروگرفتمان هەیە و پرۆسەی ئاشتی دەبێ وردە وردە ڕێگەی بۆ خۆشبکرێ. وەڵامی ئێمە بەو برادەرە ئەوە بوو کە هەر پەیوەندییەکی لەم جەشنە کە بەنهێنی و بە بێ ئاگاداری ڕەسمی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات بگیرێ، پێویستە وەکو پلان سەیری بکرێ و دەبێتە هۆی ناو زڕاندنی خۆشت. ووتی: دەی باشە ئەوە من لە ڕێگەی ئێوەوە بە سەرکردایەتی کومەڵەم ڕاگەیاند، وتمان لەگەڵ حزبی دیموکراتیش باسیبکە، ئێمەش لەگەڵ هاوڕێیانمان باسیدەکەین و هەڵوێست دەگرین.

دوای ماوەیەك وەڵامیداینەوە کە لەلایەن تەرەفی گفتوگۆکانمەوە پێیانگوتوم کە باسکردنی ئەو جەرەیانە لەگەڵ کۆمەڵە ئیشکالی نییە، بەڵام لای حزبی دیموکرات باسی مەکە، چونکە مۆبادەرەکە لە بار دەچێ. ئەو کاتە بوو کە ئێمە بە ڕوونی هەستمانکرد کە پلانێك لە دژی کۆمەڵە لە ئارادایە، کە تەنانەت خۆی ئەو برادەرەش وردەکارییەکانی نازانێ و ئەگەری ئەوە هەیە کە لەو بە ناو گفتوگۆ نهێنییانەدا ئەو برادەرە وەکو نوێنەرێکی ناڕاستەوخۆی کۆمەڵە قسە و هەڵسوکەوت بکات. بۆیە بە سەراحەتەوە هەر جەشنە پەیوەندی و قسەیەك کە بە ناوی کۆمەڵەوە بکرێ ڕەتمانکردەوە.

مابووە ئەوەی کە ئەم جەرەیانە لە لایەن ئێمەوە لێدوانی ڕەسمی و ئاشکرای لەسەر بدرێ. لەو کاتەدا بوو کە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە لەڕووی هەڵسەنگاندنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵەوە بەوە گەیشت کە ئەو کارە لەو کاتەدا زیانی هەیە و نەکرێ.

ئەم جەرەیانە ڕێك لەو کاتەدایە کێشەکانی ناوخۆی کۆمەڵەش توند بوونەوە و وردە وردە ئەو هاوڕێیانەی پێشووی ئێمەی بەرەو جیابوونەوە برد. هەمووان دەزانن کە چەند مانگ پێش جیابوونەوە، دوو لایەنی کێشەکە لەسەر جێگا و شوێنی بەرەی ڕیفۆرم خوازانەی ڕژێم هەڵسەنگاندن و بۆچوونی جیاوازیان هەبوو. من لام وایە ئیتلاعاتی ڕژێم کە هەستی بە هەندێك جیاوازی لە ناو ئێمەدا لەسەر ئەو مەسەلەیە کردبوو، هەوڵیدەدا، هەلەکە بقۆزێتەوە و ناڕاستەوخۆ کێشەکانی ناوخۆی کۆمەڵە قوڵکاتەوە، ئەمە چوارچێوەی ئەو پلانەیە کە باسکرا.

***کێ بوو ئەو کەسە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێم باش نییە ئێستا ناوی بەرم.

***پێتوایە ئەوە نائاگایانەبووە وەکو تۆ دەڵێیت یان ئاگایانەبووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من هیچ بەڵگەیەکم نییە و ناتوانم خۆی بە هیچ جەشنە هاودەستێك لەگەڵ ڕژێم تاوانبارکەم، بەڵام هەرچەند دەقی ئەو قسانەی کە کراون لە بیرم نەماون بەڵام سەرجەمی جەرەیانەکە بەو شێوەیە بوو کە باسمکرد و مێژوو و بەڵگەنامەکان لە داهاتوودا قەزاوەتی لەسەر دەکەن.

***یەعنی کارەکەی سەریگرت؟ ئەوەی کە ئەو کەسە ئەیویست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی ئەو برادەرە کەوتبووە شوێنی، خۆشباوەڕی و ئەوەهۆماتی خۆی بوو. لای وابوو ڕۆژێك لەڕۆژان دەبێتە واسیتەی، مۆفاوەزە و ئەویش تێیدا دەور دەبینێ و جێگا و شوێنێك بۆ خۆی

دەستبەر دەکات. بەڵام لە راستیدا نە رژێمی ئێران خەیاڵی وتوویژی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی کوردستان بوو و نە هەلومەرجی وەها وتوویژێك رەخسا بوو. ئەوە غەیری پلان هیچ شتێکی دیکەی تێدا بەستە نەبوو.

***مەبەستت ئەوەیە بڵێی کۆماری ئیسلامی لەو رێگایەوە، تەنها هەوڵی لەت لەتکردنی کۆمەڵەیداوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، ئەوە هەوڵێکبوو، بەڵام من ناڵێم هۆکارەکەی ئەوەبوو، ئەوە لە جوابی ئەو پرسیارەدا دەڵێم کە دەڵێی دوژمنانی ئێمە هەوڵیاندەدا، منیش پێموایە دژمنانی ئێمە هەوڵیاندەدا. بەڵام جیابوونەوەکە بە عەمەلی نەك لە ناکامی پلانی رژێم، بەڵکو لەدرێژەی کێشە سیاسییەکانی ناوخۆی کۆمەڵەدا هاتبووە ئاراوە.

***کە کاك عەبدوڵڵا و تۆ، دوژمنان تاوانبار ئەکەن بە لەت لەت بوونی کۆمەڵە، بۆ کۆمەڵەتان لەت لەتکرد ئێوە بەرپرسیارن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە لەسەر جێگای خۆی بوو، کاك عەبدوڵڵا و هاورێیانی لێی جیابوونەوە. ئەوان ئەگەرچی لەسەرەتاوە بە روونی باس نەدەکرا، بە بیر و بۆچوون و بە رێباز و بە ستراتێژی سیاسی لەگەڵجیبهەتی کۆمەڵە نامۆ ببون. پێداگرتنی ئەوان لەسەر ئەو جیبهەتە، درەنگ یان زوو، ئەوانی بەرەو جیابوونەوە دەبرد. ئەوان حزبێکی دیکە، حزبێکی جیاواز بوون.

**موهتەدی، پروپاگەندە دەکات**

***هەر لەو گوزارشتەدا عەبدوڵڵای موهتەدی دەڵێ " یەکەم دەستکەوتی ساغکردنەوەی کۆمەڵە، هاتنەدەری کۆمەڵە بوو لەحزبی کۆمۆنستی ئێران و جاریکی کە بەفراوانی کۆمەڵەی بە خەڵکی کوردستان و چەپی ئێران و ناوچەکە ناساندو هێنایەوە ناو ناوان"، واتا کۆمەڵە ئیهمالکرابوو لەناو خەڵك و چەپی ئێراندا ناوی نەمابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو قسانە دەچنە خانەی پروپاگەندەوە. ئەگەر رۆژێك لەرۆژانیش باوەری بەم هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی خۆی بووبێ، باوەر ناکەم ئێستا وابیر بکاتەوە. لە هەلومەرجێکدا کە دەسەڵاتی دیکتاتۆری بە سەر وڵاتدا زاڵە، ئەو جۆرە بە خۆدا هەڵگوتنە، بۆ ماوەیەك مەودای دەبێ بەڵام بەری زۆر درێژ نییە. لە لای هێزە چەپەکانی ئێرانیشدا باوەر ناکەم حیسابێکی ئەوتۆیان بۆ بکرێ. ئەمان کۆمەڵەیان نەبوژاندەوە بەڵکوو رێبازی سیاسی خۆیان گۆری و بەداخەوە ناوی کۆمەڵەشیان لەسەردانا، کە مۆنسیفانە نەبوو.

***پاش کۆنگرەی تۆ، لە دیدارێکدا لەگەڵ تۆ، ئەڵێیت "جیابونەوەی موهتەدی لە کۆمەڵە، پاش هەڵنەبژاردنەوە بە کۆمیتەی ناوەندی، بە مەبەست ئەوەی کردووە، گوایە وتویەتی حزبی کۆمۆنیست باوی نەماوەو تۆ پێی ئەڵێی کە مەسەلەی میللی باوەشێن ئەکات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دیالۆگی کاك عەبدوڵڵا لەگەڵ ئێمە لەسەر پێویستی حزبی کۆمۆنیست و هەروەها لەسەر مەسەلەی میللی، هیچ کامیان ئەوەندە ئەچوونە پێش کە بتوانین بڵێین ئەوانە بوون سەرچاوەی جیابوونەوەکەیان. کاك عەبدوڵڵا تاچەند مانگ پێش جیابوونەوەکەی هەوڵ ئەدات ببێ بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیست و دوایین بەیانی ساڵەهاتی حزب لە لایەن کاك عەبدوڵڵاوە بەحەماسەوە نووسراوە. لەسەر مەسەلەی میللی، تەنیا دەچێتەوە سەر یەك پاراگراف لە راپۆرتێکی کۆنگرەکانی پێشوو کە ئەویش خوێندنەوەیەکی نادروستی لێدەکات. واقعیەت ئەوەیە کە کاك عەبدوڵڵا ئەوکات بە سەراحەتەوە

باسی لەو بۆچوونانەی کە تازە پێگەیشتبوو نەدەکرد.

چەند ساڵ دواتر ورده ورده ئەو جیاوازیانە روونبوونەوە. ئەوان لەڕاستیدا بە ناڕاستەیەکی ناسیۆنالیستیدا رۆیشتن و کۆمەڵە لەسەر ڕێبازی سۆسیالیستی خۆی مایەوە. بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە گوایە ئەوان ڕێگەیەکی باشتریان بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوەیی لە کوردستان هەڵبژارد. بەپێچەوانەوە ئەوان وەکو زۆربەی ناسیۆنالیستەکانی سەردەمی ئێمە نیشانیاندا کە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەیی هێزێکی کارا نین. بۆ ئەوان دەسەڵاتی حزبەکەی خۆیان لەسەرەوەی چارەسەرکردنی واقعی کێشەکەیە.

**ئەوان نەدەبوو ناوی کۆمەڵە بەرن**

***هەر لەوجوابەدا تۆ نووسیوتە کە ئەوان کەمایەتین کۆمەڵە جێ ئەهێڵن، وەناشبێ ناوی کۆمەڵەببەرن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وایە، من وام وتووە و پێموایە حەق وابوو ئەوان لەو ناوە کەڵک وەر نەگرن، چون هەم کەمایەتی بوون و هەم ڕێبازەکەیان لە ناوەرۆکدا ڕێبازی کۆمەڵە نەبوو.

***بەڵام ئەو ئەڵێ من حەقی ئەوەم هەیە کە ناوی کۆمەڵە بەرم، بەوپێیەی کە خۆم یەکێکم لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵە موهتەدی دەڵێ "خەڵکێك کە هێشتا بەناوی کۆمەڵەوە کارئەکەن، ئەو کاتە ئەندام نەبون یان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبوون، یا ئەندامانی دروستکەری کۆمەڵە نین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حزبایەتی ملکداریەت و بازرگانی نییە کە بەناوی خاوەنێکەوە دیاریکراوەوە سەبتبکرێ. حزب بریتییە لە ڕێکخراوێك کە لەدەوری بەرنامەیەکی دیاریکراو، ستراتێژێکی دیاریکراو، لەسەر بنەمای ئیدیۆلۆژییەکی دیاریکراو پێکدێت و ئەو جار بە پێی پەیرەوێکی ناوخۆ لە ناوخۆیدا هەڵسوکەوت دەکات. هەموو ئەو کەسانەی کە بەو پرنسیپانەی حزبەکە پابەند بن و بە پێی پەیرەوی ناوخۆ ببن بە ئەندامی ئەو حزبە، لە ناو ئەو حزبەدا ماف یەکسانیان دەبێ. ئەو لە دامەزرێنەران بووە، دەستیخۆش بێ، بەڵام بەهەزاران کەسیش بۆ درێژەپێدانی خەباتی ئەو حزبە رەنجیان بردووە، ئەشکەنجە کراون، گیانیان بەختکردووە. دامەزرێنەر بوون، هیچ مافێکی تایبەتی بەکەس نادات. لە لایەن خەڵکیشەوە دامەزرێنەر کاتێك قەدری لێدەگیرێ کەڕاستگۆیانە بۆ ئامانج و ڕێبازی حزبەکەی تێبکۆشێ. ئەوان بە پێی بەیرەوی ناوخۆ کە پێشتر قبوڵیان کردبوو دەبوایە ناوێکی گونجاوتریان بۆ ڕێبازەکەی خۆیان هەڵبژاردبا. هەر چەند من لام وایە ئەوە کێشەیەکی سەرەکی نەبوو و نییە و کۆمەڵە لە لای خەڵکی کوردستان هەر بە تەنها یەك ناو نییە بەڵکو ناوەرۆکێکی رادیکال و سۆسیالیستی لە کردەوە دایە. کردەوەی ئەوانیش باشترین مەحەکە بۆ نەگونجاو بوونی ئەو ناوە لەگەڵ ناوەرۆکیان.

*** عەبدوڵڵا موهتەدی جگە لەوە، رەخنەیەکیتری لە ئێوە هەیەو ئەڵێ "کۆمەڵە دوای لاواز بوونو لەکیسچونی زۆرێکی هێزی ئینسانیو ئاڵۆزی و چەواشەبوونێکی فکری ئەو سەردەمەکە لەناو حزبی کۆمۆنیستدا مابوە زاڵبوو بەسەریدا، کۆمەڵە بوو بەهۆی لە دەستدانی هێزێکی فکریو ئینسانیو مادی زۆر لەناو ئەو حزبەدا، تۆ لەناو حزبی کۆمۆنیست بوی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو قسانە ئاماژەیە بەجیابوونەوەکەی رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری لە کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران. پێویستە ئەو ڕاستییە بسەلێنین ئەوانەی ئەوکات لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران رۆیشتن کۆمەڵێك ئینسانی سیاسی بوون. جیابوونەوەکە ئینتخابی سیاسی ئەوان بوو. ئەوان کەوتنە شوێن ڕێبازێکی دیکە. ئێمە ئەو ڕێبازەی ئەوانمان پێدروست بێ یان پێنادروست بێ، ئەوە مافێکی تەبیعی ئەوان

بوو. ئێمە دەتوانین رەخنە بگرین لەم یا لەو هەڵسوکەوتی تەشکیلاتی ئەوان لە کاتی جیابوونەوەکەدا، بەڵام ناتوانین نکۆڵی لەوەبکەین کە ئەوان دەیانەویست بە ئاراستەیەکی دیکەدا برۆن. ئەوان وەکو خۆیان دەیانگوت هێڵەکەی خۆیان گۆڕیبوو. ئەو جیابوونەوەیە لە بواری هێزی ئینسانی رێکخراودا زەربەی لە کۆمەڵەدا، بەڵام کۆمەڵە زۆر زووتر لەوەی کە تەسەور دەکرا خۆی گرتەوە و رێگای نەدا کە بۆشاییەك لە بواری پێویستی هێزی رادیکال و جەماوەری لە کوردستان پێکبێت.

دوای جیابوونەوەی ئەم رەوتە زۆری پێنەچوو کە مەجالی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەرینیش بۆ گەشەکردنی کۆمەڵە پەیدا بوو. بووژانەوەیەك لەئاستی خەباتی جەماوەریدا لە شارەکانی کوردستان دەستیپێکرد. دەربرینی نارەزایەتی مەدەنی، پێکهێنانی رێکخراوەی جەماوەری غەیرە حکومی، بوون بە باو، جموجۆڵی فەرهەنگی و ئەدەبی و هونەری پێشرەو هاتەکایەوە، کۆمەڵە بەدروستی هەوڵیدا کە لەریزی پێشەوەی ئەو حەرەکەتە نوێیانەدا دەور ببینێ. ئەمانە هەمووی قەرەبووی ئەو جیابوونەوەیانکرد و رێگایانەدا کە سەرگەردانی و بێ ئاسۆیی باڵی بەسەر بزوتنەوەی رادیکاڵ و شۆرشگێرانەی کوردستاندا بکێشێ. دوای جیابوونەوەی کاك عەبدوڵڵا و هاورێیانیشی کۆمەڵە زۆر زوو توانی بە سەر ئاسەوارەکانی ئەو جیابوونەوەیەدا زاڵبێ و دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم بە سەربەرزییەوە ئەرکەکانی خۆی بەرێوەبردووە. دیارە کەموکوریشی بووە، بەڵام هەوڵیداوە لە ناویانبەرێ.

*** ئەم بەحسە لەبەرئەوەی قسە زۆر هەڵئەگرێ، کاك عەبدوڵڵای موهتەدی هەر لەو گوزارشتەدا ئیشارەت بەوە ئەکا کە ئێوە کەلەبنەوە بەئاشکرا کردەوەتان دژی ئەوانکردوە، بەو پێیەی کە ئەوان رادیۆیان نەبوە ئێوە حەرەکەتی ئیعلامیتان دژی ئەوان بەرێکردوە، وە تەبلیغاتی ژەهراویتان دژی ئەوانکردوە، ئەو تەبلیغاتانە چی بوە کە ئێوە دژی ئەوان کردوتانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جیابوونەوەکەمان پێموایە جیابوونەوەیەکی شارستانییانە بوو. هیچ کێشەیەکی لێنەکەوتەوە. ئێمە ئەوەی بۆ ژیانیان پێویست بوو لە ئیختیارمان نان. ئەوەی بۆ پاراستنی خۆیان پێویستیان بوو دریغیمان لێنەکردن. دوای ماوەیەك کە ئیتر پێویستیان بە یارمەتی ئێمە نەما خۆیان وتیان کە بیبرین. بۆ تەبلیغاتی ژاراویش ئەوە ئارشیوەکان هەن، لام وایە بە دەگمەن دەتوانن وشەیەك بدۆزنەوە کە لە دژی ئەوان گوترا بێ و خیلاف واقیع بێ. زۆرێك لەو روونکردنەوانەی کە ئەوکاتە ئێمە لە رادیۆ و بڵاوکراوەکانی ئێمەدا دەهات، ئەمرۆکە دوای کێشە و دوو بەرەکایەتی ناوخۆیان، یەکە بە یەکە لەسەر زاری ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییان دەردەکەون.

**ئیدارەی سلێمانی هاوکاری موهتەدی کرد**

***چۆن بوو پێویستیان بەئەوان نەما ولەرێگای کێیەوە یارمەتیدران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پەیوەندییان بە حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئیدارەی سلێمانییەوە کرد و یارمەتی باشیش دران.

***ئەو کۆمەك و هاوکاریکردنە ناماژەبوو بۆئەوەی کەهەر ئەو لایەنە دەستی لەئینشعابی کۆمەڵەدا هەیە مادام پشگیریان دەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبرِوای من سەرچاوەی جیابوونەوەی ئەوان لە کێشەکانی ناوخۆی کۆمەڵەدا بوو. بەڵام دیارە ئەوان بەهۆی نزیکایەتی سیاسی و بە هۆی پێشینەیەك کە لە پەیوەندییەکانیاندا لەگەڵ ئیدارەی

سلێمانی بوویان، توانیان کۆمەڵێک یارمەتی بۆ خۆیان دەستەبەربکەن.

***پێتوانییە ئەگەر ئەو هاوکارییە بۆعەبدوڵڵای موهتەدی نەبوایە، ئەو جیابونەوەیە دوائەکەوت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەم بابەتەوە کاک عەبدوڵڵا خۆی هەڵەیکردبوو، رەخنەشی لێگیرا و داوای لێبوردنیشی لە کۆنگرەی حزب کرد. لام وایە هۆکاری سەرەکی ئەوەی کە ئەندامانی کۆنگرە دەنگیان پێئەدا هەر ئەوە بوو.بەڵام سەبارەت بە سەرچاوەی یارمەتییەکەیان ناتوانم بڵێم ئەگەر نەیانبوایە جیا نەدەبوونەوە، چونکە مومکین بوو بچن لە شوێنێکی دیکە پەیدایکەن.

*** پێتانوانییە ئەوەکارێکی دۆستانە نەبوو؟ ئەو هاوکارییە ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من بە هەڵوێستی دوژمنانەی لەدژی خۆمان ناوی لێنابەم.

***ئەی بەچی ناونەبەی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سیاسەت و هەڵوێست.

***پێتوانییە ئیمتیازێك لەو مەسەلەدا هەیە بۆ ئەو لایەنەی کە هاوکارییان ئەکا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر ئاساییە، کاتێك حزبێکی سیاسی چاو لەکێشەی ناوخۆی ئەو حزب و ئەو حزب دەکات، دەتوانی تەشخیسی ئەوەبدا کام لایان لە خۆی نزیکترن بە فکر و بە بۆچون بە سیاسەت و بە ئاسۆی داهاتوو، بە هەموی ئەوانەوە پێموایە رەوتێك کە کاك عەبدوڵڵا و ئەوان گرتبوویانە بەر لە بەرنامەی سیاسی و لە ئامانجی ئەم برادەرانەی کە کۆمەکیان دەکردن نزیکتربوو.

***ئەوەش مەسەلەی ناسیۆنالیزم بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دەتوانین بڵێین کە تارادەیەك لەم رەوتەدا یەکیان دەگرتەوە.

**مام جەلال ویستی جیابوونەوەی کۆمەڵە روونەدا**

***ئەوەتان بەو برادەرانە راگەیاندووە هاوکاریکردنی ئەوان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکێك لەو کەسایەتییانەی کە لە کاتی جیابوونەوەکە لە نێوان ئێمە و ئەواندا دەوری نێوبژیکەری دەبینی مام جەلال بوو. ئەو هەوڵیدا بۆئەوەی کە ئەو جیابوونەوە رونەدا. بەڵام رێگا چارەیەك کە سەرئەنجام پێشنیاریکرد بۆ بە یەکەوە مانەوەمان ئێمە قبوڵنەکرد، چونکە لامان وابوو ناتوانێ پێشی جیابوونەوەکە بگرێ وە تەنیا تۆزێك دەیخاتە دواوە و لە کاتێکدا کە بە تەواوی بەزیانی لایەنی ئێمە تەواو دەبوو.

*** چی بوو ئەوەی مام جەلال داوای ئەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ناوەرۆکی پێشنیارەکەی مام جەلال بریتی بوو لە پێکهێنانی نیوچە بەرەیەك کە نزیکبوو لەوەی کەلەکاتی خۆیدا یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەری پێکهاتبوو. ئەوە چوارچێوەی گشتی پرۆژەکە بوو کە بە نووسراوە درا بە هەر دوو لامان. بەڵام هەر لایەنەی تەفسیری خۆی لێی هەبوو.

ئەو برادەرانە دەیانەویست کە ئێمە کۆنگرە دوا بخەین و لەم ماوەیەشدا بە پێی تەوافوق هەر لایەنەی (٥٠) لە سەدی کۆمیتەی ناوەندییان هەبێ. ئەو قسەیە بە مانای ئەوە بوو کە ئێمە ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی (٨)، پەسەندکراوێکی ئەو کۆنگرەیە کە کۆمیتەی ناوەندی

کۆمەڵە بووهەڵوەشێنینەوە و لەسەروی کۆنگرەوە کەسانێکی دیکە وەکو کۆمیتەی ناوەندی دیاریبکەین کە نە مەعقول بوو، نە ئوسولی بوو و نە زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵە ئەوەیان لێ قبوڵدەکردین. ئەو تەفسیرەی کە ئەوان لە گەڵاڵەکەی مام جەلال دەیانکرد، بۆ ئەوە بوو کە ریزی هەڵسوراوانی لایەنی ئێمە تووشی ناژاوە کەن. ئەوان بریاری خۆیان بۆ جیابوونەوە دابوو، بەڵام دەیانەویست لە کاتێکدا بە عەمەلی دەستیبدەنێ کەدەسەڵاتی زۆرتریان بە دەستەوە بێ. لە حاڵێکدا کە دەسەڵاتی زۆرتر تەنیا دەیتوانی بەرهەمی ململانێکی ئوسولی ناوخۆی حزبی بێ، نەك رێك کەوتنێکی (٥٠ بە ٥٠)لە کاتێکیشدا کە ئەوان بە لانی زۆرەوە تەنیا لە سەدا (٢٠)ی کۆمەڵەیان پێکدەهێنا.

***هەربۆیە ئەوان تۆ بەوە تاوانباردەکەن کە تۆ لەگەڵ رەنیەکانی مام جەلالیش نەبووی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تاوانێك لە گۆرێدا نییە. ئێمە لەسەرەتاوە کولیاتی گەڵاڵەکەی مام جەلالمان قبوڵکرد، بەڵام کاتێك کە هەستمانکرد ئەوان خوێندنەوەیەکی بە قازانجی خۆیان لەو گەڵاڵە دەکەن، قبوڵمان نەکرد.

**مام جەلال هەڵوێستی نەگۆرا**

*** مام جەلال پێی ناخۆش نەبوو پرۆژەکەیتان قبوڵ نەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دوای ئەو ماجەرایە، هەڵوێستی دۆستانەی مام جەلال بەرامبەر بە لایەنی ئێمە نەگۆرا.

***موهتەدی ئەڵێ، عەلیزادە لە کۆنگرەی حەوتی حزبی کۆمۆنستدا، ویستی ئینشعاب ببێ ، بەڵام لە کۆنگرەی نۆدا روویدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی حەوتی حزب بە شێوەیەکی دیموکراتیک بەرێوەچوو، کاك عەبدوڵڵاش تێیدا بەشدار بوو. ئەو کۆنگرەیە لە هەڵەیەکی سیاسی و تەشکیلاتی کاك عەبدوڵڵای کۆڵیەوە. کاك عەبدوڵڵا لای وابوو هەر ئەوەندەی کە رەخنەی لە خۆی گرتووە، کافییە و خۆی کاندید کردەوە بۆ ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی و چاوەروانی ئەوە بوو کە دەنگی پێبدەنەوە.

زۆرینەی کۆنگرە دەنگی پێنەدا. تەنانەت ئێمە کە هەستماندەکرد لەوانەیە هەڵنەبژاردنەوەی کاردانەوەی هەبێ لەسەر داهاتووی یەك ریزی حزبی کۆمۆنیست، لەکۆبوونەوەیەکی پەراوێزی کۆنگرەدا، لە لایەن هاورێ سەلاح مازوجییەوە داوا لە ئەندامانی کۆنگرە کرا، کە سەرەرای خەتایەك کە لێی روودابوو، هەر دەنگی پێبدەنەوە. بەڵام دەنگدان نهێنییە و کۆنگرە ئەو تەوسیەی کاك سەلاحی لە کاتی دەنگداندا قبوڵنەکرد. پرسیار ئەوەیە بۆچی کاك عەبدوڵڵا دەبێ هەڵنەبژاردنەوەی خۆی بۆ ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیست بەمانای هەوڵدان بۆ جیابوونەوە ناوبەرێت. چ دەبوو ئەگەر ئەو وەکو زۆربەی ئەندامانی حزب بۆ دەورەیەك لە دەرەوەی کۆمیتەی ناوەندی بوبایە؟.

**موهتەدی هەڵەی کردبوو بۆیە هەڵنەبژێردرایەوە**

***بۆ هەڵنەبژێردرایەوە کاك عەبدوڵلا لە کۆنگرەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێنچینەن بە هۆی ئەو هەڵەیەوە کە کردبووی.

***چیبوو ئەو هەڵەیە لەبواری تەشکیلاتی کردبووی عەبدوڵڵای موهتەدی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەوڵیدابوو بۆ ئەوەی دەستی بە سەرچاوەیەکی ماڵی سەربەخۆ بۆ بەهێزکردنی ئەو

لایەنەی کە خەریك بوو بۆ بە دەستەوە گرتنی دەسەڵات لە دەوری خۆی کۆیان بکاتەوە، رابگات. زانیاری لەسەر داراییەك کە بۆ ئەو مەبەستە کۆی کردبۆوەو لە زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە و حزبی شاردبۆوە و تەنیا کەسانێکی دیاریکراوی خۆی لێئاگادار کردبوو.

***هەر ئەو کاتە راگەیاندوە دوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنستی ئەو کاتە کە ئینشعابین وتووتە کارێکی ناشایستەیان کردبوو ، بۆیە هەڵئەبژێردرانەوە ، دەرکران وەمەوڵەکەیان پوچەڵبووە ویستیان کودەتا بکەن، کێ بون؟ چۆن چۆنی ویستیان ئەو کودەتایە بکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من وەکو کودەتا ناوم لێنەبردووە. ئەو بە سەر سەرەوەی بەشی دارایی کۆمەڵە، پارەیەکی دیاریکراوی بە شێوەیەکی ناشەرعی هێنابووە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. دیارە پێویستە ئەوەش بڵێم کە، ئەو هیچ کەڵکی شەخسی لەو پارەیە وەرنەگرتبوو. لام وایە ئەو هەستی بەوە کردبوو کە بۆ ئەداروکی کۆنگرەیەکی دڵخوازی خۆی کە تێیدا کۆنترۆڵی هەموو حزب و کۆمەڵە بە دەستەوە بگرێ، پێویستی بە پارە هەیە.

**کۆبوونەوە لەگەڵ ئیتلاعات**

***ئەوەتا چەند راستە، هەر لەوکاتەدا موهتەدی لەسەر وەختی هاتنی خاتەمی داوای مفاوەزاتی کردووەو چرای سەوزی بۆ مفاوەزات لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هەڵگردووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە نووسراوەکانی ئەوکاتی کاك عەبدوڵادا بە شێوەیەك ئەو بۆچوونە بەدیدەکرا، بەڵام لە راستیدا رەوتی رووداوەکانی لە ناوخۆی رژێمی کۆماری ئیسلامیدا خێراتر لەوە بوون کە ئەو فورسەتی فۆلکردنەوەی ئەو بۆچوونەی خۆی هەبێ. ناسەواری شکستی پرۆژەی خاتەمی بۆ چاکسازی لە رژێمی ئیسلامیدا زۆر زووتر لەوەی کە ئەو تەسەوریدەکرد دەرکەوت. ئەو فورسەتی فورموڵەکردنی بۆچوونەکانی خۆی بە دەستنەهێنا. بەڵام پاشماوەی ئەو تەوەهۆماتەی هەر تێدا مابوو، هەر بۆیە، ساڵێك دواتر، خۆی بەشداری کۆبوونەوەیەکی نهێنی لەگەڵ‌مەئمورانی ئیتلاعاتی رژێم لە شاری سلێمانی بوو.

***ئەوەتا چەند راستە گوایە لە پانزەکەس، چوار کەس لە کۆنگرەی حەوت لەو جیابونەوەیەدا بەشداربوون، مەبەستم لە کۆنگرەی حزبی کۆمۆنیستە، کە هەشت مانگ پێش کۆنگرەی نۆی کۆمەڵە بەرێوەچوو. کەلەوێش لەبیست کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی تەنها دوکەسیان لەگەڵ موهتەدی بوون ئەمە تا چەند راستبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، ئەوە رێك وابوو. لە کاتی بەرێوەچوونی کۆنگرەی حزبدا، هێشتا جیهەتی سیاسی ئەو روون نەبوو تا بەو پێیە ژمارەیەك لەئەندامانی لە دەورە کۆبێتەوە. هەڵەکەشی ئەوەندە لە ناو ریزەکانی ئێمەدا گەورە و نامۆ بوو کە ئەگەر کەسێکیش لێرە و لەوێ تەئیدی کردبێ، لەم کێشە دیاریکراوەدا هەوڵی ئەدا کە خۆی لێدوورخاتەوە.

***بەڵام ئەوان هەربەو دووکەسەوە نەمانەوە، بەڵکو بەشێکی زۆر لە کادرانی قەدیمی کۆمەڵە دواتر چونەوە پاڵ عەبدوڵڵا موهتەدی ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ وایە، ئەوانەی کە کەوتنە شوێن حەرەکەتەکەی ئەو، کەسانێك بوون کە هەستیان بە نزیکایەتی لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەو دەکرد. ئەو توانی، هاوپەیمانی فیکری و سیاسی لە ناو ریزەکانی حزب و کۆمەڵەدا بۆ خۆی بدۆزێتەوە. ئەوانە کەسانێك بوون کە ئامادەبوون لەپێناوی هاوجیهەتی

سیاسیدا، له خەتاکەشی چاوپۆشی بکەن.

***کۆنگرەی نۆ وەکو خۆت دەزانی، شەش مانگ دواکەوت، موهتەدی دوای ئەوەش داوای دواخستێکی تری ئەکرد بۆ کۆنگرەوە، داوای (٥٠٪)ی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیشی دەکرد لەو گروپەی ئەو بێت، لە کاتێکا ئێوە قەناعەتتان وابوو (٢٠٪) لایەنگرانی موهتەدی لەو کۆنگرەدا بەشدار دەبن یان لەو کۆمیتەی ناوەندییەدا بەشداردەبن، بۆچی کاک عەبدوڵڵا داوای ئەمانەی دەکرد ؟ بۆچی ئێوە قبوڵتان نەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو بۆ ئەوەی جێگە پێی خۆی مەحکەمتر بکات، پێویستی بە زەمان هەبوو. بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێ لەو زەمانە کەڵکی پێویست وەربگرێ، دەبوایە خۆی و ژمارەیەك لە لایەنگرانی لە ناو کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەدا ببن. ئەوەش بە شێوەی شەرعی و لە ڕێگەی کۆنگرەوە بۆی مەیسەر نەدەبوو. هەر بۆیە لە ڕێگەی هێنانە گۆڕی هەرەشەی جیابوونەوە، زەختی دەهێنا بۆ ئەوەی بە شێوەی تەوافوق نیوەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە لایەنەکەی ئەو بن. ئەوە بۆ ئێمە قبوڵنەدەکرا، چونکە دانی ئەو ئیمتیازە بە ئەو تەنیا لە سەلاحیەتی کۆنگرەدا بوو. ئەویش نەیدەویست بێتە ناو کۆنگرەیەکەوە کە تێیدا کەمایەتی بێ. ئەوەی ئەو داوایدەکرد، دابەشکردنی دەسەڵات بە شێوەی ناشەرعی بوو. ئەو داوایە لەگەڵ هەموو بنەمای فیکری و سیاسیمان، لەگەڵ سوننەتی تێکۆشانی تا ئەوکاتی حزبیمان ناتەبا بوو.

## کۆمەڵەی شۆڕشگێر، ناسیۆنالیستێکی بێ چارەسەرە بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی

*** کاک عەبدوڵڵا پێیوایە یەکێکی تر لە دەستکەوتەکانی ساغبونەوەی کۆمەڵە، چالاکی سەربەخۆیەتی بریتییە لەوەی کە ڕەوتی چەپو ڕادیکاڵی لە کوردستانەوە خستۆتە سەر سکەی خۆی، لە کاتێکدا ئێوە ئەوان تاوانبارئەکەن بەوەی کە ئەوان ڕەوتێکی ناسیۆنالیست یاخۆ مەیلو گەراشێکی قەومیانەیان زیاترهەیەو ئاڵای کوردستانیان هەڵگردوە ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە کردەوەی ئەم یەك، دوو ساڵەی دوایی ئەوان بە تایبەت ئەوەی نیشاندا کە بەڕاستی و لە هەڵسەنگاندنێکی مونسیفانەدا ئەوان ناسیۆنالیستن، بەڵام بەبڕوای من ناسیونالیستێکن کە لە توانایاندا نییە کارێکی گرنگیش بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی بکەن. خۆ هەڵواسین بە بەرەیەکی کارتۆنی بە ناوی بەرەی گەلانی ئێران، هەستان و دانیشتن لەگەڵ کوڕی شاو شا پەرستەکانی ئێران و بەدەوروبەری ڕێکخراوێکی وەکو فیدائیانی ئەکسەریەتدا هاتن لە گوێ و هەوڵدان بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەی کورد لە ئێران لە کوێ؟ پرۆژەی ستراتیژیکی ئەوان واتە فێدرالیسم بێ بنەماتر لەوەیە کە بتوانێ تەنانەت ئیدیعای ئەوەش بکات. بە بڕوای من ئەوان لە بەرەی سۆسیالیسمدا نەماون، ئەگەر دەور و بەرلێیان قبوڵکەن، پێیانناخۆش نییە ئەگەر لە جێگای خۆی وەکو سۆسیال دیموکرات پێناسەیان بکەن. بە دوو زمان قسەکردن و بە پێی مەسڵەحەت لێرە و لەوێ هەڵوێستی ناتەباگرتن، هاتوچۆ لە نێوان سۆسیالیسم و ناسیۆنالیسمدا، ئەوڕۆکە باوی نەماوە و خەڵك وریاتر لەوەن کە ئەو گەرمێن و کوێستان کردنە تەشخیس نەدەن.

***یەکێکی تر لە قسەکانی کاک عەبدوڵڵا موهتەدی ئەوەیە ئەڵێ "ئەوکاتە لەناو حزبی کۆمۆنیستدا ئێمە لە حزبێکابوین تەشکیلاتێکی بێ سەرەو بەرە ڕەنجمان دەبرد، حەق کوژی تێدا هەبوو، گەندەڵی تێدابوو، لەبەر ئەو کارانە حزبی کۆمۆنیستمان بەجێهێشت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە هەرگیز ڕێکخراوێکی گەندەڵ نەبووە، کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەمیشە بۆ

خەڵکی کوردستان نمونەی پاکی و راستگۆیی بووە. بەڵام بە داخەوە کاک عەبدوڵڵا موهتەدی خۆی لە دوایین ساڵەکانی مانەوەی لە ناو کۆمەڵەدا تووشی هەڵەیەکی کوشندە بوو کە بە داخەوە دەچێتە خانەی گەندەڵییەوە و لەگەڵ خۆشی چەند کەسێکی لە کەسانی دەوروبەری خۆی تێوە گلاند، هەر بۆیەش لە کۆنگرەی (٧)ی حزبدا هەڵنەبژێردراوە. کۆنگرەکانی زۆربەیان لە کاتی خۆیاندا بەڕێوە چوون، هەرگیز هیچ نمونەیەك لە پێشێلکردنی ماف ئەندامان بۆ هەڵبژاردن لە کۆنگرەکاندا نەبووە. ئاساییە کە گیروگرفتی ناوخۆیی بووە، بەڵام وەکو نەریتی جێکەوتوو هەمیشە هەوڵدراوە کە بە شێوەی هاوڕێیانە چارەسەربکرێن.

ئایا بە راستی ئەو هەڵسوکەوتەی کەمەوان لەم دواییانەدا و لە کاتی پەرەسەندنی ناکۆکییەکانی نێوان خۆیاندا نیشانیاندا، هیچ پەیوەندییەکی بە نەریتی تا ئێستای کۆمەڵەوە هەیە؟ ئەوەیە ئەو بوژاندنەوەی کە ئەو بەڵێنی دابوو؟

*** ئەوەتا چەند راستەکە فراکسیۆنەکانی ناو پەرلەمانی ئێران رۆڵیان هەبوو لە یەکخستنەوەی ئێوەوکاك عەبدوڵڵا بۆ ئەوەی کە ئەو ئینشعابە روئەدا، بەنهێنی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموایە ئەوە بنچینەی نییە.

***بەڵام پاش ئەم جیابونەوانە، هەمان رادیۆ، هەمان مەراسیم ، (٢٦)ی رێبەندان، (٣١)ی جۆزەدان مەراسیمەکانی گوردانی شوان، کارەساتی هەڵەبجەو بۆتێ لای هەردووکتان بۆنتە مولکی خۆتان هەرکەسی بەناوی خۆیەوە دیمایەی بۆ بکات، شەهیدەکانتان هەرکەسە بەناوی خۆیەوە دیمایەی بۆ بکاو بە مولکی خۆی بزانێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەمانە بەشێك لە مێژوی کوردستانن. ئەوە مێژووی خەباتی گەلێکە بۆ ئازادی. بەرەی رادیکالی چەپ لە کوردستان دەوری چارەنووس سازی تێدا بینیوە و تەنیا ئومێدی سەرکەوتنی قەتعی دواڕۆژی ئەو خەباتەشە. ئەو برادەرانەش کە لە ئێمە جیابوونەوە هەر بەشێکن لەو مێژووە. ئەم رابردووە مولکی تایبەتی هیچ کەس نییە و هەموو کەس بۆی هەیە شانازی پێوەبکات و رێزی لێبگرێ. بەڵام بۆی نییە ئەم رابردووە چەواشە بکات. مێژوویەکی درۆیینەی بۆ بنوسێتەوە. رووداوەکانی لەسەر حەز و مەسلەحەتی ئەمڕۆی خۆی لێکبداتەوە.

*** بەمێژووی (٢٠٠١/٢/١٥) لەراگەیاندنێکی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بەیاننامەیەکیان داوەتەدەر بەناوی راگەیاندنی کۆمیتەی ناوەندی سەبارەت بە پیلان گێڕییەکانی باندی خائین و ریسوایی(مەنسوری حیکمەت)، هاتوە کە حزبی کۆمۆنیست بەشدارن و نزیك ئەبنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەمە بەشێك لە شەڕێکی تەبلیغاتی بوو کە ئەو دوو لایەنە لە دژی یەکتر دەستیان دابوویە. ئێمە لەگەڵ ئەو شێوە لێدوانانە لە ناو ریزەکانی ئۆپۆزسیۆنی رژیمی ئێران نین و هەر ئەو کات هەوڵاندا خۆمانی لێدووربگرین. نزیکبوونەوەی ئێمەش لە جەرەیانی کۆمۆنیزمی کرێکاری، چاوورلوێك بوو کەحزبەکەی کاك عەبدوڵڵا بە مەبەستی تایبەت بڵاویاندەکردەوە. لایانوابوو بەم شێوەیە ئەیارانی کۆمۆنیزمی کرێکاری لە کوردستانی عیراق لە دژی ئێمە هاندەدەن کە تێیدا سەرکەوتوو نەبوون.

**کۆمۆنیزمی کارگەری قسەیان بەیەکێتی و مام جەلال دەوت**

***یەکێتی نیشتمانی تاکوێ گوێی لەو داوایانە ئەگرت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من گوێی پێنەدان.

**★چۆن کۆمەڵەی زەحمەتکێشان هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە نایەڵێ حزبی کۆمۆنیستی کارگەری بێتەوە فەعالییەتکا بە چ دەلیلێك بەچ هێزێك؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەداخەوە ئەوان نەك هەر لە دژی کۆمۆنیسمی کرێکاری لەو جۆرە هەڕەشانەیان دەکرد، بەڵکو بە نیازی شەڕ هەڵگیرساندن لەدژی ئێمەش بوون و چەند جارێك بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە تەقەشیان لە شوێنەکانی ئێمە کرد. خۆشبەختانە زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندی ئەوان سەرئەنجام لەگەڵ ئەو پلانە موافەقەتی نەکرد، ئەگینا ئەگەرچی من لەو بڕوایەدام کە ئەوان لەڕووی ئیزامییەوە شکستیان دەخوارد، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبوو بە کارەساتێکی سیاسی و ئینسانی.

**مەنسوری حیکمەت، نەخائین و نەبەکرێگیراوبوو**

**★ هەر لەو ڕاگەیاندنەدا هاتووە کە ئاغای ئیبراهیمی عەلیزادە لەگەڵ خەتی هاوبیرانی کۆمۆنیزمی کارگەری پەیوەندییەکی نزیکایەتی هەیە، "ڕاشیان گەیاندووە مەنسوری حیکمەت و حزبەکەی وەکو ڕەوتێکی سۆسیالیستی کرێکاری ناناسین، بەڵکو ئەوانە وەکو ڕەوتێکی خائین و بەکرێگیراو دەناسین.خائین و بەکرێگیراوی کێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من مەنسوور حیکمەت و ڕەوتێك کەو ئەو نوێنەرایەتی دەکرد نەخائین بوون و نە بەکرێگراو. ئەوان بیری جیاواز و ڕێگای جیاوازیان لەگەڵ ئێمە هەبوو. ئەوە گەلێك ئاساییە و ئەم جۆرە ناو و ناتۆرە لێدانە ناسیاسی و سووکن.

**★مەبەست لەو خائین و بەکرێگیراوە چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان کۆمەڵەیان بەجێهێشت لە کاتێکدا کە باوەڕیان بە ڕێبازەکەی نەمابوو. باسەکانیان سیاسی بوو کە خۆیان باوەڕیان پێی بوو. پێشتریش باسمکردووە کە لە ئەزەر منەوە باسەکانیان لە کات و لە شوێنێکی نابەجێیەوە دەستپێکرد، کە ئەوەش زەرەری خۆی گەیاند و جێگای ڕەخنەیە، هەر ئەوەندە. ئەوان هاوڕێیانی ڕۆژانی خۆش و ناخۆشمان بوون و تا کاتێك کە لە گەڵمان بوون بەفیداکاری و لێبراوی و ڕۆشن بینییەوە بە یەکەوە کارماندەکرد، جیابوونەوەکەش لام وایە سەرجەم جیابوونەوەیەکی شارستانییانە بوو. ئەم جۆرە پڕوپاگەندەیە کە لە هەر دوو لایەنەوە پەرەی پێدەدرا هیچ ئاکامێکی جگە لە ژاراویکردنی کەشوهەوای سیاسی کوردستان نەبوو.

**ئەندامانی کۆمەڵە داوای مانەوەیان کرد لەحزبی کۆمۆنیست**

**★وەلحاسڵ کۆنگرەی نۆ کۆنگرەیەکی پڕ کێشەو قەیران و ناخۆشی بوو بۆ کۆمەڵە دەرئەنجام ئەوەی لێکەوتەوە کە چاوەڕوان نەکرابوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی نۆی کۆمەڵە کۆنگرەیەکی پڕ کێشە نەبوو. چونکە ئەوان هەر نەهاتنە ناو ئەو کۆنگرەیەوە. کۆنگرەی پڕ کێشە کۆنگرەی (٧)ی حزب بوو کە تێیدا لە هەڵەی کاك عەبدوڵڵا کۆڵدرایەوە. پێش بەڕێوەچوونی کۆنگرەی (٩)ی کۆمەڵە بڕیارنامەیەك گەڵاڵەکرا کە بە پێی ئەو بڕیارنامەیە دەبوایە لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە ناو ئەندامانا ڕێفراندۆمێك بکرێ و تێیدا لەئەندامان پرسیاربکرێ ئایا دەیانەوێ لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بمێننەوە یان نا؟. ئەوان ئەم ڕێگاچارەیان پەسەند نەکرد. دوای ڕۆیشتنی ئەوان کۆنگرە ئەو بڕیارنامەیەی پەسەند کرد و سەرئەنجام ئەو ڕاپرسییەکرا و زیاتر لە سەدا نەوەدی ئەندامانی کۆمەڵە بڕیاری مانەوەیان لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا قبوڵکرد.

(١٦) ی گەلاوێژ دەربخست کێ کۆمەڵەیە؟

***کاک عەبدوڵڵا رائەگەیەنێ ئەوەی کەپاش ساغکردنەوەی کۆمەڵە لەماوەی یەک ساڵداکراوە، زیاترە لەساڵانی رابردوو توانیویانەخەڵک راکێشن بۆ ناو ریزەکانی کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وانییەکاک عەبدوڵڵا ئێستا باوەری بەو قسەیەی خۆی هەبێت. لە (١٦)ی گەلاوێژی ساڵی (١٣٨٤) ئێمە بە ناوی کۆمەڵەوە داوامان لە خەڵکی کوردستان کرد بۆ پشتیوانی لە خەڵکی شاری مەهاباد و دەربرینی بێزاری لە جینایەتێك کە دەرحەق بە لاوێکی تێکۆشەری کورد بە ناوی "شوانەی قادری" کرابوو خەڵك دەستبدەنە مانگرتنێکی گشتی. هاوکات ئەوانیش هەر بە ناوی کۆمەڵەوە داوایان لە خەڵك کرد کە وەڵامی ئەو بانگەوازە نەدەنەوە. ئەوەی بە کردەوە روویدا مانگرتنێکی شکۆداری سەرانسەری بوو هەر لە ورمێ وە هەتا کرماشان. ئەو رووداوە بەراورد بکەن لەگەڵ ئەو ئیدعایە کە ئەمان دەیکەن.

لام وایە ئەو پرۆژەیەی ئەوان کە لە روانگەی خۆیانەوە ناوی ساغکردنەوەی کۆمەڵەیان لێنا، بە مانای وردی وشە شکستی خواردووە. ئەوان لەم ماوەیەدا کۆمەڵەکەی خۆیان لە سفرەی رازاوەی ناو ئۆردوگاکەیاندا بوژاندەوە و خۆشیان تووشی ئەو خۆشباوەرییە بوون کە گۆیا ئەوەیە بوژاندنەوەی کۆمەڵە. هەڵبەت ئەمرۆکە کەسانێك هەن کە هەوڵدەدەن کە بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەم پرۆژە زیندوو بکەنەوە، بەڵام لەو باوەرەدام ئەوانیش تێیدا سەرکەوتوو نابن.

***ئەو سفرەیەی کە تۆ ئەیڵێیت ئێستا سفرەیەکی رازاوەیەوکۆمەڵێك پیناو خانوی سپۆرتیان دروستکردووە لە زرگوێزەڵە، ئەتەوێ بڵێی کێ لەپشت ئەوەوەیە یەعنی ئەو دەعمە لە کوێوە دێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەبڕوای من پەیداکردنی پارە بۆ ئەو ئەوعە کارانە بۆ حزبێکی سیاسی کە لەسەر ریبازی کۆمەڵە نەمابێ زۆر گران نییە.

***تۆ گەیشتوی بەو قەناعەتەی کە نفوزی ئێوە زۆر زیاترە لە نفوزی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، یا ئەوەی کە ئەوان وا دەڵێن تا چەند راستە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەرچەند ئێستاش گەلێك نیشانە هەیە کە دەتوانێ تاڕادەیەکی زۆر راستی ئەو مەسەلەیەمان بۆ روون بکاتەوە، هەر بەم مەبەستە بوو کە من نمونەی(١٦)ی گەلاوێژی (١٣٨٤)م بۆ هێنانەوە. بەڵام دیارە لە هەلومەرجێکدا کە دیکتاتۆرییەکی سەرکوتگەری ئیسلامی لە ئێران لەسەر کارە مەجال بۆ دەرکەوتنی رادەی نفوزی ئەم یان ئەو حزب بەرتەسکە. لەگەڵ پەیدا بوونی هەر تروسکاییەك لەدیموکراسی لە کوردستاندا دەردەکەوێ کە باڵی چەپی ئەم کۆمەڵگایە رەوتێکی کۆمەڵایەتییە بە پانایی هەموو کوردستان.

***لە گوزارشتی کاک عەبدوڵڵای موهتەدی بۆ کۆنگرەی نۆ هاتووە " پێویستە لە مەودوا کۆمەڵە ببێتە رێکخراوێك و چەترێك کە کوردی ئێران لە خۆیدا نوێنەرایەتی بکا، یەعنی مەبەست لە کوردی ئێران چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە لەسەرەتاوە کە دروستبووە رێکخراوێك بوە کە خۆی بە چینێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتییەوە گرێ داوە. جا لەو پێگەیەوە چووە بۆ چارەسەر کردنی هەموو کێشە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە و لەوانە مەسەلەی نەتەوایەتیش لە کوردستان. بۆیە پێموایە ئەو فۆرمۆڵەی کە ئەوان بەکاری دەبەن لە واقیعدا دورخستنەوەی کۆمەڵەیە لە ناسنامە چینایەتییەکەی .

***پێتوایە کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی رێکخراوێکی چەپە؟ تۆ پێتوایە ؟ وەکو ئەوەی ئەوان خۆیان**

نەیلێن؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەرەتای جیابوونەوەکەیاندا هەوڵیاندا بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆرتر لە ئەندامانی کۆمەڵە بە لای خۆیاندا بکێشن، بە زمانێکی چەپ قسە بکەن. بەڵام لەم کاتەوە تا ئێستا هەتا هاتووە رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر بەرەو راست کشاون.

**عیراق، نەیویست پەیوەندی لەگەڵ سازمانی زەحمەتکێشان هەبێ**

*** بە دوای جیابونەوەی سازمانی زەحمەتکێشان، پەیوەندییەکانی ئەوان لەگەڵ عیراق پچڕاوە، بەپێچەوانەوە پەیوەندییەکانی ئێوە بەردەوام بوو، ئەوان یەکێك لە شانازییەکانیان ئەوەیکە رێگاکانیان قەتعکردوە لەگەڵ بەعس، ئەوان هیچ بارەگایەکیان نییە لەوێ، هەموو پەیوەندییەکانیان بڕیوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شاهیدی زیندوو هەیە بۆ ئەوەی کە ئەوان هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی کە ئەو پەیوەندییە بەرقەرارکەن، بەڵام دەوڵەتی عیراق ئەو پەیوەندییەی بەرقەرار نەکردوە.

***بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لام وایە لەو کاتەدا دەوڵەتی عیراق نەیدەویست بە هاندەری جیابوونەوەکەی ئێمە بناسرێ. وەکو تەجرەبەیەك خۆیان دەیانگوت کە ئێمە نەدەبوایە لە جیابوونەوەکەی حزبی دیموکراتیش لە هیچ لایەنێك پشتیوانیمانکردبا، دەبا هەر رەوتی ئەسلییەکە کە بۆمان ئەوە نیدامەمان دابا، تا بەم وەسیلەیە ئیمکانی یەکگرتنەوەیان فەراهەم بکەین.

***ئەمە کێ؟ رەئی کێ بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رەئی مەسئولینی عیراقی بوو کە بە نوێنەرایەتی ئێمەیان راگەیاندبوو.

***راستیاندەکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان لەگەڵ رژێمی کۆماری ئیسلامی کێشەیەکی دوورودرێژی مێژوویيان هەبوو. لەم جۆرە مەسەلانەش کە دەهاتەپێش ئەوان زۆر تاکتیکی و پراگماتیکی بیریان دەکردەوە و لایان وابوو تەفرەقەی ناو هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن بە قازانجی ئەمرۆی کۆماری ئیسلامی تەواو دەبێ.

***لە گوزارشتی عەبدوڵڵای موهتەدیدا بۆ کۆنگرەی نۆ هاتووە "کە حزبی دیموکرات زۆر بە گەرموگوڕی لەو جیابونەوەیە ئەڕوانی"، واتە مەبەستی ئەوەیە کە خۆشحاڵە بەو جیابونەوەیە، تۆ لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبووی؟ وە حزبی دیموکرات بۆ خۆشحاڵە بەجیابونەوەی کۆمەڵە؟ کە دەرەنجام دەبینیت لە چەند مانگی رابردودا دیموکرات خۆی توشی ئەو لێکجیابونەوەو ئینشعابە بونەتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من بە راستی بە شێوەی رەسمی بە شێوەی راگەیاندن شتێکی وام لێ نەدیتن کە ئەو خۆشحاڵییەی خۆیان دەربڕن ئەوەی کە ئەم یا ئەو مەسئولیان ئەم یا ئەو بەشی تەشکیلاتیان خۆشحاڵ بوو بێ یا لە کۆبوونەوەیەکی ناوخۆیی خۆیاندا خۆشحالی خۆیان دەربڕی بێ، خۆ ئێمە ئاگاداری ئەوان نین، بەڵام روو بە دەرەوە ئێمە شتێکی ئەوتۆمان نەدیتوەلێیان.

**کۆمەڵە، دەستی لەجیابوونەوەی دیموکراتەکاندا نەبوو**

***ئێوە بەجیابونەوەی ئەم دوایەی ( حزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران) لە (حزبی دیموکراتی کوردستان ئێران) باڵی مستەفاهیجری تا چەند خۆشحاڵن، کە قسەی ئەوە دەکرێ کە کۆمەڵە خۆشحاڵە یا لەپشت ئەو**

**مەسەلەیەوە چەندین دیداری خێرا ئەنجامدراوە بۆ نموونە لەنێوان عەبدوڵڵای موهتەدی و باڵی جیابووەی حزبی دیموکرات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هیچ هەوڵێکمان بۆ جیابوونەوەی ئەوان نەداوە. تەنانەت ئەو گرژی و ناڵۆزییەی کە لە نێوانیاندا پەیدا بووە پێمان ناخۆشبوو و پێمانوابووە کە بە زیانی خەباتی سیاسی هاوبەشمان لە دژی رژێمی کۆماری ئیسلامییە. ئەم جۆرە رووداوانەی کە لە کاتی جیابوونەوەکاندا روودەدەن کەشوهەوایەکی نالەباری سیاسی لە کوردستاندا دەخوڵقێنن کە لە نیهایەتدا بە زەرەری هەموو لایەك تەواو دەبێ. جیابوونەوە دەتوانێ گەلێك ئاسایی بێ بەو مەرجەی کە لەسەر بنەمای ناکۆکی سیاسی جیدی، ناکۆکی ستراتیژی و بەرنامە و بە شێوەیەکی هێمنانە و شارستانییانە بەرێوە بچێ.

**دیموکراتەکان، کێشەی پلەو پایەیان هەبوو**

***بەقەناعەتی تۆ فاکتەرەکانی پشت جیابونەوەی سەرلەنوێی حزبی دیموکرات پاش جیابوونەوەی ساڵانی کۆتایی هەشتاکان لەنێوان حزبی دیموکرات و رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ، ئەو فاکتەرانە چین، چەندە خەتەرە لەسەر مەسەلەی کورد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من پێموایە کە رەهبەرانی حزبی دیموکرات خۆشیان نازانن کە ئەوکات بە وردی لەسەر چی جیابوونەوە. واتە ناتوانن تەوزیحێکی واقعی بدەن لەسەر هۆکاری جیابونەوەکەیان، نەك ئەوەی کە ئەیشارنەوە، لەوانەیە هەر خۆشیان تەشخیسی ئەوە نەدەن کە بەراستی لەسەر چیبووە. بەڵام من پێموایە کە زۆرجار ئینسانەکان بەعەزە کردوەوەیەك دەکەن کە خۆشیان نازانن سەرچاوەکەی چییە، بەڵام کەسێك لە دەرەوەی خۆیان دەتوانێ بزانێ کە سەرچاوەکەی چیبووە.

بەبروای من لە ناو حزبی دیموکراتدا کێشەی تەشکیلاتی هەبووە، ناکۆکی لەسەر کورسی و پایە هەبووە، پێشێلکردنی دیموکراسی هەبووە. بەڵام پرسیار ئەوەیە کە بۆچی رێبەرانی حزب ناتوانن ئەو کێشانە چارەسەر بکەن؟ بۆ ئیمکانی ئەوەیان نییە چارەسەری بکەن؟ لەبەرئەوەی کە نفوز و متمانەی پێویستیان پێناگرێ، ئەو متمانەیان لە دەستداوە. بەڵام ئەو نفوزومتمانەیە لە کوێ لە دەستچووە؟ لە مەیدانی سیاسەتدا. واتە ئەگەر لە حزبێکا کۆمیتەیەك یان تەنانەت بڵێم کەسایەتییەك لە قۆناغە گرنگەکانی سیاسی کە بەسەر کۆمەڵگا و خەباتەکەیاندا دێت بتوانێ ئەو رێکخراوەیە یان ئەو کۆمەڵگایە بە سیاسەتی دروست بە سلامەتی دەربازبکات، کادر و ئەندامانی ئەو حزبە ئەوەندە خۆیان بەقەرزاری ئەو رەهبەرییە دەزانن کە لەکاتی قەیرانی سیاسیدا کە حزبەکەیان تووشی دەبێ بە قسەیان بکەن. حزبی دیموکرات بەهۆی ئەوەی کە بە درێژایی چەند ساڵی پێش لە تیرۆری قاسملوو چی سیاسەتی دارشتوە غەڵەت دەرهاتوە، چی سیاسەتی دارشتوە نەتیجەی پێچەوانەی بووە، لەو کاتدا تووشی ئەزمە دەبێ و دکتۆر قاسملوو وەکو کەسایەتیەکی ناوداری ئەو حزبەش ناتوانێ کۆنتڕۆڵی بەسەردا بکات. با بۆ نموونە باسبکەم. سکرتێری گشتی حزب دەچێتە ناو گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی کۆماری ئیسلامی بە بێ ئاگاداری دەفتەری سیاسی حزبەکەی، گفتوگۆ دەکات لە کاتێکدا کە حزبەکەی خۆی لە لاوازترین هەلومەرجی ژیانی دایە و رژێمیش لەبەهێزترین هەلومەرجی خۆیدا. گوا ئەو هاوسەنگییە گفتوگۆی هەڵدەگرت.

لە شەڕ لەگەڵ کۆمەڵدا کۆمەڵێك پێش شەرتی نادیموکراتیك بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕ دادەرێژن کە نەك هەر تەنیا کۆمەڵگا لێیان قبوڵ ناکات بەڵکو ناتوانن دۆستان و سەمپاتەکانی خۆشیانی پێ رازیبکەن.

لە دارشتنی سیاسەت بەرامبەر بە رەوتی ریفۆرمی حکومەتی لە ئێران تووشی بێ ئینسجامی دەبن و سەر لەلایەنگرانی خۆشیان دەشێوێنن.

خەباتی چەکداری بەکردەوە وەلا دەنێن بە بێ ئەوەی کە هیچ روونکردنەوەیەکی سیاسی و ستراتیژیک بۆ خەڵك و بۆ ریزەکانی خۆیان بدەن. حزبێك کە بۆ ساڵیانی دوورودرێژ بنەمای چالاکی خۆی لەسەر خەباتی چەکداری دادەرێژێ، لە وەها کاتێکدا چۆن تووشی ئەزمە نابێت؟. خۆیان بە سیاسەتی ئەمریکا لە ناوچەکەوە گرێدەدەن و بە پرۆژەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەراست هەڵدەڵێن، دوای ماوەیەك بە خشکەیی لێی پەشیمان دەبنەوە و هەوڵدەدەن هەڵوێستی رابردوویان پینەوپەرۆ بکەن.

ئەوانە و لەوانەیە چەندین نموونەیتریش کە هەر یەکێکیان بۆ هەڵتەکاندنی حزبێکی نۆرماڵ بە بێ ئەوەی رەخنە لەخۆی بگرێ، کافییە، هەموویان لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا روویانداوە. ئەم قەیرانە لە کێشەی دیموکراسی ناوخۆی حزبدا و لە کێشەی پاوانخوازی سەرکردایەتی و کۆمەڵێك شتی ریکخراوەییدا سەر هەڵدەدات، بەڵام ئەمانە رووکەشی ئەزمەکەن و ناوەرۆکی ئەوەیە کە باسمانکرد. بەبڕوای من ناسیۆنالیزمی کورد لانیکەم لە سێدەیەی رابردوودا نیشانیداوە کە ناتوانێ رێبەرێکی لێوەشاوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی بێ، ناتوانێ کۆمەڵگا بە سەلامەت لەم کێشەیە دەرباز بکات و خەڵکی کورد بە مافی دیاریکردنی چارەنووسیان شاد بکات. خەتەرێك ئەگەر هەبێ لێرەوەیە. بەڵام کۆمەڵە لە کوردستانی ئێران دەتوانێ بەرامبەر بەم خەتەرە بەدیل بێت. ئێمە هیواداریین و هەوڵدەدەین دەوری خۆمان لەم بابەتەوە بنوێنین.

***پێتوانییە فاکتەرێکی دەرەکی مەبەستم ئێرانە لەپشت ئەو مەسەلانەوەیە ناڕاستەوخۆ، وەکو چۆن وتت لە جیابونەوەی کۆمەڵەدا دەستی هەبوو، جارێکی تر فاکتەرێکی ناوخۆیی کوردستانی عیراق کە مەبەستم یەکێتی نیشتمانی کوردستان‌و پارتی دیموکراتی کوردستانە دەستیان لەو مەسەلەیەدا هەیە وئەوەی کە تۆ باستکرد ناوشیاری سەرکردایەتی سیاسیە، هەرئەم سێ فاکتەرە هەرسێکیان لەپاڵ جیابوونەوەی حزبی دیموکراتن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دەزانم کە کۆماری ئیسلامی ئێران ئەگەر رێگا دەستێکی هەبوو بێ بە دڵنیاییەوە کەڵکی لێوەرگرتووە. بەڵام ئایا لە چ کەناڵێکەوە کردویەتی؟ کەی کردویەتی؟ چۆنی کردووە؟ لەو بابەتەوە دەبێ فاکتی موشەخەس هەبێ کە ئینسان بتوانێ قەزاوەت بکات. من ئەو فاکتانەم نییە.

**یەکێتی و پارتی هۆکاری جیابوونەوەی دیموکرات نین**

***رۆڵی یەکێتی و پارتی رۆڵێکی نێگەتیڤانە نییە لەو مەسەلەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رەقابەتی یەکێتی و پارتی لە ناو کێشەکانی ئەم دواییانەی حزبی دیموکراتدا رەنگدانەوەیەکی هەبوو، بەڵام من ئەوان بە هۆکاری لەت بوونی حزبی دیموکرات نازانم.

***فاکتەرێکن یەکێکن لە فاکتەرەکان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** فاکتی پێویستم بۆ وەها قەزاوەتێك لە دەستدا نییە.

***یەکێك لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی حزبی دیموکراتی کوردوستانی ئێران بە منی وت "جیابونەوەی کۆمەڵەکان زۆر مۆدێرنانە تربوو لە جیابونەوەی ئێمە، کە خەریکە ئەگاتە شەڕە تفەنگ، پێتوایە ئەمە ئیمتیازێکە بۆ کۆمەڵە؟یان ئەمە فەرهەنگی کۆمەڵەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ناو کۆمەڵەدا ئێمە بەردەوام هەوڵمانداوە کێشە و ناکۆکییە سیاسییەکان بە سوونەتەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ. ئەڵبەت ئەوەش بڵێم کە بە بڕوای من جیابوونەوەیەکی شارستانییانە هێندە شانازییەکی گەورە نییە، ئەوە لانیکەمی تەوەقوعێکە کە ئینسانێکی سیاسی ئەم سەردەمە دەبێ لە خۆی و لە ڕێکخراوەکەی هەبێ. بە پێچەوانەکەی بە راستی کارەساتە.

**سەلاحی موهتەدی موخالیفی فیکری ئێمەبوو**

*** یەك پرسیاری تایبەت سەبارەت بە جیابوونەوەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان لە کۆمەڵە، وەکو چەندین جاریش بیستومە کە( سەلاحی موهتەدی) رۆڵێکی دیوە لەم مەسەلەیەداو لە بزووتنەوەی سیاسی بەردەوامی کۆمەڵەی ئێراندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەندەی کە من لە نزیکەوە کاك سەلاحی موهتەدی بناسم، هەر لەسەرەتای پێکهاتنی کۆمەڵەوە تا بە ئەمڕۆ لەگەڵ رێبازی سیاسی و جیهەتی فیکری و بەرنامەی ئێمە مۆخالیف بووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە وەکو ئینسانێکی سیاسی هەم هاتوچۆی بۆ لامان هەبووە و هەم ئێمە چووین بۆ لای ئەو و پەیوەندییەکی سیاسی نۆرماڵمان لە گەڵی هەبووە. ئەو بەردەوام هەوڵیداوە کە لەو پەیوەندییە بۆ ئەوەی کە ئێمە بەرەو ناسیۆنالیزم رابکێشێ و لە کۆمۆنیزم دورمانخاتەوە، کەڵك وەربگرێ. ئەوەش شتێکی گەلێك ئاساییە. بە لای منەوە گەلێك ئاساییە ئەگەر ئەو لە کاتی جیابوونەوەی باڵی کاك عەبدوڵڵا و ئەواندا لایەنگری لێکردبن، چونکە ئەوە ئاواتێکی چەندین ساڵەی ئەو بوو کە لای وابوو خەریکە دێتە دی. دیارە رۆڵێك کە ئەو هەیبووە بۆ خۆی و بۆ رەوتەکەی باش بووە و بۆ ئێمە و بۆ رەوتەکەمان خراپ بووە.

**یەکێتی هاوکاری باشتری کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کرد**

***جگە لەوانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە پێی نفوزێك کە لە ناو یەکێتیدا بوویەتی لە کاتی جیابوونەوەکاندا هەوڵیداوە کە بە تایبەت لە بواری ماددییەوە کارئاسانییان بۆ بکات.

***چی بۆ کردون، شتی بەرچاوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەبواری دابینکردنی ئیمکاناتی ماددی، لە بواری ئاسانکاری ئیداری، لە بواری کردنەوەی رێگایان بۆ زانکۆکانی کوردستان و شتی تری لەو چەشنە.

**موهتەدی دەڵێ دەچینە بەرەبەر ناچینە ناو حزبی کۆمۆنیست**

*** کاك عەبدوڵڵای موهتەدی دەڵێ کادیرەکانی ئێمە پاش ساغکردنەوەی کۆمەڵە وتیان لەبەرئەوەی حزبی کۆمۆنست زۆر غەدری لە کادرەکانی ئێمە کردوە ، کادرەکانی ئێمەو پێشمەرگەکانی ئێمە گوتویانە دەچینە بەرەبەر، بەڵام ناچینە ناو حزبی کۆمۆنست ، ئەو غەدرانە چیبوە ئێوە کردوتانە؟ تاچەند ئەوانە راستە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك عەبدوڵڵا ناتوانێ هیچ نموونەیەکی بەرچاو لەم بابەتەوە بێنێتەوە. دۆست و دوژمن دەزانێ کە ئەوە لایەنی ئێمە بوو ئیمکانی ئەوەی پێکهێنا کە جیابوونەوەکە شارستانییانە و بە بێ کێشە بەرێوەبچێ. کادرەکانی ئەوان نایەنە ناو ریزی ئێمەوە نەك لەبەرئەوەی کە غەدریان لێکرابێ، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە رێبازێکی سیاسی بە تەواوی جیاواز لە کۆمەڵە و لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران گرتووەتەبەر، ئەوەندە جیاوازە کە تەنانەت کاك عەبدوڵڵا لە خۆی رادیوە کە بیر لە پرۆژەی هاتنە سەر مەقەرەکانی ئێمە

بە دەستی ئەوان دابڕێژێ. ئەڵبەت لام وایە ژمارەیەکی زۆر کەمیان ئامادەیی چوونە ناو وەها کارەساتێکیان تێدا هەبووە. هەر ئەو ژمارە کەمەن کە کاك عەبدوڵڵا دەڵێ دەچنە بەر بەفر و نایەنەوە ناو حزبی کۆمۆنیست.

***عەبدوڵڵای موهتەدی دەڵێ" ئێمە ئامادەین یەکبگرینەوە لەگەڵ ئەوان یان ئێمە رازین بەو یەکگرتنەوەیە"، بەڵام بەمەرجێك ئەوان لە حزبی کۆمۆنیست بێنە دەرەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو قسانە لەچوارچێوەی راستگۆیی سیاسی دەر دەچن و دەچنە خانەی دیپلۆماسییەکی بورژوایبانەوە. ئاشکرایە کێشەی ئەوان لەگەڵ کۆمۆنیزم وەکو بەرنامە و رێبازی سیاسییە نەك لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست.

***ئەگەر تۆ داوای یەکگرتنەوە لەگەڵ ئەوان بکەی، مەرجت چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە بۆ ئەندامگیری لە ناوخۆماندا پێش مەرجمان هەر ئەوەیە کە لە پەیرەوی ناوخۆماندا نوسراوە. هەر کەس بەرنامەی ئێمەی قبوڵ بێ و ئامادە بێ بە شێوەیەکی رێکخراو لە ناو حزبی ئێمەدا چالاکی بکات دەتوانێ ببێ بە ئەندامی ئەو حزبە، بۆ ئەوان یان بۆ هەر کەسێکی دیکە.

**بابێنەوە ناو کۆمەڵە**

***جارێکی کە بێنەوە ناو کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەو مەرجەی سەرەوە.

***هەر لەژێر ناوی سازمانی کوردستانی- حزبی کۆمۆنستی ئێران (کۆمەڵە)دا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ.

**بائەوان ناوی کۆمەڵە لەسەر خۆیان لا بەرن**

***ئەوان قبوڵیان نییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** قبوڵیان نییە، هەر بۆیە نایەنەوە و ئەو قسانەش موجامەلەیەکی بێ ناوەرۆکە.

***یەعنی هەروا پەرش‌وبڵاو، هەردوو رێکخراوی سیاسی دەبن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** باشتروابووو‌باشتر وایە کە ئەوان ناوێکی دیکە لەسەر خۆیان دابنێن کە گونجاوتر بێ لەگەڵ رێبازی ئێستایان. ئەگەر وایانکرد ئەوە کێشەی دوو کۆمەڵە و چەند کۆمەڵە چارەسەر دەبێ. ئەگەر واش نەکەن بەبڕوای من مەسەلەیەکی گرنگ نییە. کۆمەڵە دەتوانێ لە مەیدانی کردەوەدا جیاوازییەکانی خۆی لەگەڵ هەر حزب و رێکخراوێکی دیکە کە بەناوی کۆمەڵەوە کاربکەن نیشان بدات. کۆمەڵگای کوردستان سیاسی تر لەوەیە کە مەسەلەی ناو کێشەیەکی درێژماوەی چارەسەر نەبووی بۆ بخولقێنێ.

***ئەتەوێ بڵێی ئەوان چەپ نیین و با بەناوی مەیل‌و گەرایشی قەومی کاری خۆیان بکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە دەتوانێ تەعبیرێك بێت.

*** عەبدوڵڵای موهتەدی ئەڵێ "ئێمە داوای سێ پێشنیارمانکردووە لەکاك ئیبراهیمی عەلیزادە یەکەمیان هەردولا نێوی یەکتری بەکامڵی بەرین، بەو شکڵەی کە ئاویە، بەڵام ئێوە ئەم داوایەتان قبوڵ نەکردووە بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کێشەی ناو بنچینەی نییە، هەڵبژاردنی ئەو ناوە لە لایەن ئەوانەوە ناڕەوا بووە بەڵام

جیاوازی سەرەکی ئێمە لە جێگایەکی دیکەدایە. ئەو کێشەیە ئێستا لە کۆمەڵگای کوردستانیشدا فەرعی بووەتەوە و مەشغەڵەیەکی جیدی نییە. ئەو ناوەی کە ئەوان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو واتە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران دوو وشەی تێدایە کە لە دیپلۆماسییەتێك کە ئەوان پێویستیان پێیەتی، ژانە سەری زیادییان بۆ دەخوڵقێنێ. ئەویش شۆڕشگێڕ و زەحمەتکێشانە. وەرگێرانی هەردوو ئەو وشانە بە زمانە ئەوروپاییەکان بە لای ئەوانەوە خۆش ئاهەنگ نییە. هەر بۆیە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەو تێکستانەدا کە بە زمانی ئینگلیزی دەیان نوسی ناوی "حزبی کۆمەڵە"یان بە کاردەهێنا. ئەوە بۆ دەربازکردنی خۆیان لە قورسایی ئەم دوو وشەیە بوو. جا ناوێك کە ئەم هەمووە کێشەیەی بە دواوە هەبێ بۆیان و بە رەسمیش لە رێبازەکەی لایاندابێ، چ قازانجێکی هەیە و ئەگەر هەیبێ تاکەی دەبێ؟

**بەڵگەنامەکان بڵاودەکەینەوە**

***خاڵی دووهەمیان دیارە داوای سێ خاڵیان لەنێوەکردوە کۆبوونەوەیەك لە ئاستێکی باڵا لە نێوان کۆمیتەی ناوەندی ئێوەو ئەواندا بۆ قسەکردن لەسەر ئەسنادو ئەدارەکو کۆمەڵێ شتیتر، بەڵام تائێستا ئێوە کۆنەبوونەوە لەگەڵیان ئەو داوایەتان قبوڵ نەکردون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ئێمە ئەو داوایەمان کە نەك لە دانیشتنی رەسمیدا بەڵکو لە رێگای ناوبژیوانانەوە هاتووەتە گۆرێ لێ قبوڵنەکردوون، چونکە بە پێی پەیرەو و پرۆگرامێك کە هەردوو لامان لە کاتی خۆیدا سەلماندوومانە حزبی دایك لەسەر جێگای خۆیەتی و ناکرێ باس لەدابەشکردنی هیچ ماتریالێکی بکرێت. ئەو داوایەی ئەوان شەرعیەتی نییە. ئەوەش بزانن کە ئێمە خەریکین زۆربەی بەڵگەنامەکانی ئەو حزبە، ئەوانەی کە کێشەی شەخسی بۆ هیچ کەسێك ناخوڵقێنن لەسەر تۆری ئینترنێت دادەنێین کە بۆ ئەوان و بۆ هەرکەسی دیکە کە بیەوێ لە دەسترەسدا بێ. لام وا نییە ئەوان زۆر بە ئاشکرا بوونی ئەو بەڵگەنامانە خۆشحاڵ بن.

***دانیشتنتان بووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ ساڵێك لەمەوپێش.

***لەسەرچی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر هەندێك کێشە کە پەیوەندی هەبوو بە نزیکبوونی مەقەر و ناوەندەکانی چالاکیمان لە یەکتر.

***کێشەکان چی بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کەسی ئێمە بەردەرگای مقەری ئەواندا رۆیشتووە، پیلەیان پێگرتوە بردوویانە لێیانداوە بریندارییانکردوە عەزێتیانکردوە، هاتونەسەر ئەم بەرزاییانە لەوێدا تەقەیان بەسەر ئۆردوگاکەی ئێمەدا کردوە. من بیرم نایە ئێمە هیچ مەوردێك دەردی سەری‌و کێشەمان بۆ ئەوان خوڵقاندبێ. دوایین جارێك کە کێشە دروستبوو ئەوان دوکەسیان بە حاڵەتێکی تۆزێ ناخۆشەوە یەعنی وەزعیان تەواونەبوو هاتبونە بەردەرگای ئۆردوگای ئێمە. دوای تۆزێك لێکۆڵینەوە ئەو کەسەیان کە رێزی لە بەرپرسی پرسگەکە نەگرتبوو، ناردمانەوە بۆ لای خۆیان.

***ئامادەنین ئێوە ئەسنادەکان کۆپییەکانیشیان بدەن بەئەوان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت هەیە با بچن هەڵیبگرن.

**کۆمەڵە حزبە، شەریکەی بازرگانی نییە**

***ئەی بۆ راستەوخۆ نایاندەنێ؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: هەرکەسێ رۆیشتوە لەو حزبە رۆیشتوە و خۆ شەریکەی بازرگانی نییە کە هەر کەس رۆیشت داوای بەشبکات. حزبایەتی رێ و رەسمی خۆی هەیە. جگە لەوانیش گەڵێك کەسی دیکە هەن کە لەو حزبە رۆیشتوون چۆنەگرێ دەستبکەین بە دابەشکردنی بەڵگەنامەکانی حزب لە ناو ئەم و ئەودا. ئەمانە بەشێك لە مێژووی ئەو وڵاتەن و هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە لێیان ئاگادار بێت. هەر بۆیە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دانراوە.

***ئەگەر لەسەر ئینتەرنێتی بێ ، بە (PDF) ناتوانن کۆپیکەن ئەوان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەدەنگ و بە نوسراوە هەمووی قابیلی کۆپیکردن و دەستڕەسن.

***مەبەستتان لەوە چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** مەبەستمان ئەوەیە کە مێژوی کوردستان موستەنەد کەین.

***خاڵێکی زۆر گرنگ کە لە گوزارشتی کۆمیتەی ناوەندی نوێی کۆمەڵە، عەبدوڵڵای موهتەدی پێشکەشی کۆنگرەی کردوە ، خاڵێکی زۆر گرنگە سەرنجت بۆ ئەوە رابکێشم ، دەبێ "ئێمە داوامان لە رەهبەری حزبی کۆمۆنستی ئێران- سازمانی کوردستانی ئەو حزبە کردوە، ناڵێ کۆمەڵە، سەبارەت بەو دیمایەی کە جەماعەتی مەنسوری حیکمەت کردویانە و لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاویانکردۆتەوە، ئەو کاتە کە گوایا پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەوری کۆنگرەی نۆی ئەوانی گرتومو لەژێر بەرقی سەرنێزەی ئەواندابوە کە پرۆژەی هاتنەدەری کۆمەڵە لە حزبی کۆمۆنستی ئێران روویداومو داوامانکردوە ئەمە بەدرۆ بخەنەوە بەڵام نەیانکردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە راست نییە کە ئێمە بەدرۆمان نەخستبێتەوە، من خۆم وتویژم کردوە لە گەڵ رۆژنامەکانی کوردستانی عیراق وئەوەیان لێپرسیوم و ووتوومە شتی وا نەبووە.

***ئێوە لەکاتی کۆنگرەدا شتی واتانگوتوە کە گوایا یەکێتی نیشتمانی دەوری بارەگاکانی ئەوانی پاراستوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نە، بنچینەی نییە، نە یەکێتی ئەو کارەی کردووە نە ئێمەش وتوومانە.

**یەکێتی هاوکاری موهتەدی کردووە**

***ئەتان وتووە یەکێتی نیشتمانی رادیۆی داوەتێ هاوکاریکردوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کە یەکێتی یارمەتییان دەکات، ئەوە مەوزوعێکی دیکەیە، ئاشکرایە و شاراوە نییە. ئەوەی ئێمە لەسەر ئەو مەسەلەیە پروپاگەندەیەکمان کردبێ، ئەوە راست نییە.

***ئێوە بانگەشەی ئەوەتانکردووە کە ئەو رادیۆیەی لە یەکێتی نیشتمانی وەرگرتوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حکومەتی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی سلێمانی) یارمەتی هەموو حزبە سیاسییەکانی کوردستانی ئێرانی داوە، زۆر و کەمییەکەی بۆ ئەم و ئەو بە جێگای خۆی. بۆ ئەوانیش هەر لەوچوار چێوەیەدا بووە.

**ئێمە دژو ئەوان هاوکاری ئەمریکان**

***ئەی بۆ مەنسوری حیکمەت ئەوەیان بڵاوکردەوە؟ مەبەستیان لەو بڵاوکردنەوەیە چیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەبلیغاتی سیاسی خۆیانە و خۆیان لێی بەرپرسن.

**ئێمە سۆسیالیست و ئەوان ناسیۆنالیستن**

***هێزی پێشمەرگەی ئێوە یان ئەوان ئێستا بەهێزترە، ئێوە لەو بارەیەوە جیاوازییەکانتان چیە؟ یەعنی جیاوازیەکانتان لەباری ئەزمری، پێشمەرگایەتی، تەشکیلاتی، ئیداری مال، پەیوەندییەکانی ناوخۆ و دەرەوە لە کورتترین خاڵدا چییە؟ چۆن ئەکرێ یەکێك ئەم هەموو سیفاتانە بناسێتەوە لە کۆمەڵدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێموانییە ئەوان لە هیچ بوارێکەوە لە ئێمە بەهێزتر بن. لە بواری رێکخراوەییەوە ئەوان رێکخراوێکی هەر بە تەنها کوردستانین، بواری چالاکی ئێمە لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا سەرانسەرییە.

بەرنامەی ئێمە بۆ دووا رۆژی ئەو وڵاتە بە سەراحەتەوە لەسەر بنەمایەکی سۆسیالیستی دامەزراوە، هی ئەوان بە ناسەریحی لەسەر بنەمایەکی ناسیۆنالیستی دارێژراوە. ئەوان هاوپەیمانانی سیاسی خۆیان لە ناو بەرەی راستی ئۆپۆزسیۆنی ئێراندا دەبیننەوە، ئێمە روومان لە بەرەی چەپی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانە. ئەوان تەئیدی سیاسەتی ئامریکا لە ناوچەکە دەکەن و خۆیان بۆ بەهرەمەند بوون لە ئاکامەکانی ئەو سیاسەتە ئامادە دەکەن، ئێمە لامان وایە سیاسەتی ئامریکا بۆ دوارۆژی ئێران کارەساتی گەورەی لێدەکەوێتەوە و لەگەڵی نین.

ئەوان هەوڵدەدەن یارمەتی دارایی لە ئەمریکا وەر بگرن و ئێمە ئەو سیاسەتەمان پێ زیانبارە. لە بواری رێکخستنی هێزی پێشمەرگەدا لام وانییە جیاوازییەکی بنچینەی هەبێ، بەڵام ئێمە دژی گەلێك لەو کردەوانەین کە ئەوان بە دەستی ئەو هێزەیان جاروبار لە ناوەوەی کوردستان دەیکەن، بۆ نموونە لە جەریمەکردنی ئەم و ئەو و کۆکردنەوەی پارەدا.

***سنوورەکانتان زۆر لەیەك نزیکە، تەنهاچەند سەد مەترێکیتان بەینە، ئەوە تا چەند لەروی نەفسییەوە لەروی سایکۆلۆژییەوە تەئیسر لەوەدەکا کە ئێوە رۆژانە یەکتر ئەبینن، تا چەند رۆژانێك بووە بەیەکەوە پێشمەرگەبوون خەباتتان کردوە، بەڵام ئێستا بوون بە دوو بەشەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستا بە تایبەت بە لەبەرچاو گرتنی ئەو راستیەی کە ئەوان لە باری رێبازی سیاسی و بەرنامەیی و بۆچوونەوە تەواوەن وەکو حزبێکی دیکە خۆیان نیشاندەدەن و حزبێکی دیکەن هەمووشتێك ریلاکس تر بۆتەوە، یەعنی ئێستا بەبڕوای من هەرچی ئەوان رێبازی فیکری و سیاسی و عەمەلییەکەیان شەفافتر بکەنەوە ئیمکانی بە یەکەوە ژیان و ئیمکانی تەبایی زۆرتر دەبێ.

***بۆئەوان پێش ئێوە(T.V)یەکی سەتەلایتیان دانا، لە کاتێکادا ئێوە پێشتر بەنیازبون دایبنێن، ئەوە تاکتیك بوو پێش ئێوە کەوتن و بوون بەخاوەنی یەکەمین تەلەفزیۆنی ئاسمانی بۆ ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێرانی لەشاخ، وەکو خۆشیان ئەڵێن بوون بە دووەمین ئۆپۆزیسیۆنی کوردی لەشاخ دوای پارتی کرێکارانی کوردستان (pkk) بەو ئیعتبارەی ئەوان یەکێتی و پارتی بەحکومەت دەزانن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان پارەیان لە ئێمە زۆرتر بوو هەر بۆیە توانیان دەسپێشخەری بکەن. ئێمە بۆ

دامەزراندنی ئەم کەناڵە تەلەفزیۆنییە بنچینەن پشتمان بە پارمەتی خۆبەخشانەی ریزەکانی خۆمان لە دەرەوەی ولات و هەروەها خەڵکێك کە ئامادە بوون لەم بوارەدا هاوکاریمان بکەن، بەستبوو. ئەگەر بتانەوێ دەتوانن بە وردەکارییەکی زۆرترەوە باسی چۆنیەتی دامەزرانی ئەم کاناڵە تەلەفزیۆنییەتان بۆ بکەین.

(TV) کۆمەڵە بەکۆمەك دامەزرا

*بەڵێ... بەڵێ؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاتێك بریاری دامەزراندنی کەناڵی تەلەفزیۆنی کۆمەڵە هاتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، کۆمیتەیەکمان بۆ دابینکردنی ئیمکاناتی دارایی بۆ بەرێوە چوونی پرۆژەکە دیاریکرد. ئەو کۆمیتەیە داوای لە هەموو ئەندامانی حزب لە دەرەوەی ولات کرد کە هەر کامەیان لانیکەم بری هەزار دۆلار بە قەرزیدەن بە سەندوقی تەلەفزیۆن. بەو مەرجەی کە هەرکات کۆمەڵە لە توانایدا بوو بیانداتەوە. جا خۆیان ئەو برە پارەیان هەیە، یان قەرزیدەکەن، ئیشی خۆیانە.

هەروەها داوا لە هەموو ئەندامان کرا کە هەر کامەیان کە توانای ئەوەیان هەیە پارەیەك لە بانکەکان قەرزبکەن، ئەو کارەبکەن و کۆمەڵە هەر لەسەرەتاوە قیستی بانکەکەیان بۆ ئەداتەوە. هاوکات لە دەرەوە و لە ناوەوەی ولاتیش داوای یارمەتی بۆ دامەزراندنی تەلەفزیۆنکرا. دوای ماوەی چەند مانگ برێکی ئیسبەتەن باش پارە کۆبووەوە. ئەو پارەیەمانکردە دووبەش، بەشێکی بۆ دابینکردنی مەسرەفی سەرەتایی تەلەفزیۆن و بەشێکی سەرمایەگوزاری پێکرا بۆ ئیدامە کارییەکەی.

هاوکات گەلێك لە مەسرەفەکانی ناوخۆی حزبمان داشکاند و بە تایبەت هاورێیانمان لە هەموو شوێنێك بە مەبەستی سەرخستنی ئەو پرۆژەیە، لە گەلێك لە پێداویستییەکانی سەرەتایی خۆیان سەرفی نەزەریان کرد. بەم جۆرە بوو کە ئێمە پشت بە خۆمان و ئیمکاناتی خۆمان و یارمەتی خەڵکی دڵسۆز توانیمان ئەو پرۆژەیە بەە سەرئەنجام بگەیەنین.

***کەواتە ئەوە راست نەبوو کە وتیان یەکێتی نیشتمانی کوردستان تەلەفزیۆنەکەی بۆ داناون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ درۆ بوو. یەکێتی نیشتمانی کوردستان یارمەتی ژیان و بەرێچوونی هاورێیانمان لە کوردستانی عیراق دەدات. ئەوەش پەرەنسیپ و مێژووی خۆی هەیە.

**ناتوانم بڵێم یەکێتی چەندە پارەمان دەداتێ**

***چەندتان ئەداتێ مانگانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە نهێنییە کە بە داخەوە ناتوانم ئێستا ئاشکرای بکەم.

***ئەی ئەوەتا چەند راست بوو کە ئیسرائیل یارمەتیداون لە دانانی تەلەفزیۆنەکەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بنچینەی نەبوو.

***تەلەفزیۆنی کۆمەڵە، بۆ ناوتان نا تەلەفزیۆنی کۆمەڵە؟ چۆن بوو کە عەبدوڵڵای موهتەدی بیریان لەوە نەکردوە، پێش ئێوە تەلەفزیۆنێکیان دانا ناویان نەناکۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە ناوێکی ناسراو و خۆشەویستە لە کوردستان، ئەوەی کە خەڵکی دیکە بە رێبازی دیکە و بەم ناوەوە چالاکی دەکەن غەدرێك بوو کە لە کۆمەڵە کرابوو. ئێمە بریارماندا بەم شێوەیە

ڕێگانەدەین کە ئەو ناوە وا بە هاسانی لە ناوەرۆکەکەی جودا بکرێتەوە. هەڵبژاردنی ناوی کۆمەڵە بۆ ئەو کەناڵە تەلەفزیۆنییە لەپێناوی ئەو مەبەستەدا بوو.

***بەس لەلایەن خەڵکی دۆستی کۆمەڵە و سەرمایەدارەوە پارەمتیدراون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ.

***ستودیۆتان هەیە لە زرگوێز؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ستودیۆیەکمان لە زڕگوێز هەیە. بەڵام ستودیۆی سەرەکیمان و ناوەندی بەڕێوەبردنی تەلەفزیۆنەکەمان لە دەرەوەی وڵاتە.

***پێموایە نەتانوێراوە لەبەر تۆپبارانکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران و لەڕووی ئەمنییەوە لێرە دابنرێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کێشەکە لەسەر وێران و نەوێران نییە. لە بواری بەرژەوەندی داهاتووی کۆمەڵە ئەوە باشترە کە ناوەندی دەزگا سەرەکییەکانی تەبلیغاتی کۆمەڵە لە ئوروپا دامەزرابێت. تۆپباران و هێرشی کۆماری ئیسلامی هەمیشە لە حیساباتی ئێمەدا جێگای خۆی بۆ کراوەتەوە.

***شۆڕشێکی ڕاگەیاندنی گەورەبوو تەلەفزیۆنی کۆمەڵە، بۆ کۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەلەفزیۆن مدیایەکەی سەرەکی و گرنگە. لەم عەسرەدا کۆمەڵە نەیدەتوانی لە ئیمکاناتی ئەم ئامرازە گرنگە بێ بەهرە بێ.

***بەس خاتری کۆماری ئیسلامی ئێران دەگرن، لە بەرنامەکانتان لەوەی کە جمهوری ئیسلامی زۆر تەعەسوبی نەبێ نەوروژێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نا، خاتری کۆماری ئیسلامی ناگرین، بەڵام تەبلیغاتی ئێمە پرنسیپی جێکەوتووی خۆی هەیە، بەو پێیە هەڵسوکەوت دەکەین. ئەو تەبلیغاتە دەبێ بە وشیارکردنەوەی جەماوەر و بە ڕێکخستنی خەباتی جەماوەری خزمەت بکات. ئێمە بە توندی خۆمان لەئاژیتاسیۆنی نا سیاسی دەپارێزین، بەرانبەر بە کۆماری ئیسلامی بێ یان هەر نەیارێکی کۆمەڵە.

***بەرنامە و ڕەنگدانەوەی مەسەلەی چەپ زۆر کاریگەری هەیە لەسەر تەلەفزیۆنەکە، ئەوە بۆ چوون و فکرەی تۆیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەلەفزیۆنی کۆمەڵە هەوڵدەدات ڕەنگدانەوەی خەبات و ئاواتەکانی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان بێ، بە کرێکار و زەحمەتکێشەوە، بە ژنی ستەم لێکراوەوە، بە خوێندکار و مامۆستا و بە پەرستارەوە، فەرمانبەری ئیدارە دەوڵەتییەکانەوە، بە خەڵکی کەم داهاتی بازارەوە، بە گشتی هەر کەسێك کە لە بواری ئینسانییەوە هەست بە نازارێك دەکات و ویستێکی عادلانەی هەیە. سەرنجی هەموو کێشە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵگادەدا، کێشەی مادە هۆشبەرەکان، کێشەی لەشفرۆشەکان، کێشەی منداڵانی کار و خەڵکی بێ خانە و لانە، ئەمانە هەمووی لە بەرنامەی کاری ئەو تەلەفزیۆنەدا ڕەنگدەداتەوە.

***ڕۆڵی دەنگی شۆڕشی ئێران و پێشڕەو ئۆرگانەکانو دەنگی حزبی کۆمۆنیستی کەم نەکردۆتەوەو لاوازی نەکردون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئاشکرایە کە دەوری ئەم ئامرازانە کەم دەکاتەوە. تەنانەت لەوەش واوەتر، دەتوانم بڵێم کە کەم و کوڕییەکانمان لەم زەمینانەدا دەشارێتەوە. ئێمە پێویستە هەوڵبدەین کە ئەم ڕاگەیەنە گشتییە

گرنگە وەتە تەلەفزیۆن جێگا و شوێنی واقیعی خۆی پەیدا بکات و کتێب و رۆژنامە خوێندنەوە کە گەلێک گرنگە بۆ قولکردنەوەی ووشیاری جەماوەر. ئێمە پێویستە هەوڵبدەین کە فەرهەنگی کتێب خوێندنەوە و رۆژنامە خوێندنەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا جێبکەوێ. تیراژی کتێب و رۆژنامە بچێتە سەرێ. هەر بەو مەبەستە تەلەفزیۆنی کۆمەڵە بەرنامەی تایبەتی هەیە و پەرەیشی پێدەدا. لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری باوەکو سەدان کەناڵی تەلەفزیۆنیش هەیە، بەڵام تیراژی گۆڤار و رۆژنامە و کتێب هەر لەسەرەوەیە، بۆ ئێمەش هەر ئەو ئەریتە بە کەڵکە.

***کێ سەرپەرشتی مەکتەبی راگەیاندن ، یان راگەیاندنی کۆمەڵە ئەکات لێرە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە گشتی کۆمیتەی رەهبەری کۆمەڵە خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی کاری راگەیاندن دەکا و لە ناوخۆیدا کاری دابەشکردووە. بۆ تەلەفزیۆنی کۆمەڵەش لەو کاتەدا کۆمیتەیەکی باڵامان هەیە کە لەسەر هێڵە گشتییەکانی کاری تەلەفزیۆن بریار دەدات و هەر کام لە ستدیۆکانیش بەرێوەبەرایەتی تایبەتی خۆیان هەیە.

***ئەڵێن تۆ زۆر دەست ئەخەیتە ناوکاروباری راگەیاندنی کۆمەڵەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوەی کردبێتم لەچوارچێوەی ئەو ئەرکانە دایە کە پێم سپێردراون. هەوڵیشمداوە بۆ ئەوەیکە کەمیان بکەمەوە.

***بەرنامەی داهاتوی کۆمەڵە لەبواری راگەیاندندا چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەوڵدەدەین کە سەعاتەکانی کەناڵی تەلەفزیۆنی کۆمەڵە زیادکەین تا رۆژێک کە دەگاتە (٢٤) سەعات. دەوڵەمەندکردنی چ لەبواری ناوەرۆکدا و چ لە بواری تێکنیکیدا. جگە لەوە هەوڵدەدەین کە ئەکەوینە شوێن ئەو رەوتی خۆرسکەی کە هەموو شتێك لە تەلەفزیۆندا دەبینێتەوە. دەرکردنی رۆژنامەیەکی لە تیراژی زۆردا، یارمەتیدان بە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی سیاسی و زانستی بەکەڵك کە دەرك و تێگەیشتنی کرێکاران و خەڵکی ئازادیخوازی کۆمەڵگا قولبکاتەوە. ئێمە پێویستە هەوڵبدەین ئەو کەلێنەی کەلەناو کۆمەڵگای کوردستان و ئێراندا لە نێوان رووناکبیران و جەماوەری خەڵکدا هەیە پڕ بکەینەوە. ئەو کارە بە دەرەجەی یەکەم بە چاپەمەنی دەکرێت نەك بە تەلەفزیۆن.

***بەرپرسەکانی تری کۆمەڵە لەراگەیاندنەکان کەمتر دەرئەکەون بەو شکڵەی تۆ، ئەوە سیاسەتێکی تەعمیمکراوەوە دابەزیزە کە پێویست ناکا هەر کەسە بۆ خۆی لێدوان بدات و دیدار بکاو قسەبکا لەسەر سیاسەتی گشتی کۆمەڵە یان فاکتەرەکانی پشتی چین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەپێچەوانەوە ئێمە تەوجیهاتی نێو خۆمان ئەوەیە کە هەموو کەس بەراشکاوی لە هەموو جێگایەك بتوانێ دەرچێ. ئێستا کە تەلەفزیۆنمان هەیە هەوڵدەدەین کە بۆ ئەو مەبەستە بە باشی کەڵکی لێوەربگرین. بە شاهیدی بینەرانی تەلەفزیۆنی کۆمەڵە تائێستا لەم بوارەوە پێشکەوتنی باشمان بووە و زۆربەی هاورێیانی کۆمیتەی ناوەندی و بەشێك لە کادرەکانی کۆمەڵە دەوری خۆیان بینیوە و پێویستە پەرەشی پێبدەین.

***تۆ زۆر ئەخوێنیتەوە، بەبەردەوامیش لەسەر ئینتەرنێتی، ئەتوانی پێمبڵێیْ باشترین کەناڵی سەتەلایتی جیهانی کە تۆ زۆر موعجیب بیت بەهەواڵ و ئیخباروکارکردنی کامەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کەناڵەکانی ئینگلیسی و فەرانسەوی تەعقیب دەکەم. بە زۆری "بی.بی.سی"، "نیوزو

نیوز" و "کەناڵی ٢"ی فەرانسە.

**فەرەنسی و ئینگلیزی دەزانم**

***فەرەنسی و ئینگلیزی ئەزانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ تاڕادەیەك پێویستییەكانی خۆم دابین دەكەم.

***كەناڵێكی فارسی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هیچ كەناڵێكی فارسی وا شك نابەم كە بتوانم بە ئیشتیا دابنیشم و بەرنامەكانی ببینم.

***كەناڵەكانی كۆماری ئیسلامی باش نین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڕاستی كەناڵەكانی كۆماری ئیسلامی تەحەمول ناكرێن.

***بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەبەرئەوەی كە زۆر یەك لایەنەن، لەبەرئەوەی كە زۆر مەحدودن، لەبەرئەوەی كە تەنانەت هەواڵێكیش كە بڵاودەكەنەوە غەرەزئاوییە و ئەوەندە زەهری خۆیان تیا رشتووە كە بنیادەم دانیمەن هەست بەوە دەكات كە فریوی دەدەن یان سووكایەتی پێدەكەن. تەنانەت كاتی وا هەیە كە وتاری رۆژنامەیەكی خاریجی تەرجومە دەكەنەوە، بەڵام بە فەرهەنگی خۆیان دایدەرێژن و هەڵوێستی خۆیان لە جیاتی هەڵویستی رۆژنامەكە بە شێوەیەكی شاراوە جێدەكەنەوە. هەر بۆیە ئەمانەشیان جێگای هیچ متمانەیەك نییە.

***خەڵك چەواشەدەكەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وایە.

***عەرەبی ئەزانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حاڵی دەبم بەڵام قسە كردن زۆر بە كەمی.

***گوێ لە جزیرە ئەگری؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، جاروبار.

***پێتوا نییە كەناڵێكی زۆرباشی عەرەبییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** كەناڵی ئەلجەزیرە لەسەرەتاوە زۆرباش دەستی پێكرد و تاڕادەیەكی زۆر كەشوهەوای دیكتاتۆری و سانسۆری لەوڵاتانی عەرەبیدا گۆڕی. بەڵام ئێستا بەهۆی ئەوەی كە بەرامبەر بە رەوتی ئیسلامی توندرەو و هەروەها شوڤێنیزمی عەرەب هەڵوێستێكی لایەنگرانەی ئاشكراتری گرتووەتەبەر، بەبڕوای من گرنگی جارانی نەماوە. بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبێ هاتنە كایەی ئەو كەناڵە تەلەفزیۆنییە وەكو رووداوێكی گرنگ لە جیهانی وڵاتانی عەرەبیدا چاو لێبكرێ.

**(رۆژTV)و لۆمۆندو ئاوێنە وBBC و پەیامم پێ باشە**

***باشترین كەناڵی كوردی سەتەلایت كامەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەرووی ناوەرۆكەوە كەناڵەكەی خۆمانم لە هەموو كەناڵەكانی دیكە پێباشترە.

هەرچەند لەڕووی تەکنیکییەوە گەلێك لاوازە. لەباری تەکنیکییەوە ڕۆژ(TV )کەناڵێکی دەوڵەمەندە، هەرچەند سیاسەتی تەبلیغاتییەکەیم بە دڵ نییە.

***باشترین ڕادیۆی جیهانی کە تۆ زۆر گوێی لێبگری؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** "BBC"، ڕادیۆی دەوڵەتی بەریتانیا و "RFI" ڕادیۆی دەوڵەتی فەرانسە.

***ڕادیۆیەکی کوردی باش هەیە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەم بیستوە.

***باشترین ڕۆژنامە کە تۆ زۆر موتابەعەی بکەی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە ڕۆژنامەکانی دەرەوە من (لۆمۆند و لۆمۆند دیپلۆماتیك)م پێ باشە

***باشترین ڕۆژنامەی کوردی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئاوێنە.

**ڕۆژنامەی ئاوێنە زۆر باشەو یارمەتی هاوڵاتیمان داوە**

***دەنگۆی ئەوەش هەیە ئێوە لەپشتەوە یارمەتی ئاوێنەدەدەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو دەنگۆیە ڕاست نییە. بەڵام لەسەرەتای دامەزراندنی ڕۆژنامەی هاووڵاتیدا ئێمە تارادەیەك یارمەتیدەریان بووین.

***باشترین سایتی ئینتەرنێتی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە سایتە ئینتەرنێتییە ئینگلیسی زمانەکاندا سایتی "BBC" و "Z.NET" و لە سایتە کوردییەکاندا سایتی پەیام و دەنگەکان.

**بەلینین زۆر موعجیبم**

***باشترین سیاسەتمدار کە لەسەرتاسەری دنیادا پێی موعجیب بێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** زۆر موشکیلە ئەمە. بەڵام لام وایە تا ئێستاش لینین هەر گەورەترین سیاسەتمەداری سەدەی بیستەمە. نەك هەر لەبەرئەوەی کە هاوبیروڕامە، بەڵکو بەڕاستی بەهۆی ئەوە کە لەتەمەنی کورتی خۆیدا کاری گەلێك گەورەی کرد.

***باشترین سیاسەتمەدارێکی کورد کە تۆ موعجیب بی بە سیاسەتی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** شك نابەم ، بەداخەوە.

***عەبدوڵڵای موهتەدی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تەبعەن ناتوانێ وابێ.

***ناڵێم باشترین ئەڵێم وەکو سیاسەتمەدارێك؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** عەبدوڵڵای موهتەدی ناتوانێ ئەو کەسایەتییە بێ. هەڵەی زۆر گەورەی لە ژیانی سیاسی خۆیدا کردووە.

***بە شۆڕشگێری دەزانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پەیوەندی بەوەوە هەیە کە مەبەست کام شۆرش بێ، ئەو لە ڕاپەرودوودا کۆمۆنیستێکی شۆڕشگێر بوو.

***بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، گەلێك ئاسایی و دۆستانە لەگەڵ یەك دواوین.

**ئامادەم لەگەڵ موهتەدی دانیشم**

***ئامادەی لە مونازەرەیەکی ئاوا دانیشن دووبەدوو قسەبکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەگەر زەرورەتێکی سیاسی هەبێ بە لامەوە موشکل نییە.

***بەس ئەو هەمیشە ئەڵێ ڕێزی تایبەتم هەیە بۆ ئیبراهیمی عەلیزادەو بەکەسێکی شۆڕشگێرو تێکۆشەری ئەزانم لەناو کۆمەڵەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حەق وابوو کەئەو ڕێزبۆرابوردوویەکی پڕ لە شانازیدا بنێ کە لە ریزی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بە دەستیهێنابوو. ئەو ئینسانێکی بە توانایە و دەیتوانی ئەگەر لەسەر ئەو ڕەوتەی خۆی مابا دەورێکی کاریگەر لە بزووتنەوەی ئێمەدا ببینێ.

***دوای جیابونەوەتان ڕۆژێك لەرۆژان توشی یەك هاتون مەرحەباییەك، دانیشتنێك، قسەیەك؟**

**ئیبراهیم عەلیزادەبەڵێ بوو.**

**ئامادەم موهتەدی ببێتە سکرتێری کۆمەڵە**

***ئەگەر سوتفە توشی یەك بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** حەتمەن بە ئیحترامەوە ڕەفتاری لە گەڵ دەکەم و تا ئێستاش بیرم نایە لە هیچ دیمانەیەك لە هیچ دیالۆگێکدا و لە هیچ شوێنێکا بە بێ ئیحترامی ناوم بردبێ.

***ئەگەر موهتەدی بگەڕێتەوە ناو کۆمەڵە، ئامادەی واز لە سکرتێری بهێنیو تەسلیمی عەبدوڵلای موهتەدی بکەی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەختێك هەمووومان پێکەوە بووین بە دڵنیاییەوە ئامادە بووم دەنگبەوە بدەم کە شوێنی سکرتێری بەو بسپێردرێ. خۆیشی ئەوە دەزانێ. ئەو لەگەڵ من موشکیلی نەبوو، بە دەرەجەی یەکەم کادرەکانی کۆمەڵە بوون کە متمانەیان پێنەدەکرد.

***پێتوانییە عەبدوڵلای موهتەدی یا ئیبراهیمی عەلیزادە بە بێ کۆمەڵە ئەو کەسایەتی و شەخسیەت و سیاسەتمەدارە نین، یان عەکسەکەی ڕاستە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** دەزانی مەسەلەکە چییە؟ مەسەلەکە ئەوەیە کەسایەتیەکان لەڕێگای ڕێکخراوەکانیانەوە موهیم نابن، لە ڕێگای خەباتی جەماوەرییەوە ئەهەممییەت پەیدا دەکەن، ئێمە لە ناو کۆمەڵەدا بە دەیان کادرمان بووە کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبون، بەڵام لە ڕوی کۆمەڵایەتییەوە زۆر دەورێکی گەورەیان بووە وە خەڵکی دەرەوەی ئێمە ئەوانیان بە ڕەهبەری کۆمەڵە زانیوە.

یەعنی ئەگەر لە کەسێکت پرسی بێ لەشاری سنە، ڕەهبەری کۆمەڵە کێییە؟ گوتوویانە(سدیق کەمانگەر) لە حاڵێکدا ئەو کاتە (سدیق کەمانگەر) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە نەبوو. من دەمەوێ بڵێم کە

ڕێکخراوی ئێمە، تەلەفزیۆنی خۆمان، ڕادیۆی خۆمان، گۆڤاری خۆمان ئێمە تەرح دەکا، وێنەی خۆمان بڵاو دەکاتەوە، ئەمە شەرت نییە ئێمە بکات بە ڕەهبەری ئەو کۆمەڵگایە. کۆمەڵگا خۆی دەبێ ڕەهبەرانی خۆی هەڵبژێرێ، وە مەعمولەن ئەو ڕەهبەرانە لە مەقاتعێکی مێژووییدا کە دەخولقێ بۆ کۆمەڵگایەک خۆ نیشاندەدەن وە ئەو دەورە پەیدادەکەن. شۆڕشێک شکست دەخوات یەکێک دەوری هەیە لە بەرزکردنەوەی سیاسەتێک ئاڵوگۆڕ دەکرێ کۆمەڵگایەک لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەک دەبردرێ لە کاتێکی هەستیاردا. بەپێچەوانەوە ئەو هەڵانەش لەو مقاتعەدا ڕوو نەکەنە هەموو ڕەهبەرێکی ڕێکخراوەیی دەبەنە خوارەوە.

**کۆنگرەی (١٠)ی ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە -٢٠٠٢- زرگوێز**

***کۆنگرەی (١٠) وەکو وخۆتان ڕاتانگەیاندووە لە (٢٨)ی پوشپەر تا (٤)ی گەلاوێژی (١٣٨١) بەرامبەر بە (١٨ تا ٢٥)ی ژوییەی (٢٠٠٢) جارێکی دیکە لەزرگوێز بەرێوەدەچێ و (٣١) کەس بۆ کۆمیتەی ناوەندی تازە و (٧) کەسیان ژنن بەشداریدەکەن، ئەگەر پێمبڵێیت کۆنگرەی (١٠) دیارە جیاوازییەکی تایبەتی هەبوو، لەو سەرو بەندەدا کە ئینشعاب روویدا بوو لەناو کۆمەڵەداو کۆمەڵەی جارێکی دیکە تووشی کۆمەڵێك کێشەو گرفت کردبوو، ئەم کۆنگرەیە بۆ ئەوەبوو کە ئێوە بتوانن جارێکی دیکە خۆتان ڕێکخەنەوەو ئەو ئینشعابەی کە کرابوو پێتانەوە دیار نەبێ، بەحس و نەزەراتی تازە لەڕووی فیکرییەوە چی بوو و ئەو ئینشعابەو کێشانەتان چۆن دایە بەر لێکۆڵینەوەو تاچەند کاریگەری لەسەر کۆمەڵە هەبوو و ئەو کۆنگرەیە تاچەند بەبەراورد بەکۆنگرەکانی تر جیاوازتر بوو، بەحسەکانی چڕ و پڕتر بوو و سەرکەوتوو تر بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە،** کۆنگرەی (١٠) بۆ ئێمە دوو تایبەتمەندی هەبوو، تایبەتمەندییەکی ڕێکخراوەیی‌و تایبەتمەندییەکی سیاسی، کۆنگرەی پێشووتر، واتە کۆنگرەی (٩) بەهۆی ئەو جیابوونەوەیەی کەتێیدا ڕوویدا، زۆر لەژێر کاریگەری کەشوهەوای جیابوونەوەدابوو. لەم کۆنگرەیەدا ئەو جۆرەی کە پێویست بوو نەپەرژاینە سەر مەسەلە سیاسییە گرنگەکانی ئەو سەردەم،زۆرترین هەوڵەکان ڕووی لەدەربازکردنی کۆمەڵە لەوکێشەدابووکەتووشیبوو،لەکاتی بەرێوەچوونی کۆنگرەی(١٠)دا تەپ‌وتۆزی ئەوهەلومەرجەی ئەوکات نیشتبۆوەوئێمە مەجالی ئەوەمان بۆ پەیدابوو کە لەکەشوهەوایەکی ئارامتردا وەلامی مەسەلە سیاسییەکانی سەردەم بدەینەوە. ڕێکوپێکی‌و ئامادەیی ڕێکخراوەی باشترمان هەبوو، دوو ساڵ دوای جیابوونەوەیەك کەلە کۆمەڵەدا ڕوویدابوو، ئیمکانی ئەوە پەیدا بوو کە ئینسجام و بەردەوام بوونی خەتی کۆمەڵە دوای ئەو جیابوونەوەیش لە مەحەك بدرێتەوە. بەخۆدا هاتنەوەو تەسبیتکردنی سەرجەمی خەت و جیهەتی خۆمان، ئەوە تایبەتمەندی ڕێکخراوەی کۆنگرەی (١٠) بوو.

تایبەتمەندی سیاسییەکەی هەڵدەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجێکی سیاسی کە ئەوکات لە ئێران لەکایەدا بوو. ئەوە هاوکاتە لەگەڵ بەرێوەچوونی پرۆژەی ئیسلاحاتی حکومەتی لەئێران. بەشێك لەو پرۆژەیە ڕووی لە کوردستان بوو، ڕیفۆرم خوازەکانی حکومەتی هەوڵیاندا ڕێگایەکی تایبەت بەخۆیان بدۆزنەوە بۆ ئەوەی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان بێننە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. داخوازییەکانی خەڵکی کورد تا ئاستی چەند ڕیفۆرمێکی فەرهەنگی و چەند ریفۆرمێکی ئیداری دابشکێنن. خەڵکی کورد لەرابوردووی خۆی و خەباتێك کە کردوویەتی پەشیمان کەنەوە. هەستی رەنج بەخەساری و بێ حاسڵی خەباتێك کەتائەوکات لەژێررێبەری حزبە سیاسییەکانی کوردستان بەرێوەچوو بوو، پەرەپێبدەن. وا بنوێنن کە گوایە ئازادی لەکوردستان دەتوانێ لە ئاکامی ریفۆرم لەژێر چاوەدێری دەزگای دەسەلاتداردا بەدیبێت، ڕەوتی شۆرشگێر لە بزووتنەوەی کوردستاندا، بەتاق بخەنەوە. لە هەمانکاتدا دەیانویست بەدەسەلاتدارانی باڵی توندرەوی ڕژێمیش نیشانبدەن کە ئەوان دەتوانن لەڕێگایەکی نوێیەوە، جیاواز لەوەی کە تا ئەوکات ڕژێمی ئێران پەیرەویکردبوو، بزووتنەوەی شۆرشگێرانەی کوردستان کۆنترۆڵکەن، لەباری بەرن. کۆنگرەی ئێمە دەبوایە وەلامی ئەو هەلومەرجە نوێیەی دابا‌وە.

ئەگەر پرۆژەی ئیسلاحاتی ڕژێم لەسەردەستی خاتەمی‌و هاوبیرانی لەئاستی ئێراندا لایەنگرانێکی هەبوو، لە کودستانیش کەم نەبوون ئەوانەی کەمەو زۆر دڵیان بە ئاکامی ئەو پرۆژەیە خۆشکردبوو. تەنانەت دەتوانم بڵێم تاڕادەیەك کاریکردبووە سەر بۆچوونەکانی ئۆپۆزسیۆنی کوردیش. هەڵوێستەکان‌و تەبلیغات‌و ڕادەربرینی

ئەو کاتی ئەو حزبانە، نیشاندەدات کەخۆشباوەڕی بەرانبەر بەم ڕەوتە لە ناو ئەوانیشدا کەم نەبووەو سیاسەتەکانیان کەوتۆتە ژێر کاریگەری ڕەوتی ئیسلاحاتی حکومەتی.

کۆنگرەی (١٠)ی کۆمەڵە بۆ ئێمە فۆرسەتێك بوو بۆئەوەی کە خوێندنەوەی خۆمان بۆ ئەو وەزعە بەیان بکەین. وەڵامی پێویست بۆ هەرکام لەم بوارانە کەپرۆژەی ئیسلاحاتی ڕژێم ڕووی تێکردبوو، بدەینەوە دەبوایە وەڵام بەو مەسەلانەی کەلەرابوردوودا وەڵامیان وەرگرتبووەوە لەم ڕوانگەیەشەوە جارێکی دیکە وەڵامیان پێبدرێتەوە. ئەگەر لە پەسەندکراوەکانی ئەو کۆنگرەیە وردبینەوە دەبینین کە هەوڵماندداوە تێیاندا سنووری خۆمان لەگەڵ ئەو پرۆژەیە لەهەموو بوارێکدا هەر لەڕێگای چارەسەری کێشەی نەتەوایەتییەوە بگرە هەتا خەباتی چەکداری، هەتا بوارەکانی خەباتی ژنان، خەباتی کرێکاران سنووری خۆمان لەگەڵ ئەم پرۆژەیە دیاریبکەین و ڕێگای بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستان، دیاریبکەین.

**تەشکیلاتی نهێنی بەشداری کۆنگرە دەکەن**

***لەو کۆنگرەیەدا نوێنەری تەشکیلاتی نهێنی شارەکانیش بەشداربوون، هەمووجار لەکۆنگرەکاندا تەشکیلاتی نهێنی ناوشارەکان بەشدارنەبن، تاچەند زەحمەتە پەرینەوەیان لە سنوور و لێرە لەسەیتەرەکانو تاچەند مەترسی ئەوەیان هەیە ئاشکرا بن، ئەم کێشەیە بەردەوام لەکۆنگرەکانی ئێوە هەن تائێستا چۆن چارەسەرتانکردووەو کێشەو گرفتەکانی چۆنە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە بۆنەی وەڵامی ئەو پرسیارەی ئێوەوە، دەمەوێ ئاماژە بۆ دوو گرفتی خۆمان لەهێنانی نوێنەرانی بەشی نهێنی بۆ کۆنگرەکانمان بکەم. یەکەم گرفت ئەوەیە کە بە هۆی هەلومەرجی کاری نهێنی، ئیمکانی ئەوە نییە کە ئەندامانی ئەو بەشە لە دەوری یەك کۆببنەوەو یان بەشێوەیەك لەشێوەکان هەڵبژاردن بکەن، نوێنەرانی خۆیان بۆ بەشداری لەکۆنگرە دەستنیشان بکەن. هیچ ڕێگایەك نییە غەیری ئەوەی کە کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە یان کۆمیتەی سەرپەرشتکاری تەشکیلاتی نهێنی خۆی، ئەو کەسانە دەستنیشان بکاتو دەعوەتیان بکات. ئەوەش هەمیشە ئەو پرسیارە دەهێنێتە گۆڕێ کەچەند کەس دەعوەت بکات؟ بە پێی سوننەت تائێستا هەوڵدراوە بەپێی هاوسەنگیەکی مەنتقی ئەو ژمارە دیاریبکرێ و دواجار سەرجەم بابەتەکەو مەسەلەی خاوەن دەنگبوونی یەکە یەکەی ئەو کەسانەی کە بانگکراون لە کۆنگرەدا یەك لایی بکرێتەوە. ئەوە کارێکە کە هەمیشە لەسەرەتای هەر کۆنگرەیەکدا جێبەجێدەکرێ. مەعمولەن ئەو ژمارەیەی کە دەعوەت دەکرێنو دەتوانن خۆیان بگەیەننە شوێنی کۆنگرەکان زۆر کەمترە لە وەزنێکی واقیعی کە تەشکیلاتی نهێنی ئێمە بوویەتی.

گرفتی دووهەم: گرفتی ئەمنیەتییە. ئەوە بەلامانەوە گەلێك گرنگە کە بەهۆی بەشداربوونیان لە کۆنگرەدا ئەمنیەتیان نەکەوێتە مەترسییەوە. هەوڵمان ئەوەیە ئەو کەسانەی کە دێن بۆ ئێرە لەڕێگەی ئاساییەوە بێن، لەڕێگەی ئێمەوە نەیەن. وەکو هەر هاوڵاتییەکی کوردی ئێران کە دەیهەوێ سەفەر بکات بۆ کوردستانی عێراق، بە قاچاغ بێ یان بە ئاشکرا، وەکو خۆی ئیمکاناتی هاتنەکەی ئامادە دەکاتو سەفەرەکەی بکات. بەهۆی خزم و کەسیانەوە، بەهۆی ئاشناو ڕۆشناییانەوە، بەبیانووی مەعامەلەوە و ڕێگای دیکەی لەو چەشنە. تائێستا زۆر کەم واهەبووە کە کەسێکی ئێمە بەهۆی بەشداری لە کۆنگرەوە لەکاتی گەڕانەوەیدا و لە ئێران گرفتێکی ئەمنی بۆ

پێش هاتبێ.

**★ هەر لەو بڕیارنامەیەدا کۆنگرە رایانگەیاندووە "کە کۆمەڵگای ئێران تینووی ئاڵوگۆڕە، بورژوازی و رژێمی ئیسلامی بەهەموو تواناوە هەوڵدەدەن ئەو ئەزمەیە ئێستا بەفازانجی خۆیان چارەسەر بکەن. پرسیارەکەی من ئەوەیە پاش چەند ساڵ لەم قسانە هێشتا ئاڵوگۆڕ پێکنەهات، ئەوەی کە خەڵك تینووی ئاڵوگۆڕە، کێ بەرپرسە لەوەی کە ئەو ئاڵوگۆڕە پێکنەهات؟ ئێوە وەکو هێزە سیاسییەکان؟ یان جەماوەر بەرپرسە لەوەی کە خۆپیشاندان و ئەو ئاڵوگۆڕەی پێکنەهێناوە یان ئێرانە رێگەی لە هەموو ئەوانە گرتووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵگا هەرکات ئێمە ویستمان، یان بڵێین تەنیا لەرووی هەوڵی ئێمەوە پێ نانێتە دەورەیەکی شۆڕشگێڕانەوە، لە سەد ساڵی رابوردوودا کۆمەڵگای ئێران تەنیا (٣) جار مەجالی ئەوەی بۆ رەخساوە کە ئاڵوگۆڕی سیاسیو کۆمەڵایەتی جدی تێدا پێکبێت. ئەوەی کەجەماوەر تینووی ئاڵوگۆڕە هێشتا وەڵامی ئەوە ناداتەوە کە کەی دەتوانن ئەو ئاڵوگۆڕە پێکبێنێ. ئێمە دەتوانین کۆمەڵگا لەو هەلومەرجە نزیککەینەوە، دەتوانین لەرەوتی ئەو نزیککردنەوەدا یارمەتی بدەین کە ژیانی خەڵك باشتر بێ، بەڵام کەس ناتوانێ ئەوە دیاریبکات کە کۆمەڵگایەك کەی پێدەنێتە هەلومەرجێکی شۆڕشگێڕانەوە.

یەکێك لە ئامانجەکانی درێژە پێدانی شەڕ لەگەڵ عێراق لەلایەن رژێمی کۆماری ئیسلامییەوە سەرکوتکردنی پاش ماوەکانی شۆڕشی ساڵی (١٩٧٩)ی ئێران بوو. رژێم توانی لەژێر سێبەری ئەو شەڕەدا ئەو ئەرکەی خۆی بەئەنجام بگەیەنێ. دوای کۆتایی هاتنی شەڕ رژێم داوای لە خەڵك کرد کە مۆڵەتی پێبدەن وێرانکارییەکان و ناسەواری شەڕ لە کۆمەڵگای ئێران بسڕێتەوە. رەفسەنجانی لە سەر بنەمای ئەم بەڵێنییە (٨) ساڵ حکومەتی کرد. نارەزایەتییەکانی جەماوەر وەڵامیان وەر نەگرتەوە. کۆمەڵگا هەروا تینووی ئاڵوگۆڕ بوو و نارەزایەتییەکان پەرەیاندەسەند. پرۆژەیەکی تازە هاتەکایەوە، ئەویش پرۆژەی رێفۆرمی حکومەتی بوو.

خاتەمی وەعدەیدا کە سەرخانی سیاسی پێویست بۆ ئاڵوگۆڕی ئابووری پێکدێنێ. بەڵێنی کۆمەڵێك رێفۆرمی سیاسی بە خەڵکدا. جارێکی دیکەش جەماوەر ئەو دەرفەتەیان بەرژێمداو ئەویش (٨) ساڵ حکومەتی کردو ژیان لەکۆمەڵگای ئێراندا بۆ زۆرینەی خەڵکی ئەو وڵاتە ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی تێدا پێکنەهات.

خەباتی جەماوەری کرێکاران، ژنان، خوێندکاران و خەبات لە کوردستان، پەرەیدەگرت. رێفۆرمخوازەکان بەرامبەر بەمەترسییەك کە لەئاکامی ئەو بزووتنەوانەدا هەرەشەی لەرژێمەکەیان دەکرد، لەبەڵێنییەکانیان پاشگەزبوونەوەو چوونەوە باوەشی مەحافزەکارەکان. پێگەی کۆمەڵایەتی رژێم لە چوارچێوەی دەستو پێوەندەکانو ئەو کەسانەی کە بەرژەوەندی خۆیان لەبەردەوامی رژێمدا دەدی، بەرتەسك بووەوە لەدەورەی ئەحمەدی ئەژاد دا بەشداری خەڵك لەهەڵبژاردنەکاندا بە نزمترین ئاستی خۆی گەیشت و ئەحمەدی ئەژاد لەشێوە کودەتایەکی سوپای پاسداراندا هاتە سەرکار. ئێستا خەڵك بە پانایی هەموو ئێران لە رژێم نارازییە. بەڵام بەدیلێکی جەماوەری بۆ روخاندنی ئەو رژێمەو بۆ هێنانە سەرکاری رژێمێکی نوێ هێشتا شکڵی نەگرتووە. بۆ ئەوەی کۆمەڵگای ئێران پێ بنێتە دەورەیەکی شۆڕشەوە پێویستە هەم جەماوەر نەیانهەوێ بەشێوەی

جاران حكومەتیان بەسەردا بكەن‌و ئەرژێم بتوانێ بەشێوی جاران حكومەتیان بەسەردابكات.

**جەماوەر دەبێ ئاڵوگۆڕ پێكبێنێت**

***لەیەكێك لەباسەكانی كۆنگرەدا هاتنە سەر لێكدانەوەی مەسەلەی بزووتنەوەی كرێكاری‌و زۆر مەسەلەی تر، هەمیشە لە بەحسەكانی كۆنگرەدا ئەم مەسەلە پێشنیار ئەكرێ، پێتانوایە گەیشتوونە ئەوەی كەرێگا چارەی شیاوی بۆ بدۆزنەوە و لەرێگای رێكخراوە ناحكومییەكانەوە كرێكاران لە كوردستان رێكخەن‌و بتوانن دەور و نەقشێكی جدیتان هەبێ. لەو مەسەلەدا، یان ئەمانە تەنها كاری شكڵی كۆنگرەكانە كە بەردەوام ئەوترێتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گۆڕانكاری لەكۆمەڵگادا لەسەردەستی جەماوەر پێكدێت‌وجەماوەر ناتوانێ لە خەباتی نهێنیدا دەور و نەقشی خۆی بۆ ئەو گۆڕانكارییانە بنوێنێ. كەوایە هەلومەرج ئیستبدادی بێ یان كەشوهەوای سیاسی كراوە بێ، هیچ رێگایەك نییە غەیری ئەوەی كەخەباتی ئاشكرای جەماوەری بۆ گۆڕانكاری شكڵبگرێ. بۆ ئەو مەبەستەش جەماوەری خەڵك پێویستی بە رێكخراو بوون هەیە. رێكخراو بوون لەئاستی جەماوەریدا. پەرەپێدانی رێكخراوەی حزبی وەڵام بەم پێویستییەناداتەوە. هەر بۆیە ئێمە لە هەموو كۆنگرەكاندا بەردەوام لەسەر پێویستی پێكهاتن و پەرەسەندنی رێكخراوە جەماوەرییەكان پێدادەگرین. راستەكەئیستبدادی سیاسی گەلێك رێگری لەمبابەتەوەدروستدەكات، بەڵام لام وایە كەلەژێردەسەڵاتی رەشترین ئیستبدادیشدا دەتوانین مەجالی جۆرێك لە چالاكی عەلەنی بدۆزینەوە. پێموانییە كاری ئێمە لەم بواردا بێئاكام بووبێ. ئەگەر رێكخراوەی سەرانسەری و بەهێزیش پێكنەهاتبێ گەلێك رێكخراوەی مەدەنی، مەحەلی بۆ ئامانجی دیاریكراو پێكهاتوون كە دەوریان هەیە لەبەرەوپێشبردنی خەباتی خەڵك لە كوردستان. پتەوتركردنی كاری رێكخراوی نهێنی حزبی گەلێك گرنگەو بنچینەی چالاكی ئێمەیە، بەڵام بۆ نزیككردنەوەی كۆمەڵگای كوردستان لە هەلومەرجێكی شۆڕشگێڕانە، بۆ بەرەوپێشبردنی رەوتی خەباتی هەر رۆژەی خەڵك، رێگایەك نییە غەیری ئەوەی كە جەماوەر لە رێكخراوەكانی مەدەنیدا خۆیان رێكبخەن.

**خەباتی چەكداری تەنها رێگا نییە**

***بەحسێكی تر، مەسەلەی خەباتی چەكدارانەیە كە باس‌و خواستەكانی كۆنگرە بووە، هەمیشە قسە لەسەر ئەوە ئەكەن كە خەباتی چەكداری یەكێكە لەو چەمكانەی كەبەدەست كۆمەڵەوەیە ولەهەركاتێكی پێویستدا بەكار دێن‌و مانای ئەوە نییە كە كۆمەڵە وازی لەخەباتی چەكداری هێناوە، بەڵام پرسیارەكەی من و هەم خەڵكیش ئەوەیە واز نەهێنان چۆنە؟ وەختێك كە تۆ لە ماوەی (١٠- ١٥) ساڵی رابردوودا هیچ عەمەلیاتێكی چەكداری‌و كارێكی چەكداری ناكەی لە ناوخۆی ئێران و لەسنوورەكانەوەو تەنها لەئۆردوگایەكدان‌و بەشێك لەئەو ئینشعابانەی كەلەناو كۆمەڵەشدا روویداوە زۆر كەس ئەیگەڕێنەوە بۆ ئەوەی كە كۆمەڵە، یان ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بووە بە حزبی ئۆردوگا نشین و بەپێچەوانەوە هیچ چالاكییەكی نییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێستاكە باسی كۆنگرەی (١٠)ی كۆمەڵە دەكەین، زۆرترین باس لەسەر هەلومەرجی ئێستای خەباتی چەكداری لەكوردستان لەم كۆنگرەیەدا كراو بناغەی سیاسەتی تا ئێستاشمان لەم دەورەیەدا هەر لەسەر باس و پەسەندكراوەكانی ئەم كۆنگرەیە دامەزراوە.باسم بۆكردی كەكۆنگرەی(١٠)لە دەورەیەكدابەستراكەپرۆژەی ئیسلاحاتی دەورەی خاتەمی

روویکردبووەکوردستانیش‌وژمارەیەك ڕیفۆرمخوازی کورد کە زۆربەیان هەردەست‌وپێوەندەکانی حکومەت بوون لەکوردستان کەوتبوونە خۆهەوڵیانەدا کەخەڵکی کورد لەڕابوردووی خۆیان پەشیمان کەنەوە، هەستی ڕەنج بەخەساری لەنێویاندا پەرەپێبدەن و لەحزبە سیاسییەکانی کوردستان دووریانخەنەوەو پرۆژەی خۆیان بۆ ڕیفۆرم لەسەر ئەساسی جێ خستنی وەها بۆچوونێك بینابکەن. یەکێك لەو بوارانەی کە هێرشێکی تەبلیغاتی و ڕەوانییانکردبووە سەری، خەباتی چەکداری بوو. ئەوان بەردەوام بە خەڵکیان دەگوت کە بەهەڵەچوون ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان پشتگیرییان لەم شێوە خەباتەکردووە. ئەم بۆچوونە تەنانەت لە ناو هەندێك لە حزبە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆن لەکوردستانی ئێران‌و هەروەها هێزە سیاسییەکانی دۆست لەکوردستانی عێراق جێگەی خۆی کردبووەوە.

کۆنگرەی (١٠)ی کۆمەڵە لە هەموو بوارەکانداو بەتایبەت لە بواری خەباتی پێشمەرگانە لەکوردستاندا هەوڵیدا ئەو هێرشە ئیعلامی و سیاسیە بەرپەرچبداتەوە. کۆنگرە لەسەر ماف گەلی کورد بۆئەوەی بەمەبەستی بەرگری لە گیان‌و ژیانی خۆی بۆ بەدەستهێنانی ئازادی خۆی دەست بە چەك بەرێ پێیداگرت‌و جەختکردەوە کە ئەوە ڕژێمە دیکتاتۆر و سەرکوتگەرەکانن کەخەڵکی کوردستان ناچار دەکەن بۆ بەدەستهێنانی مافە سەرەتاییەکانی خۆیان دەست بۆچەك بەرن.هەروەها کۆنگرە بەلێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی کۆنکرێتی خۆی نیشانیدا کە ئەگەرچی خەباتی چەکداری لەکوردستان هەموو ئامانجەکانی خۆی نەپێکاوە، بەڵام مۆقاومەتێکی شەرافەتمەندانەو سەربەرزانەیکردووە و ئەگەر ئەومۆقاومەتەی نەکردبایەزیانی گیانی زیاتریشی بەردەکەوت. ئەگەر کوردستانی ئێران لەڕووی ژمارەی ئێعدامکراوەکانی و لەڕووی ژمارەی ئەو کەسانەی کەلە مەیدانەکانی شەڕی ئێران و عێراقدا گیانیان لەدەستدا، لەکاتێکدا ڕژێم نەیدەوێرا لەو ناوچەیە سەربازگیری بکات، بەراورد بکەین لەگەڵ باقی شوێنەکانی ئێران، خەسارەتی گیانی خەڵکی کورد لە هەردوولا رووەو کەمتربووە.دەستکەوتە سیاسییەکانی ئەومۆقاومەتەش کەبزووتنەوەیەکی شۆڕشگێرانەی لەکوردستان جەماوەری کردۆتەوەو سەرمایەی بەنرخی خەباتی لەوەوە داوییەتی بە جێگەی خۆی.

بەهەمووی ئەوانەوە ئێستاو لەسەر بنچینەی بنەمای ئەم باسانە ئێمە سیاسەتێکی روونمان بەرامبەر بە خەباتی چەکداری هەیە. لە مەسەلەی خەباتی چەکداریدا پێویستە دوو لایەنی ئەو مەسەلەیە لێك جیابکەینەوە. یەکیان حزبی چەکدارە و ئەویتریان خەباتی چەکداریە لەکوردستان. حزب یان ڕێکخراوێکی دیاریکراو دەتوانێ لەهەر هەلومەرجێکدا بە پێی بڕیاری دەزگای ڕەهبەرییەکەی، چەکدار بێ. زەمان و شێوە، و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئەوبڕیارەخۆی دیاریدەکات.کەی‌وچۆن‌وبەچ شێوەیەك بەکاریدێنێ‌بڕیارێکی ڕێکخراوەییە.بەڵام خەباتی چەکداری لەکۆمەڵگایەکی وەکوکوردستاندابەیوەندی هەیەبەپێویستییە سیاسییەکەی، پەیوەندی هەیە بەڕادەی ئامادەیی جەماوەر بۆ بەشداریکردن تێیداو بۆ پشتیوانیکردنی. خەباتی چەکداری لەوڵاتێك ناتوانێ لەسەر بنچینەی ئەوە دابمەزرێ کە داخوا وڵاتە پاڵدەستییەکەی هاوسنوور، سنوورەکانی بۆ دەکاتەوە یان نا؟ ئەگەر زەرورەت‌و ئیمکانی هەڵگیرسانی وەها خەباتێك لە وڵاتێکی دیاریکراو پێگەیشت، ئەوجار دەکرێ بیرلەوەش بکرێتەوە کە چۆن ئاسانکاری بۆ بکرێ، یان

لەناکۆکی ئەمونەوبۆپەرەپێدانی کەڵکی دیاریکراووەربگیرێ.بەڵام ناکرێ هەڵگیرسان و یان گوزاندنەوەی بەسیاسەتو بەرژەوەندی لایەنیکی دیکەوە گرێ بدرێ کە بڕیاری بەدەستی ئێمە نییە.

خەباتی چەکداری لەکوردستانی ئێران بەدوای هێرشی کۆماری ئیسلامی لە (٢٨)ی گەلاوێژی (١٣٥٨)ی هەتاوی دەستپێکرد، بەبێ ئەوەی گرێدرابێ بەسنوورکردنەوە یان سنووربەستنی دەوڵەتی عێراق. ئەو خەباتە پەرەیسەند،جەماوەری بۆوە و بە ئیعتباری زەرفیەت و هێزێک کە هەیبوو توانی تارادەیەك لەناکۆکییەکانی دوو دەوڵەتی ئێرانو عێراق کەڵك وەربگرێ. ئەگەر خەباتی چەکداری لەکوردستانی ئێران زەروری بێ، دەبێ بتوانێ بەبێ ئەوەی کە پشتی جەبهەیەکی لەوڵاتێکی پاڵ دەستی بۆ فەراهەم بێ، بتوانێ خۆی ئیدامە بەکارەکەی خۆی بدات. ئەگەر نەتوانێ ئیدامە بەکارەکەی خۆی بدا دیارە نەزەرورییە نەئیمکان پەزیرە. چونکە ئاخر ئەگەر شتێك زەرورەتەکەی بوو خۆناتوانی بڵێی مەسەلەن زەرورەتی کۆمەڵایەتی، زەرورەتی سیاسی بۆ خەباتی چەکداری پێگەیشتووە بەڵام بەداخەوە فلانە دەوڵەت کۆمەکم پێناکات. ئەگەر گەیشتووە دەبێ بتوانی بیکەی. لە ئامریکای لاتین لە کوبا، کێ پشت جەبهەیان بوو وەختێك فیدل کاسترۆ و یارانی دابەزین. بە هەر بەدبەختی و هەر رەنجێك بوو ئەسلەحەیان پەیداکرد، پشتی جەبهەیان دروستکرد، مەنتەقەی ئازادیان دروستکرد خەڵکیش بوو بە پشتیوانیان. لە "ڤیتنام"یش هەر وابوو، ئەوان کاتێك کە خۆیان بوون بەبزووتنەوەیەکی جەماوەری بەهێز توانیان لەیارمەتی شۆرەوی و چین بەهرەمەند بن.

***بۆ ئێوە ئەوە ناکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە دەبێ زەرورەتەکەی لەکۆمەڵگاکەدا پێکهاتبێ.

***بۆ پێکنەهاتووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بوو، تاسالی (١٩٨٤) هەبووە ناوچەی ئازادکراویش هەبوو، کۆنگرەی (١٠) وەڵامێکی بەم پرسیارەدایەوە کە تائێستاش سیاسەتی کۆمەڵە لەبواری خەباتی چەکدارییەوە هەر لەسەرئەو بنەمایە دامەزراوە. مەقتەعی کۆنگرەی (٩و١٠) بەو لاوە کەوتراوە کۆمەڵگای ئێران تینووی ئاڵوگۆڕە ئەمە هەر مۆشاهەدە دیتنێکی سادەنەبوو، ئەمە واقعیەتێکی سیاسی عەمەلیش بوو کەلەکۆمەڵگای کوردستاندا لەگۆڕاندا بوو. مەسەلەن بۆ نمونە دەڵێم بە دەیان رۆژنامەو گۆڤار کە هەڵوێستی رەخنەگرانەیان بەرامبەر بە گەلێك شت بەرامبەر بەرژێم هەبوو هاتبۆکایەوە، کۆمەڵێکی زۆر رێکخراوەی مەدەنی وردە وردە سەریانهەڵدابوو "ئێن.جی.ئۆ"وەکان و هەموو ئەوانە. جۆرێك لەخەباتو ناڕەزایەتی لەئەشکالی جۆراوجۆردا کەراستەوخۆ پەیوەندیشی نەبوو بەحزبە سیاسییەکان، بەڵام لەواقیعی کۆمەڵگای کوردستاندا هەبوو، ئەم رەوتە کە لەو وەختەوە دەستپێکردبوو تائێستاش ئیدامەی هەیە. یەکەم پرسیار بۆ ئێمە ئەوە بوو کە ئایا دەچینەوە سەر دەورەی پێشوو کە خەڵك هەر چاوەروان بێ قارەمانانی پێشمەرگە رێگای نەجاتی پێنشاندەن یا خۆی دەجوڵێ و بڕوا بە خۆی پەیدادەکاو کارێکدەکات؟ قسە لەسەرئەوە بوو. مەسئەلە تەنیا ئەوەنەبوو کە یەکێتی نیشتمانی، پارتی و حکومەتی هەرێم رێگامان دەدەن لە سنوورەکان چالاکی بکەین یا نە؟ مەسەلە ئەوە بوو کە ئێمە لەو دەورەیەدا بەو نەتیجە گەیشتین کە ئەگەر

بەشێوەیەکی نابەوەخت ئێستا پەرەبدەین بەخەباتی چەکداری دوو زەرەری تێدادەکەین.

**پێشمەرگە باسکی چەکداری کۆمەڵەیە**

یەکەم ئەوە کە ئەم جۆش و خرۆشە جەماوەرییەی کە کەوتووەتە ڕێ و زۆریش هیوابەخشە ئەوە دادەمرکێنێتەوە.

یەعنی خەڵك دووبارە هەر ئومێد بە پێشمەرگەوئومێد بە پێشمەرگایەتی تێیدا دەبێت بە نەسڵ و هەڵسوراوان و تێکۆشەرانی ئەو بزووتنەوەیە، ڕەهبەرانی دووبارە ڕوو دەکەنەوە پێشمەرگایەتیو کۆمەڵگا لەو بابەتەوە تووشی بۆشاییەك دەبێ. ئەوە لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە مەجال فەراهەم دەبێ بۆ کۆماری ئیسلامی کۆمەڵگای کوردستان جارێکی دیکە بە هێزێکی زۆرترەوە میلیتاریزە بکا، ئەو میلیتاریزەکردن و ئیزامیکردنەوەی کۆمەڵگای کوردستانیش لە لایەکی دیکەوە دووبارە زەربەیێک بدات لەو حەرەکەتە جەماوەرییە کە کەوتووەتە ڕێ.

ئێمە ئێکدانەوەکەمان ئەوە بوو، پەس ئەگەر وایە ئەتیجەی ئەوە چییە؟ ئەتیجەکەی ئەوەیە لەلایەکەوە ئێمە نابێ خەباتی چەکداری وەکو ڕێگایەك لەبەردەم ئەو خەڵکە لە بیربەرینەوە، نابێ زەرفییەتەکانی خۆمان بۆ زیندووکردنەوەی و بۆ تەقویەتوبەهێزکردنی کەمبکەینەوەیەلکودەبێ بیشی پارێزین، بەڵام لە هەمانکاتدا نابێ نا بەوەختوبەشێوەیەکی نامەسئولانەش بەکاریبێنین.ئەتیجەکەی وتمان هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە وەکو باسکی چەکداری ڕێکخراوێکی سیاسی دەپارێزین و پەرەشی پێدەدەین.

ئەگەر ڕێگام بدەن دەمەوێ لە کۆتایی ئەو باسەدا مۆلاحزەیەکیش لەسەرتەعبیری ئۆردوگانشینی کەلەپرسیارەکەی ئێوەدا هاتبوو، بڵێم. ئەوە ڕاستە کە مەقەراتی ناوەندی ئێمەو زۆربەی ناوەندەکانی کۆمەڵە لە شوێنێکی وەکو زرگوێز دامەزراوە، بەڵام کاری ئێمە تەنها بەڕێوەبردنی ئەم مەقەراتە نییە. ئێمە پەیوەندی بەردەوام و ڕۆژانەمان لەگەڵ ناوەوەی وڵات هەیە. تەشکیلاتی ئێمە ڕاستەوخۆ، یان ئەو هێزو کەسانە کە لەسەر ڕێبازی سیاسی ئێمەن، بەڵام سەربەخۆن، لەناوەوەی وڵات بەردەوام خەریکی چالاکین، مانگرتن ڕێکدەخەن، خۆپیشاندان بەڕێوەدەبەن، خەبات دەکەن بۆ باشترکردنی ژیانی خەڵك. جگە لەوە هەڵسوراوانی ئێمە کە ژمارەیان گەلێك لەو کەسانەی ئێستا لە بارەگاکانی ناوەندی ئێمە لەکوردستانی عێراقن زیاترە، لەسەرتاسەری دونیا لەگەڵ ڕەوتی ئێمە کاردەکەن. کەناڵی ڕادیۆوتەلەفزیۆنی ماهوارەیی بەڕێوەدەچێ، لەکۆڕوکۆمەڵەکانی کەلەئاستی جیهانیدالەسەرمەسەلەی کوردبەڕێوەدەچن، بەشداری دەکەین و چەندین بواری دیکەی تێکۆشان. ئەوەی کە هەمووی ئەو هەوڵانە بە "ئۆردوگا نشینی" پێناسە بکرێ و ئەوجار بەهۆکاری ئینشعاب و جیابوونەوەش دابنرێ، واقیعی نییە.

**نابێ خەڵکی کوردستانی عیراق نیگەران بکەین**

***باسی ئەوەتکرد کەهێزەکانی باشوور یان حکومەتی هەرێم زۆرجار بەشێوەیان ڕاگەیاندووە و لەڕاگەیاندنەکانی خۆشیان باسی ئەوە ئەکەن کە پێویستە هێزەکان لەڕێگای دیالۆگ و خەباتی سیاسی و چالاکی مەدەنیو دیمۆکراسییەوە بەشداری بکەن و ئاڵوگۆڕ پێکهێنان، بەڵام تۆ پێتوا نییە ئەم سانسۆر خستنەسەری ئێوە، خۆ دزینەوە لەوەیە کەئەوان نایانهەوێ ئێران یان تورکیا لەسنوورەکانیان نیگەران بن، تۆپبارانیان بکەن، کێشەیان بۆ دروستکەن و پێئەچێ کە ئیتفاقییەکی نهێنی ئەمنیش هەبێ لە بەینیاندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە بۆهەردووکیان موشکیلەمان هەبوو. لەلایەکەوە ئێمە پێمانخۆش نییە لەسەرسنوورەکان کارێکی وابکەین کەخەڵکی کوردستانی عێراق تووشی گیروگرفتی نەخوازراوبن، رێگەی هاتوچۆیان لێببەسترێ، تووشی گەمارۆی ئابووری بن، بەتایبەت لە ساڵانی ئەوەدا کەهەلومەرجی ژیانی کوردستانی عێراق گەلێك دژوار بوو، ئەمە مەسەلەیە گرنگییەکی زیاتری هەبوو. ئێمە پێش ئەوەی کە مۆلاحزەی حکومەتی هەرێمان هەبێ، مۆلاحزەی ژیانی ئەو خەڵکەمان بوو کە ژیانیان لەڕێگەی ئەو سنوورانەوە ئەگوزەرێ. ئێمە دەڵێین خەباتی چەکداری ئێمە نابێ لەسەرحیسابی ژیانو بەرێچوونی خەڵکێك بێ کە ئەمە بە ئیشی خۆیان نازانن. خەڵکی کوردستانی ئێران پشتیوانی لێدەکەنو فیدارکاریشی بۆ دەکەن، بەڵام خەڵکی کوردستانی عێراق کە ئاپانهەوێ ژیانیان، ئەمنیەتیان، بەرێچوونیان بخەنە پێناوی خەباتی چەکداری لەلای ئێمە بەحیسابی ئەوەی کە کوردن خۆ نابێ ئێمە ژیانیان لێ تاڵبکەین. لەبەر ئەوە ئێمە موشکیلەیەکمان بوو بەرامبەر هەر دانە تۆپێك کەدەکەوتە هەر ئاواییەکی کوردستانی عێراق، بەرامبەر بە هەر گەمارۆیەك کە دەکەوتە سەر ژیانی خەڵك و خواردن و خۆراکی ئەدەهێشت بێت بۆ ئەو لایە و گرانی لێ دەکەوتەوە، نیگەران بووین. ئەمە کێشەیەك بوو، کێشەی حکومەتی هەرێمیش کێشەیەك بوو. تا ئەو جێگەیەی کە بەحکومەتی هەرێم مەربووتە بەڕاستی هیچ وەخت بەڕەسمی نەهات بڵێن ئەوە مەکەنو ئەوە بکەن. بەڵام تەبعەن بە عەمەلی ئێمە لێیان حالی دەبووین، واتە دەمانزانی و حالیبووین کە ئەگەر بەعزە کارێك بکەین لەگەڵ کاردانەوەی توندی ئەوان بەرەو روو دەبین.

*** ئەو دیعایەی ئەوان جەخت ئەکەی کە ئەڵێن ئەوەتا کورد نمایەندەی لە پەرلەمان هەیە و سەرۆکی شارەوانی هەیە یا تۆ پێتوایە ئەمانە نوێنەرایەتی ئەسلی خەڵکی کوردستان بکەن پیاوی رژێمن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە هیچ شکلێك لەشکڵەکان نوێنەرایەتی خەڵکی کورد ناکەن.

**پژاك ئەمریکای لەپشتە**

*** بۆ تۆ وتت ئێمە پشتی جەبهەمان نییە و زروق زاتیو بارودۆخی پێکنەهاتووە، بەڵام بۆ (پژاك) دەستیداوەتە ئەم کارە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من لام وایە پژاك بۆ ئەم چالاکیانەی خۆی لە ئیمکاناتێك بەهرەمەندە کە ئێمە ئەمانویستووە کەڵکی لێوەربگرین. پژاك بەبێ جۆرێك لەچاوپۆشی ئەمریکاییەکان لەعێراق لەسنوورەکان نەیدەتوانی ئەو چالاکیانە بکات. ئێمە ئەوەمان پێ سیاسەتێکی زیانبارە و تائێستاش نەیتوانیوە پێشکەوتنێکی لەخەباتی جەماوەری خەڵکی کوردستان لەدژی رژێمی کۆماری ئیسلامی لێ بکەوێتەوە.

***بۆ حکومەتی هەرێم جۆرەها رێگری بۆ ئێوە دروست ئەکات، بەڵام بۆچی ناتوانێ دەست بخاتو رێگری کارەکانی پەژاکەوە، لەم سەر بۆ ئەو سەری سنوور چالاکی ئەکەن و پاسدار ئەکوژن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** عێراق تائێستاش وەکو وڵاتێکی داگیرکراو لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوەیەو بڕیاری کۆتایی لەمەڕ گەلێك لەکێشەکان دەچێتەوە لای ئەوان. ئەگەرچی خۆ دیارە حکومەتی مەرکەزی پێکهاتووەو حکومەتی هەرێمی کوردستانیشمان هەیە، بەڵام بەهۆی هەلومەرجی

عەینییەوە، دەسەڵاتی یەکەم تائێستاش هەر ئەمریکاییەکانن و هەرچی ئەوان لەسەری ساغ ببنەوە و بڕیاری لەسەربدەن، بنچینەی بەڕێوەدەچێ.

**بەڵێنمان بەیەکێتی و پارتی نەداوە خەباتی چەکداری نەکەین**

*** ساڵی (٢٠٠٢) یەحیا رەحیم سەفەوی فەرماندەی سوپای پاسداران لە سنە رایگەیاند "کۆمەڵە و دیموکرات بەڵێنی رەسمییانداوە بە یەکێتی و پارتی کە هیچ جۆرە چالاکییەکی نیزامی دژی ئێران نەکەن و وتی "ئێران حیساب بۆ کۆمەڵە و دیموکرات ناکات، چونکە مردوون دیارە ئێوە ئەبێ بەڵێنتانداپێ بەحکومەتی هەرێم، بەیەکێتی و پارتی کەنابێ هیچ جۆرە چالاکییەک بکەن کاتی خۆیشی وەڵامی ئەم بۆچوونەی یەحیا رەحیم سەفەویتاندایەوە، پێتان وانییە ئەو قسانەش بەشێکی راستی تێدا بێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هیچ رێککەوتنێکی رەسمی سەبارەت بەخەباتی چەکداری لەنێوان ئێمەوحکومەتی هەرێمدانەکراوە. بەڵام ئەوەی کەبە کردەوە بەڕێوەمانبردووە ئەوە بووە کە لەسنوورەکانی کوردستانی عێراق بۆ هێرشبردنە سەر بنکەکانی سوپا و ئەرتەشی ئێران کەڵکمان وەرنەگرتووە. ئەم سیاسەتەی ئێمە لەلایەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بنەمایانەی کە پێشتر باسمکردن و لەلایەکی دیکەشەوە ئێمە کە زەرفیەتەکانی رژیمی ئێران دەناسین، ئێمە کە نیگەرانییەکانی یەکێتی و پارتی دەرک دەکەین، لەیەک حالی بوونێکی بەکردەوەی لە نێوانماندا هەیە. پێویستە ئەوەش دووپات کەمەوە کەدرێژەی خەباتی چەکداری وەکو لایەنێکی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستان لەگەڵ بوونی باڵێکی چەکدار بۆ کۆمەڵە، لەگەڵ کەڵک وەرگرتن یان وەرنەگرتن لەسنوورێکی دیاریکراو بۆ ئۆپەراسیۆنی چەکداری سێ بابەتی جیاوازن.

**بەرنامەی کۆمەڵە بۆ نەتەوەی کورد زۆرباشە**

***لەسەرویەندی کۆنگرەکەی ئێوە عەبدوڵڵا موهتەدی راپگەیاندووە "کەکۆنگرەکەیان شکستخواردوویووەو جارێکی تریش هەر لەسەرئەوە کە ئیبراهیم عەلیزادە لە جیهانی ئیمرووزدا وتوپەتی کەگوایە من بەرگری لە خودموختاری دەکەم نەک لەمافی چارەی خۆ نووسین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم جۆرە لێدوانانە دەچنە خانەی پڕوپاگەندەی غەیرە مۆستەنەدەوە. ئەگەر کەسێک بیەوێ هەڵسەنگاندنێک بکات، لەسەرکۆنگرەکانی ئێمە یان لەسەرئەم یا ئەوبۆچوونی ئێمەبۆ مەسەلەیەکی دیاریکراو پێویستە پشت ئەستور بێت بەبەڵگەنامەو لێدوانی رەسمی ئێمە نەک بە ئارەزووی خۆی هەرچی ویستی بیداتە پاڵ ئەمو ئەو. باسەکانی ئێمە لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی گەلێک شەفافترو کۆنگرێت تر لەوەن کەبکرێ بەم شێوەیە قەزاوەتی لەسەربکرێ. چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی بۆ ئێمە تێپەرکردنی قۆناغێکی زەروریە کەنزیکمان دەکاتەوە لە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی. بەرنامەی کۆمەڵە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی بەهەموو لایەنەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە تائێستاش لەبەرنامەی هەموو ناسیۆنالیستێکی کورد واقیع بینانەتر و عەمەلی تر، رادیکاڵتر و ئینسانی ترە.

**حزبی کۆمۆنیست لایەنی بەهێزی چەپی ئێرانە**

***جگە لەوەی کە ئێوە لە کۆنگرەدا جەختتان کردۆتەوە لەسەرگرنگی حزبی کۆمۆنیستی ئێران و لەسەر**

راستگۆییەتی‌و لێبراوانە و ئارەزووە ئینسانی و سۆسیالیستییەکان. بەڵام مۆهتەدی لەپەیوەند بەم مەسەلەیە، پێیوایە، لەوەڵامی پرسیارێکدا لە دیدارێکدا لێی دەپرسن ئەڵێ" حزبی کۆمۆنیست مەحەلی ترین رێکخراوی چەپی ئێرانە"؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم پروپاگەندە لە دژی حزبی کۆمۆنیستی ئێران پشتی بە هەلومەرجێکی دیکتاتۆری بەستووە کە ئێستا بەسەر کۆمەڵگای ئێراندا زاڵە. بەم حاڵەشەوە هیچ ئینسانێکی واقیع بین‌و مۆنسیف‌و راستگۆ ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات، کە حزبی کۆمۆنیستی ئێران بە هەموو کەموکۆڕییەکانیشیەوە لە بواری رێکخراوەییدا، یەکێك لەلایەنە بەهێزەکانی چەپی مەوجودی ئێرانە لەئاستی سەرانسەریشدا. دروشمەکان‌و رێبازی بزووتنەوە جەماوەرییەکانی رادیکاڵ‌و پێشرەوی ئێران ئەگەر چاولێبکەن بەئاسانی جێگا و شوێنی خەبات‌و رێبازی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان تێدا دەبیننەوە. هەبوونی حزووری حزبی کۆمۆنیستی ئێران وەکو ئیدئۆلۆژی، وەکو بەرنامە، وەکو ستراتێژ و تاکتیك، وەکو سوننەت، لەهەموو بزووتنەوەکانی وەکو بزووتنەوەی کرێکاران، بزووتنەوەی ژنان، بزووتنەوەی خوێندکاران و هەر جوڵانەوەیەکی بەناوەرۆك رادیکاڵ‌و چەپ لە ئێراندا نکۆڵی لێناکرێ. بەڵام سەرەڕای ئەوانە هێشتا یەکەم، ئەم نفوزە لەو ئاستەدا نەچووەتە بواری رێکخراوەییەوەو ئەوەش خۆی ئەساسەن هەڵدەگەرێتەوە بۆ هەلومەرجی دیکتاتۆری لە ئێران، دووهەم، لەچاو ئەو زەرفیەتانەی کە لەو کۆمەڵگایەدا هەیە ئەو ئامانجانەی کە ئێمە دیاریمانکردووە، گەلێك لاوازە. هەر ئەم لاوازبوونەیە کە مەجال بە نەیارانی حزبی کۆمۆنیست ئەدات لێرە و لەوێ ئەم جۆرە پروپاگەندەیە لەدژی بکەن. ئەوەی تائێستاکراوەو دەکرێ بەردی بناغەی کارێکی گەورەیە بۆ داهاتووی کۆمەڵگای ئێران.

**کۆمەڵە بەشێکە لەحزبی کۆمۆنیست**

***بەڵام تۆ پێتوا نییە ئەمانە نفوز و ئیدئۆلۆژی کۆمەڵەن تا حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆچی دەبێ هی هەردووکیان نەبێ ؟ ئێمە باسی یەکەرەیەکی واحید دەکەین، لەرووی بەرنامەو ستراتێژو تاکتیك‌و سیاسەت‌و ئیدئۆلۆژییەوە. نفوزی کۆمەڵە لە کوردستان رێگا خۆشکەربووە بۆ پەرەسەندنی رێبازی کۆمۆنیستی لەهەموو ئێران.کۆمەڵە بەشێکە لەحزبی کۆمۆنیستی ئێران. ئەوە شانازیەکە لەمێژوودا بۆ جوڵانەوەی چەپ لەکوردستان تۆمار دەکرێ.

***باشە بۆ تۆ راستی ناکەیتەوەو بڵێی حزبی کۆمۆنیست بەشێکە لە کۆمەڵە؟ بۆ هەمیشەئەڵێی کۆمەڵە بەشێکە لە حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو دوو قسەیە لە روانگەی ئێمەوە لەناوەرۆکی خۆیاندا جیاوازیان نییە. جیاوازیەکە کاتێك دەردەکەوێ کەبتهەوێ ئەنتیجەیەکی دیاریکراوی لێوەربگری. ئەوکات رووندەبێتەوە کەلەوانەیە سەرچاوەی ئەو بۆچوونە بگەرێتەوە بۆ دوو رێبازی سیاسی وبەرنامەیی و فیکری جیاواز. ئەو مەجالانەی کە بۆ کۆمەڵە رەخساوە لە کوردستان هێشتا ئەو مەجالانە بۆ حزبی کۆمۆنیستی ئێران نەرەخساوە تاهەموو زەرفیەت‌و تواناییەکانی خۆی لەئاستی ئێراندا نیشانبدات. لە یەك ،دوو ساڵی رابوردوودا کە تاڕادەیەك کەشوهەوای سیاسی ئێران بەرەو رادیکاڵتربوونەوەو چەپ تربوونەوەچووە، تاڕادەیەك جێ پەنجەی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش

دیاره.

**ژنان لەكۆمیتەی ناوەندیدا كەمن**

***لەو كۆنگرەیەدا ئێوە (٣٠) كەستان هەڵبژارد بەكۆمیتەی ناوەندیو (٧) یان ژن بوون بەپێچەوانەوە لەكۆنگرەكانی داهاتووتردا ئەوانەی دوای ئەوە دێ ژنان كەم بوونەوە، مەبەستم ئەوەیە بە پێی ئەو ریزبەندییە كە هەموو جارێ ئێوە لە دوایین راگەیاندنی سەبارەت بەكۆنگرەكان ئەیكەن ئەو ناوانە ریزئەكەن مەبەستیان ئەوەیە كە هەر كەس بەپلەبەندی زۆرترین دەنگی هێناوە یان ئەكەوێتە سەرچی و بۆچی ئەو هەموو ژنە لەوێ هەڵبژێردران جارێكی تر لە كۆنگرەكانی داهاتوودا پاشەكشەی كرد ریژەی ژنان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەنیسبەت ریزبەندییەكەوە پەیوەندی بەژمارەی دەنگەكانەوە نییە، بەڵكوو لەڕووی پیتی "ئەلف و بێ"یە، بەڵام سەبارەت بەژمارەی ژنان لەناو كۆمیتەی ناوەندی كۆمەڵەدا ئەو راستییە پێویستە بگوترێ كە ئەوە كەموكوڕییەكی جدییە كەبەسەرجەمی كاروچالاكییەكانی ئێمەوە دیارە. بەداخەوە لەوەی كە ژنان لەناو دەزگای رێبەرایەتی ئێمەدا دەورێكی كەمتر لەوەی كە شیاوی هەن، دەبینن. ئەم هەلومەرجە هۆكاری تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئەوە بزانن كەمن ژمارەی هاورێیانێكی ژن كە خۆیان كاندید بكەن بۆ رێبەرایەتی و دەنگیان پێبدەرێ. دیارە لە ناو ئێمەشدا ئەو هەلومەرجە بەتەواوی ئەرەخساوە كەژنان ئەوەندە بڕوا بەخۆ پەیدابكەن كە خۆیان لەئاستی سەركردایەتی حزبەكەیاندا ببینن.

**خیلافمان لەگەڵ حیكمەتیست هەیە**

***لەسەرویەندی ئەم كۆنگرەو پێشترو دواتر هێرشێكی زۆر كراوەتە سەر تۆ و كۆمەڵە لەسەرئەو پەیوەندییەی كە ئێوە هەتانە لەگەڵ جەماعەتی مەنسور حیكمەتو هاتووە كەگوایە تۆ " ئیبراهیم عەلیزادە" پێدانگری لەسەرتەبلیغاتی خۆی دژی كۆمەڵە و بێدەنگی لەئاست جنێوفرۆشییەكانی ئەم ناژاوەگێرییەی جەماعەتی مەنسوور حیكمەت دەكاو عەبدوڵا موهتەدی پێوایە عەلیزادە هیچ سنوور بەندییەكی فیكری لەگەڵ خەتی مەنسوور حیكمەت نییە و لەهێرشی چەند ساڵەی مەنسوور بۆ سەر كۆمەڵە تۆ بێدەنگ بووی و سوخەنرانییەكت كردووە لەساڵی (٢٠٠١) دا لەلەندەنو لەئەڵمانیا بەشێكی زۆری بەشداربووان جەماعەتی مەنسوور حیكمەت و كۆمۆنیزمی كارێگەری بوون، ئەم تۆمەتانە راستەو ئەم پەیوەندییە لەگەڵ ئێوە هەیە لەكاتێكدا مەنسوور حیكمەتو كۆمۆنیزمی كارگەری زەربەیەكی گەورەیان لەرێكخراوەكەی ئێوەداوەو خیلافێكی سیاسیو فیكریو ئایدلۆژی زۆریشتان هەبووە و تاكەیشتووە بە ئینشعابێكی گەورە و زەربەیەكی گەورە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو كۆبوونەوەی كە ئاماژەتان پێكرد لە شاری كۆڵن لە ئەڵمانیا بووە و نەك لە لەندەن. كۆبوونەوەكەكراوەبوو و هاتن بۆ هەمووان بوو. راستە كە ئێمە ئیختلافاتێكی سیاسیو ستراتیژیكمان لەگەڵ باڵەكانی جۆراوجۆری كۆمۆنیزمی كرێكاری هەیە، بەڵام ئەولەویەتی ئێمە نە تەبلیغات دژی ئەوانەو نە وەڵامدانەوە بە پروپاگەندەی ئەوان كە گەلێك جار بەشێك لە باڵەكانیان زۆر نامەسئولانە بەرێوەی دەبەن. بۆ ئێمە ئەوبابەتانەگرنگن بۆوەڵامدانەوە كەكاریگەری هەبێت لەسەر بزووتنەوەیەكی كۆمەڵایەتی لەناوەوەی وڵات. جۆرێك لەدەم بە دەم بەناوی خەباتی سیاسیو ئیدئۆلۆژیك لەناو ئۆپۆزسیۆنی ئێران و لەوانە باڵەكانی حزبی

کۆمۆنیستی کرێکاری رۆژانە بەرێوەدەچێ کە ئێمە نەمانویستووە و نامانەوێ بچینە ئەو مەیدانەوە. تەنانەت بۆ ئەو باڵانەی کە بەناوی کۆمەڵەشەوە کاردەکەن هەر ئەو سیاسەتە بەرێوەدەبەین. سەرچاوەوهۆکاری کێشەکان لەرابردوودا بە ئەندازەی پێویست روونکراونەتەوەو ئەگەر کەسێك پێویستی پێیان هەبێ دەتوانێ لە ئارشیودا بیاندۆزێتەوە.

***مەنسووری حیکمەت ویستی لەو رێگایەوە نزیك بوونەوەیەك هەبێت لەگەڵ ئێوە یان مەبەستی ئەوەبوو کەزیاتر باڵی مۆهتەدی نیگەران کات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو کۆبوونەوەیە کەباسکراوبەشداری ئەندامانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری تێیدا، گەلێك ئاسایی بووەو هیچ لێکدانەوەیەکی لەم چەشنە هەڵناگرێ. بەردەوام کۆبوونەوەی لەو چەشنە بەرێوەدەچێ و لایەنگرانی ئەم یا ئەو رێکخراوێش لەدەرەوەی وڵات بەشداری تێدادەکەن. بەڵام ئەوەی کە بەشێوەیەکی گشتی مەنسوور حیکمەت تا ئەو کات کە لەژیاندا بوو هەوڵێکی لەو چەشنەی دابێت، زۆر لە واقیع نزیك نییە.

**ئێمە لەموهتەدی زیاتر دۆستی حیکمەتیستین**

***کەواتە تا ئێستا ئێوە دۆستترن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە هەموو جیاوازیکیشەوە کە ئێمە لەگەڵ باڵەکانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری هەمانە، کە بە لامانەوە جیاوازییەکان گەلێك جیددین، ئەوان هەر لەناو بەرەی چەپی ئێراندا پێناسەدەکەین. سیاسەتو هەڵسوکەوتیشمان بەنیسبەت رادەی کاریگەری ئەوان لەبزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی واقیعی ناو کۆمەڵگای ئێران دیاری دەکەین. لەرووی عەمەلییەوە لامان وایە کە لە دوای مەرگی مەنسوور حیکمەتەوە تائێستا ئەوان هەتا هاتووە لەناو ئەو بزووتنەوانەدا لاوازترو بە تاق کەوتووتربوونەتەوە. ئەوەش بەتایبەت هەڵدەگەرێتەوە بۆ هەڵسوکەوتی ئەو بەشەیان کە لەبۆچوونەکانی مەنسوور حیکمەت، ئایین و ئیدئۆلۆژیەکی نوێیان خوڵقاندووە و دەمارگرژانە پەیرەوی لێدەکەن. ئەوەی ئەوان بەم شێوەیە کەوتوونەتە شوێنی لەراستیدا مارکسیزم نییە، بەڵکو هەر وەکوبۆخۆیان دەڵێن حیکمەتیسە، بەڵام بەنیسبەت رێکخراوەکەی کاك عەبدوڵڵاوە کە باستانکرد لەروانگەی ئێمەوە ئەوان رێکخراوێکی ناسیۆنالیستی کوردن و هێشتاش نەیانتوانیوە خۆیان بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە کوردستاندا گرێبدەن. بۆ ئێمە ئەوان جێگاو شوێنێکی هەروەکو باڵەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان هەیە.

**لەگەڵ گرووپی حەمیدی تەقوایی پەیوەندیمان باشە**

***ئەو ئینشعابە خێرایانە دواتر لەناو (حزبی کۆمۆنیستی- کرێکاری حیکمەتیست) و ئەوانە رووپیدا جیابوونەوە لەگەڵ حەمید تەقوایی و دواتر چەند لایەنی ترو ئەوانە چیبوو ئەو هەموو فاکتەرە ئەساسییەکانی چیبوو و پەیوەندی ئێوە لەگەڵ کام لایەنیان بەهێز بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** جیابوونەوەکانی ناو حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری هۆکاری جۆراوجۆریان هەیە. بەڵام بەبڕوای من گرنگترینیان ئەوەیە کەئەوان بۆچوونەکانی مەنسوور حیکمەتیان وەکو مەزهەبێك لێکردووەو دەستیانکرد بە خوێندنەوەی جۆراوجۆری بنەماکانی ئەو بۆچوونانەو هەرکامەیان لەسەرئەساسی تەفسیرێك کەخۆیان لەو بۆچوونانەبوویان رێگایەکی جیاواز

لەیەکتریان هەڵبژارد. خوێندنەوەی جیاواز بۆ نووسراوەکانی مەنسوور حیکمەت نەک لەرووی کاریگەریان لەسەررەوتی خەباتی سیاسی و چینایەتی لەکۆمەڵگادا بەڵکو ناوێتە بوو لەگەڵ کێشمەکێشی روناکبیرانە و زێهنی و هەروەها جاروباریش کێشەی ناوخۆیی لەسەردەسەڵات و هی تر.

ئەوەندەی کە من مەنسور حیکمەتم ناسی بێت، ئەو هەرگیز شەیدای بۆچوونەکانی خۆی نەدەبوو، ئامادەیی هەبوو لەژێر ناوی گەشەپێدان و بەرەوپێشبردن بە ئاسانی لێیان تێپەر بێ و لەگەڵ هەلومەرجی نوێ بیانگونجێنێ. جێنشینانی نە ئەو تواناییەیان هەیەو نە ئەو بروا بەخۆیە. هەربۆیە دەمارگرژانە لە هەر وشەیەکی بەرگریدەکەن، کارێک کە مەنسور حیکمەت خۆی هەرگیز نەیدەکرد. لەو کاتەدا کە ئەو گوفتوگۆیە دەکەین ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ باڵی ناسراو بەحزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران کە حەمید تەقوایی سەرکردایەتی دەکات، ئاساییە، بەبێ ئەوەی تائێستا هیچ چەشنە هاوکارییەکی لێکەوتبێتەوە.

***پرنسیبەکانی حیکمەتیزم چییە؟ من بۆچوونم وایە کە (حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ئێران- حیکمەتیست) ویستی مەنسوور حیکمەت زۆر مۆقەدەس کاتەوەو هەر ئەمەش بوو کە ئەم کۆپییە دروستبوو و تەنانەت تائاستی مۆقەدەسی مەنسوور حیکمەتو هێنانی ناوی لیدەر و شتی سەیر سەیر؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو پرەنسیپانە تێکەڵاوێکن لە مارکسیزم و لینینیزم و چەند داهێنانێکی سیاسی لەلایەن مەنسور حیکمەتەوە کەلادان بوو لەسەرەتاکانی مارکسیزم. ئەوانە گەشەپێدانی مارکسیزم نەبوون، بەڵوو پێداچوونەوە و لادان بوون لە بنەماکانی ئەندێشەو بەرنامەو ستراتێژی مارکسیستی. لەگەڵ گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی خەباتی چینایەتی لە ئێران ئەم جۆرە داهێنانەش وردە وردە کاڵدەبنەوە. ئەوان وەکو حزبی سیاسی بەپیرۆز راگرتنی ئەم هەڵوێستو بۆچوونانەی کەلەزەمانی ژیانی مەنسورحیکمەتیشدا کاریگەریەکی ئەوتۆیان نەبوو، ئێستا کە زەمانیشیان تێپەر بووە، هەتا دێت زۆرتر تەریک دەکەونەوە.

***ئەمە جۆرێک نییە لەوەهم، وەختێک مەنسوور دەبێتە کارێزما و لیدەر و ئێستا لەژیاندا نەماوەو حزبێک بەناوی حیکمەتیستەوە بکرێ جۆرێک نییە لە وەهم و دروستکردنی کارێزما و جۆرێک لە خوڵقاندنی دیکتاتۆرییەت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەم بۆچوونە ئەگەر لە ناو حزبەکەی خۆیاندا کارێزما و دیکتاتۆر دروستدەکات، ئەوەندەی کە نفوزی لەناو بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیدا هەبێت، سێکتاریزم پەرەپێدەدات و بەکردەوە زیان بە بەرەوپێشچوونی بزووتنەوەکە دەگەیەنێ.

**مەنسورم خۆشدەویست**

***تۆ بۆ شەخسی خۆت هیچ خۆشەویستییەکت هەبوو بۆ مەنسوور حیکمەت یا هیچ ئیعجابێکت هەبوو بۆ تەفسیرەکانی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تائەوکات کە مەنسور حیکمەت لەناو حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بوو خۆشمدەویست پەیوەندیەکی هاورێیانەی نزیکمان پێکەوە هەبوو، ئەوکاتیش کە لە حزبی کۆمۆنیستی ئێران جیا بووەو حزبێکی دیکەی دروستکرد، سەرەرای کۆمەڵێک خیلافی سیاسی

کەلەگەڵی هەمبوو، سەرەڕای وشە و رستەی نامۆنسیفانە کە لەدژی لایەنی ئێمە بەکاریدەهێنا،من هەروەکو تێکۆشەرێکی سیاسی و یەکێك لە دامەزرێنەرانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران رێزم بۆی هەبوو، لام وابوو بە هەموو لادانەکانیشیەوە هەر خەباتی لەچوارچێوەی بەرەی ڕانەگەیەندراوی چەپ و رادیکاڵی ئێران دایە. مەنسور حیکمەت ئینسانێکی سیاسی و تاکتیسیەنێکی وریا و تیژ بوو، بەڵام ئێئۆریسیەن و ئەزمەریە پەردازێکی سەرکەوتوو نەبوو.

*بە مردنی مەنسوور حیکمەت، بزووتنەوەی چەپ لەدونیاداو بزووتنەوەی چەپ بە تایبەتی لەئێران زەرەرێکی گەورەی لێنەکەوت؟

ئیبراهیم عەلیزادە: من لە دڵەوە بۆ مەرگی مەنسور حیکمەت وەکو هاوڕێیەکی دێرینی خۆم بەداخەوەبووم. پێش مردنی مەنسور حیکمەتیش زۆر کەس دەیزانی کە دوای ئەو حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری ناتوانێ ئینسجامی خۆی بپارێزێ. زیانێکی گەورەبوو لەو رەوتە. لەداهاتووی ئێرانیشدا دەیتوانی چ دەورێك ببینێ، قابیلی پێشبینی کردن نییە.

**کۆمەڵە ئاڵای خۆی هەیە**

*لەسەرو بەندی کۆنگرەی (١٠)ی ئێوە، کۆنگرەی (٩)ی کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانیش ئەبەستڕێ و لەو بەحسانەدا مۆهتەدی باسی ئەوە ئەکات کەجگەلەوەی کە فیدراڵی ڕانەگەیەنن و بەرنامەی کۆمەڵە بۆ حکومەتی فیدراڵی ئەخەنە روو و پێیانوایە ئەوە یەکێك بووە لەو خاڵانەی کە ئێوە پێشتر نەتانکردووە و باسی فێدراڵی و ئەوەتان نەکردووە و ئاڵای کوردستان بەرز دەکەنەوە و باس لەوەش ئەکا کە ئێوە لەگەڵ موهتەدی کەمێکەوە کارتان کردووە لەو سەروبەندەیەدا رێککەوتوون کە رێفراندومێك بکەن لەسەرمان و نەمانی حزبی کۆمۆنیست و باسیش لەوە دەکات کە (٨ تا ١٢) مانگ درێژەی پێدراوە، بەڵام دواتر ئێوە بێدەنگەتان لێکردووە و نەچوونە ژێر ئەو بارەوە، مەبەستم ئەوەیە کەبەرنامەی کۆمەڵە بۆ حکومەتی فێدرال ئێوە لەو بارەیەوە شتێکتان هەبوو یان تەرحی تازەی هەڵگردنی ئاڵای کوردستان کە تائێستا ئێوە نیتانە و مەسەلەی ئەو ریفراندۆمە لەسەرحزبی کۆمۆنیست تا چەند راست بوو؟ قەناعەتێکتان بە ئاڵای کوردستان نییە ئێوە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: پرسیارەکان زۆر بوون پێویستە یەکە یەکە وەڵام بدرێنەوە:

یەکەم، تا کاتێك کاك عەبدوڵلا و هاورێیانی لەگەڵ ئێمە مابوون، داوایەك بۆ رێفراندۆم نەهاتە گۆرێ، هەتا ئێمە پەسەندی بکەین یان نەیکەین. بەڵام لەسەروبەندی کۆنگرەی (٩)دا ئێمە خۆمان ئەو پێشنیارەمان کرد، ئەویش بۆ پاراستنی یەکگرتوویی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی بوو. ئەوان ئەوەندە نەمانەوە کە ئەو رێفراندۆمە بکرێ. دوای رۆیشتنی ئەوانیش، ژمارەیەك لەهاورێیانی ئێمەش بوون کە داوای نەمانی حزبی کۆمۆنیستیان دەکرد. ئێمە چەند مانگ دوای کۆنگرە ئەو رێفراندۆمەمان کرد و لەوێدا زۆرینەی ئەندامان دەنگیان بە مانەوەی حزبدا. مەرجەکانی ئەوان بۆ مانەوە، ئەوە نەبوو، شتێکی دیکە بوو کە ئەگەر لە بیرم مابێ پێشتر لەو وتووێژانەدا باسمانکردووە.

دووهەم، سەبارەت بە دروشمی فێدرالیسم، تا ئەوکات کە کاك عەبدوڵلا لەناو ئێمەدا بوو، قسەیەك لەبەرنامەی فێدرالی نەبوو. تا ئەوکات بەرنامەی ئێمە لەسەربنەمای ماف دیاریکردنی

چارەنووس داڕێژرا بوو. کە لە ساڵەکانی دەیەی(٨٠)دا ئێمە ستراتێژی خۆمان بۆ گەیشتن بەو مافە لەچوارچێوەی بەرنامەیەکی دیاریکراو بۆ خۆدمۆختاریدا بەیان کردبوو.

سێهەم: سەبارەت بە ئاڵای کوردستان، ئێمە ئێستا ئاڵای خۆمانمان هەیە. وەکو هەر حزب و ڕێکخراوێکی دیکە. حکومەتی هەرێمی کوردستانیش ئاڵای خۆی هەیە. کۆماری مەهابادیش لەکاتی خۆیدا کە نیمچە دەوڵەتێك بووە، ئاڵای خۆی هەبووە، دوای سەرکەوتنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان، یان دوای هاتنەسەر کاری حکومەتێکی کرێکاری لە ئێران، چ ئاڵایەك دیاری دەکرێ، پەیوەندی بەناوەندەکانی بڕیاردەری جەماوەری ئەو کاتەوە هەیە.

**ئاڵای کوردستانمان قبوڵە**

*** ئەگەر بڕیار بێتە سەر ئەوە کە ئەم ئاڵایەی کوردستان هەڵکەن ئێوە قبووڵی دەکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە ئەوکاتیش وەکو ڕێکخراو ئاڵای خۆمانمان دەبێت و ئاڵای حکومەتیش هەرچی بێ بە ڕەسمی دەناسین. کێشەی ئاڵا، کێشەیەکی گرنگ نییە.

***لەو سەروبەندەی کە کۆنگرەی ئێوە ئەبەسترێ، بە چەند مانگ دوای ئەوە بەعس ئەرووخێ، ساڵی (٢٠٠٢) ئێوە هیچ ئاگاداری ئەوە هەبوون کە بەعس ئەرووخێ؟ پەیوەندییەکتان لەگەڵ ئەمریکییەکان هەبوو یا لەڕێگەی حکومەتی هەرێم و ئەوانەوە هیچ ئامادەسازییەکتان کردبوو بۆ ئەوەی کە ئەو ئاڵوگۆڕە جیدییانە بەسەر عێراق دێ و بەشێك بوون لە کوردستاندا بوون تاچەند چارەنووسی ئێوەی پێوەبەستراوە؟ کاریگەرییەکانی چارەنووس سازئەبوون لەسەرئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** پێشبینی کردنی ئەوەی کەرژێمی بەعس دەروخێ کارێکی ئاسان بوو، چونکە رژێمی بەعس سەرەڕای ئەوەی کە لەژێر زەختی ئامریکاو رۆژئاوادا بوو، لەناو خۆشیدا رزیبوو. لەراستیدا ئێمە بەرانبەر بەم رووداوە غافلگیر نەبووین. تەنیانوسینگەیەکمان لەبەغدا هەبوو کەزۆر سووك بارمانکردبوو. هاتوچوونەکانیشمان بۆ بەغدا زۆر دەمێك بوو کە کەمکردبۆوە.

بەهۆی ئەوەی کە ئەولەوییەتی کاری ئێمە لەکوردستانی عێراق نەبوو، بەهۆی ئەوەی کە بوونی ئێمە لەکوردستانی عێراق و لە عێراق تەنیا بەشێك لە چالاکی ئێمەی پێیەوە گرێدرابوو. نەفسی رووداوەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەرئێمە نەبوو. کاری ئێمە بە رەوانی عادی خۆی دەچووە پێشەوە و چارەنووسی هەڵسووڕانی ئێمە بەو رووداوانەوە نەبەسترا بوونەوە. بەنیسبەت ئەمریکاییەکانەوە، ئەوان هەر لە سەرەتایی حزووری پۆل بریمەر بەڕێوەبەری کاروباری ئەمریکا لە عێراقەوە، هەیئەتێکیان هاتنە لامان و داوایانکرد کە وەکو هەموو هێزێکی چەکدار لە عێراق ئێمەش بە پێی بڕیارێك کە دەرچوو بوو چەکەکانمان تەسلیم بکەین. بەڵام خۆتان دەزانن ئەو بڕیارەی چەککردنی حزبە سیاسیەکانی کوردستانی ئێرانو عێراق کەلەلایەن بریمەرەوە دەرچووبوو، بەهۆی رووداوەکانی دوایی لەعێراق، لەبیرچۆوەو ئێمە چەکە قورسەکانمان لەلای شوێنێکی باوەرپێکراو دانا و چەکە سووکەکانمان بە ئاشکرا پاراست.

**یەکێتی هێزەکانی دیموکراتی رزگارکرد**

*** موهتەدی لەراگەیاندنێکدا ئەڵێ: ئێمە زۆر خۆشحاڵین بە رووخانی بەعس لە مانگی (ی ٢٠٠٢) ئێوەش بە**

**هەمانشێوە خۆشحاڵبوون و ڕاگەیاندنێکی وەهاتاندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، ئەو ڕاگەیاندنە هەیە و لام وایە پێش هەموو حزبەکانی دیکە دەرچووە و ناوەرۆکێکی دەوڵەمەندی هەیە.

***ئێوە لەڕۆژی (٢٧)ی ڕەشەممە ڕۆژی شەهیدانی گوردانی شوان، ڕۆژێکی مێژوویی بەنیسبەت کۆمەڵەوە، کە ئەکاتە(١٨)ی مارس، باڵی موهتەدی ئەمەیانکردووە بەڕۆژی گیانبەخت کردووانی خۆیان، ئەمەوێ هەم بڵێم ئێوە تاچەند قەناعەتتان بەوە هەیە، ئەگەر بە وردتر باسی کارەساتی هەڵەبجە و تێداچوونی ئەو گوردانەم بۆ بکەی ڕەنگە شتێکی مێژوویی و دەقیق بێ، بۆچی ئەو گوردانەتان ئاوا تێدا چوو، پاشەکشەی نەکرد بە پێچەوانەی هێزەکانی حزبی دیموکرات ئەوکاتە لەو مەنتیقەیە بوون زوو پاشەکشەیان کرد؟ ئەو گوردانە یەکێك بوو لەهەرە هێزە کار لێهاتووەکان؟**

**بەسەرهاتی تێداچوونی گوردانی شوان لەهەڵەبجە**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەهۆی ئەوە کە هەر وەك ئێوەش باستانکرد تێداچوونی گوردانی شوان ڕووداوێکی گرنگە لە مێژووی خەباتی کۆمەڵەوهەمووخەڵکی کوردستاندا، پێم باشە کە باسی وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوەتان بۆ بکەم.

لە ڕۆژی (٢٥) ی ڕەشەمەدا، واتە مانگی ئەسفەند هاوڕێیانی ئێمە ئاگاداربوون کە جەبهەکانی شەڕ جموجۆڵی تازەی تێکەوتووە و لەوانەیە لەم جەبهەیەدا شەڕێکی قورس بەڕێوە بێ. کۆمیتەی ناوچەی سنەی کۆمەڵە بڕیاریدا کە ئەو هێزەی کەلە ئاوایی بیارە جێگیر بوو پاشەکشە بکات. ئاوایی بیارە یەکێك لەو ئاواییە سنووریانە بوو کە دیاریکرابوو بۆئەوەی گوردانی شوان یەکێك لەگوردانەکانی سەر بەناوچەی سنە بۆ حەسانەوە و پشتی جەبهەی خۆیان لەوێ کەڵك وەر بگرن.

هاوڕێ شۆکێ خەیرئابادی فەرماندەی گوردان بوو. دوو ڕێگا بۆ پاشەکشە هەبوو، ڕێگایەکیان بە ناوەڕاستی جەبهەکاندا تێپەڕدەبوو کەناوچەی کوێستانی سوڕێن بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە بە هێزی دوژمن تەنرا بوو، ڕێگەیەکی پڕ مەترسی بوو. هەر ئەوکات هێزێکی حزبی دیموکرات بە ڕێنوێنی و هاوکاری هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی توانیبویان لەو ڕێگەیەوە دەرباز بن. ئێستاش بە وردی نەزانراوە کە هۆی چی بوو هێزەکەی ئێمە ئەو کات نەیتوانی لەو هاوکاریە بەهرەمەند بێ. ڕێگایەکی دیکەش ڕێگای دەشتایی بوو کە ڕێگای دەشتایی ئەگەرچی بە ڕواڵەت ئەمین تر دەکەوتە بەرچاو، بەڵام ئەویش لەبەردەم نووکی هێرشی هێزەکانی ڕژێمی ئێراندا بوو. هاوڕێیانی ئێمە ڕێگای دەشتاییان هەڵبژارد و هاتن بەرەو لای ئاواییەك بەناوی عەنەب، کە گەیشتنە ئەو ئاواییە، ئاگاداربوون،کە هێرشەکە بەربڵاوتر بووە لەوەی کە پێشبینی دەکرا و لە هێرشێکی کوت و پڕدا هێزەکانی کۆماری ئیسلامی بەهاوکاری هێزەکانی بەرەی کوردستانی بەشێکی زۆر لە ناوچەکەیان گرتبوو و پردی ئەسلی ڕێگای پاشەکشە، کە سەید سادقی بە هەڵەبجە دەبەستێتەوە، پردی زەڵم، وێرانکرابوو. بە ڕووخانی ئەو پردە ڕێگایەك نەدەما غەیری ئەوەی کە لەدەریاچەی دەربەندیخان بپەڕنەوە. هێزێکی یەکجار زۆری ئەرتەشی عێراق لەو ناوچەیە بڵاو ببۆوە و هاوڕێیانی ئێمە پێشبینی دەکەن کە پردێکی مۆەقەت لە شوێنێکی چۆمی سیروانەوە لێبدرێ و ئەوانیش بتوانن کەڵکی لێوەربگرن. هەر بۆیە مەسیرەکەی خۆیان درێژە دەدەن بەو هیوایەی کە ڕێگایەك بۆ پاشەکشە بکرێتەوە، دێن بەرەو شارۆچکەیەك بە "ئاوی سیروان" یان "دۆجەیلە" کاتێك ئاگادار

دەبن کە دەوروبەری ئەو شارۆچکەیەش شەڕی تێدایە و هێزەکانی کۆماری ئیسلامی خۆیان گەیاندۆتە ئەو شوێنەش ناچار دەبن بچنە ناو شارۆچکەکە و لەوێش بەنهێنی لە چەند ماڵدا خۆیان بشارنەوە تادەرفەتێکی باشتر بۆ دەربازبوون بدۆزنەوە.

بەیانی تا ئێوارە دەمێننەوە و لە چەند ماڵدا خۆیان حەشار دەدەن، بەڵام ئەو مانەوەیان هاوکاتە لەگەڵ ئەوەی کە تەواوی ناوچەکە بۆمبارانی شیمیایی دەکرێ و بەشێك لە گاز و ژەهرێك کە لەو ناوچەیە بڵاو ببۆوە، روو لە ناو شارۆچکەی سیروانیش دەکا و هاوڕێیانی ئێمەش ژاراوی دەبن، بەشێکیان بە توندی و بەشێکیان بە سووکی. لە لایەن کۆمیتەی ناوچەوە بە بیسیم پەیوەندییان پێوە دەکرێ و ڕێنوێنی دەکرێن بۆ ئەوەی کە بێن بەرەو شوێنێك لەدەریاچەی دەربەندیخان تالەوێوە بەبەلەم بپەڕێنەوە، ئەم هاوڕێیانە بەهۆی ئەوەی کەلەناوچەکەدا شەڕبوو ناچار دەبن راوەستن تا ئێوارە کە کەمێك هەوا تاریك دەبێ بەرەو دەریاچە وەرێکەون. ڕێگای شارۆچکەی سیروان تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە قەرار بوو لەوێ کاری پەڕینەوەکەیان ڕێکبخرێ، نزیکەی دوو سەعاتە، بەڵام ئەوان لە بەر ئەوەی کە یەکەم مەسموم بوون، دووهەمیش ڕێگاکە شارەزا نەبوون، ئەم ڕێگا دوو سەعاتەیان بە (۷) سەعات بڕی و سەرئەنجامیش نەیانتوانی خۆیان بگەیەننە لێواری دەریاچەکە و ئەو شوێنەی کە قەرار بوو بەلەمەکانی ئێمە بچنە ئەوێ.

لەم بەری دەریاچەکەوە گوردانێکی تری ناوچەی سنە و ژمارەیەك لە هاوڕێیان پەیوەندییەکانی کۆمەڵە لە عێراق لەسەرلێواری ئاوەکە چووبوون بە هانایانەوە و هەوڵیاندەدا کەپێویستییەکانی دەربازبوونیان بۆ ئامادەکەن، هاوڕێیانی بەرپرس بڕیاردەدەن کە بەلەمێك بنێرنە ئەوبەر بەکەسی شارەزاوە، بۆ ئەوەی ڕێنوێنی یان کەن و بیانگەیەننە لێواری دەریاچەکە و بیانهێنن. تەنیا نزیکەی (۲۰) دەقیقە یان نیو سەعاتیان مەودا مابوو کە خۆیان بگەیەننە سەر لێواری ئاوەکە کە بەهۆی تاریکی بۆیان نەدەدۆزراوە. (٥) پێشمەرگە لە بەلەمێکدا بەرەو ئەوبەری ئاوەکە ڕێدەکەون، بەڵام لەو فاسلەیەدا هێزەکانی کۆماری ئیسلامی خۆیان گەیاندبووە لێواری دەریاچەکە و ئاگاداری نزیکبوونەوەی ئەو بەلەمە دەبن. پێش ئەوەی کە بەلەم بگاتە قەراغ ئاوەکە، تەقەی لێدەکەن و (٤) هاوڕێ سەرنشینی بەلەمەکە گیانبەخت دەکەن و یەك کەسیان بە دیلی دەگیرێ. کاتێك روون دەبێتەوە کەکاری ئەم بەلەمە بە ئاکام نەگەیشتووە و ئیمکانی ئەوەی کە هاوڕێکانمان خۆیان بگەیەننە قەراغ ئاوەکە تەئمین نەبووە،

دیسان هەوڵدەدەن کە جارێکی دیکە ڕێنماییان بکەن و لە ڕێگای بێسیمەوە بەشکەم ئامادەیان بکەن بۆ ئەوەی کە خۆیان بگەیەننە شوێنێکی تر لە قەراغ ئاو، (۱۰) بەلەم لەمبەر ئاوەوە بۆ عەمەلیاتی پەڕینەوەیان ئامادەدەکرێ. هێزی پارمەتیدەر ئامادە دەبێ تا بە تەقەکردن ڕێگای پەڕینەوەی هاوڕێیان خۆشکات، لەوکاتەدا هاوڕێ شۆکێ خەیر ئابادی بە بێ سیم فەرماندەی هێزەکانی کۆمەڵە لەوبەری ئاو ئاگادار دەکاتەوە کە بەشێك لەهێزەکانمان لەگەڵ دوژمن دەرگیر بوون. ئەو دەرگیرییە ماوەیەك بەردەوام دەبێ، دوای ماوەی نیو سەعاتێك، ڕەنگە کەمتر یان زۆرتر، پەیوەندی لەگەڵ فەرماندەی گوردان قەتع دەبێ. بەمجۆرەیە کە ئیتر ئاخرین وتەکانی هاوڕێیانی فەرماندەی ئەمبەر و ئەوبەر بە یەکەوە ڕەد و بەدەڵ دەکرێن دوای ئەوە ئیتر هیچ پەیوەندییەك بە گوردانی شوانەوە نامێنێ.

ڕووداوەکان کەم کەم و بە پێی زەمان ڕوون بوونەوە. هاوڕێیانمان کە ناتوانن بگەنە سەر لێواری دەریاچەکەو شەو دەبێ و بەتاریکی ڕێگا وون دەکەن. لە ناو زۆنگ ناوەکانی ئەم ناوچەیەدا خۆیان حەشار دەدەن و لەبەرئەوەی بەشێکی زۆریان مەسموم دەبن و توانای شەڕکردنیان زۆر کەمدەبێتەوە، هێزەکانی ڕژێمیش دەزانن کە پەلەمێکی ئێمە پەریوەتەوە بۆ ئەوبەر خەریکی بەرنامەیەکە، بەوە پەیدەبەن کە دەبێ واحیدێکی ئێمەلەو ناوچەیەدا گیری خواردبێ، بۆیە هێزێکی یەکجار زۆری بۆ کۆدەکەنەوە و شوێنەکە بە تەواوەتی گەمارۆدەدەن.

هاوڕێیانی ئێمە زۆر دلێرانە مۆقاوەمەت دەکەن تا ئاخرین فیشەکیان و تا ئاخرین هەناسەیان تسلیمی دوژمن نابن. مەگەر ئەوانەی کە برینداربوون و ئیتر هیچ توانای شەڕکردنیان نەمابوو (١٢) کەسیان بە ئەسیری دەگیرێن و بەبرینداری دەبردرێنە شاری سنە و دوای ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر (١١) کەسیان ئیعدام دەکرێن. دوو هاوڕێش لەناوچەکە دەرباز دەبن و ماوەیەك دواتر خۆیان دەگەیێننە ریزەکانی کۆمەڵە و باقییەکەیان لەمەیدانی شەڕەکەدا گیانیانبەخت دەکەن و تەرمەکانیشیان تا ماوەیەکی زۆر هەر لەوێ دەمێنێتەوە. دواجار لە فورسەتێکی تر کە ناوچەکە ئەمین بۆوە، تەرمەکانیان راگواستران بۆ شوێنێکی تایبەت بە گیانبەخت کردووانی کۆمەڵە کە لە سلێمانی تەرتیب کرابوو.

ئەم ڕووداوە گەلێك دلتەزێن بوو، هاوڕێیانی ئێمە بەدرێژایی شەڕی ئێران و عێراق زۆر هەوڵیاندا، بۆ ئەوەی کە خۆیان لەئاگری ئەو شەڕە بپارێزن. مەیدانەکانی شەڕکێشرابووە کوردستان و ئێمە هەولمان دەدا بۆ ئەوەی کە شەڕی خۆمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی سەربەخۆ لەو شەڕە بەرێوەبەرین و بەپێچەوانەی مەیلی خۆمان بەداخەوە ئەمجارە لەو شوێنە کەوتینەداوی شەڕی ئێران و عێراق. بەڵام ئەمە کارەساتێك نەبوو هەر بەتەنیا بۆ ئێمە، بەڵکو کارەساتێك بوو کە بە هەزاران ئینسانی دیکەش گیانیان تێیدا لەدەستدابوو. بەمجۆرە خوێنی تێکۆشەرانی کۆمەڵەش تێکەڵ بەخوێنی خەڵکی لێ قەوماوی هەڵەبجە بوو.

**قسەکانی رەزا کەعبی و عومەری ئیلخانیزادە پڕوپاگەندەن**

***سێپتەمبری (٢٠٠٢) رەزا کەعبی بە بۆنەی (٣) ساڵ بە سەرهاتنەدەری کۆمەڵە لە حزبی کۆمۆنیست لەمەقالەیەکدا دەڵێ: کۆنفرانسی ساغکردنەوەی کۆمەڵە وڵامێکی دروست و گونجاو و سیاسییانە بوو چونکە ساڵەها بوو هەست بەوە دەکرا کەحزبی کۆمۆنیستی ئێران قسەیەکی نییە بۆ خەڵکی کوردستان و ئەو پێوابوو کە حزبی کۆمۆنیست کۆمەڵەشی لەگەڵ خۆی تووشی سەر لێشێواوی کردبوو، قسەی رەزا کەعبی و دواتر کە ئیلخانی زادەش لە مەقالەیەکی تردا هەمان شت دووبارەئەکاتەوە و ئەوکات پێیوابوو ئێستا کۆمەڵە توانیویەتی متمانەی بەرینی کۆمەڵانی خەڵك بۆ خۆی دروستدەکات، ئەم بەحسانە لەنەزەر چییەوەبوو لەکاتێکدا دواتریش دێنەسەر ئەوانە خودی خۆیان تووشی جارێکی دیکە ئینشقاق و ئینشعابێکی جیا بوونەوە لەسەرئەوەیە ئەم بانگەشەیە لەگەڵ ئینشعابەکەی خۆیاندا یەکیناگرێتەوە. ئەمانە تەنها فشارێك بوو لەسەرئێوە لەڕووی ئیعلامییەوە یان حەقیقەتێکی تێدا بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو قسانە دەچنە خانەی پڕوپاگەندەی ڕێکخراوەییەوە و واقیعی نین. حزبی کۆمۆنیستی ئێران و ڕێکخراوی کوردستانی ئەو حزبە واتە کۆمەڵە شەفافترین و رادیکاڵترین ڕێبازو هەڵوێستیان بووە بۆ سەر خستنی خەباتی خەڵکی کوردستان. لام وانییە تائێستا هیچکام لە

حزبە سیاسییە کوردییەکان بەم روونییە، بەم شێلگیریە بەرگریبیان لە بەرژەوەندییەکانی ئەمڕۆ و داهاتووی خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێران کردبێ. ئەمە دیعایە نییە بەڵکە راستییەکە کە پشتی بە مێژووی واقیعی (٢) دەیەی رابوردووی کوردستان و بەڵگەنامەکانەوە بەستووە. هۆکاری جیابوونەوەی ئەوان لەکۆمەڵە و لەحزبی کۆمۆنیست هەڵدەگەرێتەوە بۆ دوورکەوتنەوەیان لەئامانجی کۆمۆنیستی و کەوتنە شوێن رێبازی ناسیۆنالیستی. ناسیۆنالیزمی کوردیش بێ توانایی خۆی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی نەتەوەی کورد لەکردەوەدا نیشانداوە، ئەوانیش هەر ئەم بێتوانایی و نەزۆکییە لەگەڵ خۆیان کێشدەکەن. سەرچاوەی کێشەکانی ئێستا و جیابوونەوەکانی ئەم دواییانەشیان هەر هەڵدەگەرێتەوە بۆ ئەو رێبازە و ئەو رێ و شوێنە کەلەژێر ناوی کۆمەڵەدا گرتوویانەتەبەر. کۆمەڵە کالآیەکی بە قەدەر بالآی ئەو رێبازەی ئەوان نییە. ئەو ناتەباییە بەردەوام لە گەڵیان دەمێنێتەوە. حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە هەمان کاتدا کە ئامرازێکە لە خزمەت خەباتی سیاسیی و چینایەتی ئەمڕۆ و دوارۆژی هەموو ئێران، زەمانەتی پاراستنی کۆمەڵەیەکی کۆمۆنیستیشە لەکوردستان، بەپێگەی بەهێزی کۆمەڵایەتییەوە.

***ئەوان زۆرجار باس لەوە دەکەن کە بەڵێ نفوز و گەشەیەکی بەرچاویان کردووە بەدوای هاتنە دەریان لە حزبی کۆمۆنیست؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گەشەکردن دیاردەیەك نییە کە بکرێ ئیدیعای بکەی بەڵکە دیاردەیەکە دەبێ ببینی. ئەوان نەیانتوانیوە نوێنەرایەتی هیچ بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی واقیعی لە کوردستان بکەن.

*** رەنگە یەکێك لەخیلافەکانی ئێوە ئەوە بێ، موهتەدی لەو کۆنگرەیەدا کە دوابەدوای ئێوە بەستیان لە (٢٠٠٤/٨/١٠)دا ئەڵێ کۆمەڵە حزبێکی کوردستانییە، بەڵام لەئاستی ئێراندا سیاسەتی سەرتاسەری ئێرانی هەیە، تۆ پێتوایە ئەمە هەموو ئەو خیلافە بوو کە لەگەڵ ئێوە هەیبوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** خاڵی لاوازی ئەوان لەوەدا نابینرێتەوە کە ئەوان ئێرانین یان کوردستانی. بەم رێبازەی کە ئەوان گرتوویانەتەبەر ئەو کێشانە هەمووی چاوەروان کراوبوون.

**کۆمەڵەو حزبی کۆمۆنیست دووانەن**

***تۆ تەئکیدی لەوەی کەئێستا سازمانی کوردستانی- حزبی کۆمۆنیستی ئێران "کۆمەڵە" ئەگەر لەئاستی کوردستانیشدا نەبێ بەڵام بەهێزترین شاخەی کۆمەڵەکانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆمەڵە لەکوردستان رێکخراوێکی بەهێزە. حزبی کۆمۆنیستیش زەمینەی بەهێزبوونی لەئاستی ئێراندا زۆرە. ئەم دووانە ئەندامی یەکەرێکن کە هەم بۆ دوارۆژی رزگاری گەلی کورد لەستەمی نەتەوایەتی و هەم بۆ دووارۆژی شۆرشێکی کرێکاری لە ئێران گونجاوترین ئامرازن. لە ساڵی(١٣٥٧ و ١٣٥٨)ی هەتاوی کاتێك کە جۆش و خرۆشێکی سەرتاسەری لە ئێران لە ئارادا بوو، رێکخراوێکی چەپی سەرتاسەری ئێرانی واتە رێکخراوی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران، بە ئێعتباری چالاکی لەباقی شوێنەکانی ئێران لە کوردستان توانی لە ماوەیەکی کورتدا پێگەیەکی جەماوەری بەهێز بە دەست بێنێ. لام وایە بوونی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە هەمان کاتدا خاڵێکی بەهێزە بۆ کۆمەڵەش لە کوردستان.

*لەو سەروبەندانەیە لەگەڵ نزیکبوونەوەی کۆنگرەی(١١)ی ئێوە ساڵی(٢٠٠٤ )کۆنگرەی (٨)ی حزبی کۆمۆنیست ئەبەستن ئێوە، بەستنی کۆنگرەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران تاچەند پەیوەستە بەبەستنی کۆنگرەکانی کۆمەڵەوە، تاچەند بەحسەکانیان تێك ئەئاڵێ، یا تاچەند کاریگەری و تەفسیریان لەسەریەك هەیە، تا چەند ئێوە مۆهتەممن بە کۆنگرەکانی حزبی کۆمۆنیست تا کۆمەڵە لە کاتێکدا شەوق و زەوقێك بە کۆنگرەکانی کۆمەڵەوە زیاتر دیارە تا حزبی کۆمۆنیست؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بریار و پەسەندکراوەکانی ئەم دوو کۆنگرەیە لەگەڵ یەکتر ناتەبا نین. ئەوان یەکتر تەکمیل دەکەن. لەکۆنگرەکانی کۆمەڵەدا تەرکیزی ئێمە زۆرتر لەسەربابەتە کوردستانییەکانە و لەکۆنگرەکانی حزبدا بابەتە سەرتاسەرییەکان. ئەو شەوق و زەوقەی کەئێوە باسی دەکەن هەڵدەگەرێتەوە بۆ جیاوازی سیاسی هەلومەرجی واقیعی ئێستای کوردستان لەگەڵ باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران. بێگومان لەگەڵ گەشەکردنی خەباتی سەراسەری و لەگەڵ گەشەکردنی چالاکی حزبی کۆمۆنیستی ئێران لەو ئاستەدا کۆنگرەکانی حزبیش گرنگی سیاسی تایبەت بە خۆیان پەیدا دەکەن.

**داهاتووی ئێران بۆ کۆمەڵەیە**

*بۆ تۆ بەردەوام هەروەکو سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە ئەمێنیتەوە و ناگرێی بە سکرتێری حزبی کۆمۆنیست؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو هەڵوێستە هەمیشە ئینتخابی خۆم نەبووە. من ئامادەبووم و ئامادەشم کەلە هەر شوێنێك کە بۆم دیاری بکرێ و لەوانە لەئاستی خەباتی سەرتاسەریدا ئەرکەکانی خۆم بەرێوەبەرم. بەڵام ئەم مەوقعیەتەی ئێستا ئەساسەن بەهۆی هەڵوێستی هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە و کۆمیتەی ناوەندی حزبەوەیە کە لایان وایە لە بواری فەعالیەت لەکوردستاندا دەتوانم بە کەڵکتر بم.

*لەبەر ئەوە نییە کە هەست ئەکەی کۆمەڵە دوارۆژێکی گرنگی هەیە بۆ تۆ ئیمتازەو کەچی بەرگری لە مانەوەی حزبی کۆمۆنیستیش ئەکەی؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من بەدوارۆژی حزبی کۆمۆنیستی ئێران گەلێك گەشبینم و باوەرم بەوە هەیە کە ئەم حزبە دەتوانێ لەدوارۆژی سیاسی ئێراندا دەوری گرنگ ببینێ. لە هەمان کاتدا پێویستە هیچ فۆرسەتێکیش بۆئەوەی کۆمەڵەش لەکوردستان بتوانێ دەوری مێژوویی خۆی ببینێ، لە دەست نەدەین.

* ئێوە باسی کاری رێکخراوەیی و کاری سینفی و پیشەیی دەکەن لە ناو جمهوری ئیسلامی، بۆچی نەتانتوانیوە هاوشێوەی "pkk" رێکخراوێکی وەکو "DTP" دروستکەن لە ناو کوردستانی ئێراندا؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەلومەرجی سیاسی ئێستای ئێران لەگەڵ تورکیا جیاوازە، بەڵام شەرت نییە هەروا بمێنێتەوە. ئێمە هەوڵدەدەین بۆئەوەی رێکخراوەکانی خەباتی رادیکاڵی مەدەنی لە ئێران لەچوارچێوەی چالاکی عەلەنی و قانونیدا پێکبێن، هەوڵدەدەین بۆئەوەی ئەم رێکخراوانە بە ئاراستەی ستراتێژ و ئامانجی ئەورۆ و دوارۆژی ئێمەدا بچێ. بەرەو پێشچوونی ئەو رەوتە، مومکینە بکاتە ئەوەی کە ئێمە بتوانین پاڵپشتی پێکهاتنی رێکخراوی سیاسی عەلەنی لە کوردستان بین. ئەمە

ئەركێكە پەیوەندی بەداهاتووەوە هەیە و هەر لەئێستاشەوە هەوڵی بۆ ئەدەین.

**حزبەكانی كوردستانی ئێران ئۆردوگانیشن نین**

***هەر لەسەرویەندی ئەم ئاڵوگۆڕانە و كۆنگرەی ئێوە و كۆنگرەی موهتەدی و كۆمەڵێك ئاڵوگۆڕی جیدی تر لەناو ئۆپۆزسیۆنی ئێراندا دێتەكایەوە، مەسەلەن جارێكی دیكە ئینشقاقی حزبی دیموكراتەكانە، ئەم ئینشقاقانە و ئینشقاقی دواتر رەوتی چاكسازی لە كۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتكێشان، ئینشقاقێكی تر لە ناو شۆڕشگێڕان، ئینشقاقێكی تر لەناو خەبات، ئیلخانیزادە لەم بارەیەوە بۆچوونێكی تایبەتی هەیە پێیوایە "ئەوە فاكتەرێكی ئەساسی ئینشعابەكانی ناو كۆمەڵە كاری ئۆردوگا نشینییە، كە نەمانتوانیوە دەست بۆ خاڵە ئەساسییەكان بەرین كە پێویستە خەباتی چەكداری بكەین پێویستە خۆمان تەقویەت كەین لە ناوەوە، ئێمە تەنها بووینە حزبێكی ئۆردوگانشین" لەراگەیاندنەكانی كوردستانی باشوریشدا ئەم قسەیە زۆر رەنگیداوەتەوە كەلەبەر ئەوە ئەوان هیچ كارێكی دیكە نییە بیكەن تەنها كێشە ناوخۆییەكەیانە، پێتوایە ئەم بۆچوونانە راستە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: پێناسەكردنی حزبە سیاسییەكانی كوردستانی ئێران بە حزبی ئۆردوگانشین واقیعی نییە، تەنانەت ئەگەر خۆشیان جاروبار خۆیان وا پێناسەبكەن. بەشێك لەو حزبانە لە ناوەوەی وڵات كەم و زۆر پێگەیان لەناو بەشێك لەخەڵكدا هەیە. رێكخراویان هەیە. لە دەرەوەی وڵات چالاكی بەربلاوی تەبلیغی و سیاسییان هەیە. دیارە لەكوردستانی عێراقیش، مەقەراتیان هەیە. ئەوەی كە خۆیان یان خەڵكی تری دەرەوەی خۆیان بە حزبی ئۆردوگا نشین دەیانناسێنن بۆ ئەوەیە كە سەرچاوەی بنبەستی سیاسی و ستراتژیكی ئەوان ناناسن. هۆكاری سەرەكی گەورەبوونەوەی كێشەكانیان لەچوارچێوەی ئۆردوگاكانیاندا هەڵدەگەرێتەوە بۆ شكستی سیاسەتەكانی رابوردوویان و یان سەرهەڵدانی خیلافی سیاسی واقیعی ئێستایان كە نایانهەوێ دانیپێدا بنێن.

بۆ وێنە ئەو هاورێیانەی پێشووی ئێمە كەلە كۆمەڵە و حزبی كۆمۆنیستی ئێران جیابوونەوە، بڕیاریاندا خەباتی چەكداری ببوژێننەوە، هەوڵیاندا بەرەی كوردستانی پێكبێنن، كە لەم هەوڵەدا ناكام بوون هەوڵیاندا لەچوارچێوەی بەرەیەكی ئێرانیدا خۆیان ببیننەوە، دەبینین كەلەهیچكام لەوانەدا سەركەوتوو نەبوون. زۆربەی حزبە سیاسییەكانی كوردستانی ئێران جیا لە ئێمە، بەرامبەر بە رەوتی رێفۆرمی حكومەت لەدەورەی خاتەمیدا هەڵوێستی خاو و خەلیسك و سازشكارانەیان نیشاندا، كەدیتمان چ ناكامیێكی بوو. هەوڵیاندا خۆیان بە سیاسەتی ئامریكا لەناوچەكەوە گرێبدەن، هەوڵیاندا ببن بەبەشێك لە سیاسەتی ئامریكا لەو ناوچەیە، لەپێناوی ئەو بۆچوونەدا فەرهەنگ و هەڵوێستی سیاسی خۆیان گۆڕی، بەڵام دیتمان هیچ ئاورێكیان لێنەدرایەوە و ئەو تەرزەی كە خۆیان چاوەروانیاندەكرد بە هێند وەرنەگیران.

***فاكتەرێكی تر هەیە جگەلەوانە بۆ ئەو ئینشعاب و ئینشقاقانە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بەڵێ جیاوازی ستراتێژی و سیاسەت، گۆڕانكاری فیكری و ئیدئۆلۆژیك كە بەسەر ئەندامانی حزبێكدا بێ، كردەوەی جیاوازی لێدەكەوێتەوە و لەوانەیە حزبێك بەرەو ئینشعاب بەرێ. ئەو حزبە لە مەقەراتێكی دیاریكراودا بێ، لەدەرەوەی وڵات بێ، لەناوەوەی وڵات بێ، مومكینە تووشی ئینشعاب بێ. وەها رووداوێك پەیوەندی بە ئۆردوگانشینییەوە نییە. پڕاك لە چیاكانی قەندیلیش بوو، ئینشعابی بەسەردا هات. حزبی دیموكرات دەورەی پێشوو لە گەرمەی خەباتی

چەکداری و حزووری لە ناوچەکاندا تووشی لەت بوون بوو.

**پەیوەندیمان نییە لەگەڵ ئەمریکا**

***تازەترین پەیوەندی ئێوە و ئەمریکا گەیشتووەتە کوێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان بە ئەمریکاوە نییە. دوایین جار کە دەکاتە زیاتر لەساڵێك لەمەوبەر(٢٠٠٧)، هەیئەتێکی ئەمریکایی کەپێیان وتین وابەستەن بە ئیدارەی پێنتاگۆنەوە سەردانی ئێمەیان لەمەقەری ناوەندی کۆمەڵە لە زرگوێزکرد. لەو دانیشتنەدا ئێمە و ئەوان لەسەرهیچ جۆرە هاوکارییەك لە هیچ بوارێکدا رێکنەکەوتین. ئێمە بەسەراحەتەوە پێمانوتن کە دەست تێوەردانی ئەوان لەکاروباری ئۆپۆزسیۆنی ئێراندا تا ئێستا تەمەنی رژێمی کۆماری ئیسلامی درێژتر کردۆتەوە.

***داوای هاوکاری ئێوەیانکرد؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەڵێ، بەڵام ئێمە رەتمانکردەوە.

***ئەگەر ئێوە هاوکاری ئەمریکا بکەن، وەکو چۆن وتت (پەژاك) بە ئاگاداری ئەمریکا تەراتێن ئەکا لە سنوورەکاندا ئەوکاتە ئێوەش ناتوانن تەراتێن بکەن لە سنوورەکان و چالاکی و فەعالییەتی چەکدارییکەن و حکومەتی هەرێمیش ناتوانێ دەست بخاتە رێگاتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** خەباتی چەکداری لەکوردستانی ئێران، پێش هەموو شتێك پێویستە زەمینە و ئیمکانی ئیدامەکارییەکەی لەناوخۆی وڵاتەوە ئامادە بووبێ. ئێمە ناتوانین و نابێ پێ بنێینە وەها بوارێکەوە کەچارەنووسی هەڵگیرسان و یان خامۆشبوونی بەدەست لایەنی دیکەوە بێ.

***بەڵام ئەگەر قسە ئەوەیە مادام پەژاك تەراتێن ئەکا، عەبدوڵڵا موهتەدی لە کۆنگرەی(١٠)ی خۆیاندا دەڵێ بە ئەرکی خۆمانی دەزانین پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا ببەستین، کە تۆ پێتوایە ئەوان پەیوەندییان بەستووە و وەکو منیش ئاگادارم رەنگە هەندێك لە دیموکراتەکانیش پەیوەندییان هەیە، کە ئەم پەیوەندییانە بەستراوە بۆ ئەمریکا رێگە بۆ ئەوانیش خۆش ناکات کاری چالاکی و فەعالیەت بکەن و هاوکارییان بکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە نامانەوێ بکەوینە کێبڕکێ لەگەڵ سیاسەتێکی نادروست. ئێمە رێبازی سەربەخۆی خۆمانمان هەیە. ئەوان هەرچی دەیکەن ئیشی خۆیانە. لەوەڵامی بەشی دووهەمی پرسیارەکەتاندا، وا دیارە ئەمریکا لەو کاتەدا هەر ئەوەندە زەختەی کە خستوویەتە سەر رژێمی کۆماری ئیسلامی پێ کافی بووە، باقییەکەی دادەنێ بۆ ئەو کاتەی کە پێویست بێ. ئەوەیە سەرچاوەی بەرتەسکبوونی پەیوەندی ئەو حزبانە لەگەڵ ئەمریکا. لەڕاستیدا تائێستا خۆشەویستی ئەوان بۆ ئەمریکا، خۆشەویستییەکی یەك لایەنە بووە.

**پارەمان لەئەمریکا وەرنەگرتووە**

***ئێوە پارەتان وەرگرتووە لە ئەمریکا تائێستا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەخێر هەرگیز.

***بەڵام هەندێ لە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیو کوردەکانی ئێران پارەیان وەگرتووە و بەردەوام پەیوەندییان هەیە**

لەگەڵ ئەمریکا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: من بەڵگەیەکم لەم بابەتەوە لەبەردەست نییە و تەنیا دەتوانم لەسەرهەڵوێستی سیاسییان قەزاوەت بکەم.

*ئێوە هەست ناکەن بە هەر وەسیلەیەك بێ دۆستایەتی و گوێڕایەڵکردنی ئەمریکا بۆ ئێوە زەرور بێ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هەم مێژووی چەند دەیەی ڕابردوو و هەم لێکدانەوەی کۆنکرێتی سیاسی ئەو ڕاستییە ئیسبات دەکەن کە گوێڕایەڵی بۆ ئەمریکا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خەڵکی ستەم لێکراو و چەوساوە و ئازادیخواز لەئێران و لەکوردستان ناتەبایە. خۆ ئەگەر بۆ وێنە سیناریۆیەکی لەچەشنی ئەوەی لە عێراق ڕوویدا لەئێرانیش دووپات بێتەوە، کە ئەگەری گەلێك لاوازە، ئەوکاتە ئێمەش پێویستە هەڵوێستی گونجاو لەگەڵ وەها هەلومەرجێك بگرین بەجۆرێك کە لەزەرەرو زیان و ئازارەکانی وەها ڕووداوێك ئەوەندەی بتوانین کەمبکەینەوە.

* لەژێر تەئسیری ئەو مانیفێست و ئایدۆلۆژیای حزبی کۆمۆنیست و مەسەلەی مارکسیزمە ناتانەوێ لە ئەمریکا نزیکبنەوە وەکو ڕێبەری باڵی سەرمایەداری، یان ئەوەیە کە ئێوە نەتانەوێ هەڵوێستێکی جیاوازتر و سەربەخۆتان هەبێ و ئەزانن ئەمریکالە بەرژەوەندی خەڵکی کوردستاندا نییە چالاکی و فەعالییەتی دژی ئێران؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو هەڵوێستەی ئێمە پێش ئەوەی هەڵوێستێکی ئیدئۆلۆژیك بێ، هەڵویستێکی سیاسی کۆنکرێتە. سەرمایەداری بوونی دەوڵەتی ئەمریکا ئەو حەقیقەتەمان پێدەڵێ کە ناتوانین چاوەڕوانی چاکەی لێبکەین.

لەقەڵاچوالان لەگەڵ ئیتلاعات دانەنیشتووین

*پەیوەندی ئێوە لەگەڵ جمهوری ئیسلامی چۆنە، زۆرجار من گوێم لێبووە یان ئاگاداربووم کە ئێوە لە قەڵاچوالان لەڕێگای یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دانوستان بووە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێرانی ئێوە تاچەند بەشداری ئەو دانوستان و گفتوگۆ و مفاوزاتانەتانکردووە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە وەکو کۆمەڵە، ڕێکخراوی کوردستانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران، هەرگیز نەلەقەڵاچوالان و نەلەهیچ شوێنێکی دیکە گفتوگۆمان لەگەڵ نوێنەرانی ڕژێمی ئێران نەبووە. دوایین گفتوگۆیەك کەبوومانە هەڵدەگەڕێتەوە بۆساڵی (١٩٨٠) لەشاری مەهاباد لەچوارچێوەی گفتوگۆکانی هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد لەگەڵ ڕژێمدا.

*هێزە سیاسییەکانی تریش ئەیان بووە، وەکو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕان یان حزبی دیموکرات؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بۆ حزبی دیموکرات لانیکەم هەموو کەس لەوە ئاگادارە کە سکرتێری گشتی حزبی دیموکرات دکتۆر قاسملو گیانی لەڕێگای وتووێژی نهێنی لەگەڵ ڕژێمی کۆماری ئیسلامی دانا. ماوەیەك لەوەوپێشیش لەسەرزاری یەکێك لەئەندامانی پێشووی دەفتەری سیاسی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان ئاشکراکرا کەلەم ساڵانەدا جارێك لەگەڵ نوێنەرانی ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی دانیشتنیان بووە.

باڵی موهتەدی لەگەڵ ئێران دانیشتووە

*موهتەدی لە دوای کۆنگرەی (١٠)ی خۆیان لەرۆژنامەی (شۆڕش) لەژمارە (٤٢) لە ژانویەی (٢٠٠٥) دەڵێ "هیچ وتووێژێکمان نییە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و وتوومانە هەر وتووێژێك هەیە ئەبێ رەسمی و عەلەنی بێ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: دەنگوباسی ئەو دانیشتنە لەگەڵ نوێنەرانی ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی لەکوردستانی عێراق لەکاتی خۆیدا وەکو دەنگۆبلاّو بووەو ماوەیەك لەوەوپێشیش هەروەکو باسمکرد ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یان لەسەرتۆڕی ئینتەرنێت ئاشکرای کرد.

بەڵگەم هەیە کە موهتەدی لەگەڵ ئێرانییەکان بەنهێنی دانیشتووە

* تۆ پێتوایە مفاوزات هەبووە لەنێوان ئەواندا؟ ئەی چییە ئەو دانیشتنانە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هیچکام لەم دانیشتنانە لەراستیدا ناچنە خانەی وتووێژەوە، بەڵکو پیلانی ئیتلاعاتین کە بەداخەوە ئەو حزبە سیاسییانەش بەدەمییەوە چوون. تەنیا حزبێك گەبرِوایەکی بەهێزی جەماوەر نەمابێ وەسوەسە دەبێ بچێتە ناو وەها پرۆسەیەکی بێ سەرئەنجامەوە. هەردووکی ئەو نمونانەی کە باسم بۆ کردن لە دەورەی پاشەکشە و زەعفی ئەو حزبانەدا روویانداوە و لەکاتێکدا بووە کە هاوسەنگی هێز لە هەموو روویەکەوە بەقازانجی رژێمی کۆماری ئیسلامی بووە. دەزگاکانی ئیتلاعاتی بەمەبەستی جۆراوجۆری وەکو کۆکردنەوەی زانیاری راستەوخۆ، دووبەرەکی نانەوە لەناو هێزە سیاسییەکان، بێ ئیعتبارکردنی ئەم هێز و ئەو هێز، وەها پیلانگەلێك رێکدەخەن.

*لەم نزیکانە یان لە داهاتوویەکی نزیکدا مفاوەزات و گفتوگۆتان ئەبێ لەگەڵ ئێراندا؟

ئیبراهیم عەلیزادە: وتووێژ لەگەڵ دوژمن دەتوانێ بەشێك بێ لە خەباتی بەردەوام لەگەڵ ئەو دوژمنە. بەڵام ئیمکانی وتووێژ لەئەنجامی گەیشتنی هاوسەنگی هێز بەرادەیەکی دیاریکراو دەخوڵقێ. لەکاتێکدا کە هەلومەرجی سیاسی و هاوسەنگی هێز بە قازانجی لایەنی ئێمە نەبێ وتووێژ دەبێتە بوارێك بۆ پاشەکشە و لەنیهایەتدا بۆ رێککەوتن لەسەرچۆنیەتی تەسلیم بوون. لە هەر حاڵدا ئێمە دژ بەبەرێوەچوونی وتووێژی نهێنی لەگەڵ کۆماری ئیسلامین.

*ئەی چۆن ئێوە کێشەکانتان یەك لا ئەکەنەوەو چۆن ئەتوانن ئەم رژێمە بروخێنن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هەروەك باسمکرد ئێمە وەکو سەرەتایەك دژ بەوتووێژ نین، بەڵام پێویستە هەلومەرجی وەها وتووێژێك برەخسێ. وتووێژ نابێ لەلایەن ئەم یان ئەو رێکخراوەوە بە جیا ئەنجام بدرێ. ئەگەر وتووێژ لەسەرمافەکانی گەلی کوردە، پێویستە وەکو ئەمرێکی نەتەوەیی چاوی لێبکرێ و لەلایەن نوێنەرانی خەڵکی کوردستانەوە بەرێوەبچێ. هەربۆیە لامان وایە ئەوەی کە ئەم لایەن یا ئەولایەن خۆیان بە تەنیا پێوەندی بگرن لەگەڵ دوژمن و ناوی بنێن وتووێژ بۆ دابینکردنی مافەکانی خەڵکی کوردستان شتێك نییە غەیری رێگا خۆشکردن بۆ پیلانەکانی ئەو رژێمە. خەبات بۆ روخاندنی کۆماری ئیسلامی خەباتێك نییە کە ئەرکەکەی هەر بە تەنیا لەسەرشانی بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان بێ. ئەم ئەرکە پەیوەستە بەخەباتی سەرانسەری جەماوەری خەڵکی ئێران. ئێمە لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا بۆ بەئەنجام گەیاندنی وەها ئەرکێك بەپێی ستراتیژێکی راگەیەندراو هەوڵدەدەین.

رووخانی ئێران دیار نییە

*رووخانی کۆماری ئیسلامی نزیکبووەتەوە؟

ئیبراهیم عەلیزادە: کەس ناتوانێ ئەمرۆ پێشبینیەکی ورد بۆ وەها رووداوێك بکات. ئێمە هەوڵ

دەدەین پلە بەپلە کۆمەڵگای ئێران لە هەلومەرجێکی شۆڕشگێڕانەی وەها نزیک کەینەوە کە هەم ڕژێمی کۆماری ئیسلامی بڕوخێ و هەم چینی کرێکار بە دەسەڵات بگات. یان لانی کەم هەلومەرجی بەدەسەڵات گەیشتنی لەبارتر بێ و لەبە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی نزیک بێتەوە. هێزی دیکەش هەیە کە هیوای بە دەستێوەردانی دەرەکی بۆ ڕوخاندنی کۆماری ئیسلامی بەستووە، بە لای ئێمەوە وەها هیوایەک تەوەهۆم بێ یان واقعیەت بەرژەوەندی کۆمەڵانی خەڵکی ئێران لە وەها ڕەوتێکدا نییە.

***ئەی ئەو هەموو ئیدعایە ئەمریکا دەیکات چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ناکۆکی نێوان کۆماری ئیسلامی و ئەمریکا واقیعییە. ئەم دوو دەسەڵاتە بە هەموو شیر و تیرێکیش کە لە یەکتر ئەیکێشن، بەردەوام قازانجیش بە یەکتر دەگەیەنن. کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئەفغانستان و لە عێراق لە سەرەتاوە یارمەتیدا بەبەرێوەچوونی سیاسەتی ئەمریکا لەو دوو وڵاتە، کار ئاسانی بۆ کرد. کێشەکانی دواجاریان لەسەرئەوە بوو و ئێستاش لەسەرئەوەیە کە کۆماری ئیسلامی داوای پشکی خۆی لەم بەشداریکردنەدا دەکات و ئەمریکاش نایەوێ لەوەی زیاتر کە دەیکەوێ، بیداتێ. باشترین حاڵەت بۆ ئەمریکا ئەوەیە کە پێش بە زیادەڕۆییەکانی کۆماری ئیسلامی بگرێ و لە زەرفیەتەکانی وەکو زلهێزێکی ناوچەیی بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی کەڵک وەر بگرێ. ئەو زەختەی ئەمڕۆ ئەمریکا بۆ کۆماری ئیسلامی دێنێ لە کردەوەدا بە وەها پرۆسەیەك خزمەت دەکات.

***ئایا ئەو بەرژەوەندییانەی ئەمریکا ناتوانێ خۆی لە ڕووخانی جمهوری ئیسلامیدا ببینێتەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەندی بەوە هەیە کەرژێمی کۆماری ئیسلامی لە چ ڕێگایەکەوە و لە ئاکامی چ پرۆسەیەکدا دەڕوخێ. ئەگەر ڕووخانی ڕژیمی ئێران تێکە و لێکەیەکی وەهای لێبکەوێتەوە کە ئەم وڵاتە یان و بەرینە لەشوێنێکی ژێئۆپۆلێتیکی وەها هەستیاردا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕووی سەقامگیری بە خۆیەوە نەبینێ، وەها حاڵەتێك لە بەرژەوەندی ئەمریکادا نییە. هەروەها ئەگەر ڕوخانی کۆماری ئیسلامی لە ئاکامی خەباتی شۆڕشگێڕانە و گەشەکردنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی پێشکەوتووی ئەم وڵاتەدا بێتە گایەوە، لام وا نییە ئەمریکا بەرژەوەندی خۆی لەوەها حاڵەتێکیشدا ببینێتەوە. هەر بۆیە لە ستراتێژی ئەمریکادا ئەگەر ڕوخانی کۆماری ئیسلامی جێگایەکی هەبێ، پەیوەندی هەیە بە چۆنیەتی ڕووخانی ئەو ڕژێمەوە.

**پەیوەندیمان لەگەڵ (pkk) ئاساییە**

***پەیوەندی تازەی ئێوە و "pkk" لە کوێدایە و ئەوەی کە من ئەیبینم پەیوەندی ئێوە و "pkk" ئاسایی نەبینم بە پێچەوانەوە پەیوەندی "pkk" و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان زۆر خراپ ئەبینم و دایمە هێرشی توند ئەکەنەسەر یەکتر؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە پێوەندیمان لەگەڵ "pkk" ئاساییە، بەڵام ئەم پەیوەندییە نەچووەتە بواری هاوکاریکردنەوە.

**کۆنگرەی (١١) و رۆتین -٢٠٠٤- زرگوێز**

***لە (٤ تا ٩)ی گەلاوێژی (١٣٨٣) واتە لە (٤ی ئوتی ٢٠٠٤)ی زایینی کۆنگرەی (١١)ی کۆمەڵە ئەبەستڕێ دیسان لەسلێمانی، هەمیشە کۆنگرەکانتان لە سلێمانییە یان لە زرگوێزە، کە ئەمەش مانای ئەوەیە کە کۆمەڵە جگەلەوەی کە ئاڵوگۆڕ لە رووی سیاسییەوە بە سەریدایە نەیتوانیوە جارێکی تر هەوڵبدات کۆنگرەکەی لە شوێنێکی تر بێت مەبەستم ئەوەیە لە ناوخۆی کوردستانی ئێران بێ، ئەم کۆنگرەیە چ جیاوازییکی تری هەبوو، هیچ جیاوازییەکی هەبوو لەگەڵ کۆنگرەکانی تر یان هەر ئەوە بوو هەر لە چاوەروانیدا مانەوە ئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ ئاگاداریتان کۆنگرەکانی( ١ و ٢ و ٣)ی کۆمەڵە لە کوردستانی ئێران بەرێوەچوون. کۆنگرەکانی (٤ و ٥ و ٦) یش لەشوێنەکانی ئازادی کوردستانی عێراق بوون. لەکۆنگرەی حەوتەوەبوو کەشوێنی بەرێوەچوونی کۆنگرەکانمان هاتە سلێمانی و زرگوێز. گومان لەوەدا نییە کە بەردەوام هەوڵمانداوە و هەوڵدەدەین بۆ ئەوەی ئەو هەلومەرجە بگۆرین. شوێنی بەرێوەچوونی کۆنگرە بە تەنیایی ئەوە نیشان نادات کە هاوسەنگی هێز لەچ ئاستێکدایە، هەڵبەت دەتوانێ یەکێك لەفاکتەرەکان بێ، کۆنگرەی (١١) کۆنگرەیەکی رۆتین بوو. لێکدانەوەی هەلومەرجی سیاسی ئێران و ناوچەکەی کرد و تەئکیدی لەسەرپەسەندکراوەکانی کۆنگرەی (١٠) کردەوە. ئەم کۆنگرەیە لەکاتێکدا بەرێوەچوو کە رژێمی عێراق رووخابوو. دەوڵەتی ئەمریکا ئیدعای دەکرد کە پرۆژەیەکی دیموکراتیکی بۆ رۆژهەڵاتی ناوەراستی گەورە بە دەستەوەیە. کەم نەبوون ئەو کەسانەی کە تەنانەت بیریان لەدووپات بوونەوەی سیناریۆی عێراق بۆ ئێرانیش دەکرد. لەم کۆنگرەیەدا ئێمە جارێکی دیکە ئەو راستیەمان تەئکیدکردەوە کە بەرژەوەندی ئەمریکا و بەرژەوەندی کۆمەڵانی خەڵك لەکوردستان و لە ئێران یەکناگرنەوە. ئەو هەڵوێستە کە بەردەوام لایەنە جۆراوجۆرەکانی شیدەکرانەوە، لەکاتێکدا بوو کە شەپۆلێك لە پروپاگەندە بۆ خۆشباوەرکردنی خەڵك بەسیاسەتەکانی ئەمریکا لەوناوچەدا لەئارادابوو. تەنانەت لەناو خۆشماندا کەسانێك بوون کەبەرامبەر بەم لێکدانەوە و هەڵوێستەی کۆنگرە و کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە دردۆنگ بوون و لایان وابوو ناواقیعی و چەپ رەوانەیە. بەڵام رەوتی رووداوەکان نیشانیان دا کە لێکدانەوەکانی ئەوکاتی کۆنگرەی(١١)ی ئێمە ورد و لە جێگای خۆی بوود.

***ئەو باسانەی کە هەیە نارەزایەتیەك هەیە لەناو کۆمەڵە لێرە سەبارەت بە تێروانینیان لەسەرمەسەلەی حزبی کۆمۆنیست و کۆمەڵە لە رووی سیاسی و رێکخراوەیی ئیدئۆلۆژی و مێژووییەوە، لەو کۆنگرەیەدا قسە و باسی لێکرا یان ئەوە کۆنگرەی (١٢) یە کە ئەم بەحسە ئەوروژێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی (١١) نەچووە سەر ئەو باسە و هیچ بریارنامە یان دەستور جەلسەیەك لەم بابەتەوە پێشنیارنەکرا. هەڵبەت چەند مانگ پێش بەرێوەچوونی ئەو کۆنگرەیە لە ناو تەشکیلاتی ئێمەدا لەسەرتێروانین ئەم هاورێیانە رێفراندۆم کرا و نزیکەی لەسەدا (٩٠)ی ئەندامانی ئێمە دژ بەم تێروانینە هەڵوێستیان دەربری. ئەو هاورێیانەی کە ئەو تێروانینەیان بوو نەهاتنە ناوکۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی ئەو کۆنگرەیەوە.

***چیتانکرد لەو کۆنگرەیەدا بۆ ئەوەی کە لانیکەم جارێکی دیکە کێشەتان بۆ دروست نەبێ یا ئینشقاق و ئینشعابێکی دیکە دروست نەبێ یان هەوڵتاندا خەڵکانێکی تر جارێکی تر پەیوەست بکەنەوە بە خۆتانەوە، گرنگترین محاولاتەکانی ئەو کۆنگرەیە چی بوو ئێوە کردتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەم کۆنگرەیەدا هەوڵی سەرەکی ئێمە ئەوە بوو کە لێکدانەوەمان بۆ هەلومەرجی سیاسی لێك نزیك کەینەوە. هەوڵماندا بۆ ئەوەی کە ئەگەر خیلافێك هەیە لەبواری تەشکیلاتییەوە بگوازرێتەوە بۆ بواری سیاسی. بە گشتی هەوڵی ئێمە ئەوە بوو کە کێشەکان لەچوارچێوەی کێشە لەسەرقاڵبی تەشکیلاتی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە بگوازرێتەوە بۆ جیاوازییەکانمان لەبواری ستراتیژ و سیاسەت و هەڵوێستی کۆنکرێتدا.

***لەو قائیمەی لەبەردەستی مندایە کە بەشێکیان کە کۆمیتەی ناوەندین هەندێکیان وازیان هێنا لە کۆمیتەی ناوەندی یان لە کۆمەڵە بە بێ ئەوەی بەشداری ئینشعابیش بکەن، ئەم خەلەلە چییە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەم کۆنگرەیەدا هەوڵدرا بۆ ئەوەی کە ژمارەیەك لەو هاورێیانە خۆیان کاندید بکەن بۆ ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی. بەڵام خۆیان ئەو داوایەیان قبوڵ نەکرد و لەدەرەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا هەوڵیاندا بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی خۆیان بەرنە پێش.

***ئەو رەخنانە تاچەند راستن کە رێگری هەیە لەناو کۆمیتەی ناوەندی، رێگری هەیە بۆ سەرکەوتنی خەڵکی گەنج یان بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کە بچێتە پێشەوە یەعنی دەسەڵات و سەلاحیەت و ئیمکاناتی زیاتری پێبدرێ، ئەم رەخنانە رەخنەی شەخسین؟ چیدین؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من هەستناکەم بەوەی کە هیچ رێگرییەك هەبێ لەوەی کە گەنجەکان رێگا پەیدا بکەن بۆ ناوەندەکانی رەهبەری حزبی و کۆمەڵە بەڵام واقعیەت ئەوەیە لە کاتی دەنگداندا ئەوەی کە بەکردەوە بەرێوەدەچێ ئەو سوننەتەیە کە زیاتر متمانە بەکۆنەکارەکان دەکات. ئەوە کێشەیەکە کە لە هەمان کاتدا پەیوەندی بە هەلومەرجی سیاسیشەوە هەیە. شەرت نییە ئەگەر ئێمە کۆنگرەکانمان لە هەلومەرجێکی شۆرشگێرانە و لەناوەوەی وڵات بەرێوەبەرین، ئاکامەکانی لەم بابەتەوە هەر بەمجۆرە بێ کە لە هەلومەرجی وەکو ئێستادا هەیە.

**باڵی ساعدی وەتەندۆست بێ هێزە**

***گرنگترین بەرژەوەندی بۆ تۆ، بۆ پاراستنی کۆمەڵە چییە؟ یانی کە هەموو کەس ئەبێ ئیلتزامی پێوە بکا، ئەمە خاڵی سوورە پێویستە نەبەزێندرێ و ئیتر تۆ بە تێروانینی شەخسی لێکی ئەدەیەوە بە هەر شتێکی لێکی ئەدەیتەوە پێویستە ئەمە پرەنسیبە و لەپێناوی کۆمەڵەدایە و لێی لانادرێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هێڵی سوور تێپەراندن بەرنامەی کۆمۆنیستی و ستراتیژێکی سیاسییە کە بۆ گەیشتن بەو بەرنامەیە دامانڕشتووە. بۆ من ناوی کۆمەڵە بە بێ ئەم ناوەرۆکە هیچ جێگا و شوێنێکی نییە.

**کۆنگرەی (١٢)و ئەگەری ئینشقاق بەندی٢٠٠٦-زرگوێز**

***لەبەرئەوەی ئەم کۆنگرەیە کەهەروەك وتت کۆنگرەیەکی رۆتینە ئەچینە سەر کۆنگرەی(١٢)، کۆنگرەیەکە ئاڵوگۆڕێکی جیدی لە مەنتیقە پێکهاتووە کێشەکان زیاتر بوون و ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی تووشی کێشە و قەیرانی زیاتر بووە، وردە وردە ئینشعاب و ئینشقاقی زیاتر روو ئەدات کۆنگرەی (١٢) لە پوشپەری (١٣٨٥) و لە ژوویيەی(٢٠٠٦) لە زرگوێز بەرێوەئەچێ هێشتا کێشەکانتان بەردەوامە لەگەڵ باڵی موهتەدی، بەڵام هەر لەو کۆنگرەیەدا چەند کەس لە ئێوە کە من بەڵگەکانیشم لەبەر دەستدایە لەسایتە ئینتەرنێتییەکانیش نووسیویانە لەسەرتان‌و جەماعەتێك لەخۆتان نارازین دەیانهەوێ ناوی حزبی کۆمۆنیست بگۆڕن و پێیانوایە ئێوە کارێکی خراپ ئەکەن کە بەناوی کۆمەڵەوە قوربانی ئەدەن و حزبی کۆمۆنیست ئەیخوات؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: کۆنگرەی (١٢) هەوڵیدا لێکدانەوەیەکی شەفاف لەسەر ئەو هەلومەرجە ئاڵۆزە سیاسیەی کە باستانکرد بەدەستەوە بدات. لەسەربنەمای ئەو لێکدانەوەیە سیاسەت و تاکتیکی ئێمە بۆ هەموو بوارەکانی هەڵسوڕانمان دیاری بکات. هەر لەم کۆنگرەیەدا باس لەبەرنامەی کۆمەڵە بۆ دەسەڵاتداریەتی جەماوەر لەکوردستان کرا و بنەماکانی ئەو بەرنامەیە دیاریکرا. ئەو بەرنامەیە دواجار لەلایەن کومیتەی ناوەندی کۆمەڵەوە ئامادەکرا و وەکو بەڵگەیەکی رەسمی بڵاوکرایەوە. بەنیسبەت کێشەکانی ناوخۆشمان لەو کۆنگریەدا چەند لایەنێکی سیاسی جیاوازیەکان لەگەڵ هاورێیانی ئۆپوزیسیون خۆیان دەرخست و لە کۆی (٢٢) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (٣) کەسیش لەو هاورێیانە هەڵبژێردران.

سەبارەت بە دوایین بەشی پرسیارەکەتان لە پێشدا با ئەوەتان پێبڵێم راستە کەئەو هاورێیانەی ئێمە نایانەوێ کۆمەڵە لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا فەعالیەت بکات. بەڵام ئێستا ئەوە بە تەواوی روونە کەکێشەی ئەوان تەنها لەگەڵ چوارچێوەی حزبی کۆمۆنیست نییە، بەڵکو لەگەڵ گەلێك لە بنەما فیکری و سیاسی و ستراتژیەکانی کۆمەڵەش ناتەبان. ئەوەی ئەوان دەیان هەوێ تەنیا گۆڕینی ناو نییە، بەڵکو بە ووتەی راگەیاندراوی خۆیان گۆڕینی رێبازو ناوەرۆکی ستراتیژی سیاسی ئێمەشە.(٢٥) ساڵ لە پێکهاتنی حزبی کۆمۆنیستی ئێران تێپەردەبێ. لە هەموو ئەو ماوەیەدا کۆمەڵە پێگەی جەماوەری خۆی پاراستوە و بگرە بەهێزتریشی کردووە و لەچوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانیشدا کاری کردووە. ئەگەر ئەو رێبازە لەکوردستان زەمینەی کۆمەڵایەتی نەبوایە ئەو رەوتە بەم شێوەیە چۆن دەپارێزرا؟ ئەوە رێبازێکی سیاسییە کە هەم ئێمە وەکو رەوتێکی رادیکاڵی سوسیالیستی پێویست بوو بیگرینەبەر و هەم کەم ژانەسەرترین ریگایە بۆ سەرکەوتنی بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی کوردستان و بۆ لەناو بردنی ستەمی نەتەوایەتی.

**جیاوازی لەنێوان موهتەدی و ئیلیخانیزادەدا نابینم**

***لەسەرئەو جیابوونەوانە، رێکخراوێکی تر بە ناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران -رەوتی چاکسازی‌و گەشە، پێتوایە بەحسەکانیان ئەوەندە ئەزەریبوون کەئەیانەوێ ئاڵوگۆڕێکی جیدی لە بواری سیاسی‌و فیکری پێکبێنن یان ئەوەیە کە دووبارەکردنەوەی ئینشعابەکانی پێشوەو یان ئەوە راستەکە پێیانوایە ئەمە رێفۆرمە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: من هیچ جیاوازییەك لەبەرنامە و لەستراتیژی سیاسی ئەو دوو لایەنەدا نابینم. کێشەکانیان لەسەرهەڵسوکەوت‌و شێوەکاری تەشکیلاتییان خۆی دەرخستووە، بەڵام من لام

وایە هۆکاری سەرەکییەکەی ئەوەیە کە ئەو سیاسەتانەی وا لەماوەی چەند سالّی دوای جیابوونەوەیان لەنێمە دایانڕشتووە و هەموشیان لە سەری کۆکبوون، هیچکامیان نەکەم و نەزۆر وڵامیان وەرنەگرتووەتەوە. لەوەها حاڵەتێکدا سەیر نییە ئەگەر کێشە ناوخۆییەکان لەسەرنەبوونی دیموکراسی بێ یان شەڕی دەسەڵات یان شتی تر، زاڵ بێتەوە.

*** لایەنی سێهەم کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو جارێکیتر هاتە ناو وەزعەکەوە، بەڵام نەیتوانی چارەسەری ئەم گرفتانە بکات پێتوایە لەهەموو کێشەکانی ئێوە یەکێتی جارێکی کە دیتەوە ناو دانیشتنەکانی ئێوە و دواتریش سەرکەوتوو نابێ، مەسەلەکە ئەوەیە کە یەکێتی زۆر دۆستی نزیکی ئێوەیە؟ نەیهەوێ ئەمانە روو نەدا؟ یان فاکتەرێکە لە پشت ئینشعابەکانەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من ئاگاداری وردەکارییەکانی هەینەتی ناوبژیوانی یەکێتی نیشتمانی لەکێشەکانی ساڵی رابردووی ئەو رێکخراوەیە نیم. بەگشتی دەتوانم بڵێم کەکێشەکانی ناوخۆی حزبە سیاسییەکانی کوردستان هەموویان هۆکاری ناوخۆییان هەیە. هەڵبەت ئەگەر لایەنێك دڵنیابێ لەوەی کەدوای جیابوونەوە یارمەتی ماددی بۆ دەستەبەر دەبێ، جیابوونەوەکە رەوتێکی خێراتر بەخۆیەوە دەگرێ. لەوانەیە ئەگەر ئەو فاکتەرە لە ئارادا نەبێ، ناوەرۆکی سیاسی ناکۆکییەکان لە رەوتێکی ئاساییدا زیاتر دەربکەون و رەوتی جیابوونەوە یان وەحدەتی سەر لە نوێ بەشەفاف و بەبەرچاوی خەڵکەوە بەڕێوەبچێ.

**بۆچوونەکانی ئیلیخانیزادە سەر پێیین**

*** عومەری ئیلیخانیزادە لەدوای جیابوونەوەکەی ئەڵێ "موهتەدی و عەلیزادە بەرپرسن لە وێران بوونی کۆمەڵە و چوونە ناو حزبی کۆمۆنیست" ئەو پێیوایە ئەگەر کاك فوئاد بمایە ئەم وەزعە رووی نەئەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك عومەر خۆی لە بونیادنەرانی حزبی کۆمۆنیست بوو و مەنسوری حیکمەت هەمیشە شانازی بەبۆچوونەکانی ئیلخانیزادەوە دەکرد، ئەمە لێکدانەوەیەکی زۆر روکەشییە و هەڵسەنگاندنێکی ئیختیارییە. بەمانایەك بە کەمگرتنی هەموو ئەو ئینسانە سیاسی و بەئەزمونانەیە کە لەجەرگەی خەباتێکی چڕو پڕو پڕ لە هەڵسوکەوتی سیاسی و نیزامی و کۆمەڵایەتیدا ئەو رەوتەیان تا ئێرە هێناوە. ئەمە خۆدەربازکردنە لە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی قوڵی سیاسی، لێدوانێکی سەرپێیە.

*** لە وەڵام بەو رەخنانەی کە هۆکاری جیابوونەوەن لە باڵی (رەوتی چاکسازی و گەشە) لەکۆمەڵەی زەحمەتکێشان ئیلیخانیزاد، موهتەدی تاوانبار ئەکات بەوەی کە هاوکاری ئەمریکای کردووە، کە نادیموکراتییە و دەسەڵاتی و پارە و پول و ئەوانە هەموو لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا ئەو پێیوایە کە سنترالێکی دەسەڵات هەیە کە لای عەبدوڵڵا کۆبووەتەوە و دەسەڵات لای سکرتێرە، و لەوەش خراپتر ئەڵێت لە کۆنگرەیە عەبدوڵڵا خۆی کردووە بە فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە کە ئەم کلتوورە لەناو کۆمەڵەدا نەبووە. ئەم رەخنانە رەخنەی جیدی و دەقیقن یا ئەو کاتەی کە ئینشعاب رووئەدا هەموو شتێك ئەبێ بە و رەخنە و قسەکردن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بۆ ئەوان کە لەم (٨) ساڵەدا پێکەوە کاریانکردووە و شارەزای هەموو

کێشەکان و ڕووداوەکانی ناوخۆیان هەن لەوانەیە ئەم ڕەخنانە واقیعی بن، من ناتوانم قەزاوەتێکی ورد لەم بابەتەوە بکەم. بەڵام بەبڕوای من ئەمانە تەنها دەتوانن بەشێك لەواقیعیەت بن نەك هەمووی. ئەگەر كاك عەبدوڵڵا و هاوفیکرانی سیاسەتەکانیان لەم ماوەیەدا سەرکەوتوو بووایە بەهەموو ئەو ڕەخنانەشەوە جیابوونەوە دەیتوانی ڕوونەدا. ئەو ڕەخنانە دەبنە هەوێنی ماددەیەکی دیکە.

**كاك عومەر خۆیشی لایەنگری ئەمریکا بوو**

*** بەڵام عەبدوڵڵا موهتەدی لەوەڵام بەو قسانەی عومەر ئیلخانیزادەدا ئەڵێ هیچ فاکتەرێکی سیاسی نابینم بۆ جیایی جگە لە تەموحی شەخسی نەبێ؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەگەر جیاوازی سیاسی نەبوو یان ئەگەر جیاوازییەکان ئەساسی و جیددی نەبوون، جیابوونەوە لەسەرکێشەی تەشکیلاتی زۆر لە جێی خۆی نییە. لەسەرئەساسی کۆمەڵێك کێشەی تەشکیلاتی حزبی سیاسی جیددی بنیاتنانرێ. لەوەها کاتێکدا پێویستە هەموو هەوڵەکان بۆ مانەوە تاقی بکرێتەوە و ئەگەریش هەر بەجێ نەگەیشت ڕێگای دیکەش هەیە غەیری پێکهێنانی حزبێکی دیکە کە بە ناوەڕۆك و بەرنامەی سیاسی و ڕێبازەوە هەروەکو ئەوەکەی پێشوو وابێ. دەتوانێ بە ئیشێکی سیاسی و یان کۆمەڵایەتی دیکەوە خەریك بێ.

*** کێ دەعمی ئەم هێزانە ئەکات دەعمی مادییان ئەکات وا زوو ئەکەونە سەر سکە، رادیۆ، تەلەفزیۆن، ئۆردوگاو پارە و کێ ئەمانە؟ پێتوانییە فاکتەرێکی ئەساسین جارێکی تر بۆ ئینشقاق و ئینشعاب؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بێگومان ئەو ئیمکاناتە ئەبەسەروەتی شەخسی ڕێبەرانیان سازدەکرێ و ئەبەپەلە پروژە یارمەتی جەماوەری بە فریایان دەگات. ئەگەر سەرچاوەی دارایی ئاسان و بێ دەردی سەر لەبەردەست نەبێ. ناچار دەبن زۆرتر بیری لێ بکەنەوە و ڕێگەی سیاسی تر ڕەچاوکەن.

***عومەر ئیلخانیزادە پێیوایە کۆنگرەی (١٢)ی کۆمەڵە تەپڵی جیابوونەوە بوو بەو دەلیلەی سکرتێر بوو بە سکرتێری گشتی، هێزی چەکداریش خرایە ژێر دەسەڵاتی سکرتێرەوە، کە ئەمانە پێیوابوو بەشێکە لە ئیحتیکار و ئەم سوننەتە لەناو کۆمەڵەیا نییە، ئەمانەو ڕەخنەی دەقیقن پێتوایە ئەمە ئاڵوگۆڕن ؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەمانە ڕەخنەن بەڵام پاساوی جیابوونەوە نین، مەگەر بە شوێنیدا خیلافات لەسەربەرنامە و سیاسەت و ستراتیژ و تاکتیکیش دەرکەوێ.

*** لەکۆنگرەی (١٢)ی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان ناوی کۆمەڵە یان کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان بەفارسییەکەی بوو بە (حزبی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران) پێتوابوو ئەمە چ جۆرە تاکتیکێکە، لەکاتێکدا بە ئینگلیزیەکەشی وا ئەکا بەڵام بەکوردییەکەی بۆ بوو بە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەمە کایە کردنێکە لەگەڵ ناو. سەرچاوەکەی هەڵدەگەڕێتەوە بۆ یەك تەناقوزی ئەساسی. ئەویش ئەوەیە بەرەو ڕاست چوونی ئەوان لەگەڵ ناوی کۆمەڵە و سوننەتی

کۆمەڵە ناتەبایە. ئەوان نە دەیانەوێ دەست لە ناوەکەی کۆمەڵە هەڵبگرن و نەدەتوانن نوێنەرایەتی ڕێبازەکەی بکەن، ئەوەیە وا بە شوێن ناودا سەرگەردانی کردوون.

**عەبدوڵڵا کۆنەپۆشی نوێنەرایەتی کەس ناکات**

***بە دوای ئەم کێشانە لە دووهەمین پلینۆمی دوای کۆنگرەی (١٢) جارێکی دیکە کێشە ئەکەوێتە ناو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان، کەسێك بەناوی عەبدوڵڵا کۆنەپۆشی کەمئەندامی کۆمیتەی ناوەندییە ڕووبەڕووی کێشە ئەبێتەوە و ئەوانە ئەمە هەمووی خیلاق فیکرییە لەماوەی سێ ساڵدا چوار ئینشقاق ڕوویدا و لە ناو (١٠)کیلۆمەترییەکی قەزای قەراخدا چوار کۆمەڵە دروست بووێت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو جیابوونەوانە نوێنەرایەتی هیچ بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، هیچ ڕەوتێکی کۆمەڵایەتی لە ناو کۆمەڵگای کوردستاندا ناکەن. هەلومەرجی ئێستای کوردستانی عێراق وای کردووە کە ئەوان بتوانن هەرکامەیان دام و دەزگایەك لەو ناوە بۆ خۆیان دابمەزرێنن و بەو مانایە هەبن.

***قسەیەك هەیە کە باڵی مۆعتەریزی ناو ئێوە ساعیدی وەتەندوست و مینەی حسیامی، جەعفەری ئەمین زادە و ئەوانە دانیشتنی نهێنییان یان ڕێك کەوتنێك هەبێ لە نزیك بوونەوەیان لەگەڵ باڵی چاکسازی و گەشە و عەبدوڵڵا کۆنەپۆشی و جەوادی مشکی و ئەوانە، ئەمانە تا چەند ڕاستە و پێتوایە ئەگەرێکە لە داهاتوودا ڕوو بدات؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** هەرچەند ئێمە تا ئێستا نیشانەیەکی ئاشکرامان لە وەها نزیك بوونەوەیەك نەدیتووە بەڵام لام وایە ناوەرۆکی بۆچوون و تێڕوانینی سیاسی ئەو هاوڕێیانەی ئێمە جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ جیابوونەوەکەی (٨) ساڵ لەمەوپێش لە کۆمەڵە نییە و هەر بەو ئاراستەیەدا دەڕوات.

*** ئەمە تا چەند کارێکی شیاوە یا چەند ئەگەری جێ بە جێ کردنی هەیە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا هەمووتان ببنەوە بە کۆمەڵە و هێزێکی گەورەی کوردستانی ئێران، کۆمەڵەیەکی گەورە دروست کەنەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەگەر لەسەرئەساسی یەکگرتن لە بەرنامە و ستراتیژی سیاسی و بنەمایەکی نوسوڵی ڕێکخراوەیی هاوبەش بێ، زۆر شیاوە. بەڵام بەم ڕێبازەی کە ئەم لایەنانەی وا لە کۆمەڵە جیابوونەتەوە گرتوویانەتەبەر، وەها یەکگرتنەوەیەك بە مۆمکین نازانم. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە لەگەڵگۆڕانکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کوردستان و ئێران لە داهاتوودا، لەگەڵهاتنەکایەی هەل و مەرجێکی شۆڕشگێڕانە لە کۆمەڵگایەدا، ڕیزبەستنی هێزە سیاسییەکانیش گۆڕانکاری بە سەردا دێت و بێگومان یەکگرتن و ئیئتلاف و ئیتحادی نوێ دێتە کایەوە کە چەند و چۆنەکەی لە ئێستادا پێشبینی ناکرێت.

**لەدیموکرات ناترسین**

*** ئێوە ناترسن دیمۆکرات یەك بگرێتەوە و ئێوە ببن بە هێزی سێهەم و چوارەم و دیمۆکرات ببێتەوە بە هێزی یەکەم؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ترسێك نییە، هەر كەس هەرچی بچێنێ، ئەوە دەدرووێتەوە. زەمینەی كۆمەڵایەتی بۆ گەشە كردنی ڕەوتی چەپ و سۆسیالیست لە كوردستان و لە ئێراندا گەلێك بەهێزە. ئەگەر پڕبەپڕ كاری جیددی تێدا بكەین و ئەركەكانمان بە باشی جێبەجێبكەین، دەتوانین بۆشاییەكی وا بەجێ نەهێڵین كە جەرەیانی دیكە پڕی بكەنەوە. لە هەرحاڵدا پێموایە كوردستانی ئێران دەبێتە كۆمەڵگایەكی فرەحزبی و دەتوانێ ململانێی شارستانییانە تێیدا گەشە بكات و سەرئەنجام دەسەڵاتیش بۆ بڕیاری جەماوەر بێ.

**حزبی دیموكرات ئەوەی لەدەستداوە بیبێتەوە بەحزبی یەكەم**

**٭ بە چ ڕێگایەك؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لە دوایین كۆنگرەی خۆماندا ڕێگاكانی بە یەكەوە ژیان و هاوكاری و هاوئاهەنگی لەگەڵ هێزە سیاسییەكانی سەر گۆڕەپانی كوردستانمان بە وردی دیاری كردووە. ئەمانە دەتوانن وەها ڕێگایەك بن.

**پشتگیری حەسەن زادە ناكەین دژی هیجری**

**٭ پشتگیری ئەو جیابوونەوەیەی حزبی دیمۆكراتی كوردستان بە ڕێبەرایەتی عەبدوڵڵا حەسەن زادە ئەكەن ئێوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە لە جەرەیانی ئەم جیابوونەوەیاندا بە تەواوی بێ لایەن بووین و ئەگەر قسەیەكیشمان لە جێگایەك كردبێ بۆ ئەوە بووە كە جیابوونەوەكەیان یان ڕوو نەدات، یان ئەگەر چارە هەڵنەگرە بە شێوەیەكی دۆستانە و شارستانییانە بەڕێوە بچێ.

**٭ بۆ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بەهۆی ئەوەی كە ئێمە ئەم هەڵوێست و شێوە كارە بۆ بردنە سەری فەرهەنگی سیاسی و حزبی و ململانێی شارستانییانە لە كۆمەڵگای كوردستان بە گونجاو دەزانین. ئەگەر كێشە سیاسییەكان لە بارنەچن و لە ڕەوتێكی ئاساییدا خۆیان دەرخەن، وشیاری سیاسی گشتی لە كوردستان گەشە دەكات و ئەوە بە قازانجی ڕەوتی ڕادیكاڵ و سۆسیالیستە.

**٭ ئێستاش لە مەیدانی سیاسەتدا بۆ ناتانهەوێ زەعیفیان بكەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ململانێی سیاسی، ڕەخنەگرتن و ڕۆشنگەری، ڕێگای ئوسوڵی خۆی هەیە و دەتوانێ زەعیفیان بكات. پیلان و كاری ژێر بە ژێر ڕێگە بە جێگەیەك نابات.

**٭ كام لایان بە لای ئێوە باشترە، مەرغوبترەو دۆستایەتیتان زیاترە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** تا ئەوكاتە جێگا و شوێنی هەردوو لایان بە لای ئێمەوە وەكو یەك وایە. لەگەڵ هەردووك لایان پێوەندیمان هەیە و ئامادەیی خۆمان بۆ هاوكاری لەسەربنەمای سیاسەتێكی دیاریكراوی پەسەند كراو، دەربڕیوە.

**٭ لە دوایین لێدوانی سەلاح مۆهتەدیدا سەبارەت بە وەزعی كوردستانی ئێران ئەڵێ "ساغكردنەوەی كۆمەڵەی زەحمەتكێشان قازانجی كوردی تێدا بوو، ئەو قازانجە چی بوو كە كورد كردی لە ساغكردنەوەی كۆمەڵەی زەحمەتكێشاندا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** سەیرە کە ئێستا و دوای (٨) ساڵ و دوای ئەوەی کە ئەو هەموو راستییە سەبارەت بەم جیابوونەوە و ناکامەکانی دەرکەوتووە هێشتا کەسێك پەیدا بێ کە وەها قەزاوەتێك بکات، خۆ ئەوان ئەو بەشەی خۆشیان کە جیایان کردبۆوە، نەك ساغ نەکردەوە، تێکیان دا.

**سەلاحی موهتەدی دژی سۆسیالیزمە**

*** کەواتە کاك سەلاح موهتەدی مەبەستی لەوە چییە و رۆڵی ئەو چیە لەو مەسەلەیەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کاك سەلاح موهتەدی مۆخالیفی بەرنامە و ستراتیژی سۆسیالیستییە و هەوڵدەدات لە هەر رێگایەکەوە بۆی بکرێ دژی ئەو رێبازە کار بکات. بە لای ئەوەوە دوور کەوتنەوەی کۆمەڵە لە رێبازی سۆسیالیستی خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنە.

*** لە تازەترین لێدوانی مۆهتەدیدا ئەڵێ "حزبی کۆمۆنیست گۆڕێکی بە کۆمەڵە بۆ کۆمەڵە، واتە هێشتاکانە کە ئەوان، ئەو و چەند کەسی تر و کە رۆیشتنە دەرەوە لە حزبی کۆمۆنیست بۆچی ئەم لێدوانانە لەسەرحزبی کۆمۆنیست ئەدەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان باش دەزانن کە مادام حزبی کۆمۆنیستی ئێران لە ساحەکەدا مابێ، کۆمەڵەیەکی کۆمۆنیست لە ناویدا، رێگا نادا کە رێبازەکەی چەواشە بکرێ و حەرەکەتی راست رەوانە و ناسیۆنالیستی لە کوردستان بە ناوی کۆمەڵەوە جێ ناکەوێ.

*** دەگرێ یانی پێدا چوونەوەیەك هەبێ لە کاری کۆمەڵەدا بە کارەکانی خۆدا و ئەو هێرشە ئێعلامیانە کە جاروبار لە سایتە ئینتەرنێتییەکان بەردەوام لەسەریەك و تا گەیشتووەتە زۆر جار جنێو و شتی تر رابوەستێندرێ و وەکو تۆ وتت چەند دانیشتنتان کردووە لەم بارەیەوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە پەرەپێدەری ئەم چەشنە شەڕە ئێعلامییانەی کە لەسەرتۆڕی ئینتەرنێت بەڕێوە دەچێ نابین. بەردەوام لە ناو ریزەکانی خۆشماندا بۆ ئەو کەسانەی وا بە ئیبتکاری شەخسی خۆیان قەڵەم بە دەستەوە دەگرن هەر تەوسیەمان ئەوە بووە کە نەچنە ئەم مەیدانەوە. لەسەرئەم مەسەلەیە دانیشتنمان لەگەڵ کەس نەبوو، ئەوەی لە شوێنێکی ئەو گوفت و گۆیانەدا باس کرا پێوەندی هەیە بە پێشگرتن بە ئاڵۆزی لە نێوان ئێمە و ئەواندا لە کوردستانی عێراق کە هێزەکانمان لە یەك نزیکن و مەقەراتمان دراوسێی یەکترن.

**لەهەشتاکانەوە لەگەڵ موجاهدین دانەنیشتوین**

*** لە ئێستادا پەیوەندیتان لەگەڵمۆجاهێدینی خەڵك تازەترین پەیوەندیتان چۆنە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ رێکخراوی مۆجاهیدینی خەڵك نییە و لە رابردوویەکی دووردا و لە سەرەتای ساڵەکانی هەشتادا جارێك هەینەتێکی ئێمە چاوپێکەوتنێکی رەسمی لەگەڵیان بووە و لەو کاتەوە تا ئێستا هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵیان نەبووە.

*** تا لە چەند لەگەڵئەو بۆچونەی کە مۆجاهیدینی خەڵك لە راپەرینی (١٩٩١)دا دژی خەڵکی کوردستان بووە و خەڵکی قەتڵ و عام کردووە، لە کاتێکدا لە تازترین لێدوانیا یەکێك لە بەرپرسەکان ئەڵێ مۆجاهیدین قەتل و عامی کوردی نەکردووە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** واقعیەت ئەوەیە لە کاتی راپەرینی ساڵی (١٩٩١) ئەوان لایان وابوو کە لەگەڵ

پێشرەوی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستانی عێراق بەرەو جنووبی کوردستان وئۆستانی دیالە مەوقعیەتی ئەوان دەکەوێتە مەترسییەوە و بڕیاریان دابوو بەرامبەر بە پێشرەوی ئەم هێزە مۆقاومەت بکەن. لە جەرەیانی شەڕەکانی ئەو کاتیشدا بێ گومان ژمارەیەك لە خەڵکی ئاسایی گیانیان بەخت کرد. بەڵام ئێمە لە جەرەیاندا بووین کە لە هەر دوولاوە هەوڵدرا بۆ ئەوەی کێشەکە قووڵ نەبێتەوە و لە لایەن هێزەکانی یەکێتی نیشتمانییەوە بەڵێنی درا کە هەڕەشەیەك بۆ سەر ئەوان لە گۆڕێدا نییە و لە لایەن مۆجاهیدینیشەوە بەڵێنی درا کە شەڕەکە بوەستێندرێ و ئەوەش بەرێوە چوو.

***چەندجار لەگەڵ مەسعود رەجەوی دانیشتووی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** من لەگەڵ مەسعود رەجەوی هیچ دانیشتنێکم نەبووە. بەرپرسی یەکەم هەیئەتی ئێمە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مەسعود رەجەوی هاورێی گیانبەخت کردوومان دوکتۆر جەعفەر شەفیعی بوو و ئەو دانیشتنە لەساڵی (١٩٨٢) و لە پاریس بەرێوە چوو.

*** نەیویستووە ئەو لە گەڵتان دانیشێ نزیك بێتەوە لێتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە هیچ لایەکمانەوە هەوڵێك لەم بابەتەوە نەدراوە.

***کۆنگرەی (١٣)ی کۆمەڵە بەرێوەیە، چ ئامادەکاریەکتان بۆ کردووە و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بە نیازن بکرێن و ئەو باڵە مۆعتەریزەی لە ناو کۆمەڵەدا پێتوانییە کۆنگرەی (١٣)ی ئەگەرێك بێت بۆ جیابوونەوەی ئەوان، بۆ خیلاق زیاتر و قووڵبوونەوەی کێشەکانتان؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە نیسبەت کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەوە ڕاپۆرتێکی تێر و تەسەل بۆ کۆنگرە ئامادە کراوە کە هەموو لایەنە سیاسییەکانی ئێستای کوردستان و ئێران و ناوچەکەی تێدا لێکدراوەتەوە و سیاسەت و تاکتیکی کۆمەڵە لە وەها هەل و مەرجێکدا لە هەموو بابەتێکەوە جارێکی تر روونکراوەتەوە. ئەم ڕاپۆرتە پێشکەش بە کۆنگرە دەکرێ و باسی لەسەردەکرێ. سەرئەنجام ئەگەر کۆنگرە رای لەسەربوو پەسەند دەکرێ و وەکو بەڵگەنامەیەکی ئەو کۆنگرەیە بڵاو دەکرێتەوە.

بە نیسبەت کێشەکەی نێو خۆمان هەوڵمان ئەوەیە و ئەوە دەبێ لایەنە سیاسییەکانی جیاوازییەکان بەرجەستە بنەوە و خۆیان دەرخەن. هەوڵمان ئەوە دەبێ کە هەموو رێگایەکی ئوسولی بۆ پێکەوە مانەوە و پێکەوە کار کردن تاقی بکەینەوە. خۆ ئەگەر خیلافە سیاسی و ستراتیژی و بەرنامەییەکان بگەنە ئاستێك کە پێکەوە مانەوە ئیمکانی نەبێ لەو سورەتەدا بە هێمنی و دۆستانە ئەم هاورێیانە ئیمکانی ئەوە پەیدا بکەن کە رێبازی خۆیان بە جیا لە ئێمە درێژە پێ بدەن.

**ناکرێت بەناوی فراکیسۆنەوە کاربکەن**

*** ئەگەر ئەوان داوای ئەوە بکەن وەکو فراکسیۆنی جیا لە ناو کۆمەڵەدا کار بکەن ئێوە قبووڵی ئەکەن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوە پەیوەندی بە بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە

هەیە. چونکە بە پێی پەیڕەوی ناوخۆ ئەو ناوەندەیە کە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە لەم بابەتەوە بڕیار بدات. بێگومان لە کۆنگرەی کۆمەڵەشدا ئەو باسە دێتە گۆڕێ و کۆنگرەش بۆچوونی خۆی لەم بابەتەوە دەردەبڕێ.

*** خاڵی جەوهەری ئەوانە ئەوەیە کە ئەبێ شتێك ئەمێنێ بە ناوی حزبی کۆمۆنیست و بە ناوی کۆمەڵەوە کار بکرێ با چەپیش بێ با مارکسیش بێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەتازەترین نووسراوە و لێدوانەکانیاندا دەر دەکەوێ کە جیاوازییەکانیان لەوە ئەولاترە. ئەوان دەڵێن "نەك هەر لەگەڵ چوارچێوەی حزبی کۆمۆنیست، بەڵکو لەگەڵ هەموو بەرنامە و ستراتیژ و سیاسەت و تاکتیکی ئەو حزبە خۆیان بە ناتەبا دەزانن. هەوڵی ئێمە ئەوەیە ئەو جۆرەی کە خۆیان دەڵێن ئەم جیاوازییانە لە ناوەرۆکدا و بە ڕۆشنی ڕابگەیەنن. ئەوە بە نیسبەت هەڵوێستی ڕابردوویان کە دەیانگوت تەنها کێشەیان لەگەڵ ناو و قالبی حزبی کۆمۆنیستە، هەنگاوێکی بەرەوپێشە لە پێناوی روونکردنەوەی واقعیەتی ناکۆکییەکان.

*** بەس لە ئەوەندەدا نامێنێتەوە، ئەوان داوای ئەوە ئەکەن کە لانیکەم بیر و بۆچوونەکانیان بە نەزەری ئیعتیبار وەربگیرێ، وەکو فراکسیۆنێکیش و جیا کار بکەن لە ناو کۆمەڵەدا بە خاتری ئەوەی کە ئینشعابێك روو نەدا؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوان بە پێی پەیرەوی ناوخۆی حزب ماق ئەوەیان هەیە کە بیر و بۆچوونەکانی خۆیان بە ئاگاداری هەموو ئەندامانی ڕێکخراوی کوردستانی حزب بگەیەنن. ئێمە دەڵێین نەك بە ئاگاداری هەموو ئەندامانی کۆمەڵەی بگەیەنن بەڵکوو با لە هەموو حزبیشدا بڵاوی بکەنەوە، با لە ڕاگەیەنە گشتییەکانی کۆمەڵە و حزب وەکو ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و گۆڤارەکان بە ئاگاداری هەموو کەسی بگەیەنن.

***کۆنگرەی ١٣ای کۆمەڵە کەی بەڕێوە چوو و باسەکانی چی بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** کۆنگرەی ١٣ای کۆمەڵە لە حەوتووی کۆتایی مانگی حەوتی ساڵی ٢٠٠٨ی زایینی بەڕێوە چوو. ڕاپۆرتی سیاسی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە بوو بە بنەمای باسەکانی ئەو کۆنگرەیە. لەم ڕاپۆرتەدا هەل و مەرجی سیاسی ئێستای ئێران و کوردوستان و هەروەها هەڵوێست و سیاسەتی کۆمەڵە لە سەر کێشە گرینگەکانی کوردستانی ئێران و سەرجەم ناوچەکە باس کرابوو. سیاسەتی کۆمەڵە بەرامبەر بە پەیوەندی لەگەڵ حزبە سیاسییەکانی کوردوستان، پرەنسیپەکانی هاوکاری کردن لەگەڵیان، مەسەلەی کاری عەلەنی و قانونی، خەباتی چەکداری و هەل و مەرجی ئێستای و ئاسۆی داهاتووی ئەو شێوەیە لە خەبات و گەلێك بابەتی دیکە. هەڵوێستەکان بە نیسبەت کۆنگرەی پێشوو نەگۆڕابوون، بەڵام لێکدانەوەکان بە پێی ئەو فاکتۆرە تازانەی کە هاتبوونە گۆڕێ، نوێ کرابوونەوە. هەروەها قسە و باسی زۆر لە سەر ئۆپۆزسیۆنی ناوخۆمان کرا و ناوەرۆکی پلاتفۆرمەکەیان لێکۆڵینەوەی لە سەر کرا.

ئەو کۆنگرەیە هاوکات لە دوو شوێن لە وڵاتی سوید لە شاری ستکهۆڵم و لێرە لە زرگوێز بەڕێوە چوو کە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بە یەکەوە ڕەبت کرابوون. قسە و باسەکانی ئەو کۆنگرەیە بەو بەشەشەوە کە پەیوەندی بە ناکۆکییەکانی ناوخۆمانەوە بوو، لە تەلەویزیۆنی کۆمەڵەوە بڵاو بوونەوە. ڕاپۆرت و پەسەند کراوەکانیشی لە ژمارەی دووی گۆڤاری "بەرەو سۆسیالیزم" لە چاپ دراوە.

**فراکسیۆن شکستی هێنا**

***کێشەکانی "فراکسیۆنی هەڵسوڕان بە ناوی کۆمەڵە" لەم کۆنگرەیەدا چۆن تەرح کران؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەو فراکسیۆنە ماوەیەکی کورت پێش کۆنگرە ڕاگەیەندرابوو. ئەو هاوڕێیانە(٢) کەسیان وەکوو نوێنەر لە کۆنگرەدا بەشدار بوون. کۆنگرە قسە و باس لە سەر ناوەرۆکی پلاتفۆرمی ئەو هاوڕێیانەی هێنایە دەستووری و فۆرسەتی پێدان کە بەرگری لێ بکەن. بەرگری ئەوان نەیتوانی زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرە بە قەناعەت بگەیەنێ و هەم لەگەڵ ناوەکەی و هەم لەگەڵ ناوەرۆکەکەی دژایەتی کرا و لە کۆتاییدا بڕیارنامەیەك پەسەند کرا کە کۆبەندی باسەکانی زۆرینەی کۆنگرە بوون. لەم کۆنگرەیەدا ئەگەرچی زۆربەی نزیك بە تەواوی ئەندامانی کۆنگرە مۆخالفی ئەو فراکسیۆنە بوون بەڵام چوونکە بە پێی پەیڕەوی ناوخۆ بڕیاری نیهایی لە سەر ئەو کێشەیە دەکەوتە سەر ئەستۆی کۆمیتەی ناوەندی حزب، ئەو باسانەش هەر بەو بڕیار نامەیەی کە باسم کرد کۆتایی پێ هات.

***فاکتەرەکانی ڕاگەیاندنی فراکسیۆن و ڕەت کردنەوەی حزبی کۆمۆنیست چی بوون؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ناکۆکی ئەو هاوڕێیانەی کە "فراکسیۆنی فەعالیەت بە ناوی کۆمەڵە"یان ڕاگەیاندبوو دەگەڕێتەوە بۆ دەورەی جیابوونەوەی ڕێکخراوی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران لە ساڵی ٢٠٠١. ئەوکات ئەو هاوڕێیانە بەرامبەر بە کێشەکانی ئەو سەردەمی ناو کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێران هەڵوێستێکی بەینابەینییان هەبوو. ئەوانیش ڕایان ئەوە بوو

کە کۆمەڵە لە چوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا نەمێنێ، بەڵام ئەوکات هەرکامەیان بە هۆکاری تایبەتی، سیاسی و فیکری یان شەخسی، لەگەڵ ئەو رەوتە ئەرۆیشتن و مانەوەیان لە ناو لایەنی ئێمەدا پێ باشتر بوو. بۆ ماوەی چەند ساڵ ئەوان هەر لە سەر ئەوە پێداگرییان دەکرد کە کێشەکەیان تەنیا لە سەر چوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانە و لەگەڵ ناوەرۆکی ئیدئۆلۆژی و بەرنامە و ستراتێژی ئەو حزبە ناکۆکییان نییە. بەڵام ئەگەر کێشەکە هەر ئەوە بووایە، ئەوان هەر مۆلاحزەیەکیان لەسەر چوارچێوەی رێکخراوەیی حزب هەبووایە، بە پێی ئەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری ئەندامان لەسەر چالاکی لەو چوارچێوەیەدا تەوافوقیان هەیە، دەیانتوانی وەکوو کەمایەتیەک بمێننەوە و هەوڵ بدەن لە رێگەی مێکانیزمەکانی ئاسایی ناو حزب هاوفیکر بۆخۆیان پەیدا بکەن و بۆ ئەو ئامانجەی دیارییان کردووە رۆژێك لە رۆژان ببن بە زۆرینە و چوارچێوەی فەعالیەتی ئەم رێکخراوەیە بگۆڕن. بەڵام واقعیەت ئەوەیە کە خیلافەکان لەوە ئەولاتر بوون و سەرئەنجام هەروەك باسم کرد ماوەیەکی کورت پێش کۆنگرە ئەو خیلافانەی خۆیان لەگەڵ حزب راگەیاند. لەو پلاتفۆرمەدا نووسیویانە کە ئەوان نەك هەر چوارچێوەی حزبی کۆمۆنیستی ئێران بەڵکوو سەرجەم بەرنامە و سیاسەت و رێبازی کۆمەڵەش لە روانگەی ئەوانەوە پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە. ئەوەش بەو واتایە بوو کە کێشەکەی ئەوان لە چوارچێوەی فراکسیۆنێکی ناوخۆیی کە لەمەڕ ئەم یا ئەو سیاسەت یان خاڵی دیاریکراوی بەرنامەیی مۆلاحزەیان هەبێ، واوەترە.

دواجار کۆمیتەی ناوەندی حزب ئەو فراکسیۆنەی بە رەسمی نەناسیو رایگەیاند کە لە حاڵێکدا هەموو رێکخراوی ئێمە لە کوردستان بە ناوی کۆمەڵەوە کار دەکات، "فراکسیۆنی فەعالیەت بە ناوی کۆمەڵە" ناتوانێ مانایەکی هەبێ. هەروەها چوونکە ناکۆکییەکە گەلێك لە ناو واوەترە و سەرجەم رێبازی سیاسی و ستراتژیکی ئێمە دەگرێتەوە، وەکوو فراکسیۆنیش بە رەسمی ناناسرێ. ئەوان بە پێی پەیرەوی ناوخۆ مافی ئەوەیان پێ دراوە کە وەکوو کەمایەتییەکی فیکری و سیاسی بەکەڵك وەرگرتن لە میکانیزمەکانی ئاسایی ناو حزب و ناو کۆمەڵە، هەوڵی ئەوە بدەن ئەندامانی تر لەگەڵ خۆیان هاودەنگ بکەن و وەکوو هەموان مافی ئەوەیان دەبێ کە لە رادیۆ و لە تەلەفزیۆن و لە گۆڤارەکانی کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیستی ئێراندا، راوبۆچوونەکانی خۆیان نەك هەر بە ئاگاداری ئەندامان بەڵکوو بە ئاگاداری خەڵکیش بگەیەنن. ئەو هاورێیانە ئەو هەڵوێستەی کۆمیتەی ناوەندی حزبیان رەت کردەوە و هەر بۆیە چارەنووسی کێشەکە تا ئەوکاتەی کە ئەو گوفتوگۆیە دەکەین بە نادیاری ماوەتەوە.

**یەکێتی بێ لایەنە لەکێشەکاندا**

***پەیوەندی فراکسیۆن بە لایەنەکانی تری جیابووەوەی کۆمەڵە چۆنە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئێمە ئاگاداری ئەو پێوەندییانە نین، ئەو لایەنانە خۆیان چاوەرێ دەکەن کە ئەم رەوتەی ناو ئێمە سەرئەنجام لەگەڵ یەك لەوانە رێك بکەون. بەردەوام لە تەبلیغاتی ئاشکرایاندا بانگەوازی بۆ دەکەن و هانیان دەدەن کە بە ئەوان پەیوەست بن.

*** هەڵوێستی یەکێتی نیشتمانی بەرانبەر بە کێشەکانی باڵی فراکسیۆن چی بوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکێتی نیشتمانی بە رەسمی بە ئێمەیان ڕاگەیاندوە کە لایەنگری لە هیچ جیابوونەوەیەك لەناو ئێمەدا ناکەن و بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان هاندەری جیابوونەوە نابن.

**فوئاد چۆن شەهید کرا**

*** هەر چەندە دەبوو پێشتر ئەمە بڵێن ئەگەر بەکورتی باسێکی شەهید بوونی کاك "فوئاد"م بۆ بکەی، لە رووی مێژووییەوە ئەو شەهید بوونەی کاك فواد چۆن بوو و چ تەئسیرێکی نێگەتیفی دانا لەسەرکۆمەڵە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** (٢٨)ی گەلاوێژی ساڵی( ١٣٥٨)ی هەتاوی خۆمەینی فەرمانی هێرشی بۆ سەر کوردستان دەرکرد. کۆمەڵە بەرامبەر بەم هێرشە بڕیاری مۆقاوەمەتی دا و لەڕاگەیاندنێکدا لە ژێر ناوی "گەلی کورد لە کوانوی تاقیکردنەوەدا"، داوای لە خەڵکی کوردستان کرد بە هەر شێوەیەك کە دەتوانن، بە چەك، بە مشت، بە دار و بەرد، کوردستان لە ژێر پێی هێرشی هێزی داگیرکەردا بکەن بە یەکپارچە ئاور.

سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەوکات زۆربەیان لە شاری بانە کۆببوونەوە، بۆ دارشتنی پلانی مۆقاوەمەت و وتووێژ لە ناو کۆمەڵە و لایەنە سیاسییەکانی دیکەشدا بۆ پێکهێنانی هاوئاهەنگی. کاك فوئاد لە لایەن کۆمەڵەوە لەوتووێژەکاندا بەشداربوو. هەروەها خەریکی رێکخستنی هێزی رێکخراوە دیموکراتیکەکانی کوردستان بوو کە لەسەربڕیاری کۆمەڵە پێکهاتبوون و هەوڵیدەدا ئامادەیان بکات، بۆ ئەوەی پێ بنێنە ناو قۆناغێکی نوێوە. لە گەرمەی ئەم ئیش و کارانەدا بوو کە رۆژی ٣ی خەرمانان هەواڵی تیرباران کرانی بەندکراوەکانی پادگانی مەریوان کە دوویان واتە "حسێن و ئەمین" براکانی کاك فوئاد بوون، بە کاك فواد دەگات. کاك فوئاد پێیوادەبێ کە دوای ئەم رووداوە لەوانەیە شپرزی و بێ بەرنامەیی بکەوێتە ناو ریزەکانی کۆمەڵە لە مەریوان. داوا دەکات کە خۆی بۆ رێکوپێك کردنی کارەکان سەردانێکی ناوچەی مەریوان بکاتەوە. هاورێیانی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە ئەوانەی ئەوکات لەشاری بانە بوون لە سەرەتاوە موافقەتی ناکەن، دواجار بەهۆی پێداگرتنی کاك فوئاد بە نابەدڵی موافقەتی دەکەن.

کاك فوئاد هاورێ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانی کە کاك "برایم جەلال" بەرپرسیان بوو بەرەو مەریوان رێدەکەوێت و دوای ئەوەی خۆی دەگەیەنێتە ئەو بەشە لە هاورێیانی کۆمەڵە کەلەشاری مەریوان هاتبوونەدەرێ لە دێهاتەکانی دەوروبەری شار، بە ورەیەکی بەرزەوە رێکیان دەخاتەوە و پلانیان بۆ دادەرێژێ. کاك فواد دوای جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی بەرەو شاری بانە دەگەرێتەوە. لە گەرانەوەدا کاك برایم جەلال و شێخ عوسمانی خالیدی و ناسیح خالیدی و تەهمورس ئەکبەری کە ئەندامی رێکخراوی چریکە فیداییەکان بوو لەگەڵی دەبن. لەنێوان ئاواییەکانی کانیعەمەت و بستام کە لە ناوچەی سەرشیوی سەقز هەڵکەوتووە، لەگەڵ ژمارەیەك لەهێزەکانی رژێم دەرگیردەبن و دواجاریش کۆپتەری رژێم دەگاتە سەریان و لەشەرێکی دەستەویەخەدا کاك فوئاد و تەهمورس گیانیان بەختدەکەن و کەسانی دیکەی کاروانەکەشیان دەرباز دەبن. هەواڵی گیانبەختکردنی کاك فوئاد بەخێرایی لەهەموو ئێران دەنگیدایەوە و بەشی هەواڵی سەعاتی (٢)ی دوانیوەرۆ رادیۆ تاران بە خۆشحاڵییەوە و وەکو رووداوێکی گرنگ ئەو

هەواڵە دڵتەزێنەی راگەیاند و لەکاتێکدا کە من خۆم لە نزیک پردی "بریسوێ" لەسەر رێگای سەردەشت بۆ رەبەت لەگەڵ گۆمەڵێک لە هاورێیانی پێشمەرگە بووم، ئەو هەواڵەم لە رادیۆی تارانەوە بیست. بۆ ماوەی سەعاتێک هەر لەسەرجادە دانیشتم و نەمدەتوانی یەک هەنگاو رێگا ببڕم.

ئەو کارەساتە لەیەکەم ساتەکانی خۆیدا دەروونی هەموو هاورێیانی کۆمەڵەی شێواند. گەلێک بیرۆکەی تاڵ دەهاتە مێشکمانەوە. داخوا دوای کاک فوئاد ئەتوانین ئەو رێگا سەختەی کەلەبەرمان بوو بیبڕین؟ بەڵام کاک فوئاد خۆی فێری کردبووین چلۆن لەوەها ساتەوەختێکدا ورەبەرنەدەین و رێگا و رێبازی خۆمان وون نەکەین. تەشکیلاتی ئێمە دوای ئەو رووداوە زۆر زوو توانی خۆی بگرێتەوە و دەوری مێژوویی خۆی لەبەرێوەبردنی موقاوەمەتێکی جەماوەری دا کە کەوتبووە رێ ببینێ.

**★ ئێمە خەریکی دیدارێکی دوورودرێژ بووین لە ماوەی زیاتر لەسێ ساڵی(٢٠٠٦-٢٠٠٩) رابردوودا، یا پێش ئەوەی قسەی تایبەتی تری خۆت بکەی، من هەندێک پرسیاری زۆر تایبەتت لێئەکەم، ئەگەر پێم بڵێی کتێبێک کە زۆر گرنگە لە ژیانتدا خوێندووتەوە و ئەهەمیەتی لات مابێتەوە چییە ئەو کتێبە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** وەکو رۆمان کتێبی "دایک"ی نووسراوی ماکسیم گۆرکی و هاوکاتیش کتێبێک بە ناوی "سەرەتاکانی فەلسەفە" لەنوسینی ژۆرژ پولیتزێر کە کۆمۆنیستێکی فەرانسەوی بوو و نازییەکان ئێعدامیان کرد، ئەم دوو کتێبە بیری سیاسی سەرەتایی منیان شکڵ پێدا.

**شیعرم نەنوسیوە**

**★ تا ئێستا هیچ شیعرت نوسیوە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** نەخێر. بەڵام زۆر حەز بەشیعر دەکەم.

**★ چ شاعیرێکت زۆر پێخۆشە؟ لە کوردو لە فارس؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە شاعیرانی فارس زمان "ئەحمەد شاملوو" و لە شاعیرانی کورد زمانیش "نالی".

**★ خۆشترین رووداوی ژیانت چی بوو؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** ئەوکاتە بوو لە پاییزی (١٣٥٢)ی هەتاویدا کە زانیم ماوەیەکە بە بێ ئەوەی کە خۆم ئاگاداربم لەگەڵ رێکخراوێکی سیاسی فەعالیەت دەکەم و دوو هاورێی ئەوکاتم کە یەکیان هاورێ گیانبەخت کردوو کاک "حەمە حسێن کەریمی" بوو پێیانگوتم کە وەکو ئەندامی ئەو رێکخراوە وەر دەگیرێم. ئەو رۆژەی کە ئەو هەواڵەیان پێ ڕاگەیاندم شەوەکەی تا رۆژ لە کوچە و کۆڵانەکانی شاری میاندواو بێ مەبەست دەخولامەوە و لە خۆشیان پێم عەرزی نەدەگرت.

**مانگانە(٣٠) دۆلار وەردەگرم**

**★داهات و سامانی شەخسی خۆت چییە و بەرێ چوونت چۆن دابین دەبێ؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لەزرگوێز ماڵێکم هەیە کە بۆ ژیانی من موناسبە. تا کاتێک لە زرگوێز بم وەکوو هەموو

دانیشتووانی ئێره ژیانمان بە یەکسان لە لایەن تەشکیلاتەوە دابین دەبێ و مانگانەش نزیکەی (٢٠)دۆلار وەکوو پارەمەتی نەقدی وەر دەگرم. کاتێکیش دەچم بۆ دەرەوەی وڵات بە پێی بەرنامەی سەفەرەکەم و بە پێی ستانداردێکی جێکەوتوو تەشکیلات خەرجەکەی دابین دەکات و خاوەنی هیچ سامانێکی تایبەتی نیم و پارەی حزب و کۆمەڵەش لای من نییە.

***بیستوومە دەڵێن کە سەفەر دەکەی لە ناو شەمەندەفەردا دەخەوی تا پارەی ئۆتێل نەدەی؟**

**ئیبراهیم علیزادە:** کۆمەڵە دریغی نەکردووە لەوەی هەموو پێداویستییەکانی سەفەر و هات و چوونی من دابین بکات. بە هەڵکەوت جاری واش هەبووە کە وابووە. دەزانی کە ئێستا قەتارەکان لە ئەورووپا زۆر مۆدێرن و ئاسوودەن و جێگەی خەوی رێك و پێکیان تێدا هەیە، ئەگەر هات و مەوعیدێکم بوو بۆ بەیانییەك لە شوێنێك، چ ئیشکالی هەیە لە جیاتی خەرجێکی زیادی بۆ ئوتێل شەوەکەی بە یەکێك لەو قەتارانە رێبکەوم و بەیانی بگەمە شوێنی مەوعیدەکە و دواجاریش هەر بەم شێوە بگەڕێمەوە؟ ئەوە هەر بە تەنها من نیم هاورێیانی دیکەشم کاتێك قەرارە تەشکیلات خەرجی سەفەریان بدات هەر کامە بە شێوەیەك دەستی پێوە دەگرن.

**مردنی فوئاد زۆر ناخۆشبوو**

*** ناخۆشترین رووداوی ژیانت؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بیستنی هەواڵی مەرگی کاك فواد

**سێجار زۆر گریام**

*** لە بیرت دێ چەند جار گریاوی؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** رەنگە زۆر جار ئەوە روویدابێت. بەڵام سێ جاریانم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. یەکیان کاتێك بوو کە دایکم فەوتی کرد. ئەویتریان کاتێك بوو کە هەواڵی هاورێیەکی شەخسی نزیکی خۆم بە ناوی خالید فەرهاد زادە ناسراو بە "وەستا عەولا"م بیست. سێهەمیان جارێك بوو کە لە تەبریز شۆفێرێکی تاکسی لەکاتێکدا کە ژنێکی نەخۆشی هیلاکم دەگواستەوە بۆ لای دکتۆر و شۆفێرەکە بە بیانوویەکی پڕ و پوچ (٥٠) میتر پێش ئەوەی بگەینە مەکتەبی دوکتورەکە دایبەزاندین و من و ژنە نەخۆشەکە هەردووکمان نازارێکی زۆرمان بەو پەنجا میترەوە دیت کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە و لەداخی ئەوەی کەچۆن مومکینە ئینسانێك تا ئەو رادەیە دڵرەق بێ، تێر گریام.

*** لەوەتای لە کوردستانی ئێران هاتوویتە دەرەوە تا ئێستا چوویتەوە ناوخۆ بەکاری چالاکی پێشمەرگانە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** لە پاییزی ساڵی (١٩٨٢)وە تائێستا بە هیچ شێوەیەك نەچوومەتەوە ناوەوەی کوردستانی ئێران.

**خەون بەوەوە دەبینم بچینەوە ناو کوردستانی ئێران**

*** ئەتەوێ بچیتەوە یان ناوێری، یان ناهێڵن؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** یەکێك لەخەون و ئاواتەکانمە، بەڵام رێگام پێنادرێ.

* ئەگەر برادەرانت ڕێکمیاندەی لەگەڵیان لەیەك بکەی‌وتۆیان ئیختیارگرد ئەم جەولەیە تۆ دەستنیشانی کەی، یەکەم شوێن ئەچیتە کوێ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: شاری مەهاباد و ئەو گەڕەکەی کە تێیدا گەورە بووم.

* بۆ؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بیرەوەرییەکانی دەورانی شیرینی منداڵی و نەوجەوانیم بۆ زیندوو دەکاتەوە.

* ئەی ناترسی دەستگیر بکرێی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: هەر ئەو ترسەیە کە ڕێگام پێنادات و ڕێگام پێنادەن.

* لە مردن ئەترسی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ترس لە مردن هەستێکی تەبیعییە. بەڵام نەك ئەو ترسەی کە هەموو ڕۆژێك جارێك بتمرێنێ، من ترسی لەو چەشنەم لە مردن نییە.

دوای مردنم گرنگ نییە تەرمەکەم چی بەسەردێ

* ئەگەر مردی ئەتەوێ لە کوێ بتنێژن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بە لامەوە گرنگ نییە لە چ شوێنێك بمنێژن یان تەرمەکەم چی بە سەر بێ.

* پێش ئەوەی بمری دوایین ئامانج و هیوایەت وئاواتت چیە بێتەدی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: تەبعەن سەرکەوتنی ئەو ڕێبازەی کە گرتوومەتە بەر. پێمخۆشە ئاواتەکانم تا خۆم ماوم بێنە دی.

* خەون بە چیەوە ئەبینی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: خۆشەویستی.

* خۆشەویستی چی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: خۆشەویستی ئینسانی، ئەوانەی خۆشمویستوون و خۆشم دەوێن.

* ئەگەر لەسەرئەم دیدارە کەماوەی سێ ساڵ زیاترە قسە ئەکەین ئەگەر شتێکت لە بیرچووە پێم بڵێ و ئەگەر رایەکت هەیە پێم بڵێ، پێم بڵێ چۆن رازیبووی دیدارێکی ئاوابکەی و بەشێکی زۆر لەو قسە و باسانە کە دەردی دڵی خۆتە، کە مێژووی شۆڕشگێڕانەی حەرەکەتێکە ئەوتراوە و رەنگە تووشی موناقشە و دیالۆگ و وەڵامدانەوەیەك بێ، هەرچیت هەیە لەسەرئەم بەحسە پێمخۆشە پێم بڵێی؟

ئیبراهیم عەلیزادە: دیارە بێگومان قسە زۆر ماوە سەبارەت بە مێژووی سێ دەیەی ڕابردووی کوردستان وکۆمەڵە بکرێ. بەڵام هەر ئەوەندەش کە لە دوو توێی پرسیار و وەڵامەکاندا هاتووە خۆی شتێکی باشە و دەتوانێ لە جێگای خۆی پارمەتی دەر بێ بۆ کەسانێك کە لەم بابەتەوە کاری لێکۆڵینەوە دەکەن. پرسیارەکانی ئێوە ورد و سەرنج ڕاکێش بوون، کارێکی جوان بوو، بەش بە حاڵی خۆم دەستخۆشیتان لێدەکەم. بۆ منیش مەجالێك بوو بۆ ئەوەی ئێستاکە بۆم ناکرێ بە

نوسراوەی تێر و تەسەل باس لەسەرئەو بابەتانە بکەم کە ئێوە هێناتانە گۆڕێ، لانیکەم لەدووتۆی پرسیار و وەڵامدا، روونکردنەوەیان لەسەربدەم. ئەگەر رۆژێك لە رۆژان ئەو گفتوگۆیانە بلاوبوونەوە، من هەر لە ئێستاوە داوای لێبوردن لە کەسانێك دەکەم ئەگەر لە جێگەی خۆیدا پێویست بووە ناویان بێت و بە هۆی فرامۆشکاری من ناویان نەهاتوە وە یان هەڵەیەك لەوبابەتەوە رووی دابێ، نامەوێ و نەمویستوە مافی هیچ تێکۆشەرێك لە مێژووی کۆمەڵە، لە مێژووی کوردستان دا بە ئانقەست پێ شێل بکرێ.

* چۆن رێگەتدا بە دیدارێکی ئاوا، چۆن رەزامەندیت نیشاندا؟

**ئیبراهیم عەلیزادە:** گفتوگۆکردن بۆ من ئاسانترە لە بابەت نووسین. گەلێك لەو بیرەوەرییانە پێویستە کە بە شێوەی جۆراوجۆر تۆمار بکرێن. لام وابوو کە ئەمە رێگایەکە کە ژانەسەری کەمترە و تارادەیەك بۆشاییەکیش پڕدەکاتەوە. ئێوەش دۆست و هاورێ بەرێزن کە نەدەکرا داواکەتان رەتبکرێتەوە.

عەرزێکی دیکەم نییە و زۆر سپاسی ماندوو بوون و پەیگیری ئێوەش دەکەم و بۆ هەرکارێکیش لە پێناوی کامڵترکردنی ئەم گفتوگۆیەمان پێویست بێ ئامادەم، هەر بەڵگەنامەیەکیش کە پێویست تان بێ و لەبەردەست بێ دەینێمە ئیختیارتان.

بەهمەنی سەعیدی

٢٠٠٩/٢/١٥

# پاشکۆیەك بۆ چاپی دووەم

ئەوپرسیارانەی کەلەم پاشکۆیەدا چاپکراون و وەڵامەکانیان وەرگیراوەتەوە، بەشێکی زۆریان پەیوەستن بەورووداوە گرنگانەی کەپێشتر باسنەکرابوون و وەڵامیان وەرنەگرتۆتەوە، بۆیە بەپێویستمان زانی لەم پاشکۆیەدا چاپیان بکەین و خوێنەریش لێیان ئاگادار بێت

موهتەدی، مودەرسیی و بابە میری لەگەڵ مەنسور، پێشمەرگەکانیان دەناردە دەرەوە

*لەدەورانی ڕۆیشتنی مەنسوری حیکمەت ساڵی ١٩٩١ کادر و پێشمەرگەتان هێندە کەم بوو نەتاندەتوانی بارەگاکانتان بپارێزن هۆکارەکەی چی بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو کۆچە گەورەیەی کە لەم ساڵەدا کرا، هەم هۆکاری سیاسی هەبوو هەم هۆکاری تەشکیلاتی و نێوخۆیی. شەڕی ٨ساڵەی ئێران و عێراق تازە کۆتایی پێهاتبوو. هەمووان بیریان لە ئاکامەکانی کۆتایی ئەو شەڕە بۆ سەر هەلومەرجی کار و ژیانی ئەو بەشە لە ئۆپۆزسیۆنی کۆماری ئیسلامی کە لە عێراق نیشتەجێ بوون، دەکردەوە. لە لایەکەوە بەشوێن شاڵاوەکانی ئەنفالدا هەموو کوردستانی عێراق لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە داگیر کرابوو. مەجالی چالاکی لە شوێنە ئازادەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی نەمابوو. لە لایەکی دیکەوە ئەو مەترسییە پەرە پێدرابوو کە ئێران و عێراق بەم زووانە لەسەر چارەنووسی ئۆپۆزسیۆنەکانیان لە وڵاتەکانی یەکتر پێکدێن و گۆیا ئەندامەکانی ئۆپۆزسیۆنی هەردوولا ئاڵ و گۆڕ پێدەکرێن. لەوکاتەدا کوشت و بڕ و ئێعدامیش لە ئێران بە لوتکەی خۆی گەیشتبوو. ئەو هەواڵانەی کە لە ئێرانەوە دەهاتن ترس و خۆفێکی لەرادەبەدەری لەناو ریزەکانی ئۆپۆزسیۆندا پێکهێنابوو. ئاسۆی خەباتی چەکداری روون نەبوو. بۆ ساڵەها ئەو شێوەیە لە خەبات بە کەڵك وەرگرتن لە سنوورەکانی ئێران و عێراق درێژەی پەیدا کردبوو. بە لەدەست چوونی ئازادی هاتوچۆ لەو سنوورانە چۆنیەتی درێژە پێدانی ئەو خەباتە روون نەبوو.

ئەمانە هۆکاری سیاسی بوون. بۆ هۆکارەکانی ناوخۆییش پێشتر ئاماژەم بۆکردبوو کە هەڵسوکەوتی بەشێك لە رێبەری حیزب و کۆمەڵەش لەگەڵ ئەو هەلومەرجە دیاریکراوە مەسئولانە و ورد بینانە نەبوو. ئەو بەشە لە رێبەری، کۆمیتەی رەهبەری ئەوکاتی کۆمەڵەیان خستە ژێر زەخت بۆ ئەوەی کە بە خێرایی ژمارەیەکی زۆر لە تەشکیلات رەوانەی دەرەوەی وڵات بکات، ئەویش لەکاتێکدا کە مەجالی ئەوکارەی زۆر بەرتەسك بوو. بەم جۆرە مەسەلەیەك بەناوی "ئێعزام" بەواتای بەڕێکردن بۆ دەرەوەیان کرد بە ئامرازێکی زەخت لە جەرگەی کێشە ناوخۆییەکاندا.

*هەر ئەوکات بەبانگەشەی مەنسور. زیاتر لە (١٠٠٠) کادر و پێشمەرگەی ئێوە چوونە دەرەوە، ئەوە تاچەند بۆ ئێوە قورس بوو؟

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو بانگەشەیە تەنیا لەلایەن مەنسووری حیکمەتەوە نەبوو. مەنسووری حیکمەت بناغەی کارەکەی دارشتبوو، بەڵام ئەو حەرەکەتە بەبێ یارمەتی بەشێك لە رەهبەری کۆمەڵە کە ئەوکات لەگەڵی بوون جێ بەجێ نەدەکرا. رەهبەری حیزب بۆ ئەو مەبەستە کۆمیسیۆنێکی لە ئەندامانی موخالیفی ئەوکاتی کۆمیتەی رێبەری کۆمەڵە بۆبەڕێوەبردنی "پڕۆژەی ئێعزام" کە بریتی بوون لە عەبدوڵڵای موهتەدی، ئەبوبەکر مودەڕسی و فاروق بابامیری پێکهێنا کە ئەوکارە بەخێرایی جێبەجێ بکات. دەقی بەیانێکی ناوخۆیی ئەو کۆمسیۆنەتان پێ دەدەم تا ئەوە روون بێتەوە کە پڕۆژەی ناردنە دەرەوەی کادر و ئەندامان و

پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە ساڵانی ۹۰ و ۹۱دا چۆن جێبەجێ بوو.

پێویستە ئەو راستییە دووپات بکەمەوە کە بە بڕوای من لە هەلو مەرجی ئەوکاتدا سووک بار کردنی ئۆردوگاکانی کۆمەڵە لە کوردستانی عێراق زەروورەتێك بوو کە پێویست بوو جێ بە جێ بکرێت. بەڵام، یەکەم بە هۆی ئەوەی کە ئیمکاناتەکە بەرتەسك بوو پێویست بوو زۆر بە وردی و بە شێنەیی پلانی بۆ دابڕێژرێ و بە رێك و پێکی جێبەجێ بکرێ و نەبێتە هەزیمەت. دووهەم، دەکرا لەو ئاستەدا نەبێ و ئەوەندەی کە پێویست بوو بۆ درێژەدان بە تێکۆشان لە رێگەی ئەو ناوچەیەوە، لەوانەی کەخۆیان خوازیاری مانەوە بوون رابگیرێ.

٢٥٠٠ پێشمەرگەی کۆمەڵە چونەتە ئەورووپا

*پێتانوایە چەند هەزار کوردی ئێران و چەند هەزار دۆست و لایەنگر و پێشمەرگەی کۆمەڵە لەئەورووپا و ئەمەریکان؟

ئیبراهیم عەلیزادە: دیاری کردنی ژمارەی وورد لەم بارەوە ئاسان نیە. تەنانەت لە ئاماری رەسمی وڵاتەکانیش دا ئەو کوردانەی کە لە دەرەوەی وڵات دەژین بە پێناسەی ئەو دەوڵەتانەوە ئۆمار کراون کە لێیەوە هاتوون نەك پێناسەی نەتەوەییان. سەرجەم رەقەمێك نزیك بە ٢٠٠٠تا ٢٥٠٠ پێشمەرگەی کۆمەڵە لە ماوەی ٣ دەیەی رابردوودا لە عێراقەوە بەرەو هەندەران رۆیشتوون. بەڵام لە ١٥ ساڵی رابردوودا ژومارەیەکی زۆریش لە لایەنگرانی جەریانی ئێمە لە ئێرانەوە و لە رێگەی جۆراوجۆری دیکەوە خۆیان گەیاندۆتە دەرەوەی وڵات. سەبارەت بە سەرجەم ئەو کەسانەی کە لە کوردستانی ئێرانەوە روویان کردۆتە دەرەوە ئاماری دەقیقم لە بەردەست نیە، بەڵام ژومارەیان زۆر زۆر لەو کەسانەی کە لە کوردستانی عێراقەوە چوون کەمترە.

چەکە قورسەکانمان لەژێرفشاری پۆل بریمەر دایە یەکێتی نیشتمانی کوردستان

*لەکاتی رووخانی بەعس، ئەمەریکا داوای چەکە قورسەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی و ئێوەشیکرد، چیتان لێکردن؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بڕیاری وەرگرتنەوەی چەك لە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی و تەنانەت لە هێزەکانی چەکداری کوردستانی عێراقیش لەلایەن پۆل بریمەر فەرمانداری ئەمریکی ئەوکاتەی عێراق دەرچووبوو وە بە ئێمەش راگەیەندرا. بەڵام کاری بریمەر لە عێراق بەگشتی تووشی گرفتی گەورە بوو وە زۆر زوو پرۆژەی چەك داماڵین لە ئەولەویەت کەوت. ئەوەندەی کە پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە کاتێك هەستمان کرد کە زەختەکە جیدییە، بە مەبەستی پاراستنی چەکە قورسەکان لەوەی کە بکەونە دەست ئەمریکییەکان وە یان دەوڵەتی مەرکەزی عێراق و بۆ ئەوەی زۆر لەخۆمان دوور نەکەونەوە، تەسلیمی یەکێتی نیشتمانیمان کردن. ئەم چەکانە لەچاو تواناییەکانی هێزێکی ئۆپۆزسیۆن ژمارەیان زۆر و تەقەمەنی بەرچاویان لەگەڵ بوو کە بە درێژایی ساڵەها کۆکرابوونەوە.

*ئەوە چەندە راستە کە دوای رووداوەکانی ٣١ی ئاب ١٩٩٦ کە یەکێتی نیشتمانی لە سلێمانی پاشەکشەی کرد، ئێوە بەعزێك شتتان بۆ یەکێتی لای خۆتان پاراست؟

ئیبراهیم عەلیزادە: بەبۆنەی پەیوەندییەکی نزیکەوە کە لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە بوومان ئەوان بەعزێك کەل و پەلیان لە زرگویز لای ئێمە دانا کە گرینگترینیان بریتی بوون لە وەسایلی رادیۆ و تەلەفزیۆنی یەکێتی. دوای گەڕانەوەیان هەمووی وەکوو خۆی تەسلیم بە دەزگای راگەیاندنی یەکێتی کرایەوە، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کەپەیوەندی بەدارایی یەکێتیەوە هەبوو پێیان درایەوە.

***کاردانەوەی پارتی بەرامبەر بەم کارە چی بوو؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: پارتی دەیزانی کە شتی یەکێتی لای ئێمە بە ئەمانەت هەیە، بەڵام لەو ماوەیەدا کە لە سلێمانی بوون زەحتێکیان بۆ ئەو مەبەستە نەخستە سەر ئێمە.

***یەکێتی چەکەکانی پێنەدانەوە؟ بۆچی، داواتان نەکردوە وگوایە چەندین جار داواتان لەکاك کۆسرەت رەسوڵ کرد، بەڵام تائێستا چەکەکانتان وەرنەگرتۆتەوە ئەو چەکانە چین؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: هەروەك وتم، ئەمانە چەکی قورس بوون، واتە سەرووی ئارپیجی٧. ئەو چەکانە هەر لای یەکێتین. ئێمەش بە رەسمی داوامان نەکردووەتەوە. بە لەبەرچاو گرتنی هەل و مەرجی ئێستای عێراق جارێ پێمان باشە هەر لای ئەوان بە ئەمانەت بێ.

**چەك و تەقەمەنی لەحکومەتی هەرێم وەرناگرین**

***چەك و کەلوپەلی سەربازی لەکوێوە دابین دەکەن دەیکڕن یان حکومەتی هەرێم دەتانداتێ، چ وڵاتێك چەکتان دەداتێ؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: چەکە قورسەکانمان هەر ئەوانەن کە لە کۆنەوە هەمانبوو. بەشێکی لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا لە دەوڵەتی عێراق وەرگیرابوون، بەشێکیشیان دەستکەوتی شەڕەکانمان لەگەڵ رژێمی ئێران بوون. لە ئێستاشدا تەقەمەنی بۆ فێرگە و بۆ مانۆڕەکانمان لە بازاری ئازاد دەکڕین. نە لە حکومەتی هەرێم و نە لە هیچ وڵاتێك ئێستا چەك و تەقەمەنی وەرناگرین.

***کەخەباتی چەکداری ناکەن، چەکتان بۆچییە؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە هیچ ئاتەش بەسێکمان لەگەڵ رژێمی کۆماری ئیسلامی رانەگەیاندووە. ئێمە عەمەلیاتی نیزامی خۆمان لەدژی رژێم راگرتووە، کە دەکرێ هۆکارەکانی لەکاتی خۆیدا قسەی لێ بکەین. بەڵام هەرگیز دەست پێکردنەوەیمان لە کات و شوێنی خۆیدا بەشێوە و تاکتیکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی نوێ، لەدەستوور خارج نەکردووە. هەربۆیە فێرگەی پێشمەرگایەتی و هەموو زەرفییەتەکانی خۆمان بۆ ئەو مەبەستە پاراستووە.

***کارگە و دەزگای بەرهەمهێنانتان لەکوردستان و ئێران و ئەوروپا هەیە؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: بەشێکی مەسرەفی کاناڵی تەلەفیزیۆنی کۆمەڵە لەو رێگەیەوە دابین دەبێ.

***لەمانگی پوشپەڕی ١٣٨٨،(٢٠٠٩) کۆمەڵێك هێرش و پەلاماری ئێران درا لەلایەن دیموکرات و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان و هۆکارەکەی چی بوون، ئایا ئەوە بەشێك بوو لەخەباتی چەکداری تازە تۆ پێتباش بوو ئەو کارە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە، بە رای من ئەم رووداوانە بەشێك نەبوون لە ستراتیژێکی روون کە دایان رشتبێ. خۆنیشاندانێکی پراگماتیستی، چاولێکەرانە، کاتی، بە بێ پلان و نەقشەی درێژماوە و بەبێ بیرکردنەوە لە ئیمکانی ئیدامەکارییەکەی بوون.

**خەباتی چەکداری رانەگیراوە'بەبیانووی جیاجیا خەباتی چەکداریتان راگرتوە تاکەی وادەبن، نازانن کەزەرەری زۆرە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: خەباتی چەکداری لەکوردستان، خەباتی کۆمەڵێك مەفرەزەی پارتیزانی جیا لە خەڵك نەبووە. پەیوەندیکی توند و تۆڵی لە گەڵ جەماوەرەوە بووە و هەر کات زەمینە و ئیمکانی هەلگیرسانی و یان دەستپێکردنەوەی لەو روانگەوە برەخسێ، ئێمە خۆی لێنابوێرین. بەڵام با قسەێك لە زەمینە و لە ئیمکان بکەین. زەمینە کاتێك ئامادە دەبێت کە دڵنیا بین لەوەی کە حەرەکەتی چەکداری خزمەت بە هەڵسان و راپەرینی جەماوەری خەڵك دەکات وخەڵك بەگەرموگوڕی پشتیوانی لێدەکەن و بەشداری تێدا دەکەن. لە ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی کاتێك ئێمە دەستمان دایە ئەو شێوەیە لە خەبات، لەماوەی چەند حەوتوودا بە هەزاران کەس چەکیان هەلگرت و هاتنە ریزەکانی حیزبە سیاسیەکانەوە. بە هەزاران کەس هەر لە ماڵی خۆیان چەکیان هەبوو، دەوری هێزی بەرگرییان دەبینی. ئەوە زەروورەتێکی ئەو کات بوو. من ناڵێم کە ئەو ئامادەییە رێك هەر وەك ئەو کات وابێ، جا عەمەلیاتی ئیزامی دەست پێدەکەینەوە، بەڵام پێویستە رادەی ئامادەیی جەماوەرو پێویستی حەرەکەتەکە کەم و زۆر هەر لەو چەشنە بێت کە بۆنموونە ئەو کات بوو. بزووتنەوەی چەکداری لە کوردستانی ئێران ئەگەر چی لەساڵانی دواتردا بەرەبەرە لاواز بوو، بەڵام چەندین ساڵ دەوامی هێناو تا کاتێك کە سنوورەکان لە هەر دوو دیوی ئێران و عێراقیش لە کونترۆڵی هیچ دەوڵەتێکدا نەبوو، ئەوشێوەیە لەخەبات دەیتوانی لە سەر پێی خۆی رابوەستێ. بەڵام بە دوای ئەنفال وگۆرانکاریەکانی عێراق و شەری کوێت و... بەرە بەرە ئەو ئیمکانە نەما. لە لایەکی دیکەوە بەرەبەرە شێوەیکی دیکە لە خەباتی مەدەنی لە شارەکانی کوردستان شکلی گرت. لێرەدا دەبینین کە جێگۆرکێ کراوە، ئەو دەورەی کە پێشتر خەباتی چەکداری دەگێرا لە ساڵانی دواتردا خەباتی مەدەنی لە شارەکان بینی. وەکوو یەکنموونە پێتاندەڵێم ، دوای گیانبەخت کردنی شوانەی قادری بۆ ماوەی یەك مانگ سەرتاسەری کوردستان لە جمو جۆل و حەرەکەت و ئیعتزازدا بوو، کە سەرەئەنجام لە ١٦ی گەلاوێژی ١٣٨٤دا بە مانگرتنی گشتی، گەیشت بە لوتکەی خۆی. هەر لەو ساڵانەدا دەیان مانگرتنی کرێکاری روویاندا، دەیان رێکخراوی مەدەنی کە تەنانەت رژێم رێگاشی پێنەدا بوون پێکهاتن. جم و جۆلێکی ئاشکرا لە هەموو بوارەکان دا کەوتەرێ، لە حاڵێکدا هیچ حەرەکەتێکی چەکداریش لە ئارادا نەبوو. لەو ساڵانەدا زەمینەی کۆمەلایەتی ئەوەندەی کە بۆ خەباتی جەماوەری لە بار بوو، بۆ خەباتی چەکداری وا نەبوو. دەبوایە ئەو بروا بە خۆیە کە لە جەماوەری خەڵکدا شکلی گرتبوو بپارێزرێ و پەرە پێ بدرێت.

وتم زەمینە و ئیمکان، ئێستا با بزانین مانای ئیمکان چییە؟ مانای ئەوەیە کە ئایا حەرەکەتی چەکداری لە دەورەیەکدا کە برپاری هەڵگیرسانی دەدرێت دەتوانی لە سەر پێی خۆی رابوەستێ؟

چەندە ئیدامە کاریەکەی دەکەوێتە ئیختیاری ئەو لایەنانەی کە دەتوانن بەدەر لە ئیرادەی ئێمە چارەنووسی مان و نەمانەکەی دیاری بکەن. ئەگەر زەمانەت بۆ لە سەر پێی خۆ راوەستانی هەبوو، ئەو جار دەکرێ بیر لەوەش بکرێتەوە کە یارمەتی و پشتیوانی دەرەکیشی بۆ دابین بکرێ. کاتێك لە ساڵی ١٩٧٥ پشتیوانی رژێمی شا لە بزوتنەوەی چەکدارانەی کوردستانی عێراق نەما، ئەو بزووتنەوەیە هەرەسی هێنا. ئەگەر ئەمڕۆ بە فەرز لە رووی هەر بەرژەوەندیکەوە سنوورەکان بۆ کاری چەکداری بەرەو رووی ئێمە بکرێتەوە، سبەینێ کە بە پێی هەمان بەرژەوەندی داخران، ئایا ئیمکانی ئەوەمان هەیە درێژە بە کارەکەی خۆمان بدەین؟ ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین بە دوور لە، لەبەرچاو گرتنی ئەو فاکتۆرە، ستراتێژی خۆمان دابرێژین. کاتێك کە ئێمە لە ساڵی ١٣٥٨ای هەتاوی دا دەستمان دایە خەباتی چەکداری بۆ ماوەی نزیکەی ١٥ ساڵ هیچ دەوڵەت و هێزێکی دیکە غەیری هاوسەنگی نێوان هێزی خەڵك و هێزی دوژمن لە ئێران، نەیدەتوانی چارەنووسی مان و نەمانەکەی دیاری بکات، بەڵام وردە وردە وا نەما.

دواجار، دوای هاتنی سوپای ئەمریکا بۆ ئەو ناوچەیە ئێمە نەماندەتوانی و نەدەبوایە ببین بە بارمتەی چالاکی هێزە چەکدارە ئیسلامیەکان، لە دەوڵەتی ئێران لە دژی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق پشتیوانی لێ دەکردن. نەماندەتوانی ببین بە ئامرازی سات و سەوداکردنی دەوڵەتانی ئێران و ئەمریکا بەئێمە لەسەر هێزی چەکداری سەدریەکان لەبەغدا.

**زۆرینەی سەرکردایەتی کۆمەڵە لەدەرەوەی وڵاتن**

***هەمیشە کەمینەیەکتان لەسەرکردایەتی کۆمەڵە لەکوردستانی عێراقن و لەئۆردوگان و بەشێکی زۆریان هاچیان داکوتاوە لەئەوروپا و ناگەڕێنەوە ئۆردوگا بۆچی لایان نادەن، خۆ لای دێموکرات هەر کەس سەرکردایەتی بێ دەبێ لەکوردستان و کۆیە دانیشێ، سەرکردایەتی ئەوروپاتان بۆ چییە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەوەی کە چ ژمارەیەك لە کادرەکانی سەرکردایەتیمان لە کوردستان نیشتەجێن و یان لە نێوان کوردستان و دەرەوەدا لە هاتوچۆدان، رەنگە لە رووی عەمەلیەوە بۆ ئەم یان ئەو قۆناغ گرینگی خۆی هەبێ و بوونی ژمارەیەکی زۆرتریان لێرە بۆ ماوەیەك کار بکاتە سەر بەرەو پێشچوونی باشتری ئەو کارانەی کە لێرەوە جێ بە جێ دەکرێن. بەڵام لە روانگەی بەرژەوەندیەکانی باڵا و درێژ ماوەی کاری ئێمە نیشتەجێ کردنی بەردەوامی ژمارەیەکی زۆریان لە مەقەرەکانی ناوەندی کۆمەڵە لە کوردستانی عێراق ناتوانێ سیاسەتێکی دروست بێ. ئێمە هەرگیز نەچووینە ژێرباری ئەوەی کە بە حیزبێکی ئوردوگا نشین پێناسە بکرێین. دەرەوەی وڵات لە زۆر رووەوە دەتوانێ دەوری گرینگ ببینێ لە بەرەوپێش چوونی ستراتێژی کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران. رەنگە پرسیار ئەوە نەبێ کە بۆچی ژمارەیەکی زۆریان بە بەردەوامی لێرە نین، بەڵکو پرسیاری واقیعی تر بۆ ئێمە ئەوەیە کە ئایا توانیومانە لە هەموو ئەو زەرفیەتانەی کە لە دەرەوەی وڵات هەیانە لە پێناوی بەرەوپێش بردنی ئەو ستراتیژەدا کەڵك وەربگرین؟ بە داخەوە دەتوانم بڵێم نا، بەڵام ئەوەش هۆکاری خۆی هەیە و کەم و کوریەکە، کە دەتوانێ نەمێنێ.

**منیش واز لەحزبی کۆمۆنیست بهێنم خەڵکانی تر دەست هەڵناگرن**

***بۆچی داکۆکیکارێکی سەرسەختی حیزبی کۆمۆنیستی و واز لە حیزبی کۆمۆنیست ناهێنێت و کۆمەڵەیەکی کوردستانی دروستکەی و زۆریش پێیانوایە گەر تۆ ئەوە بکەی کەس رێگرت نیە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەوە پێوەندی بە ئاسۆیەکەوەیە کە بۆ رزگاری خەڵکی چەوساوە و بەش مەینەت هەمانە. حیزب یان رێکخراو بۆ ئێمە ئامرازێکە، کە ئەگەر خزمەت بەو ئامانجە نەکات و لە خزمەت ئەو ئاسۆیەدا نەبێ، لە باشترین حاڵەتی خۆیدا شەریکەیکی تەعاونیە کە ژمارەیەك بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان پێکیان هێناوە.

با ئەوەش بڵێم، دڵنیا بن ئەگەر منیش ئەو کارە بکەم، کەسانێکی زۆری دیکە هەن کە ئالای حیزبێکی کۆمۆنیستی سەرتاسەری بۆ ئێران بەرز رادەگرن، ئەوان هەم لە ئاستی ئێران و هەم لە ئاستی کوردستانیش لە من سەرکەوتووتر دەبن و بە ویژدانێکی ئاسودەتریشەوە دەژین.

**دوو پارە لەهەرێم وەرناگرین**

***ئەوە چەند راستە کەمێوە دوو "پارە" لەحکومەتی هەرێم وەردەگرن، چ وەك کۆمەڵە چ وەکو حیزبی کۆمۆنیست؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: نەخێر ئەوە راست نییە. ئەو پارەیەی کە ئێمە وەکوو یارمەتی لەحکومەتی هەرێمی وەردەگرین لە لایەن کۆمەڵەوەیەو بەناوی کۆمەڵەوەیەو لە درێژەی پێوەندێکی ٢٠ ساڵە دایە کە کۆمەڵە لەگەڵ خەباتی خەڵکی کوردستانی عێراق بویەتی. رەهبەری حیزبی کۆمۆنیستیش لە قۆناغی جۆراوجۆردا ئەو پەیوەندیەی تەئید کردووە.

**بەڵگەنامەکان شاهیدن کەموهتەدی موعجیبی حیکمەت بووە ئەگەر مەنسور نەبوایە، کۆمەڵە و حزبی کۆمۆنیست ئێستا گەورەترین حزبی رۆژهەڵاتی ناوەراست دەبوو**

***من لەدووشت تێناگەم، موهتەدی دەڵێ سەید برایم زۆر موعجیبی حیکمەت بوو، تۆش بەپێچەوانەوە دەڵێی موهتەدی زۆر موعجیبی حیکمت بوو. گوایە تۆ دەتویست لەگەڵ حیکمەت و کۆمۆنیزمی کارگەری برۆی کام بۆچوونە راستە و واقیعە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: سەبارەت بە مەنسووری حیکمەت پێشتر بۆچوونی خۆمم بۆ باس کردبووی، دووپاتی ناکەمەوە. ئەوەی کە کاك عەبدوڵڵا لە دەروون و مێشکی دا بە درێژایی هەموو ئەو ساڵانە چی گۆزەراوە، نەدەزانم و نە زۆریش گرینگە، بەڵام ئانەوجێگایەی کەبەهەڵوێست و کردەوە مەربوتە بەشی زۆری مێژووی واقیعی کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران لە بەڵگەنامەکاندا تۆمارکراوە و ئێستا هەمووی لە سەر تۆری ئینتەرنێتە و جێگا و شوێنی واقیعی هەرکاممان لەم پەیوەندیەدا دیاری دەکات. با من چەند نموونەیەکتان بۆ باس بکەم:

لە گەڵاڵەکردنی بەرنامەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا کاك عەبدوڵڵا و مەنسووری حیکمەت بە هۆی توانایییەکانی ئەو کاتیانەوە لەچاومن وکەسانی تر دەوری سەرەکیتریان هەبوو. کاك عەبدوڵڵا سەبارەت بە جێگا و شوێنی ئەو بەرنامەیە چەندین وتار و نووسراوەی هەیە. کاتێك دوای

کۆنگرەی ٣ی حیزب کە پێداچوونەوە بە بەرنامە و ئەساسنامە هاتە دەستوورەوە، لە هەر دووکیاندا کاك عەبدوڵڵا بەرپرسی یەکەم بووو و لە سەر هەموو بابەتەکانی ئەوپێداچوونەوەیە لەگەڵ مەنسووری حیکمەت هاودەنگ بوون.

کاك عەبدوڵڵا دەڵێت کە لەگەڵاڵەکردنی باسەکانی کۆنگرەی ٦ی کۆمەڵەدا دەورێکی هەڵسووڕاوانەی نەبۆە و من دەورێکی زیاترم بینیوە، لەوەدا ڕاست دەکات، بەڵام، یەکەم، دژی هیچکام پەسندکراوەکان نەبوو، بەڵکوو لەگەڵاڵەکردنیاندا کەم قسە و یان بێدەنگ بوو. دووهەم و گرینگتر لەوە، شەش مانگ دواتری نەك هەر بوو بە لایەنگری سەر سەختی پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی ٦، بەڵکوو لەوە زیاتر داوای دەکرد کە کۆمیتەی ڕەهبەری کۆمەڵە بە هۆی پابەندنەبوونی بە بەڕێوەبردنی چالاکانەی ئەو پەسەندکراوانە، سزای تەشکیلاتی بدرێ. لەم بابەتەوە وتاری نووسی و بە ئاشکرا بڵاو بووەوە.

لەدەورەی گەڵاڵەبوونی بیرۆکەی پێکهێنانی فراکسیۆنی کۆمۆنیزمی کرێکاری، کاك عەبدوڵڵا لە پلینۆمی ١٦ی کۆمیتەی ناوەندی حیزبدا بەیانێکی بە حەماسەوە لە تەئیدی ڕەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری و مەنسووری حیکمەت خوێندەوە کە بڵاو بۆتەوە و دەتوانی بیبینی.

ئەوانە تەنها بەشێکی واقیعیەتەکانن. بۆ زانینی زۆرتری دەتوانی بەڵگەنامەکان ببینی. ئایا ئەوە موعجب بوون بووە یان لە هەر قۆناغێکدا بە پێی مەسلەحەتێك بووە، با کاك عەبدوڵڵا خۆی وەڵام بداتەوە. من مەنسووری حیکمەت بە ئینسانێکی تێکۆشەر و ڕاستگۆ بەرانبەر بە بیروباوەر و ئامانجەکانی دەزانم، بەڵام لە هەمانکاتدا لام وایە دوای جیابوونەوەی لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ورده ورده لە رووی فکریەوە لە مارکسیزم دوور کەوتۆتەوە و لە لیبرالیزم نزیك بۆتەوەو ئەگەر ئەو ڕەوتی جیابوونەوەی لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران نەگرتبایە بەر، لام وایە ئێستا ئەو حیزبە گەورەترین حیزبی ئۆپۆزسیونی چەپ لە هەموو رۆژهەڵاتی ناوەراست دەبوو.

***کەچی سەرەنجام لەکاتی ڕۆیشتنی مەنسووری حیکمەت و، کۆمۆنیزمی کارگەری لەپێلنۆمی بیستەمی ١٩٩١دا، تۆو موهتەدی دژی حیکمت یەکدەگرن و لەگەڵی ناڕۆن ئەمە بۆچی؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە هەردووکمان ڕەوتێك کە مەنسووری حیکمەت گرتبوویەبەر بە نادروست و بە زەرەرمان دەزانی، جگە لەوە لە رووی سیاسی و ئەزەریشەوە سەرەتای هێندێك جیاوازی دەرکەوتبوون. بۆ نموونە لە سەر مەسەلەی ڕاپەرین لە کوردستانی عێراق و مەسەلەی کۆڕەو و هیتر.

***پاش ڕۆیشتنی مەنسور حیکمەت و بوونی عەلیزادە بەسکرتێری کۆمەڵە چەند کەس لەکۆمیتەی ناوەندی دژی تۆ بوون، بۆچی؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: هیچ چەشنە دژایەتێکم لەم دەورەیەدا بیرنایەت لە ناو ئێمەدا تا ساڵی ١٩٩٩ کە زەمینەی جیابوونەوەی کاك عەبدوڵڵا و هاوبیرانی ڕەخسا، هیچ چەشنە ڕیزبەندێکی لەو چەشنە لە ناو ئێمەدا نەبوو. کارەکان بە تەبایی و هاوفکریی دەچوونە پێش. هەڵبەت کەم و کوڕی و ڕەخنەی ئەم لە ئەو هەبوو، بەڵام لە ئاستێکی ئاساییدا بوو و جێگەی سەرنجێکی تایبەتی نەبوو.

تەنیا مەسەلەیەك كە بیرم دێت ئەوە بوو كە هاوڕێیانێكی وەكوو ساعیدی وەتەندوست و عومەری ئێلخانی زادە كە لە پلینۆمی ١٦دا ئیستعفایان دا بوو، لایان وابوو كە دوای ڕۆیشتنی ڕەوتی كۆمۆنیزمی كارگەری، لە لایەن باقی هاوڕێیانەوە پێش گرتنی كۆنگرەی ٤ی حیزب هاتنەوەیان بۆ ناو كۆمیتەی ناوەندی، لەو ماوەیەدا بێ ئینسافییان لەگەڵ كراوە.

## شەڕی كۆمەڵە و دیموكرات روناداتەوە

***كەباس لەكۆمەڵە و دێموكرات دەكرێ، خەڵكی (كوردستانی ئێران) دەڵێن هەر كات هاتنەوە وەك یەكێتی و پارتی جەنگی ناوخۆیی دەستپێدەكەنەوە... تۆ لەگەڵ ئەم بۆچوونەی؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: دەكرێ وابێ، دەتوانێ وابێ. من لەگەڵ ئەو بۆچوونە نیم كە تێكهەڵچوونی نێوان هێزە سیاسییەكانی چەكدار لە كوردستان بەچارە هەڵنەگر بزانێ. ئێمە خۆمان نەك هەر هەوڵ نادەین پێوەندییەكان بەم ئاراستەیەدا بڕۆن، بەڵكوو هەموو هەوڵی خۆشمان دەخەینە كار بۆ ئەوەی ڕێگا لە دووپات بوونەوەی وەها تێكهەڵچوون گەلێك بگرین. ئەو هەوڵانەی ئێمە دوانەخراون بۆ دوارۆژێك كە هێشتا نەهاتووە، بەڵكوو هەر لە ئێستاشەوە كاری بۆ دەكەین بۆ ئەوەی زەمینەی ئەو جۆرە تێكهەڵچوونانە نەمێنێ. ناكۆكی نێوان هێزە سیاسییەكانی كوردستان دەتوانێ لە ڕێگەی سیاسی، هێمنانە و شارستانییانەوە بچێتە پێش و حەكەمی نیهایی دەنگی ئازادانەی خەڵك بێ. لە بەرنامەی ئێمەدا بۆ دەسەڵاتدارێتی جەماوەر جێگایەك بۆ توند و تیژی نییە و هەرچی هەیە لە دامەزراوەكانی دەسەڵاتدارێتی خەڵكدا بە دەنگی ئەكسەرییەتی جەماوەر دەبڕدرێتەوە. پابەند بوونی هێزە سیاسییەكان بە بنەماكانی ژیانی دیمۆكراتیك، ئەگەر تەنانەت هاوكاری و بەرەش لەگۆڕێدا نەبێ، دەتوانێ پێش بە دووپات بوونەوەی ئەم جۆرە شەڕانە بگرێ. خۆ ئەگەر ئەو پابەند بوونە بە شێوەیەكی عەمەلی و واقیعی بوونی نەبێ لەجەرگەی بەرە و هاوكاریشدا دەتوانێ شەڕ و توند و تیژی بێتە كایەوە. ئەگەر جەماوەری خەڵك دەوری سیاسی و كۆمەلایەتی خۆیان بە تەواوی ببینن، بێگومان تێكهەڵچونی چەكدارانە لە نێوان حیزبە سیاسیەكان دا یان هەر روو نادات و ئەگریش ڕوی دا زوو پێش بە پەرەسەندنی دەگیرێ.

## شەڕی یەكێتی و پارتی لەسەر دەسەڵات بوو

***تاچەند ئێران هۆكاری شەڕی یەكێتی - پارتی بوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: شەڕی یەكێتی و پارتی ریشەی ناكۆكیەكانی ٢ دەیەی رابردووی ئەو ٢ حیزبە لە سەر سەركردایەتی كردنی بزووتنەوەی كوردایەتی و لە نیهایەتدا لەسەر دەسەڵات بوو. لە كاتێكدا كە دەنگی ئازادانەی خەڵك نەیتوانی حەكەم بێ و تەكلیفی دەسەڵات روون كاتەوە، ڕێگا بۆ شەڕ خۆش دەكرێ. ئەگەر ئەم یا ئەو دەوڵەتیش لە قۆناغی دیاریكراودا هەوڵیان داوە كاریگەری لە سەر ئەو كێشەیە دابنێن، هەر لە سەر ئەو زەمینەیە بووە. دەوڵەتی مەركەزی عێراق و دەوڵەتی توركیە و دەوڵەتی ئێران هەموویان لە ئەساسدا بە مەبەستی دژایەتی كردن لە گەڵ چارەی خۆنووسینی خەڵكی كورد هەوڵییان داوە دەست لەم كێشەیە وەربدەن و بە داخەوە گەلێك جاریش سەركەوتوو بوون.

* PKK بەرێکخراوێکی تیرۆریستی دەناسی؟
ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو دەستەواژەیە کە لە میدیای رۆژئاواوە هاتووە، ئێمە رەتی دەکەینەوە. ئێمە موخالیفەتی خۆمان لەگەڵ سیاسەت و تاکتیك و شێوەکاری پ. ك .ك لەو چوارچێوەیەدا بەیان ناکەین. ئەو پێناسەیە لە لایەن میدیای رۆژئاواوە لە هەمان کاتدا کە پ ك ك بە تیرۆریزم تاوانبار دەکات، چاوپۆشی دەکات لە تیروریزمی دەولەتی کە بە شێوەیەکی سیستماتیك و بەردەوام لە ئاستێکی گەلێك بەرینتردا و لە مەودایەکی گەلێك دوور و درێژتردا لە لایەن دەوڵەتانی وەکوو دەوڵەتی تورکیە بەرێوە دەچێ. ئێمە هەر جیاوازێکیشمان لە بیروبۆچوون و رێبازی سیاسی لە گەڵ پ ك ك هەبێ، ناتوانین نکۆلی لەو راستیە بکەین کە توند وتیژی لە تورکیەدا لە ئەوانەوە دەستی پێ نەکردووە. بەردەوام ئامادە بوون کۆتایی بە شەڕ بێنن، تەنانەت لە پێناوی ئیمتیازی گەلێك سەرەتاییشدا. بەڵام ئەرتەش و دەزگاکانی دەسەلات لە تورکیە ئامادە نەبوون تەنانەت یەکجاریش بە پیریەوە بچن.

پێویستە ئۆجەلان لەزیندان ئازاد بکرێ

*بۆچونت لەسەر عەبدوللا ئۆجەلان چییە و تاچەند کاریگەربووی بەگرتنەکەی و پشتیوانی ئازادبوونی دەکەی و رازی، ببێ بەماندێلای کورد، یان ئازاد دەکرێت؟
ئیبراهیم عەلیزادە: جیاوازی نێوان هەل و مەرجێك و ولاتێك و کێشەیەك کە ماندێلا خەباتی تێدا کردووە و کاریگەری لە سەری بووە و هەروەها کەسایەتیان، زۆرە. شوبهاندنی ماندێلا — ئوجەلان بە یەکتر لەوانەیە لە جێگەی خۆی نەبێ.

پێموایە هەر ئینسانێکی ئازادیخواز لە هەر گۆشەیکی دونیا پیلانێك کە بۆ دەستگیر کردنی ئۆجەلان بەرێوە چوو مەحکوم دەکا مانەوەی ئوجەلان بۆ ئەو دەورە دوور و درێژە لە زیندانی تورکیە نارەوایە و پێویستە لە سەر داخوازی ئازادکردنی بە توندی پێداگەری بکرێ.

لەنێوان بارزانی و تاڵەبانی و ئۆجەلان، ئێمە تاڵەبانی هەڵدەبژێرین

*ئەگەر ئۆجەلان، یان بارزانی و تاڵەبانی ببنە سەرۆکی داهاتووی هەموو کورد کامیانت قبوڵە تۆ؟
ئیبراهیم عەلیزادە: دیارە ئێوە باسی حاڵەتێکی گەلێك فەرزی دەکەن، بەڵام بە هەر حاڵ پرسیارە و هاتۆتە گۆڕێ. پەیوەندی ئێمە و مام جەلال مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە لەو روویەوەیە کە لە ناو ئێمەدا حیسابێکی جیاواز بۆ مام جەلال لە چاو کەسی تر دەکرێ. بەڵام ئێوە دەزانن کە بەرنامەو ستراتێژی سیاسی ئێمە و مام جەلال یەك نییە. ئێمە هەوڵ دەدەین لە رێگای ئەو رەوتەوە کە خۆمان باوەرمان پێیەتی و بە رێگای نەجاتی خەڵکی چەوساوەو ستەم لێکراوی دەزانین، بە ئاکام بگەێنین. خۆ ئەگەر رۆژێك لە رۆژان لە سەر مەسەلەیکی ئەوا فەرزی کە ئێوە باسی دەکەن، کار گەیشتە دەنگدان، یەکەم، دەنگدان قاعیدەتەن بە نهێنی دەبێ و دووەهەم، هەل و مەرجی ئەو کات دیاری دەکات کە چلۆن دەنگ دەدەی یان ئەسڵەن دەنگ نادەی.

*هۆکاری ئەوەی کە دەڵێن نێوانی تۆ و مام جەلال خۆشە چییە؟
ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو پەیوەندیانەی کە لە رۆژانی سەخت دادەمەزرێن کاریگەریان بە ئاسانی

ناسرپەتەوە. چ لە رۆژانێك دا كە بۆ ئەوان سەخت بوە و چ لە رۆژانێك دا كە بۆ ئێمە وابوە، لە یارمەتیدانی یەكتر درێغیمان نەكردۆە. هەركام لە ئێمە هەرچی لە تواناماندابووە كردومانە و ئەوەیە سەرچاوەی ئەو دۆستایەتیێە.

## پژاك بەقەدەر كۆمەڵە و دیموكرات نفوزی نیە

***پژاك زوو هات و زوو لەكوردستانی خۆرهەڵات جێگای خۆی كردەوە، شوێنی بەنێوە لێزكرد، بۆچی و هۆكارەكەی چی بوو؟ پژاك، واقیعی كوردستانی ئێرانە، یان دروستكراوی (پ كا كا)یە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: رێكخراوی پژاك بەرهەمی كاری ئەو دەورەیەی "پ كا كا" یە كە كۆماری ئیسلامی كەم و زۆر هاوچەشنی دەوڵەتی سوریە چاوپۆشی دەكرد لە چالاكی ئەوان لە كوردستانی ئێران. چاوپۆشی لە بەشداری كردنیان لە كۆمەڵێك رێكخراوی مەدەنی دا كردن، رێگر نەبوو بۆیان لە ناردنی لاوانی كوردستانی ئێران بۆ ریزەكانی گریلای پ كا كا. دوای گیرانی عەبدوڵلا ئۆجالان و ئەو گۆرانكاریانەی كە بە سەر پەیوەندیەكانی دەرەوەی پ كا كا دا هات، پ كا كا بۆ چالاكیەكانی پێشوی خۆی لە كوردستانی ئێران و كوردستانی عیراق دوو رێكخراوی جیاوازی پێكهێنا، كە پژاك یەك لەوانە بوو. هەموو ئەوكارانەی كە پێشتر پ كا كا لە كوردستانی ئێران دەیكرد كەوتە سەر شانی پژاك. پ كا كا نفوزێكی دیاریكراوی لە كوردستانی ئێران هەبوو هەر ئەوە بوو كە بۆ پژاك بە جێ ما. ئەوەی كە پ كا كا هەوڵبدات رێكخراوێكی هاوجیهەتی خۆی لە كوردستانی ئێران پێك بێنێ، خۆی لە خۆی دا نە خەتایەكە لە لایەن پ كا كا وە و خاڵی لاوازی پژاكە. ئەو رێكخراوەیە لە بەرنامە و ستراتیژی سیاسی و هەڵسوكەوتی خۆیەوە قەزاوەت دەكرێ. بە بڕوای من پژاك ئەو ئەندازەیە كە لێرە و لەوێ تەبلیغاتی بۆ دەكرێ لە چاو دوو جەریانی سەرەكی چالاك لە كوردستان واتە كۆمەڵە و دێموكرات خاوەنی نفوزێكی قووڵ و جێكەوتوی كۆمەلایەتی نیە.

## حكومەتی هەرێم چاوپۆشی لە پژاك دەكات

***حاجی ئەحمەدی سكرتێری پژاك دەڵێ موهتەدی ماستاو بۆ حكومەتی هەرێم دەكات؟ دەڵێ من ئامادەنیم ناوی كۆیە و زرگوێز بخۆمەوە و تەسلیمی حكومەتی هەرێم بم، ئەو بۆچوونەی راستە؟**

**ئیبراهیم عەلیزادە:** بە پێویستی نازانم بچینە ئەو مەیدانەی حاجی ئەحمەدیی و عەبدوڵلای موهتەدی بۆ كێشەكانی خۆیان لە گەڵ یەكتر هەڵیان بژاردووە. بەڵام سەبارەت بە بەشی دووهەمی پرسیارەكەتان رونكردنەوەیەك پێویستە.

پژاك و ئەوانی دیكەش وا لە قەندیل دانیشتون بە بێ رادەیەك لە چاوپۆشی دەسەڵاتدارانی واقیعی لە عێراق و كوردستان ناتوانن لەو مەنتقەیە بمێننەوە. راستە بارەگاكانیان تۆزێك لە شارەكان كەنارە، بەڵام پێداویستیەكانی ژیانیان لە رانیە و قەڵادزێ و هەولێر و سلێمانی بە ئاشكرا و بە بێ رێگری دابین دەبێ و دوور نیە پەیوەندیەكە لەوەش زیاتر بێ. ئایا بەراستی پژاك بە بێ ئەوەی لە لایەن هیچ هێزێكەوە بۆ هەڵسووران لە سەر سنوورەكان گلۆپی سەوزی بۆ هەڵنەكراوە؟ كەوایە لە جیاتی شانازی كردن بە دانیشتن لە قەندیل، با پێمان بڵێن ستراتیژی واقعیان بۆ رزگاری میللەتی كورد لە ستەمی نەتەوایەتی چیە، لێرەدایە كە لام وایە كاك حاجی زۆر كورتی

دێنێ. ئەم جۆرە لێدوانە لە دونیای ئەمرۆدا کڕیاری زۆر نیە.

***پژاک گوێ بەیەکێتی و پارتی نادات و چالاکی سەربازی خۆی دەکات، بۆچی ئێوە زیاتر لە (١٥) ساڵە ئۆردوگانیشنن و ناتوانن چالاکی پێشمەرگانە بکەن؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە ئەگەر بەوە گەیشتباین کە هەلومەرج بۆ دەست پێکردنەوەی شەڕی چەکداری لەبارە و کۆمەڵگای ئێستای کوردستان خوازیارێتی و پشتیوانی لێ دەکات، بێگومان چالاکی خۆمان وا رێك دەخست کە تەنیا خۆمان بڕیاردەر بین و بە پێی زەخت هێنان وە یان کارناسانی دەرەکی ناراستەی کاری خۆمان نەگۆڕین. لام وانیە کە پژاك سەرئەنجام گوێی پێنەدابن.

**ئێمە لەحکومەتی هەرێم پارە وەردەگرین**

***ئێران دەڵێ کۆمەڵە و دێموکرات بەڵێنامەیان داوە بەیەکێتی و پارتی سنوور نەبەزێنن و شەڕی چەکداری نەکەن، ئەوە مانای تەسلیمبوونی ئێوە بەرامبەر بە مانگانەیەکی (٥٠٠٠٠) هەزار دۆلاریە کەیەکێتی و پارتی دەتاندەنێ؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو جۆرە لێدوانە تەبلیغاتی دوژمنە و واقعیەتی نیە. لە نێوان ئێمە و یەکێتی و پارتی دا هیچ بەڵێنێك سەبارەت بە شێوەی کار و خەباتی ئێمە نەدراوە. تەنیا لە یەك تێگەیشتنێکی عەمەلی بووە. ئێمە خۆمان بە پێی تەشخیسی خۆمان زانیومانە چ کارێك مومکینە و چ کارێك مومکین نیە. خەباتی چەکاری ئێمە ناتوانێ بە شەرتی ئەوە بەرێوە بچێ کە حەتمەن دەوڵەتێ سنوورەکانی خۆیمان بۆ بکاتەوە.

بەڵێ ئێمە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بە بڕی دابین بوونی ژیانی رۆژانەی ئەندامان و پێشمەرگەکان و بنەماڵەکانیان لە حکومەتی هەرێم یارمەتی وەردەگرین و لەم بابەتەوە هیچ قەید و شەرتێکمان بە سەرەوە نیە.

**خەباتی چەکداری داوای ئەمڕۆی خەڵکی کوردستانی ئێران نییە**

***خەڵك حەزی لەخەباتی چەکداریەو پژاك ئەوەی پڕکردوەتەوە، ئێوە چی دەکەن بۆ وەڵامی ئەم داوایەی خەڵك؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: لێکدانەوەی من لە تەمایولی خەڵك وەکوو ئێوە نیە ، بەڵام فەرق هەیە لە مابەینی ئەوەی کە خەڵك حەزیان لە کارێك بێ یان دژی نەبن لە گەڵ ئەوەی بەشداری گەرم و گوڕی تێدا بکەن. لە بەر گەلێك هۆکار کە پەیوەندیان بە هەلومەرجی سیاسی وڵاتەوە هەیە، ئەو چەشنە بەشداری کردنە مەیسەر نابێ. ئێستا ئەوە داوایەکی خەڵك نیە لە ئێمە لە داهاتوش دا ئەگەر هەلومەرجەی رەخسا ئێمەش هەوڵ دەدەین جێ بە جێی بکەین.

**هەموو مەکتەب سیاسی دیموگرات بەرپرسن لەشەڕی کۆمەڵە**

***قاسملۆ تاچەند رۆڵی خراپی هەبوو لەشەری ناوخۆ؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: لام وایە هەرکام لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی ئەوکاتی حیزبی دێموکرات لەم بابەتەوە بە بەشی خۆیان بەرپرسن. بڕیاری شەری سەراسەری زۆر پێش بەرپابوونی ئەو شەرە لە

پلینیۆمی کومیتەی ناوەندی حیزبی دێموکرات دا پەسەند کرابوو.

***ئەم پرسیارە بۆ من زۆر گرینگە بۆچی عەلیزادە کەیەکەمین و سەرسەختترین داکۆکیکاری حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانە، رێگا نادات هەڵبوەشێتەوە، کەچی ئامادەنیت ببیتە سکرتێری ئەو حیزبە و واز لەسکرتێری کۆمەڵە بهێنیت؟**

ئیبراهیم عەلیزادە، دڵنیابن لەوەی کە باوەرم بە رێبازی حیزبی کومونیستی ئێرانە و خەباتی تێدا دەکەم. هاورێیانم دەزانن هەم ئامادە بووم و ئامادەم لە رێبەری حیزبی کومونیست دا هەر دەورێکم پێ بسپێرن و لە توانام دابێ وەری بگرم و هەم ئەمانم لە پۆستی دەبیر ئەوەڵی کۆمەلە دا داوایەکی بەردەوامم بۆە کە هەوڵم بۆداوە و بەداخەوە تا ئێستا تێیدا سەرکەوتو نەبووم. عەلاقەم بە کارکردن لە کومەڵە دا هەیە بەلام نەك وەکوو سکرتێری یەکەم. بە هاورێیانم وتوە کە ئەگەر بە پێویستی بزانن لە کۆمەڵەدا کار بکەم ئەو پۆستە رەسمیم نەبێ لە پێناوی ئەو ئەرکانە دا کە پێویستە جێ بە جێ بکرین تەنانەت هەڵسوراوتریش دەبم.

*** گۆیا ئێوە لە کۆنگرەی ٦ی کۆمەڵەدا گوتتان بزووتنەوەی کوردی بۆ ئەحزابی ناسیونالیست و بزووتنەوەی سوسیالیستی بۆ ئێمە. عەبدوڵڵا موهتەدی دەڵێ کە من هەر بەو هۆیە لە کۆنگرەی ٦دا بەشداریم نەکردووە. دوا جاریش ئێوە لە کۆنگرەکانی ٧ و ٨ دا ئەو هەڵوێستەتان تەئکید کردۆتەوە. تو بەڵگەت بۆ رەتکردنەوەی ئەو قسانە چییە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: رێبازی سیاسی هەر حیزب و ریکخراوێکی جیدی عادەتەن لە کۆنگرەکانی دا دیار دەکرێت. ئەوە هەموو پەسندکراوەکانی کونگرەکانی ٦ و ٧ و ٨ لە بەردەستن دەتوانن بیان بینن لە کامیاندا ئەو بۆچونە بەدی دەکرێ؟ ئێمە ووتومانە وەکوو کومونیستێك ئامانج نیهایی ئێمە سۆسیالیسمە بە واتای یەکسانی لە ریفاه و لە خۆشگوزەرانی دا، کۆتایی هاتن بە کاری کرێگرتە و چەوساندنەوەی ئینسان بە دەستی ئینسان. گەیشتن بەو ئامانجە لە وڵاتێکی فرە نەتەوەی وەکو ئێران، لە کوردستانێکی ستەملێکراو دا گەلێك کەند و کۆسپی لە سەر رێگایە، یەك لەوانە ستەمی نەتەوایەتیە و بۆ چارەسەرکردنی ئەو ستەمەش بەرنامەی دیاری کراومان پێشکەش کردۆە کە گەلێك لە فیدرالیسمە کەی ئێوە و ناتەواوی ئەوان جیدیترە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە. مەسەلە ئەوەیە کە وتومانە جیاوازی ئێمە لە ئەحزابی ناسیۆنالیست بە تەنیا لە شێلگیرتر بونی بەرنامەی ئێمە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوایەتی دا نابیندرێ بەڵکوو لە بەرنامە و ستراتێژی ئێمە بۆ بونیات نانی کۆمەڵگایەکی سوسیالیستی دایە کە ئەو جیاوازیە بە شەفاف دەبیندرێ. گردەوەی ئێمە هەر ئەوەی نیشانداوە و پەسندکراوەکانی رەسمی ئەو کۆنگرانەش دا بە شێوەی ئیسپاتی ئەو هەر ئەو جیهەتیان بەیان کردۆە.

*** عەبدوڵڵای موهتەدی دەڵێ دوای پێکهاتنی حیزب ئێوە زۆربەی زۆری کوری چاك و کچی چاکی خۆتان لە کوردستان هێنا دەرێ و ناردوتانە بۆ تاران، ئایا ئەو سیاسەتەی ئێوە کومەڵەی لاواز نەکردۆتەوە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەوە ئەساسی نیە و بە پێچەوانەکەیەتی.ئێمە دوای پێکهاتنی حیزب نەك هەر هیچ کادرێکمان لە کوردستانە نەنارده دەرەوەی کوردستان بەڵکو بۆ پاراستنیان زۆربەیانمان هێناوە

کوردستان و بۆ ناو ڕیزی پێشمەرگە.

**موهتەدی دەیەوێ یەکێتی بکاتە دوژمنی ئێمە**

**•عەبدوڵڵای موهتەدی دەڵێ سەید ئیبراهیم تا ئێستا تەدەخوولی یەکیتی لە جیابوونەوەکەدا ڕەد نەکردۆتەوە، تۆ دەڵێی ئەو کارەمان کردووە، کێشەکە لە کوێ دایە، مەبەستی کاک عەبدوڵڵا لەو تەئکید کردنەوە چییە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: مەبەستەکە ڕوونە، دەیانهەوێ هەڵوێستی ئێمە بدەنە پاڵ حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری و بە خەیاڵی خۆیان لەم ڕێگایەوە یەکێتی نیشتمانی لە دژی ئێمە هان بدەن. خۆ ئەگەر قەرار بێ ئێمە بکەوینە شوێن هەر هەڵوێست و قسەیەکی حیزبی حیکمەتیست، دەبێ چی ئەرکمان لەسەر شانە هەمووی لە بیر بەرینەوە و کارمان ببێتە وەڵامدانەوە بە ئەوان. ئەو هێرشانە لەسەر گەلێك مەوزوعی دیکەشدا هەروا بەردەوامن و ئەو حیزبە لەو شێوەکارە هێز وەردەگرێ و بوونی خۆی لەم ڕێگایەوە مانا دەکاتەوە. سەبارەت بەوەی کە یەکێتی لەکاتی جیابوونەوەکاندا هێزی هێنابێتە دەور و بەری ئۆردوگاکانی ئێمە وە یان زەختێکی تایبەتی لەسەرمان بووبێ، من هەر ئەوکات لە ڕۆژنامەی هەواڵ دا بە سەراحەتەوە ئەوەم ڕەت کردەوە وە وتم کە ئەم جیابوونەوەیە ڕیشەی لە کێشەکانی سیاسی ناوخۆی کۆمەڵەدایە. ئەو دیپلۆماسییەی کاك عەبدوڵڵا نەیتوانی کاریگەری لەسەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان دابنێ. باوەڕ ناکەم هیچ سیاسەتمەدارێك لەوناوچەیەدا ئەوەندە خاو پێچرابێتەوە کە ئەم جۆرە فێڵانە نەناسێ.

**ئێران بەهاوکاری عێراق هێرشی کردوەتە سەر موجاهیدینی خەلق**

**•ڕووداوەکانی کەمپی ئەشرەف ساڵی (٢٠٠٩) کە تێیدا ژمارەیەك موجاهیدی خەلق کوژران و بریندار بوون، چۆن لێکدەدەنەوە؟ ئایا قەت بیرتان لەوە کردۆتەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو سیناریۆیە بۆ ئوردوگاکانیش ئێوەش دووپات بێتەوە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئاشکرایە کە هاندانی ڕژێمی ئێران لە پشتەوەی ئەو ڕووداوەدا بووە. دەوڵەتی مەرکەزی عێراق لە ژێر گوشاری کۆماری ئیسلامی پلانی دەرکردنی موجاهیدینی لە عێراق هەبوو. دەوڵەتی ئەمریکاش لەو کاتەوە کە ئەو کەمپەی تەسلیم بە دەوڵەتی مەرکەزی کرد، لە واقیعدا گڵۆپی سەوزی بۆ دەوڵەتی عێراق هەڵکرد کە چۆنی پێ باش بوو ئاوا ڕەفتاریان لە گەڵ بکات. وا پێدەچێت لە پشتی پەردەوە لە سەر کاری چەکدارانەی هێزەکانی سەدر و مەسەلەی موجاهیدین سات و سەودایەك کرابێ، داهاتوو نهێنیەکانی مەربوت بە چەکدا ماڵینی هێزەکانی سەدر ئاشکرا دەکات.

بە نیسبەت ئێمەوە، چەند جیاوازێك هەیە. یەکەم، موجاهیدین بەبۆنەی تیکەڵاو بوونی زۆر بەرچاویان لە گەڵ ڕژێمی بەعسی عێراق و بەرژەوەندیەکانی ئەو دەوڵەتە، لەناو خەڵکی عێراقدا خۆشەویست نەبوون، هەر بۆیە کەسیش لەخەڵکی ئەوناوچانەی دەوروبەری ئەوان لەعێراق لە سەریان وەجواب نەهات. بە پێچەوانەوە ئێمە خاوەنی پێگەیەکی بە هێزین لەناو جەماوەری خەڵکی کوردستانی عێراق. دووهەم، پەیوەندی دۆستانەی ئێمە لەگەڵ هێزە سیاسیەکانی

دەسەڵاتدار لە عێراق بەراورد ناكرێ لەگەڵ پەیوەندی موجاهیدین لەگەڵ حیزبە شیعەكانی دەسەڵاتدار لە عێراق كە هەر لە كۆنەوە دوژمنانە بووە. سێهەم، ئێمە بە بۆنەی پێگەی بە هێزی كۆمەڵایەتیمان لە ناو خەڵكی كوردستانی ئێران، لەو هێزانە نیین كە بە لە دەستدانی چەند مەقەر و ئوردوگایەك بنەبڕ بین و هەمووان ئەوە دەزانن. لە بەر هەموو ئەو هۆیانە، من پێش بینی ناكەم رۆژێك لە رۆژان سیناریۆی موجاهیدین بەم شێوەیە لە سەر ئێمە دووپات بێتەوە.

## رادیۆی ئازادی و یەكسانی هی كۆمەڵەیە

***رادیۆی ئازادی و یەكسانی سەر بە كام ناوەندی ئێوەیە و بە چ مەبەستێك دامەزراوە؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: رادیۆی ئازادی و یەكسانی كە بەرەسمی لە لایەن وەزارەتی رەوشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستان رێگای پێدراوە و مۆڵەتی هەیە، سەر بە ناوەندی راگەیاندنی كۆمەڵەیە و رۆژانە لە سەر مەوجی (FM)، بۆ بەشێك لە كوردستانی عێراق و بۆ شار و شارۆچكە سنووریەكانی كوردستانی ئێران، بە تایبەتی مەنتەقەی هەورامان بەرنامە بڵاو دەكاتەوە. ئەو رادیۆیە رۆژانە ٨ سەعات بەرنامەی هەیە و هەوڵ دەدات خزمەت بكات بە بواری هوشیار كردنەوە و رۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كولتوری پێشكەوتوو، بە تایبەت لەدژی نیزامی پیاوسالار و سوننەتی دواكەوتوو لە كوردستان.

## كۆمەڵە بڕیاری دەركردنی بارزانیەكانی نەدا قیادەی موەقەت كەوتە پاڵ كۆماری ئیسلامی ئێران دژی كوردەكانی ئێران

***دەوترێ كە كۆمەڵە دەوری هەبووە لە تەرح كردنی شیعارێك بۆ دەركردنی بارزانیەكان لە ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران. گۆیا خاڵێك كە لە بڕیارنامەی ٨ مادەیی مەهابادا لەم بابەتەوە هاتووە لە سەر پێشنیاری كۆمەڵە بووە، تەوزیحی ئێوە لە سەر ئەو مەسەلەیە چییە؟**
ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە هەرگیز دروشمی دەركردنی بارزانیەكانمان لە ئێران تەرح نەكردووە، بە پێچەوانەوە لە ساڵی ١٩٧٥ كاتێك كە شەپۆلێك لە پەنابەرانی كورد، بارزانی و غەیرە بارزانی روویان كردە كوردستانی ئێران، تەشكیلاتی نهێنی ئێمە لەهەموو شارەكان دەوری گرینگی گێڕا لە هاندانی خەڵك بۆ پێشوازی كردن لێیان. هەمووان دەزانن كە حەرەكەتێكی سازماندراو لە پشت ئەو پشتیوانی كردنەوە بوو، بەڵام ئەو كات نەیئەدەتوانی خۆی دەربخات. ئەو حەرەكەتە ئەساسەن لە لایەن كۆمەڵەوە رێكخرا بوو. خۆم ئەو كاتە لە مەهاباد بووم و "تەوجیهاتی" كارەكان لە لایەن كاك حەمە حسێن كەریمی وە كە بەر پرسی سەرەوەتری من بوو، دەدرا.

دوای رووخانی رژێمی شا لە ساڵی ١٩٧٩ رێكخراوێك بە ناوی (قیادەی موەقەت) كە لە مانگەكانی كۆتایی حكومەتی شادا و لە سەر بناغەی پارتی دێموكراتی كوردستان پێكهاتبوو، هەڵوێستێكی نادروستیان بەرانبەر بە حەرەكەی موقاوەمەت لە كوردستانی ئێران لە هاوكاری لە گەڵ رژێمی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو گرتبووە بەر. بە لایەنگری لە رژێمی ئێران دژایەتی بزووتنەوەی موقاوەمەتی خەڵكی كوردستانیان دەكرد. بەرنامەی ٨ مادەیی مەهاباد لە دژی ئەو سیاسەتە بوو. من لەو كۆبوونەوەیەدا نەبووم و ناتوانم بە تەئكید بڵێم كام بەندی ئەو بڕیارنامەیە، پێشنیاری

کێ بووە، بەڵام دەزانم کە بە تێکڕای دەنگی نوێنەرانی هەموو حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان و کەسایەتیەکانی ئەو کاتی کوردستان کە لە کۆبوونەوەی مەهاباددا ئامادە بوون، پەسند کرا. هەروەها دەزانم کە بە تەنکید قسە لە سەر مافی پەنابەرانی کوردی کوردستانی عێراق کراوە و هەڵوێستی بەرانبەر بە قیادەی موەقەت و بەرانبەر بە بارزانیەکان وەکوو یەك وا نەبووە.

## کۆمەڵە هەڵەیەکی گەورەی کرد

***لە ساڵانی دەیەی ٦٠ی هەتاوی دا ژومارەیەك لە هاوڕێیانی ئێوە دەکەونە زیندان کە کەسی وەك سەعیدی یەزدیان ئەندامی سەرکردایەتی ئێوەی تێدا بووە، بەشێك لەو کەسانە لە زیندان لە بیروباوەر و ڕێبازی خۆیان پەشیمان بوونەوە تەنانەت هاتنە سەر تەلەویزیونیش و لە دژی ڕێکخراوەکەی خۆیان قسەیان کرد، ئێوە ئەم دیاردەیە چۆن تەوزیح دەدەن و بەرانبەر بەم کەسانە چ هەڵوێستێك تان هەبوو؟ ئەوانە چارەنووسیان چی بە سەر هات و کەسە ناسراوەکانیان کێ بوون؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: تەشکیلاتی تاران و تەورێز و شوێنەکانی تری ئێمە لە ئێران لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی ٦٠ هەتاوی دا زەربەیەکی کوشەندەی لە ڕژێم خوارد. زۆربەی کادرەکانی یان گیران دواجار ئیعدام کران و یان خۆیان گەیاندەوە کوردستان و هاتنە ناو ڕیزی پێشمەرگەوە. لەوانە بەرپرسی تەشکیلاتی تاران هاوڕێ ئەمین ڕەنج بەر، هاوڕێ دوکتور سەعیدی یەزدیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی کۆمەڵە، هاوڕێ تەیبی عەبباسی ڕوحوڵاهی لە کادرەکانی قەدیمی کۆمەڵە کە لە زیندانی شادا موقاوەمەتی کرد بوو، کەسایەتی ناسراوی ناو چەپی ئێران هاوڕێ بیژەنی چهرازی و دەیان کەسی تر. هەروەها لە تەشکیلاتی تەورێز کەسانێکی وەکوو، هوشەنگ توحیدی، ئەمجەد وماجدی مستەفا سوڵتانی وئیسماعیل یەگانەدوست... هتد

چەند کەسێك لە هاوڕێیانی ئێمە لە ژێر ئەشکەنجەی زۆر توندا ناچارکران کە بێنە سەر شاشەی تەلەویزیۆن و بە پێچەوانەی بیر و باوەڕ و ڕێبازی سیاسی خۆیان قسە بکەن. حەماسەتی شۆڕشگێرانەی تەشکیلاتی کۆمەڵە لە دەرەوەی زیندان و بە تایبەت لە ناو ڕیزی پێشمەرگەدا، هەروەها کەم ئەزموونی خۆمان و نامۆ بوونی ئەو دیاردەیە، وای کرد کە ئێمە ئەو کات نەماتوانی هەڵوێستێکی واقیع بینانە بەرانبەر بەم مەسەلەیە بگرین و کەوتینە مەحکوم کردنیان. واقیعیەت ئەوە بوو کە هەر ئەو کات، کەسانێکیش بوون کە بە هۆی فشار و ئەشکەنجەیێك کە کران ئامادە نەبوون لەدژی هاوڕێیانی خۆیان کارێك بکەن یان لە سەر تەلەویزیونی قسە بکەن. ئەوانە بە ڕاستی ناویان لە ڕیزی قارەمانانیدا تۆمار دەکرێ. پاڵەوانی موقاوەمەت بەرانبەر بە ئەشکەنجەی دوژمن پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ و ببێت بە تاجی سەری هەمووان بەڵام ئەگەر کەسێکیش نەیتوانی دەوری پاڵەوانی بگێڕێ، نابێ ئەفرەتی لێ بکرێ. ئەوانە قوربانی دەستی ڕژێمێکی دڕندە بوون و هەموو ئەفرەتەکە هەر دەبوایە ڕووی کردبا دوژمن. هەر بۆیە لام وایە ئێمە دەبوایە گوێ بە یەك وشەش کە لە ژێر ئەشکەنجەدا بەیان کرا بوو نەدەین و هەمووی ڕەد کەینەوە. ڕژێمی ئیسلامی هەوڵی دەدا نەك هەر لەشی قوربانیەکانی خۆی تێدا بەرێ بەڵکوو ڕوح و کەسایەتیشیان بشکێنێ. هەڵوێستی ئێمە دەبوایە بە پێچەوانەی ئەو ئامانجەی دوژمن کاری کردبا. لە بیرمە ئەو

کات ئاسیلکەیەک لەلایەن ئێمەوە دەرچوو بەناوی: "لورە لوری تەوابین و خرۆشی شۆڕش" کە هەر لە ناوەکەیەوە هەلوێستی نادروستی ئێمە بەرانبەر بەو کەسانە دیار بوو. ڕای شەخسی من ئەوەیە کە ناوی ئیعدام کراوەکانی ئەو دەورەیە کە ئەو کات نەیانتوانی لە ژێر ئەشکەنجەی ڕژێمدا موقاوەمەت بکەن، بێتەوە ناو ریزی گیانبەختکردوانی کۆمەڵەوە.

**خومەینی دژی گەلانی ئێران بوو**

***عەبدوللای موهتەدی دەڵێ کە ئێوە، هاتنە سەر کاری ڕژێمی کۆماری ئیسلامی بە پیلانی ئەمریکا دەزانن و ئەو ئەوە ڕەد دەکاتەوە، لە ڕوانگەی ئێوەوە بۆچی شۆڕشی گەلانی ئێران ئەو چارەنووسەی پەیدا کرد؟ ئایا بە ڕاستی ئەوەی ڕوویدا لە ناوەرۆکدا شۆڕشێکی ئیسلامی نەبوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: مەسەلە ڕەت کردنەوە یان ڕەت نەکردنەوەی دەوری ئەمریکا نییە، ئەم جۆرە لێکدانەوانە ڕێگا نادەن بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی قووڵ و هەمە لایەنە لە ڕەوتی هاتنە سەرکاری ڕژیمی ئیسلامی لە ئێران پەیدا بکەین. ئەوە فاکتێکی حاشا هەڵنەگری مێژوویە کە لەفۆناغێکی دیاریکراو بەولاوە، ئەمریکا و چوار دەوڵەتی دیکەی پیشەسازی جیهان لە پاییزی ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی لە کۆبوونەوەی گوادۆلۆپدا هاتنە سەر ئەوەی کە کۆتایی بە پشتیوانی کردنی خۆیان لە ڕژیمی شا بێنن و کارناسانی بۆ هاتنە سەرکاری ڕژیمی ئیسلامی بکەن. چونکە لایان وابوو بەهەرحاڵ ڕژیمی شا لەوە زیاتر قابیلی پاراستن نییە و کەوابێ چ باشتر ئەگەر ڕژیمێك جێگای بگرێتەوە کە بتوانێ بە تەبیعەتی خۆی لەمپەرێك بێ بەرامبەر بە نفوزی ئیتحادی شورەوی ئەوکات.

لەچەند بواردا ئەو کارناسانییەیان بۆ کرد. یەکیان ئەوەبوو کە میدیاکانی ڕۆژئاوا زۆرتر و چڕوپڕتر کەوتنە تەبلیغاتێك کە بەکردەوە حەرەکەتی ئیسلامی و لایەنی خۆمەینی بەهێز دەکرد. دووهەم، سوپای ئێرانیان بۆ بێدەنگ کردن و ڕێگایان نەدا فەرماندەکانی سوپای ئێران بکەونە بیری کودەتاوە. سێهەم: شایان هاندا کە ئێران بەجێ بهێڵێ.

سێ ڕەوتی بەرچاو لە شۆڕشی ساڵی ١٣٥٧ی ئێراندا بە ڕوونی بەدی دەکرا. یەکەمیان ڕەوتی ئیسلامی لە ژێر رابەری خۆمەینیدا. دووهەمیان، ڕەوتی ناسیۆنالیسمی ئێرانی کە لیبراڵەکانی جەبهەی میللی و نەهزەتی ئازادی نوێنەرایەتییان دەکرد. سێهەمیان ڕەوتی چەپ و کۆمۆنیست. دەوڵەتانی گەورەی ڕۆژئاوا پشتگیرییان لە ڕەوتی یەکەمیان کرد. چونکە دەیانزانی لیبراڵەکانی ئێران توانای کۆنترۆڵ کردنی هەلومەرجەکەیان نییە و وڵاتێکی لاواز و پڕلە کێشە دەکەوێتە بەردەستیان کە ناتوانن بەرامبەر بە نفوزی شورەوی بیپارێزن. هەربۆیە هیوایەکیان بە ئەوان نەبوو، ئەوەندە نەبێ کە ئەوانیش هان بدەن بۆ پشتگیری کردن لە خۆمەینی. ڕەوتی چەپ پرژوبڵاو و بێ ڕەهبەر بوو. دەورانی دوور و درێژی دیکتاتۆری پاشایەتی فۆرسەتی ئەوەی پێ نەدابوو کە خۆی ڕێك و پێك بکات. ئەم ڕەوتە بە ئامادەییەوە پێی نایە دەورانی شۆڕشی ١٣٥٧ەوە. لەحاڵێکدا لە هەمووی ئەو ساڵانەدا، لەژێر سێبەری دیکتاتۆری شاشدا هەرگیز ڕێگە بەتەواوی لەدوو ڕەوتەکەی دیکە کە باسم کرد نەگیرا بوو، ئەوان کەم و زۆر مەجالی چالاکی و خۆ

رێکخستنیان هەبوو. بەڵام ئاشکرایە کە ئارەزووەکانی خەڵك لەو شۆڕشەدا هەمووی لە دروشمەکانی ئەم رەوتەدا رەنگی دەداوە. ئەم رەوتە ژمارەیەکی زۆر کرێکار و خەڵکی زەحمەتکێش و رۆشنبیری شۆڕشگێری لەگەڵ بوو، لە جەرەیانی راپەڕینی رێبەندانی ئەو ساڵەشدا جێ پەنجەیان بەرووونی دیار بوو. ئەڵبەت واقعییەت ئەوەیە کە بەشێکی ئەم رەوتە لە هەمانکاتدا بەرامبەر بە خۆمەینی تووشی خۆشباوەڕی ببوو. هەراوهوریای دژی ئەمپریالیستی ئیسلامییەکان گێژی کردبوون.

لە ئاکامی هاوسەنگییەکی وەهادا بوو کە رژێمی ئیسلامی لە ئێران هاتە سەرکار. ئەو شۆڕشە ئیسلامی نەبوو، بەڵام خۆمەینی و رەوتی ئیسلامی توانیان بەسەریدا زاڵ بن و دوو ساڵ دواتر لە هاوینی ١٣٦٠ی هەتاویدا بەتەواوی سەرکوتیان کرد. بۆچی دەڵێم ئیسلامی نەبوو، لەرووی ئەو واقعیەتەوە کە خەڵکی راپەڕیو، ئازادی و ژیانی باشتر و ئاسوودەیان دەویست. هیچکام لەم دوو ئاواتە لە ستراتێژ و ئامانجی خۆمەینیدا دیار نەبوو.

**ئێران چارەنووسی روخانە**

***رژێمی کۆماری ئیسلامی بەرەو کوێ دەچێت؟ لێکدانەوەی ئێوە لە سەر رووداوەکانی چەند مانگی رابردوو لە ئێران چییە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: رژێمی ئیسلامی زیاتر لەوەی کە تەسەوەر دەکرا لەسەرکار ماوەتەوە. کۆمەڵگای ئێران ئەو رژێمەی ناوێ و نەك هەر نایهەوێ بەڵکوو جورئەتی ئەوەشی پەیدا کردووە کە ئەم مەیلەی خۆیشی بە ئاشکرا و لەسەر شەقامەکان دەربڕێ. کێشەکە ئەوەیە کە چۆن و کەی و لەچ پرۆسەیەکدا جێنشینی ئەو رژێمە ئامادە دەبێ؟

لەمێژووی ١٠٠ساڵی رابوردووی ئێراندا ٣رەوتی ئیسلامی سیاسی، لیبراڵی لایەنگری رۆژئاوا وە رەوتی چەپ و سۆسیالیست بۆبەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی لە ئێران لە ململانێدا بوون.لە شۆڕشی ١٣٥٧دا رەوتی ئیسلامی بەسەر دوو رەوتەکەی دیکەدا زاڵ بوو. ئەمرۆکە نیتر حکومەتی ٣٠ ساڵەی ئیسلامی لە ئێران جێگایەکی نەهێشتووەتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر لە ئێران لەژێر ناوی ئیسلامیدا ئەم رەوتە بێتەوە سەر حوکم. زۆر لایەنی ئیسلامی کە ئەو مەترسییەیان هەست پێکردووە، هەوڵ دەدەن بەشکەم بە ئیسلاح کردنی ئەو سیستەمە رزگاری بکەن، بەڵام تێیدا سەرکەوتوو نەبوون.

کەوایە داهاتووی سیاسی ئێران مەیدانی ململانێی رژێمی دەسەڵاتدار لە لایەکەوە و دوو رەوتی لیبراڵ و چەپ لە لایەکی دیکەوە دەبێ. دەسەڵاتی سیاسی ئێران لە قۆناغی یەکەمی گۆڕانی خۆیدا لە نێوان دوو رەوتی لیبراڵ و چەپدا دابەش دەکرێ و سەرئەنجام بە بڕوای من بە هۆی ئەوەی کە رەوتی لیبراڵ هیچ پرۆژەیەکی ئیجابی بۆ ئابووری ئێران نییە و توانای ئەوەی نییە کە بۆرژوازی ئەو وڵاتە لە قەیرانی ئابووری رزگار کات، ناچار دەبێ بەرامبەر بە رەوتی چەپ و سۆسیالیست پاشەکشە بکات.

بە شێوەیەکی دیاری کراو سەبارەت بە ڕووداوەکانی چەند مانگی دوای هاتەوە سەرکاری ئەحمەدی نژاد ئەگەر مەبەستتان بێت، لەو ڕۆژەوە کە خەڵك بە بانگەوازی ریفورمخوازەگان حکومەتی هاتنە سەر شەقام و لە دژی تەقەلوب لە هەڵبژاردن دا دروشمیان دا تا بە ئەمرۆ جەماوەری خەڵك ڕۆژ لە گەل ڕۆژ زیاتر لەو ریفرمخوازانە دور کەوتونەتەوە و متمانەیان پێیان لە دەست داوە. ریفۆرمخوازەکانیش بە دەست رادیکاڵ بونەوەی دروشمی خوپیشاندانەکان سەخڵەت بوون و هەوڵدەدەن وردە وردە پای خۆیانی لێ بکێشنە دەورەوە. ئەوان نایانهەوێ هیچکام لە دامەزراوەکانی سەرەکی رژێم تۆزی لێ بنیشێ. ئەوان تەنها مەسەلەکەیان ئەوەیە کە رژیمی کۆماری ئیسلامی لە قەیرانێك رزگار کەن کە بە هۆی بالای دەسەلاتدارەوە توشی هاتۆە. ئەوان خۆیان بە ڕێرەوی راستەقینەی رێبازی خومەینی دەزانن و لایان وایە باڵی دەسەلاتدار لێی لاداوە. لێرەدای کە ئاوات و ئامانجەکانی خەلك و ئەو جۆرە بە ناو ریفۆرم خۆازانە لێك جیادەبێتەوە. ئەوان لە ڕۆژانی هەوەلی دوای هەڵبژاردن دا دەیان هەویست هێزی جەماوە وەکوو ئامرازی زەخت بۆ پاشەکشە کردن بە بالی دەسەلاتدار بەکار بێنن بەلام لە لایەکەوە دروشمەکانی جەماوەر لە ئاستی ئامانجی ئەوان تێپەر بوو و لە لایەکی دیکەشەوە بالی دەسەلاتدار ئامادە نەبوو هیچ ئیمتیازێکیان پێ بدات. هەر بۆیە ئەمرۆ بەکردەوە دەورییان لە ڕێبەرایەتی حەرکەتی جەماوەردا روو لە تەواو بونە. خەباتی خوێندارانی زانکۆکان ، کرێکاران و ژنان خەریکە دێتە روو بەلام دیارە ئەوەی کە ئیمە ناومان ناوە بەرەی سێهەم هێشتا رێبەرایەتیەکەی خۆی شکل پێنداوە.

**موسەوی نایەوێ ئێران بروخێ**

***گوایە موسەوی نوێنەری خۆی ناردۆتە ئەمەریکا بۆ پشتیوانی لەرووخانی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەوە تاچەند راست و شیاوە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: بە هیچ مەنتقێك ئەوە ناتوانێ راست بێ. چونکە موسەوی هەرگیز بە شوێن رووخانی رژێمی ئیسلامیەوە نەبووە. هەموو زەرورەتی پێکهاتنی ئەو رەوتەی کە موسەوی رێبەری یان نوێنەرایەتی دەکات لە ئەساس دا بۆ پاراستنی رژێمی ئیسلامیە، بۆ دەربازکردنیەتی لە قەیرانێك کە باڵی توندرەو بۆ ئیزامەکەیانی خۆلقاندووە.

*** بۆچی کوردستان لە ڕووداوەکانی ئەو ماوەیەی ئێراندا بێدەنگ بوو؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئەو ڕووداوانەی کە لەتاران و لە شارە گەورەکانی دیکەی ئێراندا بەشوێن هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریدا روویان دا ئەساسەن لەژێر رێبەری ئیسلاح خوازانی ناوخۆی رژێمدا بوو. خەڵکی کوردستان هیچ بڕوایەکی بەو رێفۆرمخوازانە نییە. ئەوان لەدەورەی ٨ساڵەی دەسەلاتی خاتەمیدا ئەو رەوتەیان تاقی کردەوە و هیچ شتێکی ئیجابیان بۆ ژیان و بۆ ئازادی خۆیان تێدا بەدی نەکرد. زۆربەی رێبەرانی ناسراوی ئەم رەوتە هەرکامەیان لە دەورەیەکدا دەوریان هەبووە لە داپلۆسینی خەڵکی کوردستاندا. هەر بۆیە مەعمولەن هەڵبژاردنەکانی کۆماری ئیسلامیش لە کوردستان گەلێك سارد و بێ رەونەقن. لەم دەورەیەشدا ژمارەیەکی کەم نەبێ، خەڵکی کوردستان لەم هەڵبژاردنەدا بەشداری نەکرد. ئەمەش خۆی هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی کە بەشێوەی شارەکانی دیکەی ئێران لەدژی تەقەلوب لە هەڵبژاردندا نەیەنە سەرشەقام. پێویستە ئەو

واقیعییەتەشمان لەبەرچاو بێت کە ناکۆکی خەڵکی کوردستان و ڕژیمی ئێران گەیشتووەتە ئاستێك کە هەر خۆپیشاندان و نارەزایەتی دەربڕینێك لە ئاستی جەماوەریدا دەبێتە مەیدانی شەڕی یەك لایی کەرەوە و مان و نەمان لەگەڵ ڕژیم. چوونکە لەو قۆناغەشدا خەڵکی کوردستان ئامادەیی ئەو بەرەوروو بوونەوەیان نەبوو، خۆیان پاراست لەوەی کە بێنە مەیدانی شەڕێکەوە کە ئامادەیی پێویستیان بۆی نییە.

ئەڵبەتە ئەم لێکدانەوەیە بەو مانایە نییە کە هەموو جۆرە بێدەنگییەکی خەڵکی کوردستان لەو قۆناغەدا پیرۆز بکرێ. ئەگەر لە ڕۆژانی هەوەڵی خۆپیشاندانەکانی تاراندا ڕەوتی سەوز کۆنترۆڵ و سەرگردایەتی حەرەکەتەکەی بەدەستەوە بوو، دیتمان کە لە ڕۆژانی دواتر و هەتا هات پێگەی ئەوان لاوازتر بوو وە دروشمەکان رادیکاڵتر بوونەوە و لە ئاستی تەحەممولی ڕیفۆرمخوازەکانی ناوحکومەت تێپەر بوون. کەوابێ جێگەی خۆیەتی و ئیمە بەش بە حالی خۆمان هەولی بۆ ئەدەین کە بزوتنەوەی شورشگێرانەی کوردوستان دەوری شایستەی خۆی لە ناو جەرگەی بزوتنەوە کۆمەلایەتیەکانی ئەمرۆی ئێراندا ببینێتەوە. دەمێنێتەوە رەچاو کردنی شێوە و تاکتیك گەلێك کە ڕژیم نەتوانێ بە ئاسانی نوقمی خوێنی بکات و یان خەسارەتی گەورەی پێ بگەیەنێ.

**کاتی ئەهاتوە کورد بێتە سەرشەقام**

***بۆچی لەخۆپێشاندانەکانی تارانی ساڵی ۲۰۰۹ ئێوە نەچوونە پاڵی و خەڵکی کوردستانی ئێرانتان نەهێنایە سەر جادە و هەندێ لایەن پێیانوایە تۆ دژی ئەوەبووی کە خەڵکی کوردستان بێتە سەرشەقام؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: ئێمە بەرامبەر بە ڕووداوەکانی ئێران هەڵوێستمان ڕوون بوو. لەپێشدا داوامان لە خەڵك چ لە کوردستان و چ لە هەموو ئێران کرد کە لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریدا بەشداری نەکەن. لە کوردستان بە شێوەیەکی بەرچاو وە لە ئێران بە کەمی وەڵامی ئەو داوایەی ئێمە و لایەنەکانی دیکە درایەوە. دوای ئەوەی کە شەپۆلی نارەزایەتی خەڵك لە ئاستی ئێراندا وەرێکەوت، ئێمە داوامان لە خەڵك کرد کە نەکەونە شوێن دروشمی ئەو لایەنەی کە پێی دەگوترا "شەپۆلی سەوز". ئێمە لامان وابوو کە ئامانجی ئەم لایەنە هیچ شتێك نییە بێجگە لەدەرباز کردنی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی لە قەیران و ڕێگایەکە بۆ بەردەوام ڕاگرتنی ئەو ڕژیمە بە شێوەیەکی تر. لە بەرانبەردا داوامان کرد کە خەڵك لەم هەل و مەرجە نوێیە کە پێکهاتووە کەڵك وەربگرن و بە دروشم و داخوازی خۆیانەوە شوێن ئامانجی واقیعی خۆیان بکەون، بە واتایەکیتر لە جەرگەی ئەم هەلومەرجەدا بەرەیەکی سێهەم بخەنەرێ. ئەو داوایەی ئێمە بە کردەوە تا رادەیەك چووە پێشەوە. کۆمەلانی خەڵکی ئێران زۆر زوو لە دروشمەکانی "بەرەی سەوز" تێپەڕبوون و سەرجەم حەرەکەتەکە ڕادیکاڵتر بووەوە، بە جۆرێك کە ڕێبەرانی ئەو بەرەیە بە خشکەیی و وردە وردە خۆیان لەو نارەزایەتی دەربرینانەی سەرشەقامەکان دور خستەوە.

هاتنە سەرشەقام لە کوردستان نەیدەتوانی لەژێر ئالای سەوز و دروشمی ئیسلاح خوازەکانی حکومەتی بێ. خەڵکی کوردستان بە ڕێبەرانی ئەو حەرەکەتە بێ باوەر بوون. ئەو بێ باوەڕییە

سەرچاوەی لە ئەزموونی راستەوخۆی رابردووی خەڵکی کوردستاندا بوو. زۆربەی رێبەرانی ئەو حەرەکەتە لەکاتی خۆیدا دەستیان بەخوێنی رۆڵەکانی کوردستان سوور بوو. لە لایەکی دیکەوە هاتنە سەرشەقام لە کوردستان بۆ جەماوەری خەڵك بەمانای هاتنە مەیدانی شەڕی کۆتایی لەگەڵ رژێم بوو، شەڕێك کە بەلێکدانەوەی ئێمە خەڵکی کوردستان خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو. هەرچەشنە خۆپێشاندانێك گەلێك زۆرتر لەچاو تاران و شارە گەورەکانی دیکەی ئێران، لەکوردستان سەرکوت دەکرا، ئەوەش ئیمکانی سەرهەڵدانەوەی سەرلەنوێی گەلێك دوا دەخست.

***ئێستا هەوڵێکی ئاشتی هەیە لەکوردستانی تورکیا، لەنێوان کورد و تورکیادا پێت چۆنە ئەو هەنگاوانە؟**

ئیبراهیم عەلیزادە: تا ئێستا هیچ نیشانەیەك دیار نییە کە پێمان بڵێ ئەم هەوڵانە جیدین. پێکهاتەی واقیعی دەسەڵات لە تورکیا و دەوری بەکردەوەی ئەرتەش و دەزگاکانی ئەمنیەتی ئەو وڵاتە وەهایە کە دەزگای دەسەڵاتی رەسمی ناتوانێ ئەگەر تەنانەت راستیش بکات ئەو پرۆسەیە بە بێ رەزایەتی ئەوان لەسەر ئەساسی بەرەسمی ناسینی مافە سەرەتاییەکانی خەڵکی کورد لە تورکیا بباتە پێش. دەوڵەتی تورکیا خەریکە کایە بە مەسەلەکە دەکات. دەڵێن خەیاڵیان هەیە دان بە برێك لە داخوازیەکانی خەڵکی کورد دابنێن، ئەگەر وایە بۆچی ئەوکەسانەی کە هەر لەسەر ئەو داخوازیانە کەتونەتە زیندان ئازاد ناکرێن، بۆچی ئەوکەسانەی کە بەم بۆنەوە تووشی دەربەدەری بوون و وڵاتیان بەجێهێشتوە ناتوانن بگەرێنەوە سەر خانە و لانەی خۆیان. بۆ چی لێبوردنێکی گشتی دەرناچێ؟ بۆچی تەنانەت کاتێك پ.کا.کا بریاری تەقە وەستاندن دەدات وەڵامی پێنادەنەوە؟ ئێستا کە دوای ساڵەها سەرسەختی، بیری هەوڵی ئاشتی کەوتوونەتەوە بۆچی داوای لێبوردن لە میللەتێك کە زیاتر لە ٧٠ ساڵە بە ئاگر و ئاسن دای دەپلۆسن ناکەن؟ دەوڵەتی تورکیا لە بیر خۆی دەباتەوە کە لەم وڵاتەدا خەباتێکی دەیان ساڵە بەرێوەچوو کە بە هەزاران کەسی تێدا بۆتە قوربانی. ئەو خەباتەیە کە ئەوی ناچار کردووە بیر لە رێگا چارە بۆ کێشەی کورد لە تورکیا بکاتەوە. ئەگەر دەیانهەوێ خەڵك باوەریان پێ بکات بۆچی راستەوخۆ لە گەڵ هەیئەتێك لە نوێنەرانی واقعی خەڵك ناچنە ناو پرۆسەی گفتوگۆوە؟ بۆچی هەلومەرجێکی دیموکراتیکی وەها ناخوڵقێنن کە وەها هەیئەتێك لە نوێنەرانی خەڵك شکڵ بگرێ.

بەر لە ساڵێك لەمەوبەر کەمپێنێکی رێگە پێدراو لە سەر داخوازی ئازادبوونی زمانی دایکی کەوتەرێ، کە مەبەستی سەرەکیەکەی رێگە خۆشکردن بۆ هەر ئەو پرۆسەیە بوو کە ئێستا بە ئاشکرا باسی لێوە دەکرێ. دەوڵەتی تورکیا مەسەلەی زمانی دایکی هێناوەتە ناوەندی کێشەکەوە و دەیهەوێ چەند ئیمتیازێکی بچووکی فەرهەنگی بە هەرا و هوریای تەبلیغاتی لە بەرچاوی خەڵك شیرین کات و سەروبەری مەسەلە پێك بێنێ. کاتێك کە دابین بوونی مافێکی وەکوو ئازاد بوونی زمانی دایکی ئەویش لە چوارچێوەیەکی گەلێك بەرتەسکدا دەبێ بە وەها پرۆسەیەکی ئاڵۆزدا تێپەربێ، خۆی ئەوە گومان دەخاتە سەر جیددی بوونی ئەو پرۆسەیە. بە هەمووی ئەوانە ئەگەر دەوڵەتی تورکیا دەیهەوێ بە دوور لە گفتوگۆ لە گەڵ نوێنەرانی خەڵك چەند ریفورمێك لە مەسەلەی کورددا بکات پێویستە لە کردەوەدا بیبینین و ئەوکاتە قەزاوەتی لەسەر بکەین و

لەوماوەیەدا خەباتی خەڵکیش لە سەر بەڵێنی بێ بنەما نەوەستێنین.

**بەهمەنی سەعیدی**

٢٠٠٩

# گرینگترین رووداوەکانی مێژووی کۆمەڵە

پێکهاتنی کۆمەڵە:............................................ تاران ١٣٤٨

یەکەم زەربەی ساواك لە کۆمەڵە:............................................ تاران ١٣٤٨

دەرچوونی نامیلکەی، "بۆچی پرژ و بڵاوین و چۆن یەك بگرین": ............... زستانی ١٣٤٩

دووهەم زەربەی ساواك لە کۆمەڵە: ............................................ بانە و بۆکان ١٣٥٢

سێهەم زەربەی ساواك لە کۆمەڵە: ............................................ تاران ١٣٥٢

گیانبەخت کردنی خانەی موعینی، رۆژی پێشمەرگەی کۆمەڵە ......... ٣١ی جوزەردانی ١٣٥٧

کونگرەی یەکەمی کۆمەڵە:............................ کۆتایی پاییز و دەستپێکی زستانی ١٣٥٧

گیانبەخت کردنی حمە حسین کەریمی، رۆژی کۆمەڵە: ..................... ٢٦ی رێبەندانی ١٣٥٧

پێکهاتنی یەکێتی جوتیارانی مەریوان ............................................ زستانی ١٣٥٧

پێکهاتنی یەکێتی جوتیاران لە شوێنەکانی دیکەی کوردستان........................ بەهاری ١٣٥٨

پێکهاتنی جەمعیەتەکانی دیموکراتیك لە شارەکانی کوردوستان ........................ بەهاری ١٣٥٨

دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری شۆرش زمانحاڵی نەزەری ـ سیاسی کۆمەڵە:.. زستانی ١٣٥٨

رێپێوانی خەڵکی سنە بەرەو مەریوان بۆ ئازاد کردنی زیندانیان لەسەر بانگەوازی کۆمەڵە هاوینی ١٣٥٨

کۆچی مێژووی خەڵکی شاری مەریوان لەسەر بانگەوازی کۆمەڵە............ ١ پووشپەری ١٣٥٨

هێرشی بەربلاوی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر کوردستان........................ ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٥٨

دەرچوونی بانگەوازی کۆمەڵە بۆ موقاوەمەتی جەماوەری........................ ٢٩ی گەلاوێژی ١٣٥٨

گیانبەخت کردنی فوئاد مستەفا سوڵتانی لە رێبەرانی کۆمەڵە ............ ٩ی خەرمانانی ١٣٥٨

ئاگربڕ و کۆتایی شەڕی ٣ مانگە لە گەڵ کۆماری ئیسلامی ..................... ٢٦ی خەزەڵوەر ١٣٥٨

پێکهاتنی دەستەی نوێنەرایەتی گەلی کورد بۆ وتوویژ.................. .......... گەلارێزانی ١٣٥٨

یەکەم گفتگۆی رەسمی لەگەڵ نوێنەرانی رژیمی کۆماری ئیسلامی ...... ١٩ی سەرماوەزی ١٣٥٨

دەرچوونی گەلاڵەی ٢٦ مادەیی خودموختاری کوردستان........................ ٢٤ی سەرماوەزی ١٣٥٨

چەك كردنی بنكەكانی سوپای رزگاری لە جنوبی كوردستان.................. ڕێبەندانی ١٣٥٨

پێكهاتنی بنكەی گەڕەكەكان لە شاری سنە............................ خاكەلێوەی ١٣٥٨

پێكهاتنی كۆموسیونی فێركردن و بارهێنانی كۆمەڵە......................... پاییزی ١٣٥٨

مانگرتنی گشتی خەڵكی شاری سنە بۆ ماوەی ٢٩ رۆژ لەسەر بانگەوازی كۆمەڵە ١١ی بەفرانباری............................ ١٣٥٨

دەرچوونی یەكەم ژمارەی پێشڕەو ئورگانی كومیتەی ناوەندی كۆمەڵە .......... بەهاری ١٣٥٩

هێرشی سەرلە نوێی كۆماری ئیسلامی بۆ سەر كوردستان و مقاومەتی ٢٤ رۆژەی شاری سنە.. ١٠خاكەلێوەی............................ ١٣٥٩

یەكەم شاڵاوی دەستگیری لە تەشكیلاتی تارانی كۆمەڵە........................ ١٣٦١

شاڵاوی دەستگیری لە تەشكیلاتی تەورێزی كۆمەڵە............................ ١٣٦٠

گیانلەدەستدانی هاورێیانی ڕێگای توورکەمەنسەحرا ........................ ٩خاكەلێوەی ١٣٥٩

موقاومەتی شارەكانی دیكەی كوردستان بەرانبەر بە هێرش........................ بەهاری ١٣٥٩

دەستپێكی شەڕی ئێران و عێراق............................ خەرمانانی ١٣٥٩

پەلاماری حیزبی دیموكرات بۆ سەر مەقەڕی ڕێكخراوی "پەیكار" لە شاری بۆكان ..... ٧ی رەشەممەی............................ ١٣٥٩

یەكەم تێكهەڵچوونی چەكدارانە لە نێوان حیزبی دیموكرات و كۆمەڵە.......... ٥ی گوڵانی ١٣٦٠

بەڕێوەچوونی كونگرەی ٢ی كۆمەڵە لە ئاوایی "زەمبیل"........................ بەهاری ١٣٦٠

پێوەندی دیپلۆماسی كۆمەڵە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق........................ زستانی ١٣٦٠

بەڕێوەچوونی كنگرەی ٣ی كۆمەڵە، پەسەند كردنی برنامەی حیزبی كۆمۆنیستی ئێران ............ گوڵانی ١٣٦١.

دەرچوونی یەكەم كتێبەكانی خوێندن بە زمانی كوردی لە لایەن كۆمەڵەوە........ هاوینی ١٣٦١

دەست بەكار بونی "دەنگی شورشی ئێران" رادیوی كۆمەڵە........................ ٨ پووشپەری ١٣٦١

ئێعدامی ٥٩كەس لە هەڵسووڕاوانی سیاسی لە مهاباد ........................ ٢جۆزەردانی١٣٦٢

پێكهاتنی كومیتەی بەڕێوەبەری كونگرەی دامەزرێنەری حیزبی كۆمۆنیستی ئێران...١٥ی خاكەلێوەی............................ ١٣٦٢

بەڕێوەچوونی كونگرەی دامەزرێنەری حیزبی كۆمۆنیستی ئێران.........١١ی گەلاوێژی ١٣٦٢

دەست بەكار بونی رادیوی دەنگی حیزبی كومونیستی ئێران........................ ١٨ خەزەڵوەری ١٣٦٢

دەرچوونی یەكەم ژمارەی گۆڤاری كۆمۆنیست ئورگانی حیزبی كۆمۆنیستی ئێران .....١٥ی رەزبەری............................ ١٣٦٢

بەیانیەی مافە سەرەتاییەکانی خەڵکی زەحمەتکێش لە کوردستان ............ ١٥خەرمانانی ١٣٦٢..............................................

بەڕێوەچوونی یەکەم دەورەی مەدرەسەی حیزبی نوکتوبەر.......................... هاوینی ١٣٦٢

بەڕێوەچوونی کنگرەی ٤ی کۆمەڵە..............................................ڕەزبەر ١٣٦٣

دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری تیئوریك بە سوی سوسیالیزم.......................پائیزی ١٣٦٤

پەلاماری حیزبی دیموکراتی کوردوستانی ئیران بۆ سەر مەقەری کۆمەڵە لە هەورامان......................................٢٥گەلاڕێزان ١٣٦٣

راگەیاندنی شەری سەراسەری لە گەل کۆمەلە لە لایەن حیزبی دیموکرات کوردستان ڕێبەندانی...................................................... ١٣٦٤

بە بن بەست گەیشتن نیوبژیوانی یکیتی نیشتمانی و وەلامی کۆمەلە بە پەلاماری حیزبی دیموکرات.... ...................................٦ڕێبەندانی ١٣٦٢

راگەیاندنی مەرجەکانی حیزبی دیموکرات بۆ کۆتایی هێنان بە شەر لە گەل کۆمەلە لە رۆژنامەی کۆردوستان...........................................................خاکەلیوەی ١٣٦٤

راگەیاندنی بریارنامەی کومیتەی ناوەندی کۆمەلە لە پەیوەند لە لە گەل حیزبی دیموکرات دا............................................. پوشپەری ١٣٦٤

بەریوەچونی کونگرەی ٢ی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران...............................پائیزی ١٣٦٤

دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری ئەدەبی و فەرهەنگی پێشەنگ ....................پاییزی ١٣٦٤

بەڕێوەچوونی کنگرەی ٥ی کۆمەڵە ..............................................ڕەشەممەی ١٣٦٤

دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری پەیام، بلاوکراوەی رادیو دەنگی شۆرشی ئێران...... ١٥ی خاکەلیوەی................................................................ ١٣٦٦

گیانبەخت کردنی دوکتور جەعفەر شەفیعی لە ڕێبەرانی کۆمەلە لە رووداوی سەیارە ٧گەلارێزان............................................................... ١٣٦٦

تێداچونی گوردانی شوان لە دەشتی شارەزوور ..........................٢٦ و ٢٧ رەشەمەی ١٣٦٦

راگەیاندنی ئاگربەس یەك لایەنەی کۆمەڵە لە شەڕ لەگەڵ حیزبی دیموکرات...٢ی گولانی ١٣٦٧

بەریوەچونی کونگرەی ٦ ی کۆمەلە ............................................١٧گولانی ١٣٦٧

بومبارانی مەقەرەکانی ناوەندی کۆمەلە لە لایەن دەولەتی عیراق بە چەکی کیمیایی لە بۆتێن.......... .......................................٢٥گولانی ١٣٦٧

بەریوەچونی کونگرەی ٣ی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران..........................٢٨ی ڕێبەندانی ١٣٦٧

تیروری غلام کەشاوەرز لە ڕێبەرانی حیزبی کومونیست لە لارناکا بە دەستی مەئمورانی کۆماری

# بەڵگەنامەکان

## بڕیارنامە پەسەندکراوەکانی کۆنگرەی نۆهەم

### بڕیارنامە

لەماوەی چەند مانگی رابوردوداو بەتایبەتی پاش بەستنی کۆنگرەی حەوتەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، چەند لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی حیزبی کۆمۆنیستو شوێنو پێگەی کۆمەڵە لەوچوارچێوەیەی رێکخستندا لەگۆڕێدایەو هەتائێستاش چەند تێروانینێکی هاوناهەنگو جیاواز لەئاستێکی دیاریکراودا خراونەتەڕوو لەبەرئەوە کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە بەپێویستی دەزانێت کەئەم خاڵانەی خوارەوە روونبکاتەوە:

١- کۆمەڵە لەسەرەتای دامەزراندنیەوە لەساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی هەرگیز کاروچالاکیەکانی خۆی لەتێڕوانینێکی ناوچەییدا قەتیس نەکردووە، هاوڕێ فوادی مستەفا سوڵتانو دامەزرێنەرانی تری کۆمەڵە ئەگەر هەرجۆرە تەسەورێکیان هەبووبێت لەبارەی سۆشیالیزمەوە هەمیشە یەکدیدی ئەنتەرناسیونالیستیو سەراسەریش لەگەڵ هەموو خەباتگێڕانو شۆڕشگێڕانی سۆشیالیستو رادیکاڵ ئێراندا هەبووە. ئەنەوکاتو ئەئەمڕۆش چوارچێوەیەکی ناوچەیی، رێگەخۆشکەرو وەڵامدەرەوەی چاوەڕوانیو داخوازییەکانی خەڵکی کوردستانو کرێکارانو زەحمەتکێشاندا.

٢- حیزبی کۆمۆنیستی ئێران لەمانگی خوزەیرانی ساڵی ١٩٨٢ دوای یەك ساڵ مشتومڕی گەرمو ئاشکراو نهێنی کەهاوڕێیانی کۆمەڵە بەگەرموگوڕییەکی زۆرەوە تیایدا بەشدارییان کرد، لەکۆنگرەیەکی دامەزراندندا، دامەزرا. پەیوەست بوونی کۆمەڵە بەحیزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە بەهۆی پاراستنو بڵاوکردنەوەی تایبەتمەندی شۆڕشگێڕانەو نفوزی کۆمەڵایەتیو

سیاسی کۆمەڵەوە بوو. باوەشکردنەوەی هەڵسوڕاوانی کۆمەڵە بۆ ریزەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران نیشانەی نفوزی قووڵی ئامانجە یەکسانیخوازیو کۆمۆنیستییەکانی ریزەکانی کۆمەڵە بوو.

پرۆسەی پێکهێنانی حیزبو پەیوەستبوونی کۆمەڵە پێیانەوە لەهەموو روویەکەوە لەروانگەی پرەنسیپە دیموکراتیو نەریتە پێشڕەوەکانەوە بووە. کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە ئەوکاتە لەمیانەی بەستنی ریفراندۆمێکی رێکخستنییەوە پەیوەست بوونی کۆمەڵەی بەو رێکخستنە نوێیەوە خستە دەنگدانو زیاتر لە ٩٨٪ی هەڵسوڕاوانی کۆمەڵە ئەو دەنگدانەیان بەباش زانی رێکخراوی سیاسیوزۆر لەئەندامانو خەباتگێڕانی چەپ مشتومڕیان کردو بەو شێوەیە بوو کەکۆمەڵە بوو بە بەشێک لەحیزبی کۆمۆنیستی ئێرانو ئەوەتا ئەمڕۆ ١٧ساڵە لەو پەیکەرەی رێکخستندا کاروچالاکی ئەنجام دەدات. لەبەرئەوە ئەمڕۆ هەرجۆرە هەڵوێستێکمان لەمەڕ حیزبی کۆمۆنیستی هەبێت، ناتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت کەئەم بزوتنەوەیە رۆڵێکی پڕ بەهای گێڕاوە لەرادیکالیزەکردنی سەرجەم فەزای بزوتنەوەی کوردستان لە تەرویجو تەبلیغی ئامانجی یەکسانیخوازانەو ئینسانیو لەمسۆگەرکردنی پایەداری کۆمەڵە لەبەرامبەر ئەو سەختیانەی لەم بیست ساڵەی دواییدا رووبەرووی بۆوەتەوە.

٣- بنەما سەرەکییەکانی دیموکراتیەتو ناوخۆی رێکخستنەکانو پاراستنی مافەکانی ئەندامان، وا لەدۆستانو تەنانەت خەڵکی کوردستانیش دەکات کەهەرجۆرە نوێگەرییەک لەکاروچالاکی کۆمەڵە لەژێر ناوی نوێداو لەرێگەی هەمان پرۆسەوە لەرێگەی چەندین لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن لەبارەی چالاکی هەتا ئێستاو سەرئەنجام لەیەک ریفراندۆمی گشتی لەناوخۆی رێکخستنەکانو مشتومڕو چاوخشاندنێکی بەرفراوانی بەربەستە رێکخستنەکان، بەئەنجام بگەیەنرێت.

٤- کۆمەڵە جیو رێی ئومێدو ئامرازی هەستی خەڵکی بێبەشو بەشمەینەتەو لەدژی هەموو جۆرە ستەمێکی کۆمەڵایەتیو چینایەتیو نەتەوایەتی خەبات دەکات.

ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە کە ئەگەر هەر ئاوێکیش بۆ ئایندەی کاروچالاکی خۆمان هەڵبژێرین، بەڵام دەبێت بەشێوەیەکی دووربین و بەرپرسانە هەوڵی تۆکمەکردن و بەهێزکردنی ریزەکانی کۆمەڵە بدەین. ئێمە رێگە نادەین بەهیچ بیانوویەک و بەهۆی ئەو ناستە لەجیاوازی بیروڕا کەتائێستا هەبووە یەکپارچەیی ریزەکانی ئەم بزووتنەوەیە بەرەو مەترسی بەرن.

- بەپاڵپشتی ئەوانەی کەگوتران کۆنگرەی نۆهەمی کۆمەڵە بڕیار دەدات لەسەر ئەوەی کە:

ئەلف - کۆمیتەی ناوەندی داهاتووی کۆمەڵە دەرگا لەبەردەم گفتوگۆیەکی ئاشکرا لەبارەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و بەردەوامی ئەندامێتی کۆمەڵە لەو چوارچێوە رێکخستنیەدا دەکاتەوەو سەرجەم خاوەن بیروڕاو خەباتگێڕانی چەپ و کۆمۆنیست بانگەواز دەکات بۆ بەشداریکردنێکی چالاک لەو گفتوگۆیەدا.

بـ- کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە چەندین کۆنفرانس و سیمیناری پێویست لەناوخۆی رێکخستنەکاندا بۆ ئەو مەبەستە رێکدەخات و هەموو تواناکانی خۆی دەخاتە گەڕ لەپێناو ناوەڵاکردنی زیاتری هەموو خاڵە هاوبەش و جیاوازەکان لەبارەی ئەو کێشەیەوە.

ج- کۆکردنەوەی ئەنجامیگرییەک لەو مشتومڕەو پاشان لەرێگەی ریفراندۆمێکی ناو رێکخستنەکاندا دەبێتە داخوازییەکی پێویست و دوابڕیار لەو بارەیەوە دەسپێردرێتە ئەو کۆنگرە نائاساییەی بۆ هەمان مەبەست دەبەسترێت و شێوەیەکی رەسمی بەخۆیەوە دەگرێت.

**کۆنگرەی نۆهەمی رێکخراوی کوردستانی**

**حیزبی کۆمۆنیستی ئێران (کۆمەڵە)**

**ئابی ٢٠٠٠**

**یاداشتنامەی نارەزایەتی دەربڕین لە لایەن کومیتەی ناوەندی کۆمەڵە بۆ دەوڵەتی عیراق دوای کیمیا بارانی مەقەڕەکانی کۆمەڵە لە بۆتێ کە بە زمانی فارسی لە لایەن نوینەری کۆمەڵەوە لە بەغدا تەحویلی سەرۆکی موخابەراتی ئەوکاتی عیراق دراوە.**

جناب آقای دکتر فاضل براک

با سلام، همانطوریکه قبلا باطلاع رسانده ایم ساعت 7و پنج دقیقه و ساعت 7و 15 دقیق عصر روز 15 مه سال 1988 طی دو نوبت مقرهای مرکزی کومه له واقع در منطقه رانیه مورد حمله شیمیایی چند فروند از هواپیماهای دولت عراق قرار گرفت و موجب وارد آمدن تلفات و ضایعات سنگینی بر تشکیلات کومه له گردید.

با وجود مناسبات دوستانه بین دولت عراق و سازمان ما، چه توضیحی برای این رویداد وجود دارد؟ واضح است که این رویداد به جمهوری اسلامی امکان میدهد تا بابهره برداری از آن به تضعیف روحیه مردم در کردستان ایران بپردازد که این نه به نفع ما و نه به نفع دولت عراق خواهد بود.

ما بدینوسیله به این رویداد اعتراض میکنیم و خواستار اعلام موضع رسمی دولت عراق در قبال آن هستیم.

با احترام

کمیته مرکزی کومه له

1988-05-17

# خبرنامه کومه له

۲۹

پنجشنبه ۵۹.۷.۲۵




## جنگ ایران و عراق در جهت منافع طبقات استثمارگر حاکم در هردو کشور و بقیمت خون صدها نفر از مردم بیدفاع با وحشیگری همچنان ادامه دارد.

◆ ◆ ◆

**مهاباد:**

■ خمپاره باران شهر و کشتار مردم بیدفاع بوسیله رژیم جمهوری اسلامی ادامه دارد.

■ پیشمرگان کومه له پایگاه ارتش را در تپه قاضی کوبیدند.

■ **اشنویه:** پیشمرگان کومه له به پایگاه ارتش در خانلر حمله بردند.

■ **کامیاران:** یک خودرو ارتشی در کمین پیشمرگان کومه له منهدم کردند.

---

اختلاف بین دو رژیم ایران و عراق چیست؟

ما هرچند قبلاً در تاریخ ۵۹/۷/۲ طی جزوه ای [illegible]

[illegible]

---

کارگران و زحمتکشان!
برای مبارزه علیه [illegible] متحد شوید!

---

[illegible]

کومه‌له

# خبرنامه

شماره ۱۲۶ تاریخ ۲، ۳، ۶۰

## جنگ ارتجاعی ایران و عراق و تشدید سرکوب مردم مریوان

اکنون دیگر اثرات ویرانگرانه جنگ ارتجاعی ایران و عراق، برای بیشتر زحمتکشان میهنمان روشن شده است زیرا زندگی آنان را عملا با مشکلات جدی تری روبرو ساخته است.

آوارگی، تشدید بیکاری و گرانی ارزاق عمومی و حیاتی زندگی — ونیز تشدید خفقان وسرکوب — همگی از "خیرات" این جنگ ضد انقلابی برای کارگران و دیگر زحمتکشان است. رژیمهای ضد انقلابی ایران و عراق، خون وزندگی زحمتکشان را وسیله حفظ و توسعه سرمایه سرمایه داران کشورهای خود قرار داده اند و بعد نیز آنان را قربانی سیاستهای ارتجاعی خود میسازند.

رژیم ارتجاعی ایران، از جنگ بعنوان وسیله‌ای برای اعمال بیشتر دیکتاتوری استفاده کرده وهرنوع اعتراض ومخالفتی را — ولو کوچک — به این بهانه، سرکوب میکند؛ کارگران — بخاطر جنگ — باید بیشتر تولید کنند، سود بیشتری بجیب سرمایه‌داران بریزند و مخارج زرادخانه جمهوری اسلامی را تامین کنند. وهرگاه بخواهند برای کسب مزد بیشتر بمبارزه برخیزند — باز به بهانه جنگ — ژ ۳ پاسداران را در مقابل خود می‌بینند. رژیم بمنظور ایجاد خفقان بیشتر و سرکوب انقلابیون، دادگاه زمان جنگ برای آنان تشکیل میدهد...

هرچند اثرات زیانبار ناشی از جنگ، عمومی است ولی در مناطقی که در محدوده صحنه‌های جنگ هستند، این اثرات شدت بیشتری دارند. در این مناطق، رژیم به ویرانی خانه وکاشانه اهالی اکتفا نمیکند، بلکه خود زحمتکشان را نیز بعنوان گوشت دم توپ در صحنه‌های نبرد بازور نگاه میدارد واگر کسانی اعتراض کنند، بنام خائن معرفی شده وگاه به جوخه اعدام سپرده میشوند.

مریوان یکی از صحنه‌های جنگ است وگزارشی را که در زیر میخوانید، گوشه‌هایی از جنایع رژیم را در این منطقه نشان میدهد:

حدود یکماه قبل، مزدوران رژیم جمهوری اسلامی به روستاهای سیر مریوان — دزلی حمله کرده و اهالی را از اسلحه‌ها روستاها بیرون کشیدند. مزدوران آنان را ...

■ پیشمرگان کومه‌له، طی دو نبرد جداگانه، تعرض نیرو های رژیم را به روستا های سنندج درهم شکستند.

در یکی از این نبردها که ۷ ساعت طول کشید:

● ضربات سنگینی بر دشمن وارد آمد

● تعدادی از نیروهای دشمن کشته و زخمی شدند؛

● فرمانده سپاه پاسداران سنندج به هلاکت رسید.

● چنانچه در خبرنامه ۱۲۵ به اطلاعتان رسید، تعرض گسترده نیروهای سرکوبگر جمهوری اسلامی به روستاهای اطراف کامیاران، بوسیله پیشمرگان کومه‌له درهم شکسته شد. ارابه جنگی رژیم، این بار بسوی روستاهای اطراف سنندج (کیلانه، مروزان و...) بحرکت افتاد تا زحمتکشان بیشتری را مورد تهاجمات ددمنشانه خود قرار دهد، زندانیشان کند، وهرگونه ندای آزادیخواهی را با گلوله پاسخ گوید و بالاخره "امنیت" موعود را برقرار سازد. لیکن انگار از شکست سرسختانه همین چند روز پیش پیشمرگان انقلابی در روستای "طا" (کامیاران) بی خبر بودند تا بتوانند نتایج تعرض کور خود را پیش بینی کنند...

